| | | |
|---|---|---|
| عنوان قراردادی | : | کلیله و دمنه. کُردی |
| عنوان و نام پدیدآور | : | **کلیلەودیمنە**/ وەرگێڕانی لە فارسییەوە ئەحمەد قازی. |
| مشخصات نشر | : | سقز: گوتار، ۱۳۹٤. |
| مشخصات ظاهری | : | ۳٤٤ ص. |
| شابک | : | ۱۸۰۰۰۰ریال ISBN: 978-600-5647-97-6 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | نثر فارسی -- قرن ٦ ق. -- ترجمه شده به کردی |
| موضوع | : | نثر کردی -- قرن ۱٤. -- ترجمه شده از فارسی |
| شناسه افزوده | : | قاضی، احمد، ۱۳۱۵ -، مترجم |
| رده بندی کنگره | : | ۱۳۹٤ ک۳۸آ/ ۵۰۹۲ PIR |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۸/۸۲۳ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۳۵۱۸۸٤۷ |



**کلیلەودیمنە**

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئەحمەد قازی

پێداچوونەوە: ڕەزا شەجیعی

دیزاینی بەرگو ناوەڕۆک: ئازاد سورخی

پیتچن: پەروین پیرەبابی

ئەژمار: ۱۰۰۰ دانە

قیمەت: ۱۸۰۰۰ تمەن

ناوەندی چاپو بڵاوکردنەوەی گوتار

کوردستان: سەقز، پاساژی ماد، نهۆمی ۳، یەکەی ۳۲

تەلەفوون: ۳٦۲۲۷۰۳۰ ـ ۰۸۷

گوتار



مرکزپخش: سقز، فرهنگسرای هنر و اندیشه، ۰۹۱۸۷۷۷۱۵۸۵



از سری کتاب‌های مرکز تحقیقات کردستان‌شناسی دانشگاه آزاد اسلامی واحد سنندج
سنندج ـ خیابان فلسطین ـ کد پستی ۶۶۱۶۷۹۷۱۸۱
تلفن: ۳۳۲۸۲۶۰۳ ـ ۳۳۲۳۵۸۱۱ (۰۸۷)

□

# پێڕست


پەیڤێک/ ئومید وەرزەندە ........................ ٧
ئەحمەد قازی، مامۆستای نەمر و هەرمان / شاباز موحسێنی ........ ٩
سەرەتای وەرگێڕی کوردی........................ ١٥
سەرەتای "هەڵەبڕ"، موجتەبا مینەوی تارانی ........ ٢١
سەرەتای وەرگێڕ، نەسروڵلا مونشی ........................ ٣٣
دەقی پێشەکییەکەی کوڕی موقەفەع (ابن‌المقفع) ........ ٤٥
سەرەتای کلیلەودێمنە لە زبان بوزەرجومێهری بەختەکان ........ ٥٥
برزوویەی تەبیب ........................ ٦١
شێرو گا ........................ ٧٥
لێکۆڵینەوە لە کاری دێمنە ........................ ١٢٩
دۆستایەتی کۆترو قالاو و مشکو رەقەو ئاسک ........................ ١٥٣
کوندو قالاو ........................ ١٧٧
مەیموونو رەقە ـ حەکایەتی سەرەکی ........................ ٢١١
شێخو فسۆس ........................ ٢٢٥
کتکو مشک ........................ ٢٢٩
پادشا و پۆڕ........................ ٢٣٩
شێرو چەقەڵ ........................ ٢٥١

تیرهاوێژو شێری مێ.......................................۲۷۱
میوانو شێخ.......................................۲۷۷
پادشا و بەرەهمەنەکان .......................................۲۸۳
زێرینگەرو گەڕیدە.......................................۳۱۳
شازادەو هاوڕێکانی .......................................۳۲۱
دواقسەی وەرگێڕ .......................................۳۲۹
فەرهەنگۆک.......................................۳۳۳

□

# پەیڤێک

کلیلەودێمنە بێگومان گەنجینەیەکی بەنرخە بۆ بەرینکردنەوەی پانتای هزرو ئەزموونی ژیانی مرۆڤ. خوێنەر بە خوێندنەوەی ئەم دەقە کلاسیکە نە تەنیا لەگەڵ وشەی قەبەو جوانیناسیو توانای ئەدەبیدا رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵکوو لە رێگای حیکایەتو گێڕانەوەوە ـ کە تیایدا لە هەموو دەفرایەتییەکانی ژانری چیرۆک وەک: داڕشتنی کەسایەتی (Characterization)، فەنتەزیا (Fantasy)، گێڕانەوە (Narration)، کێشمەکێش (Conflict) کەڵک وەرگیراوە ـ سیاسەتکردن، بڕیاردان، ئەخلاق، مامەڵە لەگەڵ دەسەلات، لەگەڵ مرۆڤو لەگەڵ ژیانو پێکەوە ژیانو پووچەڵکردنەوەی پیلانو حیکمەت فێر دەبێت. خوێنەری کلیلەودێمنە رووبەڕووی سەدان ئەزموونو بەسەرهاتو حیکایەت دەبێتەوە تا لە دەلاقەی ئەم دەقە کلاسیکەوە خۆ بسپێرێتە ئەو هەموو ئەزموونو حیکایەتو بەسەرهاتە لە زاری ئاژەلانەوە تا وانەی ژیان وەربگرێت.

بایەخی کلیلەودێمنە تا رادەیەکە بە هوموو زمانە زیندووەکانی دونیا وەرگێڕدراوەتەوەو هەموو میللەتانی دونیا لە خوێندنەوەی، چێژی خۆیانی لێ وەردەگرن.

ئەم دەقە بەنرخە هەرچەند لە بنەڕەتدا بە سانسکریت نووسراوەو "نەسرووڵڵا مونشی" لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە فارسی، بەڵام وەرگێڕانەکەی نەسرووڵڵا مونشی وەکوو یەکێک لە شاکارە ئەدەبییەکانی فارسی دێتە ئەژمارو بووە

بــە موڵکی ئەدەبی فارســی‌و زمان‌و ئەدەبی فارســی لە ڕێــگای ئەم دەقەوە دەوڵەمەندتر بۆتەوە.

مامۆستا ئەحمەد قازی چەند مانگێک پێش ئێستا دەقی وەرگێڕدراوی کوردیی کلیلەودیمنەی بە من سپارد تا لە ناوەندی توێژینەوەی کوردستانناسیی زانکۆی ئازادی ســنە، چاپی بکەین. ئێمەش بەوپەڕی فەخرو شــانازییەوە شاگەشکە بووین کە ناوەندەکەمان بە قەڵەمی پاراوی ئەو گەورەپیاوە دەڕازێتەوە. ســەد مەخابن هەر چەند خودی مامۆســتا زۆر بەپەلەو بەپەرۆش بوو بۆ بینینی ئەم دوایین بەرهەمەی بەڵام مەرگ مەودای بینینی ئەم کتێبەی پێنەدا.

پــاش خوێندنەوەی ئــەم بەرهەمە بەنرخە بە کوردی ئەم ڕاســتییەمان بۆ دەردەکەوێــت کــە کلیلەودیمنەی مامۆســتا ئەحمەد قازیــش ئەبێتە مایەی دەوڵەمەندکردنی زمان‌و ئەدەبی کوردی‌و ئەم هەنگاوەشــی وەکوو هەنگاوەکانی دیکەی، خزمەتکردنە بە زمان‌و ئەدەبی نەتەوەکەی.

ناوەنــدی توێژینەوەی کوردستانناســیی زانکۆی ئازادی ســنە، لە درێژەی چالاکییەکانی خۆیدا خۆی بە بەختەوەر دەزانێت کە بە قەڵەمی پاراوی مامۆستا ئەحمەد قازی کتێبخانەی کوردی بڕازێنێتەوە.

دوکتۆر ئومید وەرزەندە

بەرپرسی ناوەندی توێژینەوەی کوردستانناسیی زانکۆی ئازادی سنە

گەلاوێژی ١٣٩٤

□

## ئەحمەد قازی، مامۆستای نەمر و هەرمان

لـــە مێژووی گەلی کورد، پیاوی زاناو هەڵکەوتـــەو لێهاتوو کەم نەبوون، کە مایەی شـــانازی کوردو تەنانەت گەلانو نەتەوەکانی دیکەن. مامۆســـتای تازە کۆچکـــردوو، ئەحمەد قازی، لەو کەســـایەتییانەیە کە ژیانـــی خۆی لە پێناوی خزمەتی دڵســـۆزانە بە کەلتوورو زانستی نەتەوەکەی تەرخان کردو خزمەتێکی زۆرو بەرچاوی کردووە تا هەتایە شوێن پێی دیارو هەرمانە.

حەفتا و نۆ بەهاری تێپەڕاند، زۆربەی زۆری، تەنانەت دوایین ڕۆژەکانی ژیانی، بۆ فێربوونو فێرکردنو نووســـینو وەرگێـــڕانو توێژینەوەو ڕێنومایی لایەنگرانی فەرهەنگو بەتایبەت گەنجان، دە کار هێنا.

بە ڕاستی کە ژیانی مرۆڤی زیرو بلیمەتیان بە ژیانی مێشهەنگوین شوبهاندووە کە بریتییە لە ســـێ بەشـــی بەهرەوەرگرتـــن، پێگەیشـــتنو بەهرەگەیاندن بە کۆمەڵگا...

کاک ئەحمەد، ژیانێکی پڕ لە ئەزموونی هەبووە، ئەگەر چاوێک بە کارنامەی ئەم مرۆڤە بیرمەندو پایەبەرزە بخشـــێنین، بە درێژایی شـــەش دەیە، هەوڵێکی بێوچان بۆ ئافراندنی دەیان پەڕتووکی بەنرخمان بەر چاو دەکەوێ.

ئەم پیاوە کەســـێک نەبوو کە لە ســـووچی کتێبخانە دابنیشێو بە دوور لە کێشـــەی نێو کۆمەڵگا، تەنیا بۆ دڵی خۆی بنووســـێ. پێنووسی کاک ئەحمەد وێنای دڵێکی پڕهەست بوو کە بۆ مرۆڤایەتی لێی دەدا و وەک مرۆڤێکی بیرمەند

هەموو ساتەكانی ژیانی، تەنانەت ساتە ئەستەمو پڕ لە دژوارییەكانی دەكردە هەلێكی زێڕین بۆ داهێنانی زانستیو كەلتووری.

مامۆستا هەستی بەرپرسایەتی زۆری هەبوو لە هەمبەر زێدو نیشتمانی. بلیمەتێك بوو كە توانای لە چەندین بواردا هەبوو. كە دەهاتە ئاخافتنو نقیسان، زۆر بەپێز بوونو پڕ بوون لە نوكتەی جوانو پوختو شیرین. كەسم نەدیتبوو هێندەی مامۆستا ئەحمەد قازی بە كوردییەكی وەها جوانو ڕێكوپێكو بە كێشو سەروا بدوێت. بە رای من لە رەوانبێژیو پاراوی زماندا بێوێنە بوو.

هەندێك، مامۆستا بە وەرگێڕ دەناسن، بەلێ راستە. وەرگێڕێك بە قەلەمی بەهێز و دەستڕەنگین لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ فارسیو كوردی.

مامۆستا چەند بەرهەمی وەگێراوەتە سەر زمانی فارسی، بۆ وێنە كتێبی "نسل اژدها" لە نووسینی "پرل باك"ی ئەمریكی براوەی خەلاتی ئەدەبی نۆبێل. ئەم پەڕتووكە لە خەباتو هەولو تێكۆشانی خەلكی چین دەدوێ بۆ ئامانجی گەیشتن بە گەشەكردنو پێشكەوتن. وەك دەزانین ئەژدیها، هێمای كەلتوورو مێژووی گەلی چینەو هەروا كە دەیبینین، ئەوڕۆكە چین بووەتە زلهێزێكی ئابووری لە جیهاندا.

كتێبی"عصر غولها" نووسراوەی "وینا دلما"ی سێناریۆنووس و رۆماننووسی ئەمریكی سەبارەت بە هەندێ دێو و درنجی تازەهەلكەوتوو و نوێ كە لەم سەردەمەدا سەریان هەلهێناوە. سێ كەسایەتی وەك "ناپلئۆن بوناپارت"، "تامس جێفێرسۆن" و "توسن لوویرتور"، پالەوانی سەرەكی ئەم كتێبەنو لە كۆتاییدا نووسەر باسی قۆناغی كۆتاییهاتنی ئیستێعماری ئینگلیسو سەرهەلدانی ئەمریكا دەكات.

كتێبی"صدام و بحران خلیج فارس" نووسینی "جودیت میكێر" كە لە گەرمەی شەڕی یەكەمی بەنداوی فارسدا وەریگێڕاتەوەو زۆر بە كاتوسات گەیشتە بەر دەستی خوێنەران.

لە بەرهەمەكانی دیكەی مامۆستا، وەرگێڕانی كتێبی "گێلگامێش"، حەماسەی ناسراوی مێزۆپۆتامیا و "دۆنكیشۆت"ی "سێروانتێس"ە بە كوردی.

هەروەها نووسینی رێزمانی کوردی، مامۆستا کە دەرچووی زمانی ئینگلیزی لە زانستگا بوو بە هۆی لایەنی زمانەوانییەوە، بۆ نووسینی ئەم رێزمانە، لە نموونەی کتێبی دەستووری فارسی دوکتۆر "پرویز خانلری" کەڵکی وەرگرتووە.

مامۆستا هەندێ شیعری فارسیشی وەرگێڕاوەتەوە بۆ وێنە هەڵبەستی تەوسی بەناوبانگ "موش و گربە"ی "عبید زاکانی" شاعیری ناسراوی سەدەی هەشتی کۆچی. هەروەها شیعری "نیما یوشیج"، شاعیری نوێخوازی وەرگێڕاوە کە دەقێکی سەرکەوتووە.

هەندێکی دیکە مامۆستا بە چیرۆکنووس دەناسن، وەک دەزانین "باقەبێن" یەکێکە لە بەرهەمە سەرکەوتووەکانی. کورتەچیرۆکی دیکەش زۆرن کە هێشتا لە چاپ نەدراون. رۆمانی "شب بی پایان"یشی ئەو کاتەی لە زیندانی رێژیمی پەهلەویدا بوو، نووسی...

هەندێک، مامۆستا بە رۆژنامەوان دادەنێن. ئەوەش راستە لەبەر ئەوەی دوای کۆچی دوایی مامۆستا هێمن، بەرپرسایەتی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری سروەی گرتە ئەستۆ. تەنانەت بۆ هەڵسووڕاندنی ئەم ئەرکە ماڵی لە تارانەوە گواستەوە بۆ ورمێ. زۆربەی ژمارەکانی گۆڤاری سروە بە وتاری مامۆستا رازاوە بوو و چەندین بەشی نوێی ئەدەبی لە سروەدا هێنایە گۆڕێ کە پێشتر لە کوردستان هەلی خوێندنەوەیان بۆ نەڕەخسابوو، بۆ ماوەی نزیک بە بیست ساڵ، لە پێناوی پێشکەوتن و گەشەپێدانی فەرهەنگی کوردستان هەوڵێکی بێوچانی دا و لەو ئاڵوگۆڕە فەرهەنگییەدا دەورێکی کاریگەری هەبوو.

هەندێک مامۆستا بە شاعیر دەزانن. بەڵێ مامۆستا شاعیر بوو. شایەدحاڵی ئەم قسە دەفتەرەشیعرێکی جوانو پاراوە کە بە ئیزنی خودا لە داهاتووی نێزیکدا دێتە بەر چاوی خوێنەران.

هەندێک مامۆستا بە لێکۆڵەرو توێژەر لە بواری هزری کۆمەڵایەتی دەناسن. کە بە شایەتی بەرهەمەکانی ئەمەش راستە. لەم بوارەشدا هەندێ کاری باشی کردووە وەک راستکردنەوەی دیوانی "سیف القضات" یان "خاطرات من"ی عەبدوڵلاخانی ناهید یان "خلاصه تاریخ کردستان".

کاک ئەحمـــەد پێی وابوو هەر کەس بەهرەمەنـــدیو تواناییەکی هەیە دەبێ دەســتی لێ هەڵماڵێو بنووســـێ. زۆرجار لێی دەپرسین چ دەکەن؟ بە چییەوە ســـەرقاڵن؟ ئەگـــەر وەڵاممان داباوە کـــە خەریکی وانەوتنـــەوەو کاروباری ناو دایرەین، رەخنەی لێ دەگرتین کە وا نابێ. دەبێ بنووســـنو یادگار لە شـــوێن خۆتان جێبهێڵن. مامۆســـتا زۆر خێرخواز بوو. بـــۆ وێنە ئەو بوو کە وەرگێڕی ناوداری وڵات "محمد قاضی" کە کوڕەمامی بوو، هان دا "تاریخ کرد و کردستان"ی "واســـیلی نیکیتین" لە فەڕەنســـییەوە بکاتە فارســـی. یان رۆمانی "صلاح‌الدین ایوبی" نووسراوەی "آلبر شاندور" کە خودی "محمد قاضی" ئەمەی لە پێشەکی ئەم کتێبانەدا وتووە.

بەرپرسایەتی دایرەی پەروەردەو فێرکردنی بۆکانو وانەگوتنەوە لە زانستگای تاران، چەند چالاکی دیکەی مامۆســـتان. راســـتە کە کاک ئەحمەد ئەم حەمکە توانایـــیو بلیمەتییـــەی هەبوو، بەڵام ســـەرەڕای هەموو ئەمانـــە، بە رای من تایبەتمەندییەکی ســـەرەکی مامۆســـتا ئەوە بوو کە راستو پاکو بەحورمەتو مرۆڤدۆستو قسەخۆشو خۆبەزلنەزانو بەخشەندە بوو.

لەم دوو سێ ساڵەی دوایی تەمەنیدا هۆگرییەکی پتەوی لەگەڵ "کلیله و دمنه"، شاکاری زمانو ئەدەبی کلاسیکی فارسیدا پەیدا کردبوو. دەستی دایە پێنووسو بـــە قەڵەمێکی بەقووەتو زمانێکی بەهێز وەریگێڕایـــەوە. چارەنووس وابوو کە ئاواتی دیتنی چاپی ئەم کتێبەی نەیەتە دی. ئێســـتا شوکرانەبژێری خودام بە دەسپێشخەری دوکتۆر ئومید وەرزەندە، مامۆستای زانستگا و بەرپرسی ناوەندی کوردستانناسیی زانســـتگای ئازادی ئیسلامی سنەو بەڕێز کاک رەزا شەجیعی، بەڕێوەبـــەری بڵاوکەی "گوتـــار"، ئەم یادگارە بەنرخە لە چـــاپ دەدرێ. جێی خۆیەتی سپاسی ئەم ئازیزانە بکەم.

"کلیلـــە و دمنە" پڕ لە حیکمەتو قســـەی نەســـتەقو بەکەڵـــک، لە بنەڕەتدا بە زمانی هێندی نووســـراوە. لە قۆناغی دەســـەڵاتداری نەوشیرەوانی ساسانی، بورزوویەی پزیشـــک هێنایە ســـەر زمانی پەهلەوی. دوای سەرهەڵدانی ئیسلام، لە ســـەردەمی بزاڤی تەرجومـــەدا، "ابن مقفع" زانا و وەرگێـــڕی بەتوانا کردییە

عەرەبی. "نصرالله منشـــی" لە زەمانی "بارامشـــای غەزنەوی"دا، وەریگێڕایە سەر زمانی فارســـی، "رودکی سمرقندی"، شاعیری ناسراویش کردییە شیعر. ئێستاش ئـــەوە ئێـــوە و ئەوە "کلیله و دمنه" بە خامەی مامۆســـتای نەمرو هەرمان، کاک ئەحمەد قازی.

شاباز موحسێنی

سەقز، پووشپەڕی ١٣٩٤ی هەتاوی

□

# سەرەتای وەرگێڕی کوردی

هەمــــوو منداڵێکـــی ئەم جیهانە عاشــــقی نەقڵو نەزیلــەو حەکایەتی گوێی ئاگردانە. منیش هەر وا بووم‌و ئێســــتاش بە پیری ئەم عادەتەم هەر ماوەو زۆر حەز دەکەم، داســــتانی تایبەت بە مناڵان بخوێنمەوەو تەنانەت جاروبار دەگەڵ نەوە خوێن‌شیرینەکانم (هەســـتی)و (نەجلا) حەز دەکەم چاو لە کارتۆن‌و فیلمی "پڵینگی چێرەیی ـ پلنگ صورتی" بکەم.

لــە کتێبەکانی دەرســـی ئەدەبیاتدا لە دەبیرســــتان‌و زانکـــۆ، تاکوتەرا داســـتانەکانی کلیلەودیمنەو گوڵستانی ســـەعدی‌و مەرزبان‌نامەو سەرچاوەکانی دیکە گونجێنرابوون [لە کتێبەکانی ئێستاشدا، چ لە سەرەتایی‌و چ لە ناوەندیدا ئەم کارە دەکەن].

بێجگــە لــەوانـــە دە بنەماڵەشـــماندا پیرەپیــاو و پیرێژنـــی حەکایەتزان‌و حەکایەتخوانـــی زۆرمـــان هەبـــوون کە دە شــــەوگاری درێژی پاییزو زســــتاندا حەکایەتیان بۆ دەگوتین. میرزا ســــەعید، مەلا ســـالح، ئاڵتوونە نێرە، مەنیجە لاڵ، ئامین بابین؛ خودا غەرقی رەحمەتی خۆیان بکا.

دەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان بۆم روون بۆوە کە ســــەرچاوەی زۆرێک لەم نەقڵو نەزیلانە دە زبانگەلی عەرەبی‌و فارســـی‌و کوردی‌و تورکیدا هاوبەشـــن‌و هەر بۆ نموونە چەندان حەکایەت‌و داســــتانی کلیلەودیمنە کەوتوونەتە سەر زارو زبانی خەڵکی بێ‌سەوادو ئاسایی‌و لە زبان پیرەپیاو یا پیرێژنانی وڵات دەبیسرێن.

واهەڵکەوت لە بەهاری ئەمساڵدا کتێبی بە نرخی کلیلەودیمنەم لە دۆستێکەوە دەســـکەوتو زۆر بە وردی، وەک کەســـێک بیەوێ بـــە دەرس بیخوێنێو خۆی بـــۆ ئەزموونو تـاقیکردنەوە لەســـەر ناوەرۆکو زبانی تایبـــەت کە بابەتەکانی پێ نووســـراوە، ئامادە بکا، دەســـتم بە خوێندنەوەی کردو لەم خوێندنەوەیەدا تێگەیشتم کە ئەم کتێبە یەکێک لە سەرچاوە گرینگەکانی ئەدەبو کۆمەڵناسیو سیاسەتو دەســـەڵاتداری لە جیهاندایەو لەسەریەک، سەرچاوەیەکە بۆ ڕێنوێنی شـــێوەی هەڵسوکەوتـــی دەســـەڵاتداران، بـــۆ بەڕێوەبردنـــی وڵاتو کۆمەڵگا بەشـــەرییەکان لە لایەکو لە لایەکی دیکەشەوە بۆ مرۆڤی ئاساییو چینو توێژە ناوەنـــدیو خوارووەکانی دنیا، ڕێنوێنییە بۆ ژیانو بەرێچوونو ســـەرکەوتن لە ژیاندا و لەسەر یەک بۆ هەمووکەس، وەک سەرچاوەیەکی گرینگی پڕ لە نوکتەی ئەخلاقیو ڕەوشـــوێنی ژیانی ئاوەزمەندانەو سەرکەوتووانە دە پێوەندی دەگەڵ تاکوکۆی کۆمەڵ، لە هەڵکەوتی جیاوازو جۆراوجۆردایە. ئەوەی کە زۆربەی کات قارەمانەکان لە گیاندارانو ئـــاژەڵو باڵندەو ئاوەژییەکان هەڵبژێراون، ڕەمزێکی گەورەیە بۆ ئەوەی نووســـەر یا نووسەرانی داستانەکان بتوانن ئازادانەتر قسەی خۆیان دەربڕنو تامو بۆنو بەرامەی حەکایەتەکانیش خۆشترو شیرینتر بکەن.

ئەو کتێبە بەنرخە کە پێش ئیســـلام لە هیندووستانەوە هاتووە، بە فارسیو عەرەبـــیو تورکیو چەند زبانی بیانیش تەرجەمـــە کراوە. پێم وابوو بە کوردی تەرجەمە نەکراوە، تا ئەوەی دۆســـتی هێژا و زانام کاک عەلی ئیســـماعیلزادە، ئاگاداری کردمەوە کە تەرجەمەیەکی کوردی بەلاوە هەیەو زۆر پیاوانە پێشکەشی کردم کە بە پێویســـتی دەزانم لێرەدا ســـپاسو پێزانینی خۆم ڕابگەیەنم. ئەم تەرجەمەیـــە لە لایەن بەڕێزێکەوە بە نـــاوی "عومەر تەوفیق" لە عەرەبیڕا کراوە بە کوردیو ســـاڵی ١٩٧٥ بۆ جاری دووهەم لە بەغـــدا چاپ کراوەتەوە. چاپی یەکەمی ســـاڵی ١٩٧٠ لـــە چاپخانەی کامەرانی لە ســـولەیمانی ئەنجام دراوە. ئەوەی بە کورتی دەتوانم لەمەڕ ئەم وەرگێڕانە بیڵێم ئەوەیە کە نە وەرگێڕانەکەو نە دەرهێنانی کتێبەکە لەباری فەننییەوە، لە ئاســـتێکی بەرزدا نینو نەیانتوانی لـــەو بڕیارەی دابووم پاشـــگەزم بکەنەوە، بەڵکوو هانیـــان دام کە بە ورەیەکی

مەحکەمترەوە تەرجەمەکە ئەنجام بدەم.

لە کۆتایی پێهێنانی وەرگێرانەکەدا بووم کە دۆستی خۆشەویست، مامۆستا "مەلا حوسێن ئیبراهیمی" هەواڵی پێدام کە مامۆستا "مەلا رەسووڵ عەتووفی" لە سەردەشت کلیلەودیمنەی کردۆتە کوردیو چاپیشی کردووە. پاش چەند رۆژێک زەحمەتی کێشا و ئەو تەرجەمەو دیوانی هۆنراوەکانی مامۆستا عەتووفی بۆ هێنامو سپاسی زەحمەتەکانی دەکەم.

تەرجەمەکەی مامۆستا عەتووفی بە شێعرەو هەر چەند زۆری زەحمەت پێوە کێشاوە، ناتوانێ دەوری وەرگێڕانێکی بە پەخشان بگێڕێو کلیلەودیمنە بەرەو جەمبوورەی جەماوەری رووناکبیرانو خوێنەری ئاسایی ناو کۆمەڵگا رەپێچەک بدا.

بێجگە لەوانە کاک عەلی ئیسماعیلزادە سەرچاوەیەکی دیکەی کلیلەودیمنەی بە زبانی فارسی بۆ هێنام کە دوکتۆر "پەرویز خانلەری" بڵاوی کردۆتەوە. ئەم سەرچاوەیە لە ژێر سەردێڕی "داستانهای بیدپای" وەرگێڕانی "محمد بن عبدالله البخاری"دایەو دوکتۆر خانلەری هەڵەبڕی کردووە.

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە بریتییە لە **"کلیله و دمنه، انشای ابوالمعالی نصرالله منشی، تصحیح و توضیح مجتبی مینوی طهرانی، انتشارات امیرکبیر، ١٣٧٤"** کە باشترین سەرچاوەیە لە کتێبخانەی فارسی لە ئێراندا. نەسروڵڵا مونشی وەک خۆی لە پێشەکییەکی دوورو درێژدا باسی کردووە ئەم کتێبەی لە رووی نوسخە عەرەبییەکەی "**عبدالله بن مقفع**" وەرگێڕاوەتە سەر زبانی فارسیو پێشکەش بە "**بارامشای غەزنەوی**" کردووە (٥٥١ی کۆچی مانگی). زبانی تەرجەمەکە بەپێی هەلومەرجی ئەو سەردەمە، زبانێکی ئەستەمو تێکەڵاو دەگەڵ وشەو زاراوەی عەرەبییەو بە دە بەرچاوگرتنی نوسخەی سەرەکیو شێوەی کاری کوڕی موقەفەع، ئایاتی قورئانیو حەدیسەکانی نەبەویو شێعرو پەندو مەتەڵی عەرەبی لە زبان قارەمانانی داستانەوە دەکار هێناوە! ئەوەش لە حاڵێکدایە کە کتێبی کلیلەودیمنە لە زەمانی ئەوشیروانی ساسانیو پێش سەرهەڵدانی ئیسلامو هاتنەخوارەوەی قورئان، لە هیندەوە بە زەحمەتو تێکۆشانی **برزوویەی**

تەبیب گوێزراوەتەوە بۆ ئێرانو کراوەتە فارسـی دەورەی ساسانیو تەنیا یەک واژەی عەرەبیشـی تێـدا دەکار نەکـراوە، تا چ دەگا بە ئایاتو فەرمایشـاتی پێغەمبەر (د.خ)و شێعری ئەبوونەواسی عەرەبو باقی شاعیرانی ئەو سەردەمە!

مـن لە وەرگێڕانـی کوردیدا ئەم ئایاتو ئەحادیسـەم لابـردو زۆر کەمیش شێعرو رستەی عەرەبیم هێشتەوە. چونکە هەر وەک گوتم، زۆر دوور لە عەقڵو چاوەڕوانییە کە قارەمانانی داسـتانەکان کە هێندی بوونو پێش ئیسلام دەوری خۆیان گێڕاوە، بە عەرەبی قسەیان کردبێو لە کەلامی خوای مەزنو فەرمایشاتی رەسووڵی خودا (د.خ) کەڵکیان وەرگرتبێ! تەنیا بۆ ئەوەی زبانی وەرگێڕانەکەم حاڵوهەوا و تاموبۆنی کۆنو کلاسـیکی خۆی بپارێزێ، هێندێکم وتەی نەستەقو شـێعری عەرەبی کە دەگەڵ دەقی داسـتانەکان رێکدەکـەون لە تەرجەمەکەدا هێشـتۆتەوە. زۆریش تێنەکۆشـاوم کوردی پەتی ئەمڕۆژین دەکار بێنم تا هەر وەک گوتـم حاڵەتی کۆنیو وێکچوونی زبانی دەقـی تەرجەمەکە دەگەڵ دەقی سەرەکی هێندێک بپارێزرێ.

بێجگە لەوانە، نەسـروڵڵا مونشی بە تەناسوبی بابەت، زۆر شێعری فارسیو عەرەبی دەکار کردووە، من تا ئەو جێگەی لە دەستم هاتووە شێعرە فارسییەکانم بە شێعر کردۆتە کوردیو لە هێندێ شوێنیش لە شێعری شاعیرانی دیکەی وەک: مەحوی، نالی، میسباحو هێمن کەڵکم وەرگرتووەو تەرجەمەکەم پێ رازاندۆتەوە. زۆربەی شێعرە عەرەبییەکانم وەلا ناوەو تاکوتەرا نەبێ نەمهێشتوونەوە. شایانی باسـە بێژم بەو قرتاندنو وەلانانی هێندێک شـێعرو ئایـاتو ئەحادیس، دەقی سـەرەکی کلیلەودیمنە زۆرتر گەڕاوەتە سـەر داروپەردووی ساختاری بنەڕەتی خۆیو خوێنەری زیتو هوشـیار باشـتر تێدەگا کلیلەودیمنـە بە داماڵینی ئەو خشڵو زێوەرە خوازراوانەوە چ گەنجینەیەکی بێوێنەو گرانبەهایە.

هەر وەها بە پێویستم زانی فەرهەنگۆکیش بۆ ئەم واژەو زاراوەگەلە بنووسم کە رەنگـە دە هێندێک لە زاراوەکانی دیکەی کوردیـدا نەبن یا لانیکەم کەمتر دەکار دەکرێـن. رەنگە وا باش بێ خوێنەری ئازیز، پێش خوێندنەوەی کتێبەکە چاوێک بەو فەرهەنگۆکەدا بخشـێنێو هێندێک دەگـەڵ مانای واژەو زاراوەکان

ئاشـــنا بێ. زۆر منەتبار دەبم خوێنەرانی خۆشەویست بیروڕای خۆیان، بە هەر بارێکــدا بێ، لەمەڕ ئەم وەرگێڕانە دەرببــڕنو ئەگەر توانیان منیش لە بیروڕای خۆیان ئاگادار بکەنەوە. بێگومان هەر بۆچوونێکی دروســـتو مەنتیقی دۆستان لـــە چاپەکانی دواییدا دە بەرچاو دەگیرێ. بۆ ئەوەی بایەخو قەدرو قوتبی ئەم کارە زۆرتر بڕواتە بان.

لێرەدا پێویستە باسی زەحمەتەکانی خانمی بەڕێز "پەروین پیرەبابی" بێنمە گۆڕێ، کە دە پیتچنیی کارەکەمدا زۆری زەحمەت کێشا. هیوادارم تەمەنی درێژو لە ژیاندا سەرکەوتوو بێ.

بە سپاسەوە

ئەحمەد قازی

٩٢/٧/١ مەهاباد

□

# سەرەتای "هەڵەبڕ" موجتەبا مینەوی تارانی

کتێبی کلیلەودیمنە، یەکێکە لەو گەنجینانەی زانستو حیکمەت، کە پیاوانی زانای زەمانی قەدیم کۆیان کردەوەو بە زبانی جۆراوجۆر نووسیانەوەو بە میرات بۆ منداڵانی خۆیان بەجێهێشتو لە سەردەمانو سەدەکانی رابردوودا، بایەخیان پێ دەدا و دەیانخوێندەوەو فەلســـەفەی کرداریو رێوشـــوێنی ژیانو زبانی لێ فێردەبوون.

ئەسڵی کتێبەکە بە زبانی هیندیٚ بوو بە ناوی **پەنچەتەنتەرە** Panchatantara کە دە پێنج بەشدا کۆ کرابۆوە، **برزوویەی تەبیب مەروەزی** لە سەردەمی دەسەڵاتداری **ئەوشـــیروان** خوسرەوی کوڕی **قوباد**، پادشای ساســـانی، ئەو کتێبەی بۆ سەر فارسی وەرگێڕا و هێندێکی نەقڵو نەزیلەو حەکایەتی دیکەش رەگەڵ خست کە ئەغڵەبیان لە سەرچاوە هێندییەکان وەرگیرابوون. لە سەرەتای دەورەی فەرهەنگی ئیســـلامیدا، **کوڕی موقەفەع** (اِبْنِ‌المُقَفَعْ) لە فارسییەوە کردی بە عەرەبیو ناوی کلیلەودیمنەی بەســـەردا بڕی. لە رووی دەقی فارســـی برزوویەو دەقی عەرەبی کوڕی موقەفەعەوە بە چەند زبانی دیکەش تەرجەمە کرا. لە سەردەمی سامانییاندا **ئەبووعەبدوڵلا روودەکی**، وێژاوەری گەورەی فارسی، دەقەکەی کوڕی موقەفەعی بە هۆنەی فارســـی هۆندەوە. پاش ئەویش دیسان چەند جاری دیکە کرایەوە بە فارسی. تا لە سەر دەمی **بارامشای غەزنەویدا**، "ابوالمَعالی نِظامُ الْمُلک مُعین‌الدّین نَصرُالله بن محّمد بن عبدالحمید بن احمد بن عَبْدالصَمَد" کە مونشی (نووسەری دیوانو

دەربار) دیوان بوو و باپیرەی عبدالصمد، شیرازیو خۆی لەدایکبووی غەزنەینو گەورەبووی ئەویٚ بوو، کلیلەودیمنەی کوڕی موقەفەعی جارێکی دیکە بە فارسی تەرجەمە کردەوە. ئەوە هەر ئەم کتێبەیە کە ئێستا بە دەست خوێنەرەوەیە.

ئەم وەرگێڕانە دەگەڵ ئەوانی دیکە جیاوازی هەیە. نەسروڵڵا مونشی پابەندی پێڕەوی لە دەقی سەرەکی نەبووەو بۆ تەرجەمە، نووسینێکی سەربەخۆی دارشتووە. ویستوویەتی بە بیانووی وەرگێڕان، کتێبێک بە فارسی بنووسیٚ کە لێهاتوویی‌و توانای خۆی لە نووسیندا بخاتە بەرچاو. وە ئەلحەق پەخشانی فارسی گەیاندۆتە ترۆپکی جوانی. وە کارامەیی فارسی دە بەیانی بابەتدا و سنووری بەرزی توانایی خۆشی لە نووسەریدا، لەم کتێبەدا خستۆتە بەرچاو.

غەزنەوییەکان بە رەگەزو زمان‌ترک بوون، نازانین کە بارامشاش وەک باب‌و باپیرانی بە ترکی قسەی دەکرد یا ببووە فارس‌زبان. ئەگەر ببووە فارس‌زبان، ئایا ئەوەندەی تێگەیشتن لەسەر وردەکارییەکانی زبان‌و جوانی‌و رەمزەکانی هەبووە کە لە نێوان ئینشای نەسروڵڵا مونشی‌و ئینشای نووسەرێکی دەستڕەنگین‌و بەتوانای دیکەدا جیاوازی دابنیٚ؟ بەڵام وێژەوانانی پایەبەرزی ئەو سەردەمە (هەر چەند هەموویان لە تەواوی وردەکاری‌و جوانی نووسراوەکانی‌و ناسینی باری هونەری کارەکەی حاڵی نەدەبوون) زۆرتر مەبەستی نووسەر بوون‌و بۆ ئەوانی دەنووسی.

نووسەر یا شاعیری دەرباری **سوڵتان مەحموود‌و سوڵتان مەسعوود‌و** پادشاکانی تری غەزنەوی‌و سەلجوقی‌و ئەوانی دیکە، دەربەندی ئەوە نەبوون کە پادشاکەیان، لە وردەکاری‌و جوانکاری‌و نوکتەزانی‌و نیشانەگەلی رەوانبێژی‌و بێوێنەیی هونەرەکەی، ئەو جۆرەی پێویستە حاڵی دەبن یا خێر. ئەوان شێعریان بۆ یەکتر دەگوت‌و کتێبیان بۆ فارسی‌زبانانی تێگەیشتوو و فارسیزانانی مەعناناسی عالم‌و فازیل دەنووسی. سەرنج دان‌و وردبوونەوەیان لەسەر دروستبوونی واژەو دەستەواژەو دە بەرچاوگرتنی رێزمانی دروست‌و پابەندبوونیان بە یاسا و رێسای رەوانبێژی‌و جوانبێژی، دروستی‌و رەسایی بەیان‌و جێگرتوویی واژەو تەعبیرەکان‌و بەجیٚوریٚ دە کارکردنی پەندو مەتەڵ‌و شێعرەکان، داڕێژراوی‌و پتەوبوونی واتا

و نـــاوەرۆک، هەمـــووی بۆ خۆیان بوو. گوێیان لەوە نەبوو کە ئایا پادشـــایانو سەرکردە ترکەکان لە دروستو نادروستبوون، بەرزو نزم بوون، سستو لەرزۆک یا پتەو و مەحکەمبوونی پەخشـــانو هۆنەی ئەوان تێدەگەن یا تێناگەن. بێجگە لەو دەســـەڵاتدارە ترکانە، هەبوون کەســـانێک، کە بە دروستی زبانی فارسیو ناســـکیو جوانی مەزموونو ناوەرۆکو دزیەتـــی نەبوونی بیرو بیرۆکەو بەرهەم، بڕوایان هەبوو. نووســـەرانو شـــاعیرانیش رێزیان لە بیروبڕوای ئەوانە دەگرتو نەیاندەویست لە روانگەی ئەواندا نزمو نەزان بێنە بەرچاوان.

ئەدیبانو شـــاعیرانو زانایان لە ماڵی خۆیان یـــا گەورەپیاواندا، ئەنجومەنو کۆڕو کۆبوونەوەیان دەگرتو پێکەوە هەڤپەڤینو دەمەتەقەو ئاخاوتنیان دەکردو زانستو ئەدەب لێک فێر دەبوونو لەسەر زانستە جۆراوجۆرەکانو زبانو هونەر، ورد دەبوونـــەوەو لێکۆڵینەوەیـــان دەکرد. یەکێک لـــەم مەکۆیانە ماڵی خواجە نەسروڵڵا مونشی بوو، کە دە زەمانی نووسینی ئەم کتێبەدا هێشتا زیندوو بوو و لە دەسەڵاتدا دەست رۆیشتوو بووە. زانایانو نووسەران دەچوونە ماڵیو ئەویش بە هەموو جۆرێک میوانداری دەکـــردنو ئاگاداری لێیان دەکرد. هێندێک لەوانە (ناوی شازدە کەسی هێناوە) وەک دانیشتووی ماڵەکە بوون. نەسروڵڵا هۆگری دانیشتنو دیدارو گوتاری ئەوان بوو و تا ئەو رادەیە دە کەسبی هونەرو زانیندا رۆچووبـــوو کە هیچ کارێکی دیکەی نەدەکردو چەندین ســـەعاتی لە هاودەمیو گوتوبێـــژو ئاخاوتن لەگەڵ ئەواندا تێدەپەڕاند. هەر چەند لە کاتی نووســـینی ئەم کتێبەدا دۆســـتەکانی بڵاوەیان کردبوو. بەڵام یەکێک لە دۆســـتانی قەدیمی ئەو ســـەردەمەی، با وەکوو ئاڵوگۆڕێک بەســـەر ئەحواڵی نەسروڵڵادا هاتبوو، دەســـتی لە دۆســـتایەتی ئەو بەرنەدابوو، لەوان رۆژانـــدا کتێبی کلیلەودیمنەی عەرەبی بۆ هێنابوو. نەســـروڵڵا کە لەو کاتەدا تەنیا بە خوێندنەوەی کتێبانەوە خەریک بوو، بەو نوسخەیە کە زانای ئایینی (فقیە) **عەلی کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئیســـماعیل** بە دیاری بـــۆی ناردبوو، عەلاقەی پەیدا کـــردو لەبەر ئەوە مەیلی جەماوەر بە خوێندنەوەی کتێبی عەرەبی کەم ببۆوە، بڕیاری دا کە وەریگێڕێتە سەر فارســـیو بابەتەکان باڵو پەڕ پێبدا و ئیشـــارەو ئاماژەکان روونتر بەیان

بکا، دەقەکە بە ئایەتو شـیعرو مەتەڵو حەکایەت برازێنێتەوەو ماناکان روونو ئاشـکرا دەربخا و بە کورتی ئەم کتێبە کە باشـترین کتێبی چەند هەزار ساڵ لەمەوپێشە، زیندوو بکاتەوە تا خەڵک لە فایدەکانی بێنسیب نەبن، لەم دووبارە نووسینەوەیەدا، ئەو بەشەی کە باسی بەسەرهاتی برزوویەی تەبیب بووە، کورتی کردۆتەوە، بەڵام لە باقی بەشـەکاندا بە دوورودرێژی قسەی کردووە، ئاڵوگۆڕی دە نووسراوەی نووسەردا پێک هێناوە، قسەی دڵی خۆی کردووەو پاش ئەوەی چەند جزوەیەکی نووسـیوە، پێکەوەی لکاندوونو ناردوویەتە خزمەت بارامشا، ئەم بەشـە کەوتووەتە بەر پەسندی پادشـا و فەرمانی داوە، بە هەمان شێوە کارەکە بگەیەنێتە کۆتاییو بە ناو و نازناوی شاهانە وازۆی بکا و بیرازێنێتەوە.

گەڵۆ! ئەوەی لەم بەشـەدا لەمەڕ وێژەناسیو بەراوردکاری شاهانەوە دەیڵێو ئەوەی لە ئاخری کتێبەکەدا گوتوویەتی: "ئەگەر دەگەڵ باقی کتێبە فارسییەکان کە ئەعیانو گەورەکان بەرهەمیان هێناوە بەراوردی بفەرموون، ئاشکرا دەبێ کە دە هەموو بوارێکدا توانایی تا چ رادەیەک بووە". حەکایەت لە راستی دەکا؟ ئایا بارامشـا ئەو تواناییو زانیارییەی هەبووە کە جیاوازی نووسراوەی دیوانییەکانی خۆی هەڵسـەنگێنێ، یا ئەم قسانە وەک تەعاروفـو رووبینی نێوان خزمەتکارو خزمەتکراو لە قەڵەم بدەین؟ بە هەر حاڵ کتێبەکە ئامادەکرا و لە رووی بەڵگەو سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێ ئەم کارە دەوروبەری ساڵانی ٥٣٨ تا ٥٤٠ی کۆچی بە ئەنجام گەیشتبێ.

لە پێکەوە هەڵسەنگاندنی نوسـخە جۆراوجۆرەکانی کتێبو سەرنج دان بەو راسـتییە کە نوسـخەکان، هێندێکیان کورتو هێندێـک مامناوەندیو هێندێک گەورەو ئەسـتوورن، بۆ من ئەم بڕوایە هاتۆتە پێش کە نەسروڵڵا مونشی یەک دوو جار دەسـتی دە نووسـینی کتێبەکە وەرداوەو هەر جارەش هێندێ بابەتی لە بەشـەکان زیاد کردووە. لەوانەن: رسـتەگەلێک لەمەڕ قسـەکانی **مەنسوور عەبباسی** (در متن اصلی ١٣/٢٠ تا ١٥/٢٣)و چەند بەشێک لە کۆتایی کتێبەکەدا کە لە هێندێک نوسخەدا هەنو دە نوسخەی ئێمەدا نین. ئەم جیاوازییانە دە پێرستی جیاوازی خوێندنەوەکاندا دەبینین. ئەو نوسخە کۆنەی کە وەک سەرچاوەی ئەم

چاپە دە کارم هێناوە، بە رواڵەت لە نووســـراوە مامناوەندییەکانەو ساڵی ٥٥١ کۆچی نووســـراوەتەوە. یانی یازدە یا دوازدە ســـاڵ پاش تەواوبوونی نووسینی کتێبو دە زەمانی ژیانی نەســـروڵڵا مونشیدا بە رێنووسی پیاوێکی تەبەرستانی نووســـراوەتەوە. هەر ئەوەش یەکێک لە نیشانەکانی ناوبانگێکە کە زۆر زوو بە نسیبی کتێبی کلیلەودیمنەی بارامشاهی بوو.

هۆنەو پەخشـــانێک کە بێجگە لەم کتێبە، لە نەســـروڵڵا مونشـــی گەیوەتە دەســـتمان، شـــتێکی زۆر کەمە، سێ چوارینە بە فارســـی کە دە کتێبی (لبابُ الألباب)دا هاتووەو بە ئەویان نیسبەت داوە. دوو دێڕ شێعر بە عەرەبی کە خۆی لەم کتێبەدا هێناویەتیو دەڵێ لە زیان بارامشـــاوە نووســـیومن. وە قەتعەیەک پەخشان لە سکاڵا و شکایەت لەمەڕ رووداوێکی دڵتەزێن کە دە کۆنووسراوەیەکدا بە ناوی "لِصاحب الکلیله"دا هاتووە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

"گل مراد در سایه امل چون نام وفا و سایه عنقا معدوم ماند، و گلبن رامش و آسایش از زینت برگ و بار عاطل شـــد، و زخمهٔ بلبل خوش‌نوا در کام عیش و هوا شکســـت، و بِناء کام بناکام منهدم و لشکر صبر و آرام منهزم گشت

از هـــر بنـــا کـــه مانـــد ز ایـــام یـــادگار
اِلاّ بنـــای حادثـــه محکم که یافتســـت

و فلک بیدادگر آنچه بداده بود بازستد، و روزگار شوریده در بخشیده رجوع روا داشت

چنیـــن اســـت رفتـــار ایـــن گنـــده پیر
ســـتاند ز فرزنـــد پســـتان شـــیر"

"گوڵی موراد لە ســـایەی ئارەزوودا وەک ناوی وەفا و ســـێبەری عەنقا لەناو چوو. وە بڕکەگوڵێ عەیشو ئاسوودەیی، جوانی گوڵو گەڵای لێ ئەستێندرایەوە. وە چریکەی بولبولی دەنگخۆش دە بەزمی عەیشونۆشـــی هەواوهەوەسدا شکا، وە کۆشکی بەختەوەری بە ناهومێدی رووخا و لەشکری سەبرو ئارام تێک شکا.

رووخەکن کۆشـــکو تـــەلاری یـــادگاری رۆژگار
کۆشـــکی رووداوی هەژێنەر پایەدارەو بەرقەرار

وە فەلەکـــی بێدادگـــەر هەر چی دابووی بردیەوەو رۆژگاری شـــێوا و ئەوەی

بەخشیبووی گێڕایەوە.

بەڵـــی وایـــە ڕەفتـــاری گەردوونـــی پیـــر
لـــە منداڵـــی دەســـتێنێ مەمکـــی بەشـــیر"

کە وابوو، هەر نێوبانگێک کە لە ســـەدەکانی دواییدا بە نســـیبی نەســـروڵڵا مونشی بوو، بەرهەمی دانانی ئەم کتێبە بووە. پاش ئەو، تا سەدەی نۆهەم هیچ کتێبێک بە شێوە ئینشایەکی دەستکردو بە دەنگوفەنگ، بە فارسی بە قەڵەمی نووســـەرانی پایەبەرزدا نەهات، کە نووســـەرەکەی دە ژێر کارتێکردنی شێوازی نووســـینی نەسروڵڵا مونشیدا نەبووبێ. وە زۆرینەی ئەوانیش دە کتێبی خۆیاندا ئامازەیەکیشیان بە ناوبانگی عالەمگیری نەسروڵڵا کردووەو جاروباریش بە ئاشکرا گوتوویانە کە پێڕەوی ئەو بوون. وە لەوانەشـــە پلەوپایەی خۆیان دە نووسینی فارســـیدا لە پلەوپایەی نەسروڵڵا بەرزتر نواندبێ. لیســـتەیەکی ناتەواو، نزیک بە چل ناو، بە پەخشـــان، کە کارتێکردنی نەسروڵڵا مونشییان پێوە دیارەو لە ژێرەوە دەیاننووسین، نیشان دەدا کە نووسەران لە هەر دەستەیەکو تایفەیەک، دەگەڵ کتێبی ئەو ئاشـــنا بوونو خوێندوویانەتـــەوەو کەڵکیان لێ وەرگرتووە. وە ئەوە بێجگە لە کتێبە شـــێعرییەکانە، وەک مەســـنەوی، کە شـــاعیرەکانیان حەکایەتی کلیلەودیمنەیان وەرگرتووە، وە بێجگە لەو تەرجەمەو نووســـراوانەیە کە بە عەرەبیو ترکیو فارسی لە ڕووی کلیلەی نەسروڵڵا مونشی کردوویانە:

اخلاق محتشـــمی، اخلاق ناصـــری، الادب الوجیز، الاوامر العلائیـــه، بختیارنامه (چاپ نەکـــراوە) بزم و رزم، بســـتان العقول، تاریـــخ الماثر، تجارب الامم (فارســـی)، تحفة الوزرا، ترجمۀ محاســـن اصفهان، ترجمۀ ملل و نحل، ترجمۀ یمینی، تزجیة الاعصار، التّوسُّل الی الترسُّل، جهانگشای جوینی، چهار مقالۀ عروضی، درّةُ الاخبار، راحة الصُّدور، رسالۀ مناظرۀ گل و مل، روضۀ اولی الالباب، روضة العقول، سِـــمط العُلیٰ، سندباد نامه، عقد العُلیٰ، فرائد السلوک، مرزبان نامه، مرصاد العباد، المعجم فی‌آثارملوک العجم، المعجم فی معاییر اشعار العجم، معیار الصّدق، مکارم اخلاق، منشآت منتجب‌الدین جوینی، منشآت عمیدالدین اسعد ابزری، نامۀ تنسر، نسایم الأسحار، نصیحة الملوک یا تحفه، نفثة المصدور، وسائل الرسایل.

ئێمە کلیلەودیمنەی بارامشـــاهیمان لە (دارالمعلمین)ی ناوەندی دە ســـاڵانی

١٣٠٢ تـــا ١٣٠٥ هەتاوی لە خزمەت مامۆســـتا "عبدالعظیم قریـــب"ی گەرەکانی خوێندو بۆ ناســـینو زانینی قەدری ئەو کتێبە قەرزداری ئەو بەڕێزەم. لە هەمان سەرەتاوە شەوقو عەلاقەیەک دە مندا سەریهەڵدا و بیرێک دە مێشکمدا گوورا کە وردەوردە پوختەتر بوو. بیرەکەم ئەوە بوو، رۆژێک لە رۆژان دەقێکی دروســـتو بێهەڵەی لێ ساز بکەمو شیکردنەوەو شەرحێکی تەواوی لەسەر بنووسم. هەموو کات دەو فکرەدا بووم، هەر شـــتێکم خوێندباوەو لە هەر جێگایەک نوسخەیەکی دەســـخەتم بەرچاو کەوتبا، ئـــەم کتێبەم لە بەرچاو بـــوو، بابەتی جۆراوجۆرم بۆ کۆ دەکردەوە. ئەگەر ســـەرکەوتنێک دەســـتی دا و پاش سی، چل ساڵ بەو ئاواتەم گەیشـــتم، ئەم تەوفیقە بەرهەمی پێچەقانـــدنو بەردەوامیو زەحمەتی مێروولە ئاسای من بوو کە ئامرازو کەرەسەی پێویستی دابین کرد. بەڵام چەند حازرخۆری بێسێبەرێک کە تا ئێستا کتێبەکانی منو ئەوانی دیکەیان دزیوەو بە ناوی خۆیان کردووەو هێشـــتا دە کەمین دان کە کەسێک ماوەیەکی درێژخایەن زەحمەت بکێشـــێو کتێبێک بنووسێ، یا دەقێکی کۆن راست کاتەوە، وە ئەوان بێ ئەوەی زەحمەتو مەرارەتێک بکێشـــن، لە بەرهەمـــی وەرهەمی ئەوان نانو ناوێک وەدەســـت بێنن، لەوانەیە ئـــەوەش داگیر بکەنو چەند هەڵەی چاپی کە رەنگە من بەســـەریاندا تێپەڕیبم، راست بکەنەوەو هێندێک هەڵەی نوسخەکانی دیکە کە لە چاپ دراون، لە جێی واژەگەلێک دابنێن کە لەم چاپەدا هاتووەو ئەو دوو پیتو لەتە بکەنە سەنەدو بەڵگەی خاوەنبوونی خۆیان.

لـــە دابینکردنی ئەم چاپە رەخنەییەی کتێبەکەدا، بەندە لەو فکرەدا نەبووم کە نووسینی نەســـروڵڵا مونشی بێنمە سەر شێوازی نووسینی فارسی ئەمڕۆ و لە زاراوەو رێکەوەندی ئەمڕۆی فارســـی نزیک بکەمەوە. یا ئەو فارســـییەی ئەو نووســـیوەتی جوانترو باشـــتر بکەم. یا بە جەماعەتێکـــی گەورە لە جیلەکانی رابـــردوو کە لە رووی نەفامی یا بێئەمانەتیو نادروســـتییەوە واژەکانی ئەویان گۆڕیوەو بە هەڵە نەقڵیان کردوونو رەواجیان پێداون، بەرتیل بدەمو ئەوەی ئەوان ســـەبتیان کردووە هەڵیبژێرم. بەڵکوو ویســـتوومە لە نێوان شکڵی جۆراوجۆردا کـــە لە نێو نوســـخەکاندا دەبینـــدرێ ئەوانە بدۆزمەوەو دەکاریـــان بێنم کە بە

بڕوای خۆم نووســـراوەی ئەســـروڵڵا مونشــی بوون. ئەگەر لەو مەبەستەمدا بە مەقســـوود گەیشتبێتم، ئەوە زۆر باشە. وە ئەگەر وێڕای ئەوە عەیبی نووسینی ئەو، یا هەڵەکانی ئەوم دە وەرگێڕاندا ئاشــکرا کردبێ چ باک! بەڵام ئەگەر لەم کارەی خۆمدا تووشــی هەڵەو خەتایەک هاتبم‌و رەخنەگەلێکی بەڵگەداری دوور لە غەرەز، وریام بکاتەوە، زۆر زۆر، مەمنوون دەبم.

هەر وەک لە پێرستی نوسخەگەلی بەهرە لێ وەرگیراو دەردەکەوێ، دواییینترین نوســخەی خەتی کلیلەودیمنــە کە بۆ لەبەریەک دانانــی دەق دەکارم هێناوە، هی سەدەی هەشــتەمی کۆچییە. وە نوسخەی کلیلەی (بایسونغوری) سەدەی نۆیەمیــش جاروبار کەڵکی لێ وەرگیراوە. لــە چاپەکانی کلیلە هیچ بەهرەیەک وەرنەگیراوەو لە باســی جیاوازی خوێندنەوەکاندا ئاماژەیەکم پێ نەکردووەو بۆ بەیانی هەڵەکانیان کاتو کاغەزم خەسار نەکردووە. بەڕێز ئاغای **محەممەد فەرزان** دە زنجیرە وتارێکدا کە لە گۆڤاری "ئەرمەغان"و "پەروەردەو بارهێنان"و "یەغما"دا بڵاوی کردنەوە، هێندێک لەو هەڵانەی دەستنیشـــان کردووەو راستکردنەوەشی بۆ نووســیون. بەڵام ژمارێکی کەم لەو هەڵەبڕانــە دەگەڵ دەقە کۆنەکان یەک ناگرنەوە. هەر کــەس مەیلی هەیە دەتوانێ دەقە چاپییــە قەدیمەکان دەگەڵ ئەم نوســخەیە پێک بگرێ‌و جیاوازییەکان ببینێ. بەڵکوو بەو ئاکامە بگا کە من گەیشتووم.

بــۆ تێگەیاندنی قوتابییەکان‌و حاڵیکردنی خوێنــدەواران، زۆرم حەول داوەو ئەوەندەی لە تواناما بووە تێکۆشاوم، تا ناوەرۆکی واژەکان‌و تەرجەمەی ئایەتەکان‌و حەدیســەکان‌و شێعرو مەتەڵ‌و پەندەکان بە دەستەوە بدەم. تەرجەمەکانم واژە بــە واژە (تحت‌اللفظ) و بە مەبەســتی روونکردنەوەی واتــای واژەکان ئەنجام داوەو لــە تەرجەمەی رەوان‌و ئەدیبانە خۆم پاراســتووە. هــەر چەند جاروبار شــیکردنەوەیەکی زۆرتر یا تەرجەمەیەکی هۆنــراوەی نزیک لە مانا و ناوەرۆکی شــێعرەکانیش، پێشکەش کراوە. بۆ بەیانی مەعنای واژەیەک، هێنانەوەی یەک، دوو شێعر یا رستەیەک وەک شاهیدی مەعنایی بەس نییە. ژماری ئەو واژەگەلەی تەنیا بە یەک دوو شــاهید مەعنا کراونەتەوە دە قامووسەکانی ئێمەدا کەم نین.

ئەزموونی ساڵیانی دووروودرێژ ئەوەی سەلماندووە، کە دە کارکردنی واژەیەک دە زۆر شیعرو ڕێکەوەندی جۆراوجۆردا و لە لایەن ژمارێکی زۆر لە نووسەرانو شاعیرانی ناوچە جیاوازەکان، دە تێگەیشتنی مانای واژەکاندا یارمەتیمان دەدا.

بەندە (مینەوی) پێش ئەوەی کتێبەکە بنێرم بۆ چاپ، ڕستە بە ڕستەم بە وردی خوێندۆتەوە تا تێیبگەمو پاشان تێکۆشاوم دە خەڵکی بگەیەنمو تەنیا بە چاپی نوسخەکانو نەقڵکردنیانەوە خۆم نەبەستۆتەوە. بەو حاڵەشەوە، خوێنەر جاروبار تووشی واژەگەلێک دێ کە ماناکەیان بۆ من روون نەبۆتەوە. چونکە بەڵگەو دەلیلی تەواوم دەست نەکەوتووە.

پێرستێکی بەڕێژە تەواو، لەو واژەگەلە کە لە دەقی کتێبەکەدا هاتوون شیاوی سەرنجی تایبەتن، چ ئەوانەی لە پەراوێزدا شیکراونەوەو چ ئەو برەی بێ لێکدانەوە ماونەتەوە، بە دوای دەقی سەرەکیدا لە چاپ دراونو هیوادارم ئەم پێرستە سوودێکی بۆ خوێنەران هەبێت.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم سپاسی خۆم، ئاراستەی ئەو بەڕێزانە بکەم کە لەم ئەرکە قورسو گرانەدا یارمەتیدەرم بوون. یەکەم جەنابی دوکتور **ئەمیر حەسەنی یەزدگردی** دانشیاری زانای زانستگای تارانو دۆستی خۆشەویستی خۆم کە پێنج ساڵی تەواو، هەموو جۆرە یارمەتیو هاوکارییەکی پێشکەش کردم. دووهەم بەڕێز دوکتور **یەحیا مەهدەوی**، مامۆستای زانکۆ و هاوڕێی دێرینم کە بە بەرەکەتی هیممەتی بەرزی، ئەم کتێبە چاپ کرا، لە حاڵێکدا دامەزراوە فەرهەنگیو ناوەندە گەورەو دەوڵەمەندەکانو دامودەزگای بڵاوکردنەوەی کتێب، نەچوونە ژێر باری خەرجو هەزینەکانی ئەم ئەرکە فەرهەنگییە.

ئەوەش پێرستێکی کورت لەو سەرچاوەو ژێدەرانەی کەڵکم لێ وەرگرتوون:

**و اینک فهرستی مختصر از نسخِ مِلاک کار و مُمِدّ کار و کتبِ چاپی و مراجع:**

**اســاس:** نسخه محفوظ در کتابخانه جارالله افندی در استانبول بشماره ١٧٢٧ مورخ ٥٥١هـ.

**نق:** نســخه محفوظ در کتابخانه وزارت معارف ترکیه در انقره بشــماره ١١١ مورخ ٥٩٤هـ.

**چلبی:** نسخه محفوظ در کتابخانه عمومی بورسه از کتب حسین چلبی بشماره ۷۶۳ مورخ ۶۹۷

**P۱** : نسخه محفوظ در کتابخانه ملی پاریس بشماره ۳۷۵ فارسی از نسخ قرن ششم یا هفتم.

**P۲** : نسخه محفوظ در کتابخانه ملی پاریس بشماره ۳۷۶ فارسی مورخ ۶۷۸

**P۳** : نسخه محفوظ در کتابخانه ملی پاریس بشماره ۳۸۳ فارسی مورخ ۶۶۴

**F** : نسخه‌ای بنشان Fraser ۱۰۰ در کتابخانه بادلیان اکسفرد، غالبِ آن از قرن هفتم.

**B** : نسخه‌ای بنشان Ms.Pars.f.۱۲ در کتابخانه بادلیان، غالب آن از سال ۷۳۰.

**G** : نسخه‌ای در کتبخانه گوتا (آلمان شرقی) بنشان Hal.۱۲۳ مورخ ۷۳۶.

**نافذ:** نسخه محفوظ در کتبخانه نافذ پاشا در استانبول بشماره ۱۰۱۰ از نسخ قرن هفتم تا هشتم.

**بایسنغری:** نسخه مخفوظ در کتبخانه روان کوشکو (استانبول) بشماره ۱۰۲۲ مورخ ۸۳۳

**مجلس:** نسخه مجلس شورای ملی بشماره ۱۸۸۰، قسمتِ غالب آن از اوایل قرن هشتم.

**قانعی:** کلیله و دمنه منظوم قانعی طوسی نسخه موزه بریتانیائی بنشان ۷۷۶۶. ADD مورخ ۸۶۳

**شرح ابیات:** نسخه محفوظ در کتبخانه لالا اسماعیل (استانبول) بشماره ۵۱۶ مورخ ۷۰۷ از مؤلفی مجهول.

**شرح ابیات:** تألیف فضل‌الله اسفزاری (یا اسفرائنی) نسخ موزه بریتانیائی و پاریس و ماربورگ و مجلس.

**ع أ،ع به ع ج:** سه نسخه از متن اصلی ابن‌المقفّع بعربی محفوظ در کتبخانه ایاصوفیه (استانبول) بشماره‌های ۴۰۹۵، ۴۲۱۳، ۴۲۱۴.

**سِیَرالملوک:** نسخه عربی ترجمه شیخ زین‌الدّین عمرالفارسی از متن نصرالله منشی از کتب کتبخانه احمد ثالث بشماره ۳۰۱۵ محفوظ در طوپ قاپوسرای (استانبول)،

تاریخ آن ۷۲۷.

**کلیلـةو دمنة** تصحیح عبدالوهاب عزّام، با مقدمه طه حسـین، چاپ مکتبةالمعارف ۱۹۴۱، قاهره.

**تاج (یا بیهقی):** تاج‌المصادر ابو جعفر البیهقی دو نسـخه عکسی از روی نسخ خطّی قدیم،و نیز چاپ بمبَی ۱۳۰۱ تا ۱۳۰۲ هـ‌ق.

**مصادر (یا زوزنی):** کتاب المصادر ابو عبدالله زَوْزَنی بکوشـش تقی بینش، جلد اوّل، چاپ مشهد ۱۳۴۰ هـ‌ش.

**مقدمه (یا زمخشری):** مقدمه الأدب جارالله زَمَخشَری، عکس نسخه‌ای خطی مورخ ۷۳۵ متعلق به کتبخانه لالا اسماعیل،و چاپ لایپزیگ ۱۸۵۰.

**صُراح (یا قَرَشـی)** الصراح مِنَ الصّحاح تألیـف ابوالفضل محمّد بن عمر معروف به جمال قَرَشی، چاپ کلکتّه ۱۸۳۱ میلادی،و چاپ طهران ۱۳۰۴ هـ‌ق.

طهران، ۲۴ خرداد ماه ۱۳۴۳

مجتبی مینُوی

□

## سەرەتای وەرگێڕ نەسروڵڵا مونشی

**تێبینی:** ئەو سەرەتایەی نەسروڵڵا مونشی بۆ وەرگێڕانەکەی خۆی لە عەرەبییەوە بۆ فارسی نووسیویەتی، سەرەتا بە ستایشی خودا و پێغەمبەر دەست پێدەکا و دوابەدوای ئەو بەشە، کورتەمێژوویەک لە پادشاکانی زنجیرەی غەزنەوی باس دەکا. وەک لەو زەماندا باو بووە، سەرتاپای ئەم سەرەتایە، حەمدو سپاسو پێهەڵگوتنێکی سەیروسەمەرەو زێدەڕۆیانە، لە پادشایانو ئەمیرانی غەزنەوی دەگرێتە خۆی کە هیچ پێوەندییەکی بە باسی کلیلەودیمنەوە نییەو هەمووی بە ئایاتو حەدیسو شێعرو پەخشانی عەرەبی رازاوەتەوە. من ئەو بەشەم لە سەرەتاکە هەڵپەرتاوت. چونکە هەر وەک گوتم پێوەندی بە باسەکەوە نییەو ئەوەش دەزانین کە هەر نووسەر یا شاعیرێک لە زەمانی ئەو پادشایانەدا ویستبێتی، بەرهەمێک بڵاو بکاتەوە، ناچار بووە سەرەتایەکی پڕ لە پێهەڵگوتنو چاپلووسیو مەدحو سەنای دوور لە عەقڵو باوەڕ بکاتە سەرەتا بۆ ئەوەی پاداشێک وەربگرێ یا لانیکەم ئیزنی بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی پێ بدرێ.

کە وابوو لەو جێگەوە دەست پێدەکەم کە نەسروڵڵا مونشی هێندێکمان زانیاری لەسەر گەڕیانی کاری وەرگێڕانەکەو بەرهەمی کارەکانی بە دەستەوە دەدا.

**ئەحمەد قازی**

وا دەڵێ بەندەو بەندەزادە، نەسروڵڵا محەممەد عەبدولحەمید بولمەعالی تَولاّە

اللهُ الکریم بِفَضْله[1] چون بە بەرەکەتی پەروەردەکردنو لە سایەی خۆشی مەجلیسی بەهەیبەتی شاهەنشـــاهی اَدامَ اللهُ اَشْراقَهُ ماڵی ئەربابو گەورەی من اَطالَ الله بَقاءَهُ وَ ادامَ اَیّامَهُ و اِنْعامَهُ و رَزَقَه الله سَـعادَةَ الدّارَیْن[2] رووگەی زانایانو ئازادەگانو کەعبەی عالمانو گەورەو هەڵبژاردەکانی ئەم شـــارە گەورە بوو لازالَت مَحْروسـةَ الاطراف محمّیـه الارجاء و الاکناف[3] و هەموو کەس پەنای لای ئەویان دەناســـیو ئـەویش دەگـەڵیـان دلۆڤانو بەرپرس بوو، وە هەر ویستو ئارەزوویەکی هەیانبووایە، بە رووی خۆش بەجێی دەگەیاند. کە وێنەی ئەو پیاوەتیو ســـەخاوەتە، بە بیری ئەهلی رۆژگاردا رانەبردووە. باســـی ئەم مەســـەلەیە لەوە پتر بڵاو بۆتەوە، کە حەوجەی بەوە بێ من لە سەری برۆم.

بە کورتی بڵێم هەموو لە لای ئەو حەســـابوونەوەو دە ئەمنو ئاســـوودەییدا بوونو هەموو راســـتگۆیانە هەڵسوکەوتیان دەکـــرد. وە تایفەیەک لە فەرزانەو ناویـــەدەرەوەکان؛ کە هەر یەکەی زانســـتی زۆرو ناوبانگی گەورەیان بوو، وەک دانیشـــتووانو ئەندامانی بنەماڵەو مەحرەمانی راز وەرگیرابوون کـە هێندێکیان بـریتی بوون لە:

قازی محەممەد عەبدولحەمید ئیسحاق، بورهانەددین عەبدورەشیدی نەسر، وە ئیمامان: عەلی خەیات، ساعید میهەنی، عەبدورەحمان بوستی، محەممەد سەیفی، محەممەد نیشـــابووری، محەممەدعوســـمان بوستی، موبەشـــیر رەزەوی ئەدیب، عەبدورەحیم ئیســـکافی، عەبدولحەمید زاهیدی، مەحموود ســـەگزی، فاخر ناسر، سەعید باخزەرییو جاروبارەش ئیمامان: محەممەد خەبازی، مەحموود نیشابووری، رَحَمَ الله الماضینَ مِنهُمْ و اَطالَ بقاء الغابرین[4] وە منی بەندە ببوومە هۆگرو شـــەیدای دیدارو گوتارو هاونشـــینی ئەوانو دەمویســـت لە خزمەتیان کەسبی عیلمو هونەر بکەمو دەستم لە کارو کاسبی هەڵگرتبوو، وە تەواوی توانای خۆم تەرخان کردبوو کە بتوانم ســـەعاتێک دە خزمەت یەکێکیاندا بمو شـــتێان لـــێ فێربمو ئەوەم بە

١. خودای مەزن بە کەرەمو گەورەیی خۆی دەستی بگرێ.
٢. خودا تەمەندرێژی بکاتو خۆشبەختی هەر دوو جیهانی پێ ببەخشێ.
٣. خودا ئەم درگا و بارەگا گەورە بپارێزێ.
٤. ئەوانەی وەفاتیان کردووە خودا وەبەر رەحمەتی خۆیان بخا و ئەوەی ماویشن عومری درێژیان بداتێ.

بەختەوەری دین‌و دنیا دەزانی. رەنگە ئەم قسەی من وەک لافو گەزاف بە زەینی هێندێکاندا تێپەڕ بێ‌و بە خۆڕانان لێک بدرێتەوە، بەڵام ئەگەر ئینســـاف پەردەی ئێرەیی‌و حەســـوودی لە سەر جەماڵی خۆی لابدا و بێ‌هاوتابوون‌و موعجیزەی ئەم کتێبــە دە بەرچاو بگیــرێ، روون دەبێتەوە کە تا لە خوێندندا ورەی بەرز نەبێ‌و مەرارەتو زەحمەتی فێربوون وەئەســـتۆ نەگیرێ دە زبان‌و گوتندا کە شـــەرەفی ئادەمزادە بەسەر حەیواندا، ئەم پلەوپایە دەست ناکەوێ.

بِقدرْ الْکدِ تنقسِمُ المَعالی[1] وە چون رۆژگار بەپێی عادەتی خۆی دە وەرگرتنەوەی خۆشـــییەکاندا، ئەو جەماعەتەی لـــە بەریەک بڵاو کردو ئەو بەزمە تێکچوو، من مامەوەو کتێـــبو خوێندنەوە، وَ خَیْـرَ جَلیس فی الزَمان کِتــابُ[2] وە لە قەدیمەوە گوتوویانە نِعْمَ الْمُحَدِثُ اَلدفترُ[3].

جاروبار بۆ سەرگەرمی ئەفسانەو نەقڵو نەزیلەو بابەتی مێژوویيم دەخوێندەوە، لـــەو کاتانەدا بوو کـــە زانای پایەبەرزی ئایینی **عەلی ئیســـماعیل ئیبراهیم** ادامَ اللە تَوْفیقَــە[4] کـــە لە زانـــا هەرەگەورەکانی بارەگایەو بە زیـــوەری هونەرو عەقڵ هەڵوارتەیە ـ وە لەو زەماندا شـــانازی ئاشنایەتی‌و عەهدو بەڵێنێک لە نێوانماندا ســـەری هەڵدابوو و میـــزاج‌و حاڵەتی ئەو دەگەڵ ئاڵوگـــۆڕی ئەحواڵی زەمانە گۆڕانی بەســـەردا نەهات ـ نوسخەیەکی کلیلەودیمنەی بە دیاری بۆ هێنام. هەر چەند وێنەی ئەم نوسخەیە دە نێو کتێباندا هەبوو، ئەوم بە مبارەک زانی‌و مافی ئەو زاتەشـــم بە دۆستایەتی پاکو بێ‌ریا دە بەرچاو گرتو باسکردنی ئازادەگی‌و پیاوەتـــی ئەوم کردە باســـێکی هەتاهەتایی. خودای مـــەزن لە دنیا و قیامەتدا پاداشی بداتەوەو بە ئارەزووی خۆی بگەیەنێ.

کورتەی کەلام. هۆگری ئەو نوســـخەیە بووم. بە تێفکرین‌و لێ روانینی ورد، باشـــی‌و جوانی کتێبەکە زۆرتر دەرکەوتو مەیلی موتاڵا و خوێندنەوەی لە مندا زۆرتـــر بوو. چونکە پاش کتێبە شـــەرعییەکان، بە درێژایـــی زەمان، کتێبێکی

---

١. بە قەدەر تێکۆشان پلەوپایەی بەرز دابەش دەکرێ.

٢. باشترین هاونشین لە زەمانەدا کتێبە.

٣. باشترین گوتاربێژ دەفتەرو کتێبە.

٤. خودا تەوفیقی بدا.

لەوە پڕفایدەتر نەنووسراوە. بناغەی بەشەکانی لەسەر حیکمەتو مەوعیزەو ڕێنوێنی ڕۆندراوەو شێوەی جەفەنگیو قسەخۆشی تێدا بەکار هێنراوە، تاکوو ئەگەر چینی زانایان بۆ وەرگرتنی ئەزموون دەیخوێننەوە، چینی عەوام لەبەر جەفەنگیبوونەکەی، ڕووی تێکەنو کەمکەم ئەو حیکمەتانە دە سروشتی ئەوانیشدا جێ بکاتەوە.

وە بەڕاستی [ئەم کتێبە] کانگەی عەقڵو بیروڕای پتەو و گەنجینەی ئەزموونو تاقیکردنەوەیە، هەم بۆ پادشایان دە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، ڕێنوێنە، هەم چینو توێژە مامناوەندییەکان بۆ پاراستنی مڵکو ماڵ، وا باشە بیخوێننەوە. وە لە یەکێک لە بەرەهمەنانی هێندیان پرسی کە: "دەڵێن لە لای هێندووستان کێو و شاخ زۆرنو لەواندا گیا و دەرمانی وا دەڕوێ کە مردوو زیندوو دەکاتەوە، چۆن دەکرێ ئەم دەرمانە وە دەست بخەین؟" جوابی داوە: حَفِظتُ شیئاً و غابَت عَنکَ اَشیاء.[1] ئەم گوتەیە لە ئیشارەو ڕەمزی پێشینیانە. مەبەستیان لە کێو و شاخ، زانایانن‌و لە دەرمانو دەوا، قسەکانیانەو لە مردووان، جاهیلو نەزانان مەبەستە، کە بە بیستنی قسەی زانایان زیندوو دەبنەوەو بۆ لای زانست دەچن کە ژیانی هەتاهەتاییە. ئەم گوتە بەنرخانە سەرجەم دە کتێبی کلیلەودیمنەدا کۆ کراونەتەوە کە دە خەزێنەکانی هێنددا پارێزراوە. ئەگەر بتوانن وەدەستی بێنن، ئەم مورادەی ئێوە بەدی دێ".

سوودو فایدەی ئەم کتێبە بێسنوورە. وە کام چاکی لەوە باڵاتر کە لە تۆمەت بۆ تۆمەتو نەتەوە بۆ نەتەوە، هاتووەو ڕەت نەکراوەتەوە؟ وە کاتێک پادشایی کەوتە دەست کەسرا نەوشیروان ـ خودا لە گوناهانی خۆش بێ ـ کە ناوبانگو ئاوازەی عەدالەتو دڵۆڤانی ئەو لەسەر ڕووبەری ڕۆژگار باقییەو باسی سیاسەتو هەیبەتی، دە سینگی مێژوودا سەبت کراوە، تا ئەو ڕادەیە کە پادشایانی ئیسلام دە چاکەکاریدا بە ئەو دەشبێنن. وە کام بەختەوەری لەوە گەورەترە کە پێغەمبەر ئەم شەرەفەی پێداوە کە وَلِدْتُ فی زَمَنِ مَلِک العادل[2].

---

١. شتێک فێر بوویو زۆر شتت لەبیر چۆوە.
٢. لە زەمانی پادشایەکی دادگەردا، لەدایک بووم.

نەوشـــیروان فەرمانی دا کە ئەم کتێبە بە هەر فێڵێک بێ لە وڵاتی هێندەوە بێنـــنو بە زبانی پەهلـــەوی تەرجەمەی بکەن. پاش ئـــەو کارە، بنەمای کاری بەڕێوەبردنـــی وڵاتی لەســـەر ناوەڕۆکی بابەتـــەکان دامەزرانـــد. وە ڕێنوێنیو ئیشارەکانی وەک پێرستی یاسا و ڕێسای بەڕێوەبردنی ئەرکەکان بۆ خاسو عام دیـــاری کردو ئەو بابەتانـــە وەک بەرەکەتێکی گەورەو گرانبایی بە لایەوە عەزیز بوونو تا کۆتایی ڕۆژگاری "یەزدیگردی شـــەهریار" کە ئاخرین پادشای عەجەم بوو، بەو قەرارە مایەوە.

وە کاتێک وڵاتانی عێراقو فارس بە دەست سپای ئیسلام فەتح کرا و بەیانەی دینی حەق لەو شـــوینانە ئەنگووت، باســـی ئەم کتێبە بـــە گوێی خەلیفەکان دەگەیشـــتو ئەوانیـــش زۆریان کەیف پـــێ دەهات، تا لە زەمانـــی خەلافەتی ئەمیرەلموئمنین ئەبووجەعفەر مەنســـوور، کوڕی محەممەد کوڕی عەلی، کوڕی عەبدوڵـــڵا، کوڕی ئەلعەباس کـــە خەلیفەی دووهەم بووە لـــە بنەماڵەی مامی مستەفا، کوڕی موقەفەع لە زبانی پەهلەوییەوە وەریگێڕا سەر عەرەبی، وە ئەو پادشـــایە [خەلیفەیە] زۆری خۆش لێ دەهـــاتو باقی گەورە پیاوانی ئۆمەتیش هەر بەمجۆرە هۆگری بوون.

وە ئێســـتا بـــەرزی هیممەتو گەورەیـــی وڵاتەکەی ئەو لـــەوە هەراوترە کە نیازی بە باســـکردنێکی زیادی بێ. وە یەکێک لە شـــوێنەوارە هەرماوەکانی ئەو پادشـــایە شـــاری گەورەی بەغدایە، کە ئەمڕۆ ناوەندی خەلافەتو ڕاوەســـتاوی ئیمامەتو ســـەرچاوەی دەسەڵاتو "مَدینة السلام"ی تەواوی جیهانی ئیسلامە. نە لە دنیای ئیســـلامدا وەها شـــارێک دەبیندرێ نە لە وڵاتی کوفر. وە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانـــی ئەو حەزرەتە مَدّ الله ظَلالَهـــا[1] ئەوەیە کە نایەڵێ خەلیفەکان لەوێ وەفات بکەنو ئەمیری موســـوڵمانان ئەبووجەعفەر مەنســـوور لە "بئر"ی مبارەک، یەک مەنزڵی مەککە حَرَســـهَا الله[2] لە داری دنیا ڕۆیشـــتە داری قیامەت. وە ئەمیری مۆمنان، ئەبووعەبدوڵڵا محەممەد کوڕی مەنســـوور الملقب بِالْمَهدی،

---

١. سایەی بەردەوام بێت.
٢. خودا بیپارێزێ.

لە ماسـبەزان لە ڕێی گورگاندا. وە ئەمیری مۆمنان ئەبوومحەممەدمووسا کوڕی مەهدی الملّقب بِالْهادی لە عیسـاوا، وە ئەمیـری مۆمنان ئەبووجەعفەر هاروون کـوڕی مەهدی الملّقب بِالرّشیدِ لە تـووس، وە ئەمیری مۆمنـان ئەبولعەبباس عەبدوڵـلا کوڕی هاڕوون الملّقب بِالْمَأمون لە تەرتووسو محەممەدئەمین لە بەغدا کوژرا. بەڵام لەو سەردەمەدا خەلیفە نەبوو و زۆر کەس لە ئۆمەت بۆ لابردنی ئەو دەسـت بە یەکیان کردبوو. وە نزیک بەو زەمانە ئەمیری مۆمنان ئەبوومەنسوور الملّقب بالمسترشد بالله لە عێراقدا شەهید کرا، وە لە نێوان ئەو شوێنە تا بەغدای پێتەخت، مەودایەکی زۆر نیشـان دەدەن. لایەنە جوانەکانی ئەو شـارە گەلێک زۆرەو هەر کەسـە لە مێژووزانان لە سەری نووسـیویانەو بە وردیو بە درێژی باسیان کردووە.

وە ئێستا چەند نوکتەیەک لە قسەکانی ئەمیری مۆمنان مەنسوور دەگێڕمەوە، هەر چەند جێگەی ئەوەش نییە، بەڵام ڕەنگە خوێنەران سـوودی لێ وەربگرن: ڕۆژێک بە هاونشـینانی خۆی دەگوت کە: "زۆر موحتاجم بە چوار کەسـان کە لەبەر درگای من لە سەر پێ ڕاوەستن! حازران گوتیان: چۆن کەسانێک؟ ناویان چییە؟ گوتی: کەسـانێک کە بە بـێ ئەوان کاروباری وڵات ڕاسـت نایەتەوە؛ هـەر وەک تەخت کە بێ چوارپایە ڕاناوەسـتێ، یەکێک لەوانە حاکمێکە کە دە بەڕێوەبردنی حوکمە شـەرعییەکاندا لە ڕێگەی دیـنو دۆخی ئەمانەت لانەدا و سـەرکۆنەو لۆمەی خەڵک لە ڕێبازی هەق، هەتڵەی نەکا و دووهەم جێنشینێک کە هەقی زۆرلێکراوانی بێدەسـەڵات لە زاڵمانی بەدەسـەڵات بستێنێ. سێهەم پیاوێکی لێهاتووی ڕێنوێن کە خەراجو باجو داهاتی سامانە گشتییەکان (بیت‌المال) بە تەواوی وەربگرێو لە هەمانکاتدا بە ناهەق هیچ شـتێک بە سـەر ڕەعیەتدا نەسـەپێنێ کە من لە زوڵمو زۆر بێزارم". ئەوجار قامکی خۆی گەسـتو گوتی "ئاخ!". لێیان پرسی: "یا ئەمیری مۆمنان چوارەم کەس کێیە؟" گوتی: "قاسیدو ئاگاداریهێنێک کە هەواڵو زانیاری دروست بگەیەنێو لە ڕاستیو دروستی لانەدا". دەگەڵ ئەو قسـانەدا دەیفەرموو: "کارێکی وا بکە دوشـمن مەیلی هەڵاتنی تێدا پێـک بێو بزانێ کـە هەڵات بە دوایدا ناچی. ئـەوەش بزانە هەر کەس کە دە

لەشکری تۆدایە لە سەر تۆ جاسووسە".

وە کار بەدەستێکی ویست کە بێتە خزمەتی. ئەو کاربەدەستە سەرپێچی کردو نەهات. ئەمیر دەستووری دا و فەرمووی: ئەگەر ناتوانێ بە هەموو جەستەیەوە بێتە خزمەت ئێمە، ئێمە بەوە رازی دەبین بەشێک لە جەستەی بێنن. دەبێ سەری ئەو بە بێجەستە بێنن.

کاتێک وەسیەتی دەکرد بە کوڕی خۆی ئەمیری مۆمنان ئەلمەهدی گوت: "کوڕی من! زۆر بە لەشکر رامەگە، کە نیازو پێداویستییان بە تۆ نەمێنێ، ئەوەندەشیان زەخت مەخە سەر کە رووت لێ وەرگێڕنو هەڵبێن. بەجێو رێ خەڵات بکە بە ئەندازەی پێویست، وە دەست پێوە بگرە بێ قرنیسی، ئاسۆی هیوایان بە روودا ئاواڵە بکەو جڵەوی بەخشینو خەڵاتکردنیش توند بگرە".

هەمیشە دەیگوت: "بێ ترسو دەغدەغە هێچ کەس ناتوانێ کارێک بکا. دیندار هەمیشە لە عەزاب دەترسێ، پیاوی شەرەفمەند لە عەیبو عار دەترسێو عاقڵ لە دواهاتی غەفڵەت، خۆی دەپارێزێ".

رۆژێک بە رەبیعی گوت: دەبینم کە خەڵک منیان پێ خەسیسو دەست قووچاوە. من خەسیس نیم. بەڵام ئەو عالەمە هەموو نۆکەری درەمو دینارن، نایاندەمێ تا بۆ ئەو درەمو دینارە خزمەتم بکەنو کابرای حەکیم راستی گوتووە: "سەگەکەت برسی رابگرە با بە دواتدا هەڵبێ".

رۆژێک عەرزیان کرد: فڵان فەرماندەی سپا کۆچی دوایی کردو ماڵو مڵکێکی زۆری لە پاش بەجێ ماوەو منداڵەکانیشی وردنو نەبوونەتە پیاو، دەستوور بفەرموو کاربەدەستان، هێندێک لەو مڵکو ماڵە بەدەستەوە بگرن، بۆ دیوان قازانجێکی زۆری دەبێ. جوابی داوە "ئەوەی بە خەلافەتی دنیا تێر نەخوا بە ماڵی هەتیوانیش تێر نابێ".

هونەرو سیفەتی جوانی ئەو پادشایە دە ئەژمار نایەو کتێبە مێژووییەکان زۆر لەو بارەوە دواون. بەتایبەتی کتێبی "غُرر سیَر ثَعالِبی" رەحمەتی خودای لێ بێ، بە دوورودرێژی باسی کردووە. وە ئەو کارەی ئەو بۆ دامەزراندنو سەقامگیرکردنی خەلافەتو بەرقەراری مڵکو دەوڵەت کردی، ئەوە بوو کە

ئەو دەســـەڵاتە چوار سەد ساڵ درێژەی بوو و سووڕانەوەی چەرخی گەردوونو ڕووداوەکانی زەمان نەیانتوانی پایەو بناغەی سســـتو ڕووخەک بکەن. وە هەر بینایەک لەســـەر بناغەی دادگەریو چاکەو ئیحســـان داندرابێو دەوروبەری بە یارمەتیو ســـەرکەوتنی دینی حەقو دە بەرچاوگرتنی پێشکەوتنی خەڵک پتەو بکرێ، ئەگەر ئاڵوگۆڕی بارودۆخی زەمەن کاری تێنەکا و دەستی جەوری زەمانە لە ڕووبەری بەختەوەری ئەو کۆتا بێ، ســـەیر نییە. ئەوەی گوتمان کەمێکە لە گەورەییەکانی ئەم پادشایە. ئێستا دەگەڕێمەوە سەر مەبەستی خۆم.

بە کورتی، مەبەستم لە هێنانە ئارای ئەم باسە ئەوە بوو کە پادشایەکی لەم چەشنە، خۆشی لەم کتێبە هات. زەمانێک وڵاتی خۆراسان کەوتە دەست ئەمیر ســـەید **ئەبولحەسەن نەسر** کوڕی "ئەحمەد ســـامانی"، دروودی خودای لێ بێ، بە "ڕوودەکی" شـــاعیری ئەمر فەرموو، بە شێعر تەرجومەی بکا. چونکە شێعرو هۆنراوە، لایەنگری زۆرترە. وە ئەو پادشـــایە لە نێو پادشـــایانی ســـامانیدا لە هەموان دەســـت ڕۆیشتووترو وڵاتی زۆرتری بە دەستەوە بوو. دە زەمانی ئەودا کرمانو گورگانو تەبەرستان تا دەگاتە ڕەیو سپاهان لە ژێر دەسەڵاتیدا بوونو سی ساڵ پادشایەتی کردو زۆر بەختەوەرو سەرکەوتوو بوو. ئەگەر بە کورتیش باسی ئەو بکەین دەبێ زۆری لەسەر بڕۆین.

ئەو زاتە ئـــەم کتێبەی زۆر بەلاوە عەزیز بوو و زۆری دەخوێندەوەو موتاڵای دەکرد. وە دابشلیم ـ ڕای هێندی ـ کە ئەم کتێبە بە فەرمانی ئەو کۆ کراوەتەوە، هەر وەها بیدپای بەرەهمەن کە نووسەرو داهێنەری سەرەکییە دە خزمەت ئەودا بووە. ئەو [دابشلیم] پلەوپایەی پادشایی هەبووەو لەم کتێبەوە، کەماڵی عەقڵو تێگەیشـــتوویی ئەومان بۆ دەردەکەوێ. وە ئەو ســـیحرو تەڕدەستییەی بیدپای بەرەهمەن دە کۆکردنەوەی ئەم کۆمەڵە بابەتەدا نیشانی داوەو ئەو بابەتە جوانو شیرینو بەنرخانەی کە پێوەی لکاندوونو ئەو بارودۆخە سەیروسەمەرانەی بۆی هاتۆتە پێش، لەوە ئاشکراترە کە بتوانین حاشای لێ بکەین. چونکە هەر کەس لە عەقڵ بەهرەی بردبێ، گەورەیی ئەو کتێبەی لێ شـــاراوە نییەو ئەوانەش کە لە جوانی عەقڵ بێ بەشن، عوزریان ڕەوایەو گلەییان لێ ناکرێ.

نووری مووسا لە کوێ دەبینێ کوێر؟!
نوتقی عیسا چلۆن دەبیسێ کەڕ؟![1]

وە ئەگەر لەسەر لایەنە باشەکانی ئەم کتێبە، دەیان کتێب بنووسرێ، هێشتا کەمەو ئەو باسە کۆتایی نایە. بەڵام دەردەسەریم پێدانو زۆری لەسەر ڕۆیشتم، چونکە لەو شوێنەوە کە گەیشتینە باسی نەوشیروان تا ئێرە هەمووی زیادییەو دەگەڵ ناوەڕۆکی کتێبەکە هیچ سازگاریو موناسەبەی نییە. بەڵام مەبەست ئەوە بوو کە بزانین حیکمەت هەمیشە خۆشەویست بووە. بە تایبەتی لە لای پادشایانو ئەعیانو گەورەپیاوان. وە ئەلحەق ئەگەر لەو ڕێگەیەدا تەلاش بکرێو زەحمەتێک بکێشرێ زایەو بێبەرهەم نابێ. چونکە ناسینی یاساکانی سیاسەت لە کاری دنیاداریدا ئەسڵێکی موعتەبەرەو باقیبوونی ناو لەسەر مەودای ڕۆژگار پاشەکەوتێکی گرانبەهایەو بە هەر قیمەتێک بکڕدرێ هەرزانە.

وە ئەم کتێبە پاش وەرگێڕانەکەی کوڕی موقەفەعو تەرجەمە هۆنراوەکەی ڕوودەکی، زۆر جاری دیکەش تەرجەمە کراوەو هەر کەس بە ئەندازەی توانای خۆی لە مەیدانی بەیاندا ئەسپی خۆی لینگ داوە. بەڵام وا وێدەچێ کە مەبەستی ئەوان گوتنی ئەفسانەو نووسینی حەکایەت بووە نە تێگەیاندنی حیکمەتو ڕێنوێنیو مەوعیزە. چونکە ئەوەی گوتوویانە ناتەواوەو لە گێڕانەوەی نەقڵو نەزیلە، تێنەپەڕیون.

وە سەرەنجام، چون خەڵکان مەیلی جارانیان بۆ خوێندنەوەی کتێبی عەرەبی نەماوەو ئەو گشتە پەندو مەسەلو مەوعیزانە لە بیر دەچوونەوە، بڕیارم دا تەرجەمەی بکەمو پەرە بە ناوەڕۆکو بابەتەکان بدەمو ئیشارەو ئیماژەکانی بخەمە بەر چاوانو بە شێعرو ئایەی قورئانیو گوتەی نەستەقو نموونە بڕازێنمەوە. تا ئەم کتێبە کە بژاردەیەکی چەند هەزار ساڵەیە، زیندوو کەمەوەو مرۆڤەکان لە بەهرەو بەرەکەتەکانی بێنسیب نەبن.

بەمجۆرە بوو، دەست بەکار بوومو بارودۆخی ئارایشتی گوتەو بەرعۆدەبوونی ڕێکخستنی شێعرو بابەتەکانو نیشاندانی ڕەمزو ڕازی حەکایەتەکان وەدیهات.

---

١. نور موسی چگونه بیند کور / نطق عیسی چگونه داند کر.

پێشـــەکیم بۆ نووسی، تەرجەمەکەم ئەنجام دا و بەشێکیش بۆ باسی برزوویەی تەبیب تەرخان کرا کە دەڵێن بوزەرجومێهر نووســـیویەتی. ئەو بەشـــە زۆر بە کورتی نووسراوە، چونکە زۆرتر حەکایـەتـەو لـە سـەر تـەوەرەی نەقڵو نەزیلە داڕێژراوە. هەر بابەتێکیش بە زێرو زەمبەری سیاسەتی گشتیو حیکمەتی ئەسڵی نەڕازابێتەوە، ئەگەر کەسێک بیەوێ بە جلوبەرگی خوازراوە بیڕازێنێتەوە، بە هیچ کلۆجێک جوان دەرناچێو ئەگەر بە بەرچاوی ڕەخنەگرانی حەکیمو مامۆستایانی هەڵکەوتـــەدا تێپەڕێ، ســـەرنج نادەنە خشـــڵو زێروزەنبەرێو ناچار تووشـــی فەزیحـــەتو ئابڕووچوون دەبێ. وە ئەو، بە درێژی ئەو باســـکردنو زێدەگۆییە زەریفـو لەتیفە بە داســـتانی شێرو گا دەســـت پێدەکا کە ئەسڵی کلیلەودیمنە ئـــەو داســـتانەیەو درگای بێســـتانی زانینو حیکمەت بەسەر خوێنەرانی کتێبدا لەوێوە دەکرێتەوە.

پاش ئـــەوەی هێندێک لە وەرگێڕانەکە ئەنجام درا و ڕێکوپێک کرا، باســـی ئەو کارە بە گوێی شاهەنشـــای خاوەن شکۆ گەیشـــت، کە خودا هەمیشە هەر خەبەری خۆشـــی بە گوێ بگەیەنێ، وە چەند بەشـــێک ڕەوانەی خزمەتی کـرا. چـون پـادشـــا زیانزانو ئەدەبناسو خاوەن بۆچوونەو پسپۆڕی ئەو بابەتانەیە. کارەکەم کەوتە بەر پەسندی زاتی پادشا و شانازی دنەدانو پشتیوانیکردنی بە ســـەردا باراندم. وە پەیامی نارد کە هەر بەم شێوەیە کارەکە درێژە پێ بدەمو فەرموویووی: "سەرەتای کتێب بە باسو شەرحی مەجلیسی ئێمە برازێنەوە". وە ئەم بەندەیە بەو فەرمانەو شانازی یارمەتیو پشتیوانی، ورەم بەرز بۆوەو هێزی دڵو دەروونم گەیشـــتە ئەوپەڕی خۆی. بە ترسو نیگەرانییەوە رووم دەو ئەرکە کرد، چون بەندەکان مافی ســـەرپێچیکردن لە فەرمانی شاهانەیان نییە. دیارە لە خەڵکانی دنیا ئاشکرایە کە بیروڕای پادشا، خودا شانو شکۆی بەرزکاتەوەو سەڵتەنەتو مەملەکەتی ئەبەدی بداتێ، ڕێنوێنی عەقڵی گشتیو ڕۆحی قودسییە. نە وردبوونەوە لەم ئەزموونو ئـامـاژەگەلـە بیروڕای پادشـــا تیژتر دەکا و نە موتاڵای ئەم کتێبە لەسەر قسە درەوشاوەکانی شاهەنشا کارتێکردنێکی دەبێ.

بەڵام ئەو فەرمانەی ئەوان، بۆ بەندەو بەندەزادە، تەشویقو هانەیەکی گەورە

بوو. شـــانازیو مباهاتم پێوە دەکرد. وە خێرو چاکـــەی ئەم کارە بۆ ڕۆژگاری خاوەنشکۆش مسۆگەر بوو. وە هەر وەها ئەگەر پادشایانی رابردوو، کە ناویان لە سەرەتای ئەم بەشەدا هاتووە، تەوفیقی لەم چەشنەیان دەست کەوتووە هۆی ئەوە بووە کە قسەی حەکیمانو زانایانیان بە لاوە گرینگ بووەو لە ئاکامدا ناوی ئەوانیش بەم هۆیەوە لە سەر دنیا ماوەتەوە.

ئەمـــڕۆ کە زەمانە دە تاعەتو فەلەک دە ئیتاعەتو ئەمری پادشـــای عالەم، سوڵتانی عادڵی گەورە، شاهەنشای بەنیئادەمدایە، ولی النِعَمْ مالِک الرقاب الامم، أعلـی الله رأیَـهُ وَ رایَتَه و نَصَرَ جُندَه و اَلْوِیَتَهُ[1] وە جڵەوی دەســـەڵاتو هـەوســـاری جیهانداری بـە دەســـت عـــەدڵو ڕەحمەتو هەیبەتو سیاســـەتی شـــاهانـە ئـەســـپێردراوە، وە گەورەییو سەرتربوونی ئەم پادشا دیندارە لە نێو کەریمانی بنەماڵەی بەرێزیدا و خەســـڵەتە زاتییە بێوێنەکانی، بەســـەر پادشـــایانی ئەم عەســـرەو پادشـــایانی رابردوودا لەوە ئاشـــکراترە کە بەندەکان پێویستیان بە درێژدادڕیو لەسەر ڕۆیشتن بێ. چونکە:

گەر سەدهەزار ساڵی دیکە بچێ، پیرەدایکی دەهر
سوارێکی وەک ئەوی بۆ نایەتە مەیدانی ڕۆژگار[2]

هەر ئەو فەرمان دەرکردنە، ناوبانگو ئاوازەی مبارەکی لە سەر شریتی ڕۆژگار جاویدانو ئەبەدی کردووە. خودای تەبارەکو تەعالا، هەموو پادشـــایانی عالەم بخاتە ژێر فەرمانی ســـەرەتای ئیقبالو سەعادەتی ئەم پادشا بەندەپەروەرەو بە هەموو جۆر، خێر لە جوانیو جەوانی خۆی ببینێ.

بِمنِّه و رَحْمَتِهِ و حَوْلِهِ و قوّتِه

---

١. خودا بیر و ئاڵای بەرز رابگرێو یاریدەری سپای بێت.
٢. در صد هزار قرن سپهر پیادەرو / نارد چنو سوار به میدان روزگار.

## دەقی پێشەکییەکەی کوڕی موقەفەع (ابن المقفع)

**ئەبولحەســـەن عەبدوڵـــلا کوڕی موقەفـــەع**، رەحمەتی خـــوای لێ بێ، وا دەڵی: پاش حەمدو ســـەنای خودای تەعالا (عزَّ اسمه) وە درووود بۆ سەروەری پێغەمبەران، ســـەلامو ســـەلەواتی خوای لێ بێ، خودای تەبارەکو تەعالا بە ئەوپەڕی توانا و حیکمەتەوە دنیـــای خولقاندو بەرەی ئادەمزادی بە زانایی‌و هیممەتی خۆی، بە ســـەرەتی عەقڵو لە ســـەرتربوونی باری تێگەیشتوویی، لـــە باقی گیانداران جیاواز کرد. چونکە عەقڵ لەســـەر یەک، هاچەری درگای خێراتو دەستخستنی بەختەوەرییەکانە، مەسڵەحەتی ژیان‌و مەعاش‌و مەعادو بەختەوەری دنیا و رزگاری رۆژی پەســـڵان بە ئەوەوە بەستراوەتەوە. ئەویش دوو جـــۆرە: "غەریزی" کە خوای گەورە رەوای دەبینێ و، "دەســـتهاتوو" کە لە رێی ئەزموونان دەکەوێتە دەســـتمان. ئـــەوەی غەریزییە وەکوو ئاگر وایە لە دارو چێودا؛ کە گڕگرتنی ئەم ئاگرە بە بێ ئامرازی هەڵگرســـاندن دەســـت نادا. کارامەیی ئەمەش بێ ئەزموون‌و دەکارهێنان روو نادا. زانایان گوتوویانە: التجارب لِقاح العقول[1] وە هەر کەس لە فەیزو بەرەکەتی ئاسمان‌و عەقڵی غەریزی بەهرە وەرگرێ‌و بۆ کەســـبی هونەر تێکۆشـــێ‌و بـــە وردی‌و عاقڵانە بڕوانێتە ئەزموونەکانـــی رابردووانی پێش خۆی، ئارەزووی دنیا وەدی دێنێ‌و لە رۆژی دوامین، خۆشـــبەخت هەڵدەســـتێ. والله الهادی الی ما هُوَ اوضَحُ سبیلاً و الأرشَدُ

---

١. ئەزموونەکان دەبنە هۆی بەرهێنانی عەقڵەکان.

دلیـلاً.[١] دەبێ ئەوەش بزانین کە خودای تەعالا بۆ هەر کارێک دەلیلێکی داناوە، بۆ هەر دەلیلەش هۆکارێکو بۆ هەر هۆکارێکیش شوێنو کاتێکی دیاری کردووە، کە دەسـەڵات پێوەندی پێوە هەیەو ڕۆژانی تەمەنو ڕۆژانی دەسـەڵاتی یەکێک لـە بەختەوەران بەو دەڕازێتەوە. دەلیلو هۆی وەرگێڕانی ئەم کتێبەو هێنانی لە هیندووسـتانەوە بۆ پارس، ئەوە بوو کە خودای بانیسەر (عزّ اسمه) لە تیرێژی عەقڵو ڕۆناهی دادپەروەری، خۆشـیو حەزێکی زۆری بە پادشـای دادپەروەرو بەختەوەر، نەوشیروان کەسرا کوڕی قوباد (خَفَّفَ اللهُ عَنهُ) ڕەوا دیبوو. هەر وەهاش لە ناسـینی کارو بارانو ڕێکوپێککردنیاندا فکرو بیری تیژو ئەنگێوەی پێدابوو. ئەخلاقو ئاکاری بە پەسـندو پشتیوانی ئاسمانی ڕازاندەوە، تا قۆڵی هیممەتی بۆ کەسبی زانسـتو ڕەچاوکردنی بنەما و لقوپۆپی ئەو زانستانە هەڵماڵیو لە هەموویاندا گەیشـتە پلەیەک کە هیچ پادشایەک پاش ئەو نەیتوانی دەستی پێ ڕابگا و ئەو دارە باڵابەرزە کە وردەوردە، پەروەردە کرابوو، بۆ خۆی بخەمڵێنێ. لەخۆباییبوونی شـاهانەو هیممەتی دنیاگرتن دەگەڵ ئاکارو زانستەکانی تێکەڵ بـوون تـا ئەوەی کە ئەغلەبی وڵاتانی دنیای خسـتە ژێر دەسـەڵاتو ملی بە ملهوڕانی ڕۆژگار دانەواندو کردنیە خزمەتکارو هەر شتێکی کە دنیاییەکان لەسەر دنیا ئارەزووی دەکەن، وەدەستی هێنا.

وە لەو کاتەدا بە گوێی ئەو (نەوشـیروان)یان گەیاند کە لە نێو خەزێنەکانی پادشـایانی هێنددا کتێبێک هەیە کە لە زبانی باڵندەو گیاندەبەرانی وەحشـیو جووڵەوەرو جانەوەران کۆکراوەتـەوە. وە پادشایان بـۆ بـەڕێـوەبـردنـی کـاروبـاری ڕەعیەتو سیاسـەتو پەرەپێدانی عەدڵو دادو دلۆڤانیو شـکاندنو بـەزاندنی دوژمنانو نەیاران پێداویسـتییان پێی دەبێ. ئەو کتێبە بە کـۆی هـەموو چاکەو سـەرمایەی هەموو هونەرو ڕێنوێنی هەر سوودو قازانجێکو هاچەری دەرگای هەر حیکمەتێک دەناسـنو هەر وەک بۆ پادشـایان سوودی دەتوانێ ببێ، بۆ چینو توێـژە ناوینەکانی خەڵکیش دەتوانـێ کەڵکی لێ وەربگیرێو بەو کتێبە دەڵێن **کلیلەودیمنە**.

---

١. خودا دیارترین ڕێگاتان نیشان دەدا و خۆی گەورەترین ڕێنوێنە.

ئەو پادشـــا دادپـــەروەرە، بڕیاری دا ئەم کتێبە بهێنـــێو فەرمووی پیاوێکی هونەرمەنـــد بدۆزنەوە کە زبانی هیندیو فارســـی بزانێو لە زانســـتو زانیاریدا ناوبانگـــی هەبـــێ، تا بۆ ئەم ئەرکـــە گرینگە دیاری بکـــرێ. ماوەیەکی زۆر بە دوای وەها کەســـێکدا گەڕان، سەرەنجام لاوێکی برزوویە ناویان دیتەوە کە ئەم مەرجانـــەی تێدا کۆ ببـــۆوەو لە کاری تەبابەتدا نێوبانگـــی هەبوو. ئەوی بردە لای خۆیو پێی فەرموو: پاش وردبوونەوەو ئیســـتیخارەو تەدبیرو مەشوەرەتی زۆر، تۆمـــان بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی گەورە دەستنیشـــان کـــرد. چونکە بارو بارســـتای عەقڵو زانیاری تۆ ئاشـــکرایەو مەیلو تاسەی لە بڕان نەهاتووشت بۆ وەدەســـت هێنانی زانستو هونەر ناســـراوە. جا، دەڵێن لە وڵاتی هیندووستان کتێبێکی لەو چەشـــنە هەیەو دەمانەوێ بیهێنیـــن بۆ ئەم وڵاتەو کتێبی دیکەی هیندییەکاینشـــی دەگەڵ بێنە. خۆت ئامادە بکەو بە شـــوێن ئەم ئەرکەدا بڕۆ و هەمـــوو وردەکارییەک دە بەرچاو بگرە. پـــووڵو ماڵێکی زۆرت ڕەگەڵ دەخەم، تا هەر خەرجو نەفەقەیەک پێویســـت بوو، وە ئەســـتوێ بگریو ئەگەر ماوەی مانەوەت زۆرتری کێشا و پێداویستیت زۆرتر بوو، ئاگادارمان کەوە تا زۆرترت بۆ بنێرین، چونکە هەموو خەزێنەکانی خۆمان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکەین.

ئەوجـــار فەرمانی دەرکرد تا ڕۆژێکی پیرۆزو مبـــارەک بۆ وەڕێکەوتن دیاری بکەن. وە ئەو (برزوویە) بۆ ئەو ئەرکە ڕەوانە بوو. لەگەڵ خۆی پەنجا کیسەی هێنابوو کە هەر کامەو دەهەزار دینار بوو. لە بەڕێکردنیدا لەشـــکرێکی گەورەو مەزنە پیاوانی پادشا بەشدار بوون.

ئینجا، برزوویە بە خۆشـــحاڵیو ورەبەرزییـــەوە وەدوای ئەم کارە کەوت. وە کاتێک گەیشـــتە چین. بـــە دەوری بـــارەگـــای پـــادشـــا و کـــۆڕو دانیشـــتنی زانـــایانو دەســـەڵاتدارانو گـــەورەو دەوڵەمەندانو مەجلیســـی چینی بازاڕیو نـــاوینی وڵاتـــدا دەخولایەوەو لەمەڕ حاڵو ئەحواڵی نیزیکانو دۆســـتانی "ڕای"و فەرزانەکانو فەیلەســـووفانو زانایانی پرســـیار دەکرد. لە هەر شوێنێکدا خۆی دەگۆڕیو بە مدارا و لەسەرەخۆیی دەگەڵ هەموو لایەنێک ژیانی بەڕێوە دەبردو وای دەنواند کە بۆ فێربوونو کەســـبی زانســـت وڵاتی خۆی بەجێهێشتووەو بە

شـــێوەی شـــاگردێک، بۆ هەموو لایەک دەچوو. هەر چەند لە هەموو زانستێک بەهرەمەندو شارەزا بوو، وەک نازانایەک خۆی نیشان دەدا و لە هەموو چەشنە هەڵکەوتێـــک کەڵکی وەردەگرتو دۆســـتو هاورێی لە خۆی کۆ دەکردەوەو هەر کامەیانی بە ئەزموونی جۆراوجۆر هەڵدەســـەنگاند. لـــە نێو هەمووواندا یەکێکی کەوتە بەر دڵ کە لە باری عەقڵەوە هەڵاواردە بوو. پێوەندی دۆســـتیو برایەتی دەگەڵ پتەو کرد، تا لە رەوتی زەماندا بۆچوونو بیرورا و دلۆڤانیو دۆستایەتی ئەو کەســـەی لێ روون بۆوەو لەم راستییە تێگەیشـــت کە ئەگەر هاچەری ئەم نهێنییە بداتە دەستیو قفڵی ئەم رازەی لە بەردەمدا بۆ بکاتەوە، یارمەتی دەدا و لانی کەرەمو مروەتو مافی هاودەنگیو خۆشەویستی دە بەرچاو دەگرێ.

هەر وا کە ماوەیەک بە ســـەردا تێپەریو بناغەی سەداقەتو باوەرپێکردن لە نێوانیاندا گەیشـــتە بارستایەکی زۆرو ئاشـــنایەتی گەیشتە ئەو جێگە متمانەی ئەمانەتو رازداری مسۆگەر بێ، حورمەتو رێزلێگرتنی بردە بانو چاکەی زۆری دەگەڵ کرد. پاش ئەو کارانە رۆژێک گوتی: برای بەرێزم، من تا ئەمرۆ مەبەستی خۆم لە تۆ شـــاردۆتەوەو پیاوی عاقڵ ئیشارەتێکی بەسە. هێندوو وەڵامی داوە، هەر وایەو تۆ هەر چەند مەبەستی خۆت نەدەدرکاند، من سۆسەم کردبوو، بەڵام حاڵو هەوای تۆ ئیزنی درکاندنی پێ نەدای. وە تۆ کە ئێستا پەردە لەسەر ئەم رازە لادەدەی، ئەگـــەر بۆت بگێرمەوە، عەیبو عارێکی تێدا نییە، دەزانم، وەک رۆژ لێم عەیانە تۆ هاتووی تا شـــتە هەرەباشـــەکان لە خەزێنەکانی وڵاتی ئێمە بۆ پادشـــای خۆتان ببەیتو بە گەنجینەی حیکمەت پشـــت ئەستووری بکەیو بنەمای ئەو کارەت لەســـەر مەکرو حیلـــە دامەزراندووە. بەڵام من لە خۆراگریو ئاگاداری تۆ لە خۆت، سەرم سوور مابوو. چاوەروان بووم تا هەڵکەوێ لە کاتی قسە وباسەکانتدا، وشەیەکی زیادی، کە مەبەستی تۆ ئاشکرا بکا، بدرکێنی، کە ئەڵبەتـــە رووی نەدا. بەو هەموو وشـــیاریو خۆراگرییە بروای زۆرترم پێ پەیدا کردی، چون هیچ ئافەریدەیەک ناتوانێ ئەوەندەی وریاییو عەقڵو خۆپاراســـتن لە دیتـــران، تێدا هەبێ. [بەتایبەت] لە غەریبیو لە نێو خەڵکانێکدا کە نە ئەو دەیانناسێو نە ئەوان ئەو دەناسنو ئاگاداری ئەخلاقو رەفتارو ئاکاری یەک نین،

وە عەقڵ بە هەشت خەسڵەتان دەناسرێ:

**یەکەم**: مودارا و حەوسەلە؛ **دووهەم**: خۆناسین. **سێهەم**: ئیتاعەتی پادشایانو رازیکردنیانو حەولدانی زۆر بۆ شایستەترین خزمەتکاری ئەوان. **چوارەم**: ناسینی شوێنی نهێنی راگرتنو ئاگاداربوون لە مەحرەمبوونی دۆستان؛ **پێنجەم**: زێدەڕۆیی دە شاردنەوەی خودو دیتراندا؛ **شەشەم**: چاپلووسیو جامەلووسکێ لە بەر درگای پادشایانو بە قسەی خۆشو دەمتەڕی دۆستو هەواڵ وەدەست هێنان؛ **حەوتەم**: زبان گرێدانو کەمدووبوونو بە ئەندازەی پێویست قسەکردنو **هەشتەم**: لە کۆڕو مەجلیساندا بێدەنگی رەچاوکردنو باسی بابەتێک نەکەی کە لێیان نەویستووی‌و خۆ پاراستن لە گوتنێک کە پەشیمانی بەدواوەیە. هەر کەسێک ئەم هەشت تایبەتمەندییەی تێدا کۆ بووبێتەوە لەوانەیە بە ویستو حاجەتی خۆی بگا و دۆستان لە وەی مەبەستو مەقسوودی ئەو ئەنجام بدەن، شادمان دەبن.

وە ئەم بابەتانە لە تۆدا هەنو زانیم کە دۆستی تۆ دەگەڵ من بۆ ئەم مەبەستە بووە. بەڵام هەر کەس ئەو هەموو فەزیلەتەی تێدا رەنگ بداتەوە، ئەگەر لە هەموو رەهەندێکەوە رەزامەندی ئەو دەست بکەوێو ئەوشتە کە دەبێتە هۆی ئاسوودەیی ئەو ئەنجام بدرێ، لە رێبازی عەقڵ دوور ناکەوێتەوە. هەر چەند ئەم ویستەی تۆ منی خستە ژێر ترسو نیگەرانی، کە قسەیەکی زەلامو مەترسییەکی گەورەیە.

کاتێک برزوویە تێگەیشت کە هێندوو لە پیلانی ئەو ئاگادارە، حاشای لەو گوتەیە نەکردو بە جوابێکی نەرمو نیان گوتی: من بۆ درکاندنی ئەم رازە ماوەیەکی دووروودرێژ بیرم کردبۆوە. بۆ ئەم رازە ئەسڵو فەرعو لایەنو سووچم دانابوو. بەرەگەکانی راستو چەپو ناوەندو باڵەکانیم بە مافی دۆستایەتی‌و خۆشڕوویی‌و زەمینەی یەکیەتی‌و موخلیسی رازاندبۆوەو سەرەتاکانی عەهدو پەیمانو بنەتاکانی بەڵێنو باوەڕم کردبووە پێشەنگو حورمەتی غەریبی‌و رێزگرتن لە تەرکەوەتەنیشم کردە مایەو هانەی ئەو [لەشکرە]و ئامادە بووم کە بەمجۆرە بێمە گۆڕەپانی مەیدانو رووبەندی ترسو دڵەڕاوکێ لەسەر پەیکەری

مەبەستم لادەمو بە بەرەکەتی یارمەتیو لە سایەی نێوچاوانی تۆوە سەرکەوتوو بم. بەڵام تۆ بە ئیشـــارەتێکی کورت بەسەر زۆرو کەمی فکرو رازی مندا ئاگادار بوویو لە درێژدادڕیو لەســـەر رۆیشـــتنی زۆر، بێنیازت کـــردمو واداری کردم تەقـــازای جێبەجێکردنی نیازت لێ بکـــەمو بپارێمەوە. کەرەمو پیاوەتی تۆ هەر ئەوەی لێ دەوەشـــاوەو هیوا و هومێدی منیش لە دۆستایەتی دەگەڵ تۆدا هەر ئەوە بوو. پیاوی زانا ئەگەر متمانە بە قەڵایەک بکا کە بناغەی ساغو پتەو بێ، یـــا لە چیادا بی کە با و بارانو لافاو نایبزێوێ، هیچ زیانێکی پێ ناگا و ئیرادی لێ ناگیرێ.

هێندوو گوتی: لە لای پیاوی زانا هیچ شتێک جێگەی دۆستایەتی ناگرێتەوە. وە لە هەر جێگایەک بیروبڕوا بە خۆشەویستی رازاوە، ئەگەر گیانو سەروماڵیش فیدا بکەیو هەموو مەینەتیو مەرارەتێکی بۆ وەئەســـتۆ بگری، هێشـــتا کەمە. بەڵام کلیلی هەموو داخوازیو کارێک راگرتنو شـــاردنەوەی رازەکانەو هەر رازێک کەســـی سێهەمی تێدا بەشدار نەبێ هەرگیز بڵاو نابێتەوە. بە پێچەوانەوە ئەگەر بەگوێی کەســـێکی سێهەم بگا، بێشـــک دەکەوێتە سەر زارانو ناتوانی حاشای لێ بکەیو نموونەکەی هەوری بەهارانەیە کە بە ئاســـماندا بڵاو دەبێتەوەو هەر پەڵە هەورێک بۆ لایەک دەڕوا و ئەگەر کەســـێک نیشانی کەسێکی دیکەی بدا، ناچارە قبووڵی بکا، چون حاشالێکردنی لە فکرو عەقڵدا ناگونجێ. بەڵام ئەگەر کەسێک ئاگای لەم کەینوبەینەمان بێ، برایەتیمان وەها پایەماڵ دەکرێ کە بە ماڵـــی دنیا و پارەوپووڵ وەک خۆمان لێ نایەتەوە، چونکە پادشـــای ئێمە زۆر تووڕەو تۆســـنو جینگنەیەو لەسەر خەتایەکی وردو ئاسایی گەورەترین سزا دە بەرچاو دەگرێ.

برزوویە گوتی: پتەوترین بناغەی دۆســـتایەتی نەدرکاندنی رازەکانەو من لەم بـــارەوە هیچ مەحرەمێکی دیکەم نییە. تەنیا بـــاوەڕم بە کەرەمو عەقڵو زانایی تۆیە. دەشزانم کارێکی قورسو گرانو مەترسیدارە. بەڵام لە ئازادەگیو پیاوەتی تۆ رادەبینم کە من بە ئارەزووم بگەیەنیو ئەگەر لەم رووەوە تووشی زەحمەتێک ببی، بە ئاســـانی وەریبگریو ئەو زەحمەتە بەو بارگرانییە دابنێی کە پیاوەتیو

بەخشـــندەیی پێداویســـتی پێ هەیە. لە تۆ روونە کە بڵاوبوونەوەی ئەم رازە لە لایەن منەوە ناموەکینە، دیارە تۆ لە خزمانو نزیکانی خۆت نیگەرانی کە ئەگەر پێ بزانن بتهاوێژنە بەر غەزەبی پادشا. بەڵام وا وێدەچێ کە هەواڵێک دەرنەچێو کارێک نەیەتە پێش.

هێندوو، ئازایەتی نواندو کتێبەکانی پێدا و برزوویە لە رۆژانێکی دووروودرێژدا بە ترســـەوە لە رووی دەنووســـینەوەو ماڵو پارەیەکی زۆری بۆ ئەم مەبەســـتە خـــەرج کردو لەم کتێبەو زۆر کتێبی تری هێندوویی نوســـخەی هەڵگرتو باوەڕ پێکراوێکی خۆی ناردەوە لای پادشا و لە کارەکان ئاگاداری کردەوە.

نەوشیروان شادمان بوو، دەیەویست برزوویە زووتر بگاتە خزمەتی، تا رووداوی رۆژگار ئەو شادمانییە تاڵو سوێر نەکا. زوو نامەی بۆ ناردو دەستووری دا کە ئەو کارە زوو ئەنجام بدرێو بە ورەی بەرزو هیوای زۆرەوە بگەڕێتەوەو زۆر ئاگاداری کتێبەکان بێ، کە بۆیان نیگەرانەو بۆ وەدەرخستنیان [لە هێندووستان] وریاییو عەقڵ دەکار بێنێ کە خودای (عزّوجلّ) بەندەی عاقڵی خۆش دەوێو عەقڵیش بە ســـەبرو تەجرەبەو ئاگادارییەوە جوان دەبێ. نامە مۆرکرا و درا دەست قاسیدو پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە بە رێگا پڕ رێبوارەکاندا نەڕوا تا ئەو نامە نەکەوێتە دەست دوژمنێک.

هەر کە نامە گەیشتە دەست برزوویە، زۆر بەپەلە گەڕاوەو ئامادەی چاوپێکەوتن بوو. خەبەریان دا بە "کەسرا". بێدرەنگ بانگی کردە لای خۆی. برزوویە رەسمی خزمەتو پابۆســـی بەجێ هێنا. شا ئەحواڵی پرسیو رێزی زۆری لێگرت. کەسرا بە دیتنی ئاســـەواری مەینەتو مەرارەتی زۆر، کە لەســـەر روخســـاری برزوویە نیشتبوو، دڵی بۆی سووتا و پێی گوت. قەویدڵ بە، ئەی بەندەی باش! ئەوەی بزانـــە ئەو خزمەتەی کردووتە جێگەی رەزامەندییەو بەهرەو بایەخی ئەو ئەرکە، دەزانین. بگەڕێوەو حەوتوویەک بحەســـێوە. پاش ئەو حەســـانەوەیە وەرەوە تا ئەوی پێویستە فەرمانی لەسەر بدەم.

لـــە رۆژی حەوتەمدا فەرمووی، زانایانو گەورە پیاوانی دەوروبەری حازر بنو برزوویەی بانگ کردو ئیشـــارەی پێ دا کە مەزمـــوونو ناوەرۆکی ئەم کتێبە بە

گوێی ئامادەبوواندا تێپەڕێنێ: کە خوێندیەوە، هەموو سەریان سوور مابوو، هەزار دروودو ئافەرینیان پێشکەش بە برزوویە کردو شوکری یەزدانی پاکیان کرد کە ئەنجامی ئەو کارەی ئاسان کردووە. کەسرا فەرمووی درگای خەزێنەکان بکەنەوەو بە سوێندەوە بە برزوویەی گوت بە بێ دەستگێڕانەوەو بە مەیلی خۆی هەر چەندی دەیەوێ لە نەغدینەو جواهێرات هەڵبگرێ.

برزوویە بەرێی پادشای ماچ کردو گوتی: لوتفو مەرحەمەتو عینایەتی پادشا منی لە ماڵی دنیا بێنیاز کردووە. کام دەوڵەمەندیو ماڵی دنیا دەتوانێ جێگەی بەندەنەوازی خاوەنشکۆ بۆ من بگرێتەوە؟ بەڵام چون سوێند دراوم، لە جامەخانە [بەشی جلوبەرگ]ی تایبەت، بۆ شانازیو گەورەیی تەختەیەک قوماش لە قوماشی خۆزستانی کە بابەتی جلوبەرگی پادشایانە هەڵدەگرم. ئەوجار گوتی: ئەگەر من لەم خزمەتەدا تووشی زەحمەتو مەینەتی زۆر بوومو لە ترسو دڵەراوکێدا ژیام، هیوای ئەوەی کە راپەڕاندنی ئەم ئەرکە دەبێتە هۆی رەزامەندیو دڵخۆشی پادشا، هەموو رەنجو زەحمەتێکی لە بیر دەبردمەوە. دڵخۆشی پادشا، دەبێتە هۆی تەلاشو تێکۆشانی بەندەکان. ئەگەر نا، جێبەجێکردنی ئەرکو دەرکی موراد، بە بێ بەختەوەری زاتو هەمواربوونی بەختی پادشا سەر ناگرێ. وە کامە خزمەت هاوسەنگی ئەو کەرامەتو پیاوەتییە دەتوانێ ببێ کە لە پاش منو کاتێک لێرە نەبووم، دەگەڵ خاوخێزانی منی فەرمووە؟ وە تەنیا داخوازییەکم ماوە کە دەگەڵ دلۆڤانییەکانی پادشا مەترسییەکی نابێو ئەگەر دەگەڵ چارەنووسم تێکەڵ بێ، گەورەیی دنیا و قیامەتم موتوربە دەکرێ، خێرو سەوابی رۆژگاریش بۆ پادشا زەخیرە دەبێ.

ئەوشیروان گوتی: ئەگەر دەتەوێ لە دەسەڵاتدا بەشدار بی، مەقبووڵەو رەوایە. بێپەروا بەو لێم بخوازە. برزوویە گوتی: ئەگەر پادشا ئیزنی لەسەر بێ، با بە بوزەرجومێهر بفەرموون تا چەند لاپەڕەیەک لەم کتێبەدا بە ناوی منی بەندە، لەسەر حاڵو بەسەرهاتی من بنووسێو لەو بەشەدا کارو پیشەو بنەڕەتو ئایینی من بە تەواوی باس بکا و پاشان بە فەرمانی پادشا، شوێنێکی لەم کتێبەدا بۆ دیاری بکرێ، تا ئەو شەرەفو شانازییە، لە رۆژگاراندا هەتاهەتا

بۆ من بمێنێ‌و ئاوازەی خزمەتکاری‌و بەندەگی من لە پێناو ئەمری پادشـــادا بۆ هەمیشە بمێنێتەوە.

کەسرا و ئامادەبووان زۆر سەرسام بوونو لە هیممەتی بەرزو عەقڵی هەراوی برزوویە ئاگادار بوونەوە. وە لە ســـەر ئەوە کۆک بوون کە برزوویە شایانی ئەو پێگە بەرزەیە. بوزەرجومێهریان بانگهێشـــت کرد. شا ئەمری پێ کرد: خۆت لە راستگۆیی‌و بارســـتای ئیرادەتی برزوویە بەرانبەر بە ئێمە ئاگاداری‌و دەزانی بە فەرمانی ئێمە بەرەنگاری چ مەترســـییەک بووە. دەمانویســـت لە خەزێنەکانی ئێمـــە ئەوەندەی دەیەوێ بۆ ســـەر دنیای خۆی بەهـــرە وەربگری، ئەلبەتە لەم بارەوە شتێکی نەویســـتو گوێی پێ نەدا و داخوازییەکەی ئەوەیە لەم کتێبەدا بەشێک بەناوی ئەو بنووسرێ. بەشێوەیەک کە تەواوی بەسەرهاتەکەی لە رۆژی لەدایکبوونیەوە تا ئەو ســـەعاتە کە شـــانازی هاونشـــینی ئێمەی پێ براوە، بە تەواوی تێدا باس بکەێ. ئێمەش لێمان قبووڵ کردو دەستوور دەدەم، لە ئەسڵی کتێبەکەدا جێی بۆ بکەنەوە. کار کە تەواو بوو، کۆرێک پێک بێننو بە ئاشـــکرا بیخوێننەوە. تا تەلاش‌و رەحمەتی تۆ (برزوویە) لە کاراندا، کە بە ئەهلی رۆژگار ئەنجام نادرێ، بۆ زانایانو ئەشرافـو ئەعیانی وڵاتیش روون بێتەوە.

کاتێک کەســـرا ئەم دەســـتوورەی بەم هەراوییە دەرکرد، برزوویە سوجدەی شـــوکری بردو دوعای بەخێری کردو بوزەرجومێهر ئەو بەشـــەی بەو جۆرە کە دەستوور درابوو، پەرداختە کردو بە شێوەیەکی زۆر جوان رازاندیەوەو خەبەری دا بە پادشا، ئەو رۆژە باری عام [رۆژی دیداری پادشا] بوو، بوزەرجومێهر ئەو فەســـڵەی لە کتێبەکە بۆ برزوویەو هەموو زاناکان خوێندەوە، پادشـــا و هەموو ئامادەبووان پەســـندیان کردو لە رادە بەدەر تەحسینی کاری بوزەرجومێهریان کردو پادشا خەڵاتی بەقیمەتو بەهاداری پێ بەخشی‌و نەغدینەو جەواهێراتی زۆرو جلوبەرگی رازاوەو تایبەتی پێشکەش کرد. بوزەرجومێهر بێجگە لە جلوبەرگ، هیچ شتێکی وەرنەگرت.

ئەو جار، برزوویە دەستو لاقی نەوشیروانی ماچکرد ‌و گوتی: یەزدانی پاک، هەمیشە ئاگاداری خاوەنشکۆ بێ‌و گەورەیی‌و عێزەتی سەر دنیای لە قیامەتیشدا

پێ ببەخشــێ. ئاسەواری چاکەو پیاوەتی پادشا بەو کەرامەتەی دەگەڵی کردم گەیشتە ئەوپەری خۆی،و منی بەندە پێی رووسوورو سەربەفراز بووم. خوێنەرانی ئەم کتێبە بەهرەی زۆری لێ وەردەگرن، کە هۆکاری گوێزتنەوەی بناسنو بزانن کە تاعەتی پادشـــایانو خزمەتکردنی خاوەنشـــکۆیان، باشترین ئەرکەو پیاوی شەریف ئەو کەسەیە کە خوسرەوانی زەمانە شەرەفیان پێ بدەنو لە دەوڵەتو دەسەڵاتی خۆیاندا وەریان بگرن.

وە کتێبی کلیلەودیمنە پازدە پاژە (باب). ئەوەی هیندووەکان نووســیویانە دە پاژە.

**پاژی یەک:** شێرو گا

**پاژی دوو:** لێکۆڵینەوە لە کاری دیمنە

**پاژی سێ:** کۆتری تۆق لە گەردن

**پاژی چوار:** کوندو قەلەڕەشە

**پاژی پێنج:** پادشا و پۆڕ

**پاژی شەش:** کتکو مشک

**پاژی حەوت:** شێرو چەقەڵ

**پاژی هەشت:** مەیموونو رەقە

**پاژی نۆ:** تیرهاوێژو شێری مێ

**پاژی دە:** زاهیدو میوان

ئەوەی لە لایەن پارسییەکانەوە پێوەی لکاوە پێنج پاژە:

**پاژی یەکەم:** برزوویەی تەبیب

**پاژی دووهەم:** زاهیدو کوڕی عیرس

**پاژی سێهەم:** پادشا و بەرەهمەنەکان

**پاژی چوارم:** زێڕینگەرو گەڕیدە

**پاژی پێنجەم:** کوڕی پادشا و هاوڕێکانی

□

## سەرەتای کلیلەو دیمنە لە زبان بوزەرجومیهری بەختەکان

"ئــەم کتێبــی کلیلەودیمنەیــە، بە دەســت زانایــانو بەرەهمەنانی هێند، کۆکراوەتەوە. بابەتەکانی لە هەموو چەشــنە رێنوێنیو مەوعیزەو پەندو مەتەڵ پێک هاتوون، وە هەموو کات حەکیمانو زانایانی هەر سینفێک لە خەڵکانی عالەم، تێدەکۆشــانو بە وردە فێڵو حیلەت بە دوای ئەوەدا دەگەڕان کە ســەرجەمێک بابەت کۆ بکەنەوەو باسی نەزمو رێکوپێکی رەوەندی حاڵو ئێستا و داهاتوو و مەسڵەحەتی ژیانو دنیا و قیامەت لەودا بگونجێنن. تا سەرەنجام ئەم مەبەستە باشــە بۆ ئەوان رووی دا و بارودۆخێکی وەهایان هاتە بەر کە قسەو حەکایەتی جوانو بەدیع، بە یەقینی زۆرەوە لە زبان ئاژەڵو باڵندەو گیانداری وەحشی کۆ بکەنەوە. وە لەم کارەدا چەند قازانجیان بۆ دەســتەبەر بوو، یەکەم ئەوەی دە باســکردندا مەجالی ئاڵوگۆڕیان وەدەست هێنا، تا لە هەر باسێکدا، کە درگای بە ســەردا دەکەنەوە، تێروتەسەل بدوێنو بنووسن. فایدەیەکی تر ئەوە بوو کە پەندو حیکمەتو شــۆخیو جەفەنگ تێکەڵ کرا تا زانایان بۆ کەڵکوەرگرتن لە مەغزاو نەزانان وەک ئەفســانە بیخوێننەوەو لاوانی خوێندکار بە چاوی زانستو مەعریفەت تێــی بڕوانو لەبەرکردنو فێربوونی بۆیان ئاســان بێو کاتێک پیر بوونو بەســاڵدا چوون، لەســەر ئەو بابەتانەی لەبەریان کردووە لەنگەر بگرنو فکر بکەنەوەو لە تێگەیشتنی ناوەرۆکو مەبەستەکان کەڵک وەربگرنو لە نەکاو بەسەر گەنجینەو خەزێنەی لە قیمەت نەهاتوودا بکەون. ئەوەش وەک ئەوە وایە

کە پیاوێک لە کاتی بلووغدا بەسەر گەنجێکدا بکەوێ کە باوکی بۆی دانابێ‌و زۆر خۆشحاڵ دەبێ‌و ئێتر تا ماوە دەحەسێتەوەو تووشی زەحمەتی کارو کاسبی نابێ.

ئەوجار، خوێنەرەوەی ئەم کتێبە، دەبێ ئامانج‌و مەبەستی کۆکردنەوەو دانانی ئەم کتێبە بزانێ، چون ئەگەر ئەم بابەتە بۆ ئەو روون نەبێتەوە، بەهرەیەکی لێ وەرناگرێ. وە ئەگەر توانی بیخوێنێتەوە، دەبێ بە وردی‌و بە فکرەوە بیخوێنێتەوەو حەولی ئەوە نەدا، زوو کۆتایی پێ بهێنێ. بەڵکوو مەغزاو فایدەکانی ئەم کتێبە بە کاوەخۆ دە زەینی خۆیدا جێ بکاتەوە، کە ئەگەر بەم شێوە نەڕواتە پێش، دەبێتە نەقلی کابرای:

پیاوێک لە بیابانێک گەنجێکی دیتەوە، فکری کردەوە: "ئەگەر بە تەنیا بمەوێ ئەم گەنجە بەرمەوە عومرێکی درێژی پێ دەوێ‌و هەمووشم بۆ ناڕوا. وا باشترە چەند کەسێک بگرم‌و بارەبەرێکی زۆر بەکرێ بگرم‌و هەمووی بەرمەوە ماڵ". هەر ئەو کارەی کردو باری خەزێنەی دە پێش خۆیدا بەرەوماڵ بەڕێ کردەوە، کرێکارەکان دەرفەتیان هێنا و باری جەواهێراتیان بۆ ماڵی خۆیان بردەوە. کاتێک ئەو پیاوە عاقڵ‌و بەتێبینییە، گەیشتەوە ماڵ، بێجگە لە حەسرەت‌و پەشیمانی چی پێ نەبڕا. وە بەراستی دەبێ بزانین کە فایدە لە تێگەیشتندایە، نەک دە لەبەرکردندا و هەر کەس بێ ئاگاداری کارێک دەست پێ بکا، وەک کابرای دیکەی بەسەر دێ:

کابرایەک دەیەویست بە عەرەبی بدوێ. دۆستێکی زانای ئەو پیاوە تەختەیەکی زەردی بە دەستەوە بوو. پێی گوت: "لە زبانی عەرەبی شتێکم لەسەر ئەم تەختەیە بۆ بنووسە". پاش ئەوەی کارەکە ئەنجام درا، تەختەی بردەوە ماڵ‌و جاروبار چاوی تێدەبڕی‌و پێی وابوو بەمجۆرە فێری زبان بووە. رۆژێک لە کۆڕێکدا بە غەڵەت‌و پەڵەت دەستی کرد بە عەرەبی قسەکردن. یەکێک لە ئامادەبووان بزەیەکی هاتێ. پێکەنی‌و گوتی: "پێت وایە قسەکانم هەڵەیان تێدایە، مەگەر نازانی تەختە زەرد لە ماڵی منە؟".

لەسەر خەڵکان واجیبە کە بۆ کەسبی زانست تەلاش بکەن‌و تێگەیشتن‌و

فەهمی بابەت بە گرینگ بزانن. کە تەڵەبی عیلمو زانستو داخستنی تۆشە بۆ ئەو دنیا، زۆر پێویستە. وە مرۆڤ تا زیندووە دەبێ بە دوای زانستو کرداری باشدا بگەڕێ، نووری ئەدەبیش دڵ رووناک دەکا و دەرمانی تەجرەبەو ئەزموون، خەڵکان لە هیلاکەتی نەزانی رزگار دەکا، وەک چۆن جوانی خۆر رووی زەوی نووریاران دەکا و ئاوی ژیانیش تەمەنی هەتاهەتایی دەبەخشێ. وە زانستیش بە کردەوەی جوانەوە جەماڵی خۆی دەنوێنێ، چونکە میوەی داری زانست چاکەکاریو کەمئازارییە. وە هەر کەس زانستێک بزانێو دە کاری نەهێنێ، وەک کەسێک وایە کە ساهو هەیبەتی رێگایەک بزانێو پێیدا تێپەڕێو تووشی تاڵانو مەترسی مەرگ بێتەوە. یا نەخۆشێک کە زیانو زەرەری خواردنەکان دەزانێو گوێی پێ نادا و پەیتاپەیتا تێداخنێ، تا ئەوەی دەگاتە ئاستی مردنو تێداچوون. گومانی تێدا نییە، کەسێک کە زیانو زەرەری شتێک بزانێو خۆی تێبهاوێژێ، دەبێتە ئامانجی تیری لۆمەو تانەو تەشەر. وەک ئەوەی دووکەس دە چاڵێک بکەون، یەکیان چاوی ساغو ئەوی تریان کوێر. هەر چەند هەر دوو بە هیلاک دەچن، بەڵام عوزرو پاساودانەوەی کوێرەکە لە لای زانایان مەقبووڵترە.

قازانجی فێربوون، حورمەتی زاتو گەورەیی نەفسە. کە وابوو پیاو لە بارهێنانو فێرکردنی دیتراندا، ئەگەر فایدە بە خەڵک بگەیەنێو لە نسیبی خۆی غافڵ بێ وەک کانیاوێکە کە هەموو کەس لە ئاوەکەی بەهرە دەبەنو خۆی بێخەبەرە. لە دوو شتاندا دەبێ خۆت تەیارکەی، پاشان بیدەی بە خەڵک. زانستو ماڵ. یانی کاتێک لایەنەکانی ئەزموون روون بۆوە، لەپێشدا دەبێ بۆ رازاندنەوەو پاڵاوتەکردنی ئەخلاقی خۆت حەول بدەی. پاشان ئەوانی دیکە وە بەرچاو بگرێو ئەگەر نەفامیک ئەم باسە بە جەفەنگ بزانێ، وەک کوێرێک وایە کە خێلیک لۆمە بکا. وە عاقڵ دەبێ لە دەسپێکی کاراندا ئەوپەری ئامانجو مەبەستەکانی خۆی دە بەرچاو بگرێو پێش ئەوەی ملی رێگا بگری، بزانێ دەچێتە کوێ. ئەگینا تووشی سەرسووڕماویو سەرەنجام هیلاکەتو پەشیمانی دەبێ. وە بۆ حاڵی پیاوی ئاوەزمەند ئەوە باشترە کە هەر دەم تەڵەبی رۆژی پەسڵان بەسەر دنیادا بە پێویستتر بزانێ. چونکە هەر چەندی هەودای ئەمەلو

ئارەزووی بۆ دنیا کورتتر بێ، لە کاتی بەجێهێشـــتنیدا حەسرەتی کەمتر دەبێ.
هەر وەها ئەو کەســـەی بۆ ئەو دنیا تێدەکۆشێ، مەخسوودو مورادەکانی دنیاش وە دەســـت دێنێو ژیانی هەتاهەتایی دەبێو ئەوەی کە هەر بۆ دنیا حەول دەدا ژیانی دەبێتە وەباڵی گەردنیو سەوابی ئەو دنیاشی لە دەست دەچێ. وە حەولو تێکۆشانی خەڵکی دنیا بە تێگەیشتنی سێ مەبەست دەرازێتەوە: وەسەر یەکنانی تۆشـــەی قیامەتو ئامادەکردنی ئامرازی مەعیشـــەتو ژیانو راگرتنی پێوەندی باش دەگەڵ جەماوەر، بە کەمئازاریو خۆپاراستن لە عەزیەدانی خەڵک.

وە پەسندترین ئەخلاقی خەڵکان تەقوایەو کۆکردنەوەی ماڵی دنیا لە رێگەی حـــەلاڵ. هەر چەند لە هیچ بارودۆخێکدا لە رەحمەتی پەروەردگار (عزّ اســـمە)و یارمەتـــی رۆژگار نابێ ناهومید بی؛ بەڵام متمانەکردنـــی تەواو بـــەم بـــڕوایـــەو وەلانـــانـــی تێکـــۆشـــــان لـــە عەقڵو بۆچوونی دروســـت، بەدوورە. چونکە بە هاوار گەیشـــتنی خێراتو هەموو جۆرە بەختەوەرییەک لەو کەســـە نزیکترە کە دە کاراندا خۆ راگرەو دە کەســـبو کاردا، تەلاشی پێویست نیشان دەدا. ئەگەر چەپگەردی گەردوون وای کرد، تەوەزەلێک بە پلەوپایەیەک گەیشت، یا غافلێکی نەزان سەرکەوتنێکی وەدەست هێنا، گوێی پێنەدا و لاسای ئەو نەکاتەوە، چون بەختەوەرو دەوڵەتیار دەتوانێ کەسێک بێ کە چاو لە رێوشوێنی ئاوەزمەندانو ماقـــوولان دەکا و هیچ کات لە تەوەکول دوور ناکەوێتەوەو گەورەیی تێکۆشـــان فەرامۆش ناکا.

وە باشترین کار ئەوەیە ئاکاری جوانی رابردووان بکەیە سەرمەشقو ئەزموونی پێشـــینیان وەک عـــادەت رەچاو بکەی. چونکە ئەگەر لـــە هەر کارێکدا رەوتو رەوشـــتی خۆت دەکار بێنی، عومرت بە زایە دەچێو تووشی مەینەت دەبی. با وەکوو دەڵێن لە هەر زیانێکدا سوودێک هەیە، بەڵام لە رووی هەڵسەنگاندندا، وا باشترە کە زیانی خەڵکی دیکە ببینیو لە ئەزموونەکانی ئەوان سوود وەربگری. چـــون ئەگەر لەم رێگایە لابدەی هەر رۆژ ناحەزیو نالەبارییەک دەبینیو کاتێک لە ئەزموونەکاندا بە ئاکامێک گەیشتی، کاتی رۆیشتنو کۆچبار بوونە.

وە هەر گیاندارێک لەم کارانەدا سستیو داماوی لە خۆی نیشان بدا لە کاری

ژیانو بەرێچووندا ناهومێدو لێقەوماوە. زایەکردنو لە دەستدانی دەرفەتو تەمبەڵیکردن لە کاتی نیازو حاجەتدا و تەسدیقی قسەوباسێک کە رەنگە درۆ بن یا راست، وە قیاسکردنی دەگەڵ قسەی ناماقووڵو قبووڵکردنی بە زۆریو گوێدان بە زبانلووسی مرۆڤی دووڕوو، دڵئێشکردنی خزمو کەسو کار، بە قسەی پیاوی مایەفیتنەو وەلانانی کرداری باشو خراپە بە چاکە ناسین. وە بە دوای ئاسکدا رۆیشتن بە هەوا و هەوەس ـ کە بۆ پیاوی عاقڵ هیچ هەڵەیەک وەک بە دوای هەوا و هەوەسدا چوون نییە ـ و لە مەیدانی یەقین لاڕێ بوونو دەرچوون.

وە هەر کاتێک رووداوەکان دەوراندەوری پیاوی عاقڵ دەگرن، دەبێ بە رێگەی دروستدا بڕوا، رێگەی هەڵە نەڕوا و ناوی خۆڕاگریو پتەوی پەیمانی لێ نەنێ. چون هەر کەس بێڕێنوێنو کوێرانە بە رێگەیەکی نەناسراودا بڕوا و لە شەقامە رێگای راست دوور کەوێتەوە هەر چەند زۆرتر بڕواتە بەرەوە، گومڕاترو سەر لێشێواوتر دەبێ.

وە ئەگەر دڕوو دە چاوی زۆرداری ملهۆڕ راچێ، لە دەرهێنانی کۆتایی بکا و گرینگی پێنەدا و چاوی داماڵێ، بێگومان کوێر دەبێ.

بۆ پیاوی ئاوەزمەند واجیبە باوەڕی بە قەزای ئاسمانی بێو لایەنی ئیحتیات فەرامۆش نەکا. هەر چی بە خۆی رەوا نابینێ، بۆ دیترانیشی بە رەوا نەزانێ. چون گومان لەوەدا نییە، هەر کردەوەیەک پاداشێکی هەیە. وە هەر کە وەختی خۆی هات ئەو پاداشە دەبیندرێو درەنگو زووی تێدا نییە.

وە، خوێنەرانی ئەم کتێبە پێویستە، لەسەر فەهمو تێگەیشتنی مەعنا و ناوەرۆک جەخت بکەنەوەو شکڵو حاڵەتی ئیستیعارە (خوازە)کان بناسن. تا لە کتێبو ئەزموونی دیکە بێنیاز بنو وەک ئەو کەسەی لێ نەیە کە لە تاریکیدا مستان دەوەشێنێو لە پشت دیوارەوە بەردان داوێ. پاشان پایەی کارانو تەدبیری بژێوی ژیانو رزگاری لە رۆژی مەعاددا لەسەر ناوەرۆکی ئەم کتێبە دابمەزرێنێ، تا رووناکی جەماڵی سوودو قازانجی ئەو کارەی بە تەواوی دەرکەوێو درێژەی قازانجەکانی بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ دەست بدا. و الله وليُّ

التوفیق لِما یرضیه بواسعِ فَضلِهِ و کَرَمِهِ.[1]

### قسەی کۆتایی کوڕی موقەفەع

ئێمە کە زانیمان خەڵکی پارس ئەم کتێبەیان لە زمانی هیندیڕا بە پەهلەوی وەرگێــڕا، ویســـتمان کە خەڵکی شـــامو حیجازو عێراقو بەغـــداش کەڵکی لێ وەربگرنو بە زبانی عەرەبی کە زبانی ئەوانە تەرجەمە کرا. وە کاتێک لەســـەر ئەوە ســـاغ بووینەوە تا ئەو جێگای بۆمـــان کرا بۆ حاڵیبوونی خوێندکاران، بۆ شـــەرحو شـــیکردنەوەی بابەتەکان تێکۆشـــاین. تا بۆ خوێندەواران، کەڵک لێ وەرگرتنو تێگەیشتنی ئاسان بێتەوە.

**اِنْ شاءالله تَعالی و لِلهِ الحَمْدُ اَوّلاً و آخِراً و الصَلاةُ علی نَبیِّهِ مُحَمدٍ ظاهِراً و باطِناً.**

---

١. خودا بە فەزڵو کەرەمی هەراوی خۆی؛ بە هەر شتێک کە لێی رازیو شادمان بێ، سەرکەوتن عەتا دەکا.

□

# برزوویەی تەبیب

برزوویە، گەورەترین تەبیبی پارس، ئاوا دەلێ: باوکی من سپایی بوو و دایکیشم لە بنەماڵەیەکی ئایینی زەردەشت بوو. یەکەم شتێ کە خوای مەزن بە منی بەخشی، خۆشەویستی دایکو باوکم بەرانبەر بە من بوو. تا ئەو جێگەی من لە برایانو خوشکان جیاواز بوومو زۆرتر بۆ پەروەردەکردنو بارهێنانم تێدەکۆشان. کە تەمەنم گەیشتە حەوت ساڵ، منیان بۆ خوێندنی زانستی پزیشکی هان دا، هەر کە هێندێک سەرەدەرم لێ دەرکردو گرینگی ئەو زانستەم لێ حاڵی بوو، بە ئیشتیا و شۆرو شەوقێکی راستو دروستەوە بۆ فێربوونی تێدەکۆشام تا لەو کارەدا نێوبانگێکم دەرکردو بە موداوا و چاکردنەوەی نەخۆشانەوە خەریک بووم. ئەوجار نەفسی خۆم لە هەڵبژاردنی چوار کاراندا، کە ئەهلی دنیا ناتوانن چاوپۆشی لێ بکەن، کرد بە سەرپشک: زۆرکردنی ماڵ، خۆش ڕابواردن، نێوبانگو لەسەرزاران بوون، خێری دوارۆژو قیامەت. ئەوەش نەشارینەوە کە زانستی پزیشکی لە هەموو دینەکاندا پەسند کراوە. لە کتێبە پزیشکییەکاندا هاتووە کە زاناترینی تەبیبان ئەو کەسەیە کە دە چارەسەرکردنی نەخۆشیدا بۆ تۆشەو خێراتی ئەو دنیاش تێکۆشێ. کە بە رەچاوکردنی ئەم رەوتە نەسیبی لە دنیا بە تەواوی دەست دەکەوێو رزگاری رۆژی پەسلانیش پاشەکەوت دەکا. وەک وەرزێرێک کە مەبەستی لە چاندنی تۆم دانەوێڵەیە کە قووتی ژیانیەتی، بەڵام کاش کە خواردنی ئاژەڵانە لە سایەی ئەم کارەوە حاسڵ دەبێ. سەرەنجام

بە تەواوی پێشـــوازیم لەم ئەرکە کردو لە هەر جێگایەک نەخۆشێک هەبوایە کە هیـــوای چاکبوونەوەی تێدا بەدی کرابا، لە بەرانبەر پاداشـــدا چاکم دەکردەوە. هەر وا کە چەندێک تێپەڕیو جەماعەتێکم لە هاوشـــوغڵەکانم لە پێشـــتر هاتە بەرچاو، نەفســـی تەماعکار هانی دام بەرەو کۆکردنەوەی ماڵی دنیا بڕۆمو چی وای نەمابوو کە پام هەڵخلیسکێ، لەو حاڵەتەدا رووم دەخۆم کردو گوتم:

ئـــەی نەفـــس، بە قازانجو زەرەری خـــۆت نازانی. پیاوی زانـــا چۆن بە دڵ ئارەزووی شـــتێک دەکا کە زەحمەتو دەردەســـەری زۆر بێو قازانجو کەڵک لێ وەرگرتنی کەم؟ ئەگەر لە عاقیبەتی کارو ڕۆیشـــتن بەرەو گۆڕ بە دروســـتی بیر بکەیتەوە، تەماعو هەوەسی ماڵی دنیاش بەسەر دەچێ. وە پتەوترین دەلیل بۆ تەرکی دنیا، دە بەرچاوگرتنی ئەو چەند کەســـە پەســـتو داماوەیە کە بە ماڵی دنیـــا لەخۆدەرچوونو مەغروورن. لەم بیرۆکە بێ خێرو بێرە دەســـت هەڵگرە. وە هیممـــەتو لێهاتوویی خۆت بۆ ئەنجامدانی کاری خێرو خێرات تەرخان بکە، کە رێگە ســـەختو دوورو قاقڕەو هاوڕێیان نەیارو کۆچکردن نزیکو کاتی بارگە تێکەوەپێچان نادیار. ئامان نەکەی لە تێکەوەپێچانی تۆشەی قیامەت غافڵ بی، کە زاتی بەنیئادەم زەرفێکی نامەحکەمەو پڕە لە خڵتو پیسایی بۆگەن لە چوار جۆری دژواز. وە ژیان وەک کۆڵەکەیەک رایگرتوون، وەک چۆن بوتێکی زێڕین بە بزمارێکەوە بەندەو ئەندامەکانی پێکەوە لکاون. کە هەر کات بزمارەکە دەرکێشین، بوتەکەش لەبەریەک دەچێو دەشـــکێ. هەر کاتیش لەش شـــایانی ئەوەی ئەما ژیان هەڵبگرێ، زۆر زوو، تێک دەڕووخێو لەناو دەچێ. وە بە هاودەمی دۆستو برادەرانیـــش مەنازەو زۆر بە دوای تێکەڵاوبـــوون دەگەڵیاندا مەبە. کە میوانیو جەژنەکانی لە شـــیوەنەکانی کەمترەو غەمی لە شـــادی لەسەرترە، وە دەگەڵ ئەوانـــەش دەردی دووریو ســـۆزی دوورکەوتنەوە چـــاوەڕوان کراوە. هەر وەها دەکرێ وابێ کە بۆ ئاسایشـــی ماڵو مناڵو ئامادەکردنی ویســـتی بەرێچوونیان، کۆکردنەوەی ماڵ پێویســـت بێو کەســـێک زاتی خۆی فیدای ئەوە بکا. دروست وەک ئەمە وایە عەتر لەســـەر ئاگر دابنێن، بەهرەی پژانی ئەم بۆنە بۆ خەڵکەو ماکەی بۆنەکە دەســـووتێ. وا باشترە کە لە چارەسەرکردندا زۆر وریا بیو گوێ

مـــەدە ئەوە کە خەڵـــک قەدری تەبیب نازانن، بەڵام تـــۆ بزانە ئەگەر تەوفیقت هەبێو کەسێک لە چەنگاڵی دەردو زەحمەت نەجات بدەی، لێبوردن لە گوناهانت دەســـتەبەر دەبێ. لە جێگایەک کە عالەمێک لە خۆشـــیو کەڵکوەرگرتنی نانو ئـــاو و ژیان دەگەڵ ژنو منداڵ، بێبەشـــنو بە نەخۆشـــی درێژخایەنو دەردی کوشندەوە دەناڵێنن، ئەگەر دە عیلاجکردنی ئەواندا بۆ پاداشی ئەو دنیا، تەلاش بکرێو ســـلامەتیو کەمکردنەوەی دەردو نارحەتیان مسۆگەر بێتەوە، بارستای خێرو ســـەوابی ئـــەم کارە دە حیســـاب نایە. وە ئەگەر کەســـێکی بێغیرەت، تەلاشـــێکی لەم چەشنە لەبەر تەماعی ماڵی دنیا پەک بخا، وەک ئەوە وایە کە: پیاوێک ماڵێکی پڕ لە عوودی هەبوو، فکری کردەوە ئەگەر وردەوردەو بە کێشان بیفرۆشم زۆر دەخایەنێو لە گۆترە بە نیوەقیمەت فرۆشتی.

کاتێک بەم شـــێوەیە لە دوژمنایەتی نەفسی خۆمدا زێدەڕۆییم کرد، هاتمەوە ســـەر ڕێگەی راستو بە مەیلێکی راســـتگۆیانەو حیسابو پاداشێکی بێڕیا، بە مالیجەکردنو موداوای نەخۆشـــانەوە سەرقاڵ بووم‌و ڕۆژگاری خۆم لەم ئەرکەدا نغرۆ کرد. تا بە بەرەکەتی ئەم ڕێبازە درگای رســـقو ڕۆزیم بەســـەردا کرایەوەو خەڵاتو دیاریو مەرحەمەتی پادشایان بە سەر مندا پەیتا پەیتا داباریو بەر لە ســـەفەری هێندووستانو پاش ئەویش ئەنواعی دۆستایەتیو کامەرانیو نیعمەتم بە نسیب بوو. تا ئەو رادەیە کە لە روانگەی ماڵی دنیا و پلەوپایەوە لە هەموو کـــەس باڵاتر بووم. پاش ئەوە لە بەرهەم‌و ئاســـەواری زانســـتی تەبابەتدا ورد بوومەوەو فایدەو ســـەمەرەکانیم لەســـەر پەردەی دڵم رەسم کرد. هیچ عیلاج‌و موداوایەکـــم پێ شـــک نەهات کـــە ببێتە مایەی عیلاجی ئەســـڵیو ببێتە هۆی بنەبڕبوونی تەواو و کەماڵی نەخۆشـــی. بە جۆرێک کە ئەم نەخۆشـــییە دیسان ســـەر هەڵنەداتەوە. وە چون میزاج بەمجۆرەیە، زانایان چۆنو بە چ پاســـاوێک دەتوانن خاترجەم بنو ئەم موداواکردنە بە سەبەبی شفا بزانن؟ وە کاری خێرو کۆکردنەوەی تۆشەی قیامەت کاتێک دەست دەدا کە لە موداواکردندا، نەخۆشی نەگەڕێتەوەو سەر هەڵنەداتەوە.

وە من بە پێی ئەم ســـەرەتایەی باسم کرد، دەســـتم لە تەبابەت هەڵگرتو

هیممەتو تەلاشی خۆم خستە سەر تەڵەبی دین. وە ئەلحەق ئەم ڕێگایەم درێژو بێپایان هاتە بەرچاو. سەراسەر خۆفـو تەنگەژە بوو. نە ڕێگا دیارو نە ڕێنوێنو ڕێبەر هەبوو. لە کتێبەکانی تەبابەتیشدا باسێک لەو ڕێگایە نەکراوە. کە بە هۆی ئەو باســانە ڕێگا بدۆزیتەوە یا لە بەندی ســەرگەردانی خۆت ڕزگار بکەی. وە خیلافـو جیاوازی بیروڕا لە نێو دینەکاندا زۆر ئاشکرا بوو. هێندێک بە شێوەیەکی میراتی دەســتیان بە چڵەدارێکی زەعیف گرتبوو، تایفەیەک لە ترسی گیانو بۆ ملکەچی لە بەرانبەر پادشــایاندا پایان لەســەر پێگەیەکــی لەرزۆکو ڕووخەک دانابوو، وە جەماعەتێک بۆ تەماعی ماڵو دەوڵەتی دنیا و بەرزی پلەوپایە دڵیان بە پشــتیوانەی دافەتاو یا ئێسکو پرووسکی داڕزیو خۆش کردبوو. وە دژایەتی نێوانیان لەمەڕ، ناســینی ئافرێنەر(خالق)و سەرەتای ئافراندنو کۆتایی کار لە ئەندازە بەدەر بوو و هەر یەکەیان ڕایان لەسەر ئەوە بوو کە ڕێبازی من دروستەو دوژمنم لەسەر هەڵەو خەتایە.

وە بەم فکرو بیرەوە ماوەیەک لە بیابانی سەرسووڕماویدا مامەوەو لە هەورازو نشێودا سەرگەردان بووم. نەمدەتوانی بزانم مەقسوودو مەقسەد لە کوێیەو نە بۆ ڕێگای ڕاستو حەق ڕێنوێنێکم دیتەوە. ناچار هەر وا کەوتمە ڕێ تا زانایانی هەر سنفێک ببینمو لە ئەسڵو فەرعی بیروبڕوایان بکۆڵمەوەو تێبکۆشم بە یەقینێکی پتەو، جێ پێیەکی دڵخواز، وە دەست بێنم. ئەم کارەشم ئەنجام دا و بارودۆخی باسو لێکۆڵینەوەم پێک هێنا. تێگەیشــتم هەر تایفەیەک قسەیان لەوە دەکرد کە دینی ئەوان باشترینەو بە دوورو درێژی قسەیان دەکردو گەلانی دیکەیان بە گومــڕا دەزانیو دژایەتیان دەگەڵ غەیری خۆیان دەکرد. لەم گەڕانەمدا، بە هیچ شێوە، دەرمانی دەردی خۆم نەدۆزیەوەو بۆم ڕوون بۆوە کە بێهوودە دەگەڵیان دانیشتوومو هیچ شتێکم لێ نەبیستن کە دەروونی ئەهلی ئاوەزو زانایی قبووڵی بــێ. فکرم کردەوە ئەگــەر لەمەو دوا بە دوای دووبەرەکــیو دژایەتی بیروڕای ئەمانەدا بڕۆمو قســەی ئەو غەرەزدارانە باوەڕ بکــەم وەک ئەو غافڵو نەزانەم بەسەر دێ کە دەڵێن:

شەوێک دەگەڵ هاوڕێکانی چوونە دزی، خاوەن ماڵ هەستی بە جووڵەجووڵیان

کردو بەخەبەر هاتو زانی کە دەزەکان لەسەر بانن. خێزانی بە سپا وەخەبەر هێنا و تێیگەیاند. ئەوجار فەرمووی: من خۆم دە خەو دەکەمو تۆش بە دەنگی بەرز، بە جۆرێک کە ئەوان گوێیان لێ بێ، قسەم دەگەڵ بکە. بە پێداگرییەوە لێم بپرسە ئەم هەموو ماڵو سامانەت لە کوێڕا هێناوە. ژن فەرمانی شووی دەکار هێنا و ئەو جۆرە کە قەرار داندرابوو پرسیاری دەکرد. شوووەکەی گوتی: لەم باسە بگەڕێ کە ئەگەر پێت بڵێم لەوانەیە کەسێک ببیستێو بە سەرمان وەر بێ. ژنە گەڕاوەو دەست بەردار نەبوو. پیاوەکە گوتی: ئەو ماڵو دەوڵەتەم لە ڕێگەی دزیکردنەوە کۆ کردۆتەوە. من لە دزیکردندا وەستا بوومو سیحرێکم دەزانی کە بەمجۆرە بوو. بە مانگەشەو، لەبن دیواری ماڵی دەوڵەمەندان رادەوستامو حەوت جاران دەمگوت: "شولەم، شولەم". پاشان دەستم دە تیشکی مانگەشەو وەردێنا و بە یەک حەرەکەت دەچوومە سەربانی ماڵەکە. حەوت جاری دیکە دەمگوت شولەم شولەمو بە تیشکی مانگەشەودا دەچوومە ناو ماڵو حەوت جاری دیکەش دەمگوت شولەم هەر چی پووڵو نەغدینەی ماڵەکە بوو، وەدیار دەکەوت. ئەوەندی توانیبام هەڵمدەگرت. حەوت جاری دیکەش دەمگوتەوە شولەمو بە تیشکی مانگە شەودا دەهاتمە دەرەوە. لە سایەی ئەم سیحرو ئەفسوونەوە نە کەس دەیتوانی بمبینێو نە کەس شکی دەکردم. وردە وردە ئەو ماڵو سەروەتەم وەدەست هێنا، بەڵام دەستم بە داوێنت ئەم ئەفسوونە فێری کەس نەکەی کە زیانو زەرەری زۆرە، دزەکان گوێیان لێبوو و لە خۆشی ئەوەی فێری ئەم لەفزانە بوون ئاگایان لە خۆ نەمابوو. سەعاتێک راوەستان، کە خاترجەم بوون خێزانی ئەو ماڵە خەوتوون، سەرۆکی دزان حەوت جار گوتی شولەمو پێی دەنا و کولاوکە (رەوزەن) نا و سەرەوبن بە عەرزیدا کەوت. خاوەن ماڵ دەستیدا چۆماغو نێوشانی کوتا و گوتی: تەواوی تەمەنم شانو پیلم کوتا و ماڵم کۆ کردەوە تا تۆی کافر دە توورەکەی بکەیو ببیەی؟

ئێستا بڵێ بزانم تۆ کێی؟ دز گوتی من ئەو نەزانە بێخەبەرەم کە قسەی گەرمو فریودەری تۆ بە بادی فەنایدا دام، تا هەوەسی بەرماڵ لە سەر ئاو راخستن، هاتە سەرمو وەک پووشوو ئاگر کەوتە جەستەمو ئەو بەڵایەم بەسەر

هات، ئێستاش شەقێکم تێهەڵدە با زەحمەت کەم بکەمو ملی خۆم بشکێنمو ون بم.

کورتی ببڕمەوە، بەم گەڕانو بەدوادا چوونەدا، یەقینو متمانە رووی خۆی نەنواند. بەخۆم گوت کە: ئەگەر لەسەر دینی رابردووان، بێ متمانەو یەقین رابوەستم وەک ئەو جادووگەرەم لێدێ کە درێژە بە کاری خراپ دەدا و بەپێی رەچاوکردنی رابردوو پێی وایە رزگار دەبێ. وە ئەگەر دووبارە لێکۆڵینەوەو بە دواداچوون دەست پێ بکەمەوە، تەمەنم مۆڵەت نادا کە ئەجەل نزیکەو ئەگەر لە سەرگەردانیو حیرەتیشدا بمێنمەوە هەلو فرسەت لە دەست دەچێو بێ ئامادەیی دەبێ کۆچبار بم. وە خێرو مەسڵەحەت لەوەدایە کە هەموو دەمێک هاورێی چاکەو کاری چاک بم کە ناوەرۆکی هەموو دینەکانەو روو دەوشتانە بکەم کە پەسندی عەقڵو ویستی سروشتی منە.

پاش ئەم بڕیارە، لە ئازاردانی گیاندارانو پیاو کوشتنو دەعیەو ئیفادەو تووڕەییو خەیانەتو دزی خۆم پاراست. لە هەواوهەوس دوور کەوتمەوەو هەوەسی ژنانم بە یەکجاری وەلا نا و زبانم لە درۆو بوختانو قسەی وا کە زیانو زەرەری پێوە بێ، گرێ دا. جنێو یا بوختانو غەیبەت بەسەر زبانمدا نەدەهات. بە واجیبم زانی لە ئازاردانی خەڵکانو دۆستایەتی دنیا و جادووگەریو کاری ناڕەوای دیکە خۆ بپارێزم. ویستی رەنجاندنی خەڵکم لە دڵ دەرهاویشت. وە بۆ گەیشتن بە خێراتی رۆژی هەستانەوەو قیامەتو سەوابی ئەو دنیا، هەرگیز بوختانم بەسەر زباندا نەهات. لە ناپاکان دوور کەوتمەوەو لە پیاوچاکان نزیک بوومەوە. مەسڵەحەتی خۆم لە داوێنپاکیدا دەزانی، هیچ هاورێو یارمەتیدەرێک وەک سەلاحو مەسڵەحەت نییە. وەدەست خستنی ئەوەش ئەگەر ئیرادە دەگەڵ تەوفیقی ئاسمانی متوربە بکرێ، ئاسانە. وە هەر چەندی لێی ببەخشی کەم نابێتەوەو لە دەکارهێنانیشدا کۆن نابێ، بەڵکوو رۆژ بە رۆژ رێکوپێکترو تەڕوتازەتر دەبێ. لەوەش ناترسێی پادشایان لێتی بستێنن. وە ئاوو ئاگرو جانەوەراتو دڕندەو بەڵای دیکە کاری تێناکەنو ئەگەر کەسێک لێی رووگەردان بێو خۆشییەکی کاتی ئەو کەسە لە کەسبی

خێـــراتو زەخیرەکردنی باشـــییەکان بێ بەش بکا و مـــاڵو عومری خۆی بۆ ئارەزووی دنیا خەرج بـــکا، دەبێتە ئەو بازرگانە کە: زێڕو جەواهێراتی زۆری هەبوو، پیاوێکی ڕۆژانە بە سەت دینار بە کرێ گرت کە ئەو زێڕو جەواهێرەی بۆ کون کا. کابرای کرێکار کاتێک لە ماڵی بازرگان دانیشت چاوی بە چەنگێک کەوت. بە وردی تێی دەڕوانی. بازرگان لێی پرسی: دەزانی لێی بدەی؟ گوتی دەزانم. تێیدا زۆر وەســـتا بوو. فەرموی لێـــی دە. کابرا هەڵیگرتو بەزمێکی خۆشی دەست پێکرد. بازرگان لەو بەزمەدا شادو سەرخۆش بوو. سندووقچەی جەواهێـــرات بە ئاوەڵایی لەوێ داندرابوو. کاتێک ڕۆژ گەیشـــتە کۆتایی کابرا داوای کرێـــی کرد. هەر چەند بازرگان گوتـــی کە جەواهێراتەکە هەر لە جێی خۆیەتیو بـــۆ کاری نەکردوو کرێ نادرێ، بێفایدە بوو. کرێکار دەر هەڵبوو، گوتی بەکرێکراوی خۆت بووەو تا پایانی ڕۆژ ئەوەی فەرمووت کردم. بازرگان بە ناچار کرێی دا بە کرێکارو بەسەرســـووڕماوی مایەوە. ڕۆژەکەی زایە ببوو، پووڵـــی بە هەدەر دابوو، جەواهێرات پرژوبـــڵاو، زەحمەتو کارەکەش هەر لە جێی خۆی.

پاش ئەوەی ســـەلاحو مەسڵەحەت بەم شێوەیە لە دڵمدا جێگیر بوو، ویستم روو دە عیبـــادەت بکـــەم تا زاهیرو باتینـــم بە عیلمو عەمـــەل بڕازێتەوە. وە چون ڕەنجی عیبادەتو عەفاف لە بەرەنگاری دەگەڵ شـــەڕاڕەتو خراپەدا زرێو مەتاڵێکی مەحکەمەو لە ڕاکێشانی خێردا بۆ لای خۆت کەمەندێکی درێژەو ئەگەر کەندوکۆســـپێک یا هەورازێکی توند بێتە پێـــش دەتوانی کەلکی لێ وەربگرێو دەســـتی پێ بگری. وە یەکێک لە قازانجەکانی تەقوا ئەوەیە کە دەتوانی بژیو حەســـرەتی نەمانو زەواڵی دنیا فەرامۆش بکەی، وە هەر کات پیاوی بە تەقوا بە وردی بڕوانیتە کاروبـــاری ئەم دنیا فانییەو ئەو نیعمەتە تێپەڕانە، بێگومان ناحەزیو قەباحەتی ئەوانە بە چاوی بەســـیرەت دەبینێو هەموو تەلاشی خۆی دەخاتە ســـەر، کەم ئازاریو هەموارکردنی ڕێگای قیامەتو بە قەزاوقەدەر ڕازی دەبـــێ، تا کەم غـــەم بێو دنیا تەڵاق بدا، تا لـــە دواهاتەکانی (تبعات) ڕزگاری بێو شـــەهوەتی دنیا وەلا بنێ، تا پاقژی زاتی بێتە دیو حەسەدو ئێرەیی فرێ

بدا، تا لە دڵاندا خۆشەویســـت بێو بەخشندەیی‌و ســـەخاوەت بکاتە دۆست تا حەســـرەتی ماڵو مەتاعی دنیا نەخوا و کارەکانی لەسەر تەوەرەی عەقڵ بەڕێوە بەرێت، تا لە پەشـــیمانی ئاســـوودە بێ. تا دەگەڵ یادی قیامەت تێکەڵاو بێو قاتیعو خۆ بەکەمزان بێ. وە بە هەورازو نشیوی رێ ئاشنا بێ تا لاقی دە بەرد هەڵنەنگێوێو خەڵکان نەترســـێنێ، تا بە ئەمینی بژی. هەر چەندی لە بەرهەمە باشـــەکانی پاکداوێنیدا زۆرتر دە قووڵەوە چووم، مەیلی من دە بەدەستهێنانیدا زێدەتر دەبوو. بەڵام دەترسام، چون وەلانانی شەهوەتو خۆشیو حەزی نەغدو ماڵی دنیا کارێکی زۆر ئەســـتەمەو شەرعکردنیش لەودا مەترسییەکی گەورەیە، چون ئەگەر کۆسپێک بێتە سەر رێ، مەسڵەحەتی دنیا و قیامەت زیانی پێدەگا.

وەک ئەو ســـەگەی کە لەســـەر لێواری جۆگە ئاوێک، ئێسکێکی دیتەوە، کە ئێســـکەکەی بە دمەوە گرت عەکســـی ئەوی لە ئاودا دیت، پێـــی وابوو، ئەوە ئێســـکێکی دیکەیە. تەماع گرتی، زاری کردەوە تا ئەویش لە ئاو دەرکێشـــێ. ئەوەی دە زاریدا بوو لە دەستی دا.

بـــە کورتی، چی وای نەمابوو کە ئەم هەراســـە، ناهومێـــدیو دڵتەنگیم بە ســـەردا زاڵ بکا و بە نووکە شەقێک دە نێو شەپۆلانی گومڕاهیو سەرلێشێواویم باوێژێو هەر دوو دنیام لە دەســـت بچێ. دووبارە بە قووڵی فکرم لە کاروباری دنیـــا کـــردەوەو رەنجو زەحمەتەکانیـــم هێنایەوە بەرچاو. بـــۆم روون بۆوە کە نیعمەتەکانـــی ئەم دنیایە وەک رووناکی برووســـکە، بێ دەوامو تێپەڕن. وە بە گشـــتی وەک ئاوی ســـوێر وایە کە هەر چەندی بیخۆیتەوە، تینووتر دەبی. یا وەک کووپەی پڕ لە شـــیرەی ژەهراوییە کە تامی شـــیرینە بەڵام عاقیبەتەکەی هیلاکەتە. یا وەک خەونێکی خۆش وایە کە دەیبینیو تێدا سەرمەســـتی، بەڵام کە بەخەبەر هاتیەوە، بێجگە لە حەسرەتو ئەفسووس چت پێ نامێنێ. ئادەمزاد دە کۆکردنـــەوەی ماڵو مەتاعی دنیـــادا وەک کرمی نێو پیلە وایە، هەر چەندی زۆرتری بتەنێ بەندی لی توندتر دەبێو رزگار نابێ.

ئەوجار، بەخۆم گوت ئەوەش دروست نییە کە جارجار لە دنیاوە بە هەڕەمە دەخۆم دەنووسێم بۆ قیامەتو جار جاریش لە قیامەتەوە بە غاردان دەگەڕێمەوە

بـــۆ دنیـــا. وە عەقڵی من لەم نێوەدا وەک داوەرێک وایـــە کە لە رووداوێکدا بە قازانجی هەر دوو لایەن حوکم دەدا.

ئەگەر لەســـەر دینی عاقڵانی. تەنیا دۆستێک بەســـە، چون هەر دڵێکیشت هەیە. ســـەرەنجام بڕیارم لەسەر عیبادەت دا. چون زەحمەتو رەنجی عیبادەت لە بەراوردکردن دەگەڵ رزگاری لە رۆژی پەســـڵاندا وەزنێکی نییە. لە حاڵێکدا حەزو خۆشـــی دنیا، بەو هەموو زەحمەتە کە بۆی دەکێشـــی، پایەدار نییە، لە راســـتیدا تاڵییەکی کەم کە میوەی شـــیرینو زۆر دەدا، باشـــترە لە شیرینیو خۆشـــییەکی کورت کە تاڵیو زەحمەتی زۆری بە دواوەیە. ئەگەر بە کەســـێک بڵێن کە دەبێ ســـەت ســـاڵ دە عەزابی بەردەوامدا بژی، بە جۆرێک کە رۆژانە دە جـــار ئازای بەدەنت لەتو پەت دەکـــەنو دووبارە وەک خۆی لێدەکەنەوە تا نەجاتی هەتاهەتاییت دەســـت کەوێ، دەبێ ئەم عەزابە قەبووڵ بکا و ئەو سەد ســـاڵە بە هیوای گەیشـــتن بە نیعمەتە ئەبەدییەکان، کەمتر لە سەعاتێک دێتە بەرچـــاو. ئەگەر چەند رۆژێک لە زەحمەتی عیبادەتو بەندی شـــەریعەتدا دەبێ ســـەبر پێویست بێ، پیاوی عاقڵ چۆن لێی رووگەردان دەبێو بە کارو ئەرکێکی زەحمەتو دژواری لە قەڵەم دەدا؟

وە دەبـــێ بزانین کە هەموو شـــوێنێکی ئەم دنیایە پڕە لـــە بەڵا و عەزابو ئادەمزاد لەو رۆژە کە دە رەحەمی دایکدا شـــکڵ دەگرێ تا کۆتایی تەمەن یەک کورتە ســـاتیش لە بەڵایان ئەمین نییە. چون لە کتێبەکانی زانســـتی تەبابەتدا دەگوتـــرێ کە ئەو ئاوەی ئەولادی لێ پەیـــدا دەبێ، کاتێک دەگاتە نێو رەحەم دەگەڵ نوتفەی ژن تێکەڵ دەبیو توند دەبێتەوەو رەنگی دەگۆڕێ.

بایەک دە زگ دەوەســـتێو ئەو ئاوە خەســـتە وە جووڵە دەخا تا وەک ئاوی پەنیری لێ دێ. پاشـــان وەک ماستی لێدێ. ئەوجار دابەش دەبێو ئەندامەکان دەڕوێن، کوڕ رووی دە پشـــتو کچ رووی دە لای زگدایە. دەســـتی مناڵ لەسەر نێوچاوانو چەنەگەی لە ســـەر ئەژنۆی، جێگیر دەبی. دەوروبەری وێک هاتووەو بەستراوە دەڵێی دە کیســـەیان ناوە. بە زۆری نەفەس دەکێشێ. لای سەرووی گەرمیو قورســـایی زگی دایکەو ژێرەوەی هەموو تاریکیو تەنگی، کە پێویست

بە گوتن ناکا. ئەوجار کە ماوەی مانەوەی ئەو تێدەپەڕیو زەمانی لەدایکبوونی منداڵ دەگا، رەحەم ژانێکی تێدەوەستێو منداڵ قەوەت دەدا بەخۆی تا سەری بەرەو شوێنی چوونە دەر، وەرچەرخێنێو تەنگی ئەو رەهەندەی پێیدا دەرباز دەبێ ئەوەندە زۆرە کە هیچ ئەشکەنجەیەک لەوە زۆرتر نییە. ئەگەر دەستی نەرم یا بایەکی فێنکی نەرمونیانی وێکەوێ، ئەوەندە بە ئێشو ژانە وەک ئەوە وایە پێست لە پیاو بکەنەوە. ئەوجار هەموو چەشنە بەڵا و نەخۆشی رووی تێدەکەن. لە کاتی برسیەتیو تینوێتیدا ناتوانی داوای خواردنو خواردنەوە بکا و ئەگەر تووشی دەردێک بێ ناتوانێ رایگەنێ. گێرەو کێشەی دە لانکنانو دەرهێنانیو پەڕوگۆڕینو شتی لەم چەشنەش هەر مەپرسە! وە کاتێک رۆژانی شیرخواردن کۆتایی پێهات، دە چەرمەسەرەی گەورەکردنو بارهێنان دەکەوێو دەردو ئازارو نەخۆشی پەیتا پەیتا دێو بڕانەوەی نییە.

وە پاش بلووغو گەورەبوون غەمی ژنو منداڵو تەماعی ماڵی دنیا و کاری پڕ لە مەترسی کاسبیو بەرێچوون دەست پێدەکا و دەگەڵ ئەو هەموو پەتایەدا چوار دوژمنی دژوارە لە سروشت دەگەڵی دەبنە هاوڕێ، بەڵکوو هاوخەوی دەستەملان، ئافەتی لاوەکی وەک کرمو مارو دووپشکو جانەوەری دڕندەو گەرما و سەرما و بەفرو بووراںو بارانو برووسکەو رەعدو نابوودی لە نەکاو، بۆی دە بۆسە دان. ئەوجار عەزابو دەردی پیری ـ ئەگەر بگاتە پیری ـ و سستیو بێتاقەتی لە هەمووی خراپتر. قەستی دوژمنانی خیرەسەرو نییەتی خراپی نەیاران بە شوێنیدا دەگەڕێن. وە زمانێک کە ئەم پەتا و بەڵایانە هیچ کامیان لە ئارادا نینو هەلومەرجو بارودۆخ بۆ ژیانێکی پتەو ئامادەیە، یادکردنەوەی ئەو دەمەی کە وەعدەی مردن دێو دەبێ دۆستانو ماڵو منداڵان بەجێ بێلێو ماڵاواییان لێ بکەیو شەربەتی تاڵی مەرگ بچێژی، هەموو خۆشەویستی دنیات لە دڵدا سارد دەبێتەوە هیچ عاقڵێک تەمەنی خۆی لە دنیاویستیدا بەفیڕۆ نادا. چونکە سەوداکردنی مانو نەمانو هەتاهەتایی دەگەڵ کاتی، دێوانەییو شێتییەکی گەورەیەو مەغموونبوونێکی تەواوە. گیانی پاک بە قوربانی لەشێکی پیسو پۆخڵکردن، کارێکی سەکرانەیە.

بـــە کورتـــی لەم رۆژگارە تاریکـــەدا کە خێراتو چاکە لە ســـەر یەک رووی لــە کەمییەو هیمەتـــی خەڵکان دە کاری خێرو حەســـەناتدا کورتی هێناوە، با وەکوو پادشای عادڵ، نەوشیروانی کەسرای کوڕی قوباد، خاوەنی بەختەوەریو گەورەییو عەقڵی لەسەرو بیروبڕوای پتەو و هیمەتی بڵندو ورەی بەرزو کەماڵی راستیو قســـەی دروســـتو عەدڵو دادپەروەری دنیاگرو میهرەبانیو دلۆڤانیو بەرەکەتی ســـەخاوەتو بڵاوکردنەوەی رەحمەتو بەهرەی زانســـتو حیکمەتەو ئاگاداری حاڵی زانایـــانو تەمێکردنی زاڵمانو ملهوڕانو بارهێنانی خزمەتکارانو کوشـــتو بڕی زۆردارانو لایەنگری ســـتەملێکراوانو بێئەنوایانـــە، دەبینم کە کاروباری زەمانە رووی لە ناخۆشـــیو رۆژەڕەشـــییەو خێراتو چاکە ماڵاوایی لە خەڵکان کردووەو کاری باشو ئەخلاقی پەسندکراو لە ناو چووەو رێگەی راست بەســـتراوەو رێگەی گومڕاییو سەرلێشـــێواوی کراوەیەو دادپەروەری نابیندرێو زوڵمو زۆری لەچاو دەدا و عیلمو زانســـت تەرک کراوەو نەزانی ویستی خەڵکە. پەستیو ناکەســـی زاڵو پیاوەتیو مروەت شاراوەو دۆستایەتی کزو دوژمنایەتی بەهێز، جوامێرو پیاوخاســـان نەخۆشو زەلیلو بەدکارەو پیاوخراپان ئاسوودەو رێـــز لێ گیراو، مەکرو حیلە، بێدارو ئازادەیـــیو وەفا دە خەودا، درۆ کاریگەرو پرسوودو راستی وەلانراو و دوورکەوتە. حەق هەڵاتوو و ناحەق سەرکەوتوو. وە دوای هەوا و هەوەس کەوتن باوەو دە ژێرپێنانی ئەوەی عەقڵ فەرمانی لەســـەر دەدا، رەوا. وە مەزڵوومـــی بەرحەق زەلیلو زاڵمی ناحـــەق جـــەلیـــل، تـــەمـــاع غـــاڵـــبو قەناعەت مەغلووب. وە زەمانـــەی غەددار بەو حاڵەتانە دڵخۆشو بە وەدەستهێنانی ئەم حاڵو هەوایە کەیفی سازەو دڵی خۆشە.

کاتێک فکرو بیری من بەم شێوەیە لە ئاکاری دنیا بە تەواوی شارەزا بوو، وە تێگەیشـــتم کە ئادەمزاد خۆشەویستترینو شەریفترینی بوونەوەرانە، وە قەدری رۆژانی خۆی نازانێو بۆ رزگاری نەفسی خۆی حەولێک نادا، لە دیتنی ئەم حاڵە ســـەرم سووڕما و کە باش تێفکریم، تێگەیشـــتم مانیعو کۆسپی سەر رێی ئەم بەختەوەرییە، ئاســـوودەییەکی کەمو گەیشتن بە ئارەزووی گچکەو بێ بایەخە. کە خەڵک گیرۆدەی بووە، ئەوەش حەزو خۆشی هەستەکانە، خواردن، بۆنکردن،

دیتنو لەمســـکردنو بیســـتن، ئەم داخوازیانەش هیچ کات بە بارستای پێویست دەست ناکەون. لە زەواڵو فەنابوونیش ناپارێزرێن. وە ئەگەریش وەدەست کەون، زیانـــی دنیا و قیامەتی تێدایە. وە هەر کـــەس هەموو توانای خۆی لەم رێگەدا دەکار بێنێو گرینگییەکانی دوا رۆژ وەپشت گوێ بخا وەک: ئەو کابرایەی بەسەر دێ کە لە ترسی وشتری مەست هەڵاتو خۆی دە چاڵاوێکدا هەڵواسیو دەستی بە دوو چڵ دار گرتبوو کە لەسەر چاڵاوەکە روابوونو لاقیشی لە سەر پێگەیەک دانابوو. لەو حاڵەتەدا باشـــتری چاو لێکرد، هەر دوو پێی لەســـەر سەری چوار مار دانابوو کە سەریان لە کونەکانیان دەرهێنابوو. چاوی لەبنی چاڵاوەکە کرد، ئەژدەهایەکی ســـامناک زاری داپچڕیبوو و چاوەڕوانی کەوتنی بوو. سەرنجێکی دا دەرەوەی چاڵاو، مشـــکی رەشو ســـپی وەک ماران خەریکی قرتاندنو بڕینی ریشەی دارەکان بوون. وە کابرا لەم رۆژە رەشییەدا تەدبیری دەکردو بە شوێن رێگا چارەیەکدا دەگەڕا. لەبەر دەمی خۆی کەندوویەکی چووکەی مێشهەنگوینی چاو پێکـــەوتو کەمێکی هەنگوین تێدا دیتەوە. هێندێکی لەســـەر لێوی دانا و ئەوەنـــدەی پێ خۆشبوو کە ئاگای لە کاری خۆی نەما و لە بیری چوو کە پای لەســـەر ســـەری چوار مار داناوەو نازانێ کەی وەجووڵە دەکەونو مشکەکانیش وەک ماران خەریکی بڕینی چڵە دارەکان بوونو راوەســـتانیان نەبوو. وە کاتێک چڵەدار شـــکا، ئەویش کەوتە ناو زاری ئەژدەهاوە، ئەو حەزو خۆشـــییە کەمە، ئەوی تووشی وەها غەفڵەتێک کردو پەردەی رەشی لە بەرانبەر رووناکی عەقڵی ئەودا راگرت، تا مشـــکەکان بڕینی چڵەکانیان تەواو کردو بێ ئەنوای بە تەماع دە زاری ئەژدەها کەوت.

کە وابوو، من دنیام بەو چاڵاوە پڕ مەترسییە شوبهاندو مشکانی رەشو سپیو بڕینی بێوچانی چڵەکانم بە شـــەو و رۆژ چوواند کە بە دوای یەکدیدا هاتنیان بۆ لەناوبردنی گیانـــدارانو نزیککردنەوەی ئەجەلیان دە بەرچاو گیراوە. وە ئەو چوار مارە سروشـــتەکانی ئادەمزادن کە مۆرەی پشـــتی ئافراندنی ئادەمزادە، هەر کات یەکێک لەوان بجووڵێ ژەهری کوشـــندەو مەرگ حازرە. وە چەشـــتنی ئەو بڕووکە هەنگوینەشـــم بە خۆشییەکانی ئەم دنیایە داناوە کە سوودی کەمەو

دەردو مەینەتی زۆرە... مرۆڤ لە کاری قیامەت دەگێڕێتەوەو ڕێگەی نەجاتی لێ دەبەستێ. وە ئەژدەهاش بە شوێنی گەڕانەوە کە بە هیچ فکرو لێکدانەوەیەک چاری ناکرێ وە کاتێک شەربەتی مەرگ هەڵقوڕێندرا و زەبری کوشندەی بوویەحیا[1] دروودو سەلامی خودای لێ بێ وەشێنرا، بە ناچار دەبێ ڕەگەڵی کەوێ، ترسو خۆفو مەترسیو هاوارو قیژەی ئەو ببینێ. ئەو کات پەشیمانی بێ فایدەیەو تۆبەو گەڕانەوە بە کار نایە. نە ڕێگەی گەڕانەوە هەیەو نە عوزرو بەهانە سوودێکی هەیە.

سەرتان نەیەشێنم کاری من گەیشتە ئەو جێگایە کە بە قەزای ئاسمانی رازی بم‌و ئەوەندەی لە توانامدا بوو کاروباری قیامەتم بە ئەنجام گەیاندو بەو هیوایە دەژیام کە بەڵکوو بگەمە زەمانێک کە لەودا ڕێنوێنێکم دەست کەوێو یارێکو ڕێ نیشاندەرێکم هەبێ، تا ئەوەی کە سەفەری هێندووستان هاتە پێشو ڕۆیشتم. لەوێش ئەرکو کاری باسو لێکۆڵینەوەم تا ئەو جێگەی لە تواناما بوو جێبەجێ کردو کاتێ گەڕامەوە زۆر کتێبم دەگەڵ خۆم هێنا کە یەکێک لەوان "کلیلەودیمنە"یەو خودای مەزن لە هەموو کەس گەورەترو زاناترە.

---

١. بوویەحیا (بویحیی): مەلەکەلمەوت، عیزرائیل.

## ١
# شێرو گا

رای هێندی به بەرەهمەنی گوت: له بۆم باس بکه، مەسەلەی دوو کەسان که دۆستی یەکترنو به بۆ تێچاندنی شۆفاری غایەن ئەم دۆستایەتییه تێک دەچنو کار دەکێشێته لێک دوورکەوتنەوەو دوژمنایەتی.

بەرەهمەن گوتی: هەر کات شـــوبرو شۆفارێک بکەوێته نێوان دوو دۆستانو قســـەو باســـان بێننو بەرێ، بێگومان ئەو دۆستانه لێک دەترازێن، بۆ نموونه، بەسەرهاتێکه که دەڵێن:

بازرگانێک بوو، زۆر دەوڵەمەند. منداڵەکانی گەورەبوونو دەســـتیان بۆ کارو کاســـبی نەدەچوو. له کارو تەلاش رووگەردانو سەرگەردان، وردەوردە دەستیان بۆ ماڵو داهاتی باوکیان درێژ کردو شەشو بێش پێیاندا دەدا. باوک به پێویستی زانی ســـەرکۆنەیان بکا و پەندو ئامۆژگاری پێویســـتیان پێبدا. کۆی کردنەوەو پێی گوتن: رۆڵەکانم، ئەهلی دنیا به دوای سێ جێگەو پێگەدا دەگەڕێنو پێشی ناگەن مەگەر چوار خەسڵەتیان هەبێ، جا ئەو سێ مەتڵەبەی به دوایدا دەگەڕێن ئەوانەن؛ دەسترۆیشتوویی‌و به ئێروبوون له مەعیشەتدا، پایەبەرزیو پلەوپایەو گەیشـــتن به خێراتی رۆژی پەســـڵانو قیامەت. ئەو چوار خەســـڵەتەش که به هۆیانەوە دەگەنه ئەم مەبەستانه ئەوانەن: کۆکردنەوەی ماڵ به رێگەی دروستو پەســـندکراودا، وە بەرنامەی دروســـت بۆ راگرتنی ماڵو بەخشین، بەو مەرجەی مەســـڵەحـــەتـــی بـــەرێچـــوونـــی تێـــدا بـــێو رەزامەندی ئەهلو عەیالیش حاسڵ

بێ. وە تـۆشـەی قیامەتو ئاگاداریو پاراستنی نەفس لە بەڵا و ڕووداوی ڕۆژگار، تا ئەو جێگەی بۆت بکرێ. وە هەر کەس لەم چوار خەسڵەتە یەکیان بخاتە پشت گوێ، زەمانە پەردەی دژایەتی لە بەرانبەر مرادو خوازەکانی ئەو رادەگرێ. چونکا هەر کەس لە کەسـابەت ڕووگەردان بێ، نە خۆی پێ بەڕێ دەچێو نە دەتوانێ کەسـانی دیکە وەخۆ بگرێ، وە ئەگەر ماڵ وەدەست بێنێو بۆ زۆرکردنی تەلاش نەکا، زوو فەقیر دەبێ. سـەرمایەو سـامان هەر چەند چکەچکەش خەرج بکرێ ئاخری تەواو دەبێ. وە ئەگەر لە زیادکردنو راگرتنی ئەودا زۆر تێکۆشێو خەرجی لەخۆڕایی بکا، تووشـی پەشـیمانی دەبێو زبانی لۆمەو لەقەمی لێ دەکرێتەوە، وە ئەگەر بەجێ خەرج نەکا هەر وەک بێنەوایەکی لێدی کە لە خۆشـییەکانی دنیا بێ بەشـە. وە دەگەڵ ئەو هەموو تەقدیرو قەزا ئاسـمانییانەو ڕووداوانەی ڕۆژگار کە لە ئارادان، ئەگەر سامانەکەی بخاتە بەر بڵاوکردنەوەو بەتاڵاندن، وەک حەوزێک کە هەموو کات ئاوی دێتە نێو و ئاوەڕۆکەی ئەوەندە نەکێشێ کە دێنە ناوی، ناچار بە قەراغاندا ئاوەکە ڕێی خۆی دەکاتەوەو هەڵدەڕژێو لێی دەچێ یا کەلێنێکی گەورە دەکاتەوەو حەوز ئاوی تێدا نامێنێ.

کوڕانی بازرگان ڕێنوێنییەکانی باوکیان بیستو قازانجەکانی ئەم نەسیحەتانەیان بە تەواوی ناسـی. برا گەورەکەیان ڕووی دە بازرگانی کردو سـەفەری دووری کەوتە بەر. دوو گای دەگەڵ خۆی برد یەکیان ناوی **شەنزەبە** بوو، ئەوی دیکەش **نەندەبە**. لە ڕێگادا تووشـی زەلکاوێک هاتن. شـەنزەبە دەوێدا عاسیە بوو. بە فێڵو تەڵەکە هەر چۆنێک بوو هێنایانەوە دەر. بەڵام توانایی ڕۆیشـتنی نەبوو. بازرگان پیاوێکی بۆ بەکرێ گرت کە ئاگاداری بکا و کە قەوەی گرتەوە بە دوایدا بڕوا. کابرای بەکرێگیراو ڕۆژێک لەوێ مایەوە، حەوسـەلەو تاقەتی بەسەرچوو. شەنزەبەی بەجێهێشتو بە بازرگانی گوت، مندار بۆتەوە.

شـەنزەبە هێندێک بووژایەوەو خۆی گرتەوەو بـە دوای لەوەڕدا دەگەڕا، تا گەیشـتە مێـرگو مێرغوزارێک کە بە هەموو چەشـنە ڕووەکو گیایەکو گوڵو ریحان ڕازابـۆوە. ئەوەندە جوانو زەنوێر، لە بەغیلی، چاوی بەهەشـت کوێرو بەدیتنی ئاسمان سەرسامو هێڕ.

لــە هـــەر لاوە گۆمیلکـــە هـــەر وەک گـــوڵاو
مەلـــەی قـــازو بۆرچیـــن لـــە چۆمو شـــەتاو[1]

شەنزەبە ئەو مێرگەی زۆر پێخۆش بوو و لەوێ مایەوە، چون گوتوویانە: و اذا انتَهَیتَ الی السَــلامَةُ فی مَداکَ فَلا تُجاوز[2]. وە پێشینیان گوتوویانە کە اِذا أعْشَبَتْ فَانْــزِلْ[3]، پـــاش ماوەیەک مانەوە، قەڵەو بۆوەو قەوەتی گرتەوە. سەرمەســـتیو بێپەروایـــی تێدا بەدیهات، وە بە شـــادیو بە خۆ نازینێکـــەوە بە دەنگی بڵند بۆڕاندی. لە نزیک ئەم مێرگو مێرغوزارە شـــێرێک دەژیا کە جانەوەری وەحشیو کێوی زۆری بەدەورەوە بوو. هەموو دە ژێر فەرمانی ئەودا بوون. ئەویش جحێڵو رەعنا و ملهۆڕو سەرەڕۆ. هەرگیز گای نەدیتبوو، هەرگیز بۆڕەی نەبیستبوو. هەر کە دەنگی شـــەنزەبەی بیست لە ترسان لە خۆ میست. نەیدەویست جانەوەرانی دەوروبەری بەو ترسە بزانن، کروشمەی کردو بێدەنگ لە جێی خۆی نەدەبزووتو بۆ هیچ لایەک نەدەچوو.

لە نێو داروەدستەی ئەودا دوو رێوی هەبوون، یەکیان ناوی کلیلەو ئەوی تر دێمنە بوو. هەر دوو زۆر زیرەکو لێهاتوو بوون. دێمنە بە تەماعترو خۆبەزلزانتر بوو. بە کلیلەی گوت، چۆن لە پادشـــا حاڵی، کە لە گۆشەیەک قوونی داداوە، کزو داماوەو هەستو خوستی لێبڕاوە. کەس نازانێ چی لێ قەوماوەو بڕەمبڕەمی جارانی نەماوە! کلیلە گوتی، ئەم قســـە بۆ تۆ نابێ، تۆ چت بەم باســـە داوە؟ ئێمە لەبەر درگای پادشـــا دە ئاســـایش داینو توعمەیەک دەخۆینو لەو چینە نین کە بتوانین بە نزیکیو ئاخاوتن دەگەڵ پادشایان، سەربەرز بین، تا رێگەی حزوورمان بدەنو قســـەمان گوێبیســـت بن. لەو قسەی گەڕێ کە هەر کەس بە زۆرو زەحمەت بیەوێ کارێک جێبەجێ کا کە دە شـــانو شەوکەتی ئەودا نییەو شـــایانی ئەو ئەرکە نەبێ، ئەو بەڵایەی بەســـەر دێ کە بەسەر مەیموون هات، دێمنە گوتی: چۆن؟

گوتی: مەیموونێک دارتاشـــێکی چاو پێکەوت کە لە ســـەر دارێک دانیشتبوو

١. به هر سو یکی آبدان چون گلاب / شناور شده ماغ بر روی آب.
٢. کاتێک گەیشتیتە شوێنی سلامەت لێی تێپەڕ مەبە.
٣. کە گەیشتیەتە جێگەی سەوز راوەستە.

خەریکی بڕینەوەی بوو، دوو بزماریشی لە لا بوو، هەر کات بزمارێکیانی دەکوتا ئەوەی تری کە دە پێشــدا کوتابووی، هەڵدەکێشــاوە، لەو کاتەدا دارتاش بۆ حاجەتێک دەرکەوت. مەیموون لە ســەر دارەکە، لەو جەمســەرەی کە بڕابۆوە، دانیشت. هەر دوو گونی لە نێو قەڵشتی دارەکەدا هەڵاوەسرابوونو ئەو بزمارەی کە داکوترابوو، پێش ئەوەی، ئەوی دیکە بکوتی، هەڵکێشا. هەر دوو لای دارەکە پێکەوە جووت بوونو گونەکانی دەبەینی هەر دوو بەشــی دارەکەدا گیری کرد، لەبەر ئێشو ئازاری گونی لــە هۆش چوو. دارتاش گەڕاوەو مەیموونی ئەوەندە کوتا تا تۆپی. هەر لێرەوەڕا گوتوویانە "مەیموونو دارتاشییان نەگوتووە!"

دیمنە گوتی: تێگەیشتم، بەڵام هەر کەس لە پادشایان نزیک بێتەوە، هەر بۆ ئەوە نییە بەرێچوونو بژێوی دەســت کەوێ، چون ورگ لە هەر شوێنێک بێ بە شــتێک پڕ هەر دەکرێ. فایدەی نزیکی لە گەورە پیاوان ئەوەیە قەدرو قوتبت وەســەر کەوێو ئاگاداری لە دۆستان بکەیو دوژمنان سەرکوت. قەناعەتیش لە کەمهیممەتیو بێمروەتییەوە سەرچاوە دەگرێ.

وا دەڵــێ کاک ئەحمــەدی قازی

خوێڕییــە پیــاوی قانیــعو رازی[1]

وە هەر کەس بە دوای پاروو(طعمە)دا وێڵە، بە ئاژەڵ حیسابە. وەک سەگی برســی کە بە کوتە ئێسکێک شاگەشــکەو بە ورکە نانێک رازییە، چاو لە شێر کە، ئەگەر لە گرتنی کەروێشکدا چاوی بە گوڕەکەرێک بکەوێ، کەروێشک بەجێ دێڵێو بۆ گوڕەکە دەچێ.

گــەر دەخــوازی پێگەیــەک بــەرزو گرینــک

تــۆ وەرەی بــازت هەبــێو زەبــری پڵنــگ[2]

وە هــەر کەس بکاتە پلەی بەرز، با وەک گــوڵ تەمەنکورتیش بێ، عاقڵان لەرووی جوانی ئاســەوارو یادی بەخێر کە لێی دەکرێ، بە تەمەندرێژی دەزانن

---

١. ئەم دوو شێعرە لە دەقی کلیلەو دەمنەی فارسیدا هاتوون کە نێوی شاعیرەکانیان باس نەکراوە، وەرگێڕ لە دەقی کوردییەکەدا بۆ رازاندنەوەی بابەتەکان جارویار هۆنراوەیەک نزیک بە ناوەڕۆکی شێعرە فارسییەکان دەخاتە ناو وەرگێڕانەکە. از دنائت شُمر قناعت را / همتت را، که نام کردەست آز؟

٢. با همت باز باش و با رای پلنگ / زیبا به گهِ شکار و پیروز به جنگ.

ئەو کەســەش کە بە کەمو کورتێک رازییە، با وەک گەڵای سەرویش زۆر بمێنێ لە لای زانایان وەزنێکی نییە.

کلیلە گوتی: گوێم دا فەرمایشتەکانت، بەڵام بگەڕێوە لای عەقڵی خۆتو بزانە کــە هەر تایفەیەک جێگەی تایبەتــی خۆی هەیە. وە ئێمەش لەو چینە نین کە شایانی ئەو رێزو حورمەتە بینو بەدوایدا بڕۆین.

دێمنە گوتی: "خاوەن هیممەتــانو جوامێران لە پێوەندی دەگەڵ پلەوپایەو سەرکەوتنندا، هەم هاوفکرنو هەم جیاوازی بیروڕاشیان هەیە. هەر کەس نەفسی شــەریفی هەبێ، خۆی لە پێگەی خــواروو دەگەیەنێتە پلەوپایەی بەرزو بڵند". وە هــەر کەس، بڕوای کــزو عەقڵی کورت بینو نزمە، لــە پلەوپایەی بەرزەوە بەرەو خوار دادەگەڕێ. وە ســەرکەوتن بۆ روتبەی باڵا زەحمەتی زۆرەو دابەزین لە بەرزییەوە بۆ نزمی زیانو رووداوی کەم، بەردی گەورە بەرزکردنەوە بۆ سەر شــان زەحمەتی زۆری دەوێو بێزەحمەتی زۆر، دەتوانی بیخەیتە خوارەوە. وە هەر کەس لە وەدەستهێنانی گەورەییدا یارمەتیو هاوکاری پیاوی بەرزەفڕ نەکا، عوزری رەوایە کە گوتوویانە اذا عَظُم المطلوب قَلَّ المُساعِد.[۱]

وە ئێمە شایانی ئەوەین پلەوپایەی بەرز وەریگرینو بەو پلە نزمیو پەستییە رازی نەبین.

کلیلە گوتی: دەتەوێ چ بکەی؟

گوتــی: من دەمەوێ لەم دەرفەتەدا خۆم بە شــێر بناســێنم، کە تووشــی دوودڵیو سەرلێشــێواوی بووە. بە رێنوێنیو نسحەتی من هێندێک دەکرێتەوە. بەمجۆرە لە لای ئەو پلەوپایەیەکم گیر دەکەوێ.

کلیلە گوتی: چۆن دەزانی کە شێر لە بارێکی خەمۆکیو سەرگەردانی دایە؟

گوتی: بە عەقڵو زانایی خۆم ئاســەوارو هۆکارەکانی دەبینم. کە پیاوی زانا بە دیتنی رواڵەت لە دەروونی دیتران حاڵی دەبێ.

کلیلە گوتی: باشــە، چۆن خۆت لە شێر نزیک دەکەیتەوە؟ خۆ تۆ خزمەتی پادشایانت نەکردووەو رێوشوێنی ئەو کارە نازانی.

---

۱. ئەرکاتەی مەبەست گەورە بوو، یاریدەر کەم دەبن.

دیمنە گوتی: ئەگەر مرۆڤ زانا و بەتوانا بێ، ئەنجامی کاری گەورەو هەڵگرتنی باری گران نایبەزێنێ. وە خاوەن ورەی ڕووناکبیر لە کاراندا کورتی ناهێنێو بۆ پیاوی عاقڵیش تەنیاییو غوربەت زیانی نابێ.

کلیلە گوتی: پادشا، بە گشتی ئەهلی زانستو مروەت، زۆر ناخاتە بەر کەرەمو رەحمەتی خۆی. بەڵام ڕوو دەکاتە نزیکانی خۆی کە لە خزمەتیدا لە قەدیمەوە پلەوپایەی میراتییان هەیەو لەبەر هۆی پەسندکراو، ڕێزیان هەیە. وەک توولەی مێو کە ناچێتە سەر داری بەرزو بلندو پڕ بەرو هەر چی لێی نزیک بێ، لێی دەهاڵێ.

دیمنە گوتی: هاوڕێیانی سوڵتانو بابو باپیرانیان هەمیشە ئەم پلەوپایەیان نەبووە، بەڵکوو بە مروری زەمان، وردەوردە بە تەلاشو تێکۆشان گەیشتوونەتە پلەوپایە. منیش هەر ئەوە دەکەمو لەم ڕێگایەوە دەچمە بەرەوە.

هەر کەس خزمەتی دەرباری پادشایان بکا و لە کێشانی باری مەینەتو کاری زەحمەتو خواردنەوەی شەربەتی تاڵو ناخۆش ڕووگەردان نەبێ، گوڕمی سوتێنەری ئاگری تووڕە بە ئاوی سەبرو حەوسەلە دامرکێنێو شەیتانی هەوا و هەوەس بە ئەفسوونی ئاوەز لەغاو بکا و تەماعو زێدەخوازی فریودەر بەسەر عەقڵی ڕێنیشاندەردا زاڵ نەکا، بنەمای کار لەسەر دەستکورتیو بیرۆکەی ڕاست هەڵچنێو دەگەڵ ڕووداوان مودارا بکا و هەڵسوکەوتی عاقڵانە بێ، بەمجۆرە بە مەبەستو مرادی خۆی دەگا و بەختەوەری دە جلوبەرگی ڕازاوەدا دێتە پێشوازی.

کلیلە گوتی: گریمان لە پادشا نزیک بوویەوە، چۆن دەکەویە بەر نەزەریو چۆنو بە چ دەلیلێک بە پلەو پایەیەک دەگەی؟

گوتی: ئەگەر بتوانم لێی نزیک ببمەوە، لە قووڵایی دڵمەوەو بە هەموو تواناوە خزمەتی دەکەمو هەر چی فەرمووی وادەکەمو بە مەیلو هەوای ئەو هەڵسوکەوت دەکەم، خۆم لە لۆمەکردنو ناحەزی ئەحواڵو ئاکاری دەپارێزم. ئەگەر کارێکی کردو بە مەسڵەحەتی موڵک بوو، ئەوەندەی پێ هەڵدەڵێم کە ئەنجامی کارەکەی لەبەر شیرین بێو زۆرتر دە خۆی ڕاببینێو بە ورەی بەرزەوە ئەنجامی بدا. ئەگەر ڕوو دە کارێک بکا کە سەرەنجامەکەی کارەسات بێو شەڕو زیانو زەرەی بۆ

مەملەکـــەتو ژیانی خۆی لێ بکەوێتەوە، بـــە تەدبیرو بە نەرمو نیانییەکی زۆرو بە خۆبەکەمزانینی بێ ســـنوورەوە، لە بەرهەمی شوومو وێرانگەری بڕیارەکەی ئـــاگاداری دەکەمەوە. بە جۆرێک کە لە هیچ نۆکەرو خزمەتکارێکی دیکە ئەوەی نەدیبێ. بزانە کە پیاوی عاقڵی زیانچەورو قسەزان ئەگەر بیەوێ، کاری حەقو ڕەوا دەکاتە ناحەقو ڕەفتاری ناڕەوا و ناحەقیش دەکاتە حەق.

گەر ڕەوایـــەک نارەواکەم کەس نییە لۆمەم بکا

یا ڕەواکەم ناڕەوایەک، هەر دەڵێن سەد ئافەرین[1]

وە وێنەگەری چابوکو ڕەنگیندەست، نەقشو نیگاری وا دەکێشێتەوە کە بە چاوڕا لات وایە، بڵندو نەوێو سافـو ناهەموارە.

وە کاتێک پادشـــا هونەرو لێهاتوویی منی چـــاو پێکەوت، زۆرتر لە منی پێ خۆش دەبێ، بملاوێنێتەوەو لێم نزیک بێتەوە.

کلیلە گوتی: ئەگەر هەر وایەو لێبڕاوی ئەو کارە بکەی، دەبێ زۆر بە پارێزەوە بـــۆی بچیو زۆرت ئاگا لە خـــۆت بێ. چون کارێکی پڕمەترســـییە. وە زانایان گوتوویانە؛ خۆ لە قەرەی ســـێ کاران مەدەن. هاونشـــینی سوڵتانو چێشتنو تاقیکردنـــەوەی ژەهر بە گومانو درکاندنی نهێنی لای ژنـــان. زانایانی بلیمەت دەڵێن: پادشا وەکوو کێوە، پڕ لە مەعدەنی زێڕو زیوە، لە هەمانکاتدا مەسکەنی شێرو مارو جرۆجانەوەری درێوە، ئەشکەوتی پڕ ئەجندەو دێوە، سەرکەوتن لەو شاخە ئەستەمو لەوێدا مانەوە ئەستەمترو بە مەترسیترە.

دێمنە گوتی: ڕاســـت وایـــە. بەڵام هەر کەس لە خەتـــەر هەڵێ، هەرگیز بە گەورەیی ناگا و لە ســـێ کاراندا سەرکەوتن دەست نادا، مەگەر بە ورەی بەرزو بەرزەفـــڕی پیاوی زانا. کار بۆ ســـوڵتان، ســـەفەری دەریا بۆ بـــازرگانو تێک شـــکاندنی دوژمنان. زانایـــان گوتوویانە: مەقامی پیاوی پیاو لە دوو شـــوێندا جێگەی ئافەرینە: لە خزمەتی پادشای کامرانو نێو بەدەرەوەو لە نێو زاهیدانو لە خواترسانی قانیعو دڵ ڕوونکەرەوە.

کلیلە گوتی: خودای مەزن لەم کارەدا خێرت وەڕێ بێنێو ئاگادارت بێ، هەر

---

١. باطلی گر حق کنم عالم مرا گردد مُقر / ور حقی باطل کنم منکر نگردد کس مرا.

چەند من بە راستی دژی ئەو کارەم.

دێمنە رۆیشتو سلاوی لە شێر کرد. شێر لە دەستو پێوەندانی پرسی: ئەوە کێیە؟ وەلامیان داوە: فلانی کوڕی فلان. گوتی: بەڵێ باوکیم دەناسی دوای ئەم قسانە بانگی کردە لای خۆیو پرسی: لە کوێ دەبی؟

کوتی: لەبەر دەرگای پادشـــاداهو ئەو دەرگایـــەم کردۆتە قیبلەی حاجەتو هیـــوا و هومێدی خـــۆمو چاوەڕوانم ئەرکێک بێتە بەرو مـــن رایپەڕێنم، چونکە لە بارەگای پادشـــایاندا کارو ئەرکی زۆر دێنە پێش کە ژێردەســـتان بە باشـــی دەتوانن رایانپەڕێنن. وە هیچ خزمەتکارێک نییە هەر چەند نزمو نەناســـراو بێ، خزمەتێکی، لە دەست نەیات. تەنانەت چڵەداری ئیشک کە فڕێیان داوەتە سەر ڕێگا، ئاخری بـــە کارێک دێ. دەیکەنە خەلال (چیلکەی زۆر باریک) گوێچکەی پێ دەخورێنن. ژینەوەرێک کە خێرو شـــەڕو قازانـــجو زەرەری لێ هەڵبوەرێ، چۆن دەبێ هێچ کەڵکی بۆت نەبێ.؟ کە گوتوویانە:

گـــەر بۆت نابـــم بە دەســـتەگوڵ
بمکـــە دەســـــتەچیلەی بـــن کڵ[1]

کاتێک شێر وتەکانی دێمنەی بیســـت، سەرسام بوو، واتێگەیشت کە دێمنە دەیەوێ نەســـیحەتێکیان بکا. ڕووی لە دەســـتو پێوەندان کردو گوتی: پیاوی هونەرمەنـــدی بە مروەت، هەر چەند پلەنزمو دوژمن زۆر بێ، بە عەقڵو پیاوەتی خۆی لە نێو گەلدا دیاری دەکا، وەک گڕی ئاگر، هەر چەند هەلاییســـێنەرەکەی بیەوێ، لەسەرەخۆ بسووتێ، گڕی لێ بەرز دەبێتەوە.

دێمنە بەم فەرمایشـــتەی پادشا خۆشـــحاڵ بوو، زانی کە ئەفسوونەکەی لە گوێی شـــێردا کاریگەر بووە، گوتی: لەسەر هەموو خزمەتکارو دەستو پێوەندی پادشا پێویستە کە هەر بابەتێکی بە نرخو نەسیحەتو ڕێنوێنییەکی بە زەینیاندا تێدەپەڕێ، دەریبڕنو بارستای عەقڵو زانیاری خۆیان بخەنە بەر ئەمرو بیروڕای ســـوڵتان، کە پادشا تا ڕەعیەتو ژێردەستانی خۆی باش نەناسێو لە ئەندازەی بیروڕا و شـــێوەی بیرکردنەوەو ئیرادەتو دڵســـۆزی هەر کامیان ئاگادار نەبێ،

---

١. گر دستۀ گل نیاید از ما / هم هیزم دیگ را بشاییم.

ناتوانێ لە خزمەتکاری ئــەوان کەڵک وەربگرێو نازانێ چاکەو پیاوەتی دەگەڵ کامیــان بــکا. چۆن دەنکە تۆم تا لە ژێر خاکدا شـــاراوەتەوە کەس کاری پێی نییە، کاتێک سەری لە خاک هێنادەرو رووی خۆی نواندو زەوی بە رەنگی سەوزو زەنوێری خۆی رازاندەوە، دیاری دەکا کە چییە. ئەو جار دەکەونە خزمەتکردنو پــەروەردەی تا بەهرەی لێ وەربگرن. لە هەر کــەس دەتوانی بەو ئەندازە کە باری دێنیو پــەروەردەی دەکەی، بەهرە ببینیو لە هەموو بارێکەوە رەحمەتو چاوەدێری پادشایان لە هەمووشت گرینگترە. وەک گوتوویانە:

مــن درکو داڵو ئەتــۆش هــەورو خۆرەتــاو

پێم رابگــەو بەرەوە، دەســتە دەســتە گوڵ[1]

وە مافی رەعیەت لەســەر پادشــا ئەوەیە کە بە پێی وەفاداریو پیاوەتیو لێهاتوویی، قەدرو حورمەتیان بۆ دابنێو پاشو پێشــیان نەکا. وە کەســانێک کە دەکارانــدا غافڵو لە هونەراندا کۆڵو داماون، لە بەرانبەر زانایانی لێهاتوو و هونەرمەندانی زانادا وەپێش نەخا. کە دوو کار لە بڕیاری پادشــایاندا عەجیبو غەریب دەنوێنێ: زێروزەنبەری سەر لە پێ بەستنو پاوانەو متومورووی قاچ لە ســەرو گوێ هەڵاوەســین! وە یاقووتو مرواری دە مسو قەڵاییگرتن لە قیمەتی جەواهێــرات کەم ناکاتەوە، بەڵام عەقڵی ئەو کەســەی فەرمانی ئەم کارە دەدا دەکەوێتــە بەر لۆمەو لەقەم. وە زۆربوونی هاوڕێیــان، ئەگەر دووربینو کارزان نەبن خۆی زەرەرو زیانێکی گەورەیە. جێبەجێکردنی کاران بە دەست پیاوی زانا و لێهاتوو دەکرێ، نە بە زۆرو بۆری دەســتو پێوەندو یارمەتیدەران. هەر کەس یاقووتی بە لاوە بێ، باری سووکەو هەموو کارێکیشی لە دەست دێ. ئەو کەسەش بەردان دە کیسە باوێژێ، باری قورس دەبێو لە رۆژی حەوجەداریشدا هیچی بۆ ناکرێ. وە پیاوی زانا، پیاوی لێهاتوو، با پلە نزمیش بێ، بە کەم ناگرێ، چون رەگ لە نێو خاک هەڵدەگرنو زینی لێ دروســت دەکەن کە پادشــایان سواری دەبنو کەوانی لێ ساز دەکەن کە بە دەست پادشا و ئەمیرانەوە، قەدرو قیمەتی دەچێتە ســەر. رەوا نییە پادشــا کەســانی زانا لەبەر نزمیو نەناسراوی بابو

---

١. من همچو خاک و خارم، تو آفتاب و ابر / گل‌ها و لاله‌ها دهم ار تربیت کنی.

باپیرانیـــان وەلابنێو پیاوی بێهونەرو نەزانیش لەبـــەر میراتو ناوبەدەرەوەیی بابو باپیریان، کە هونەرێکیان کەسب نەکردووە، بلاوێنێتەوەو رێزیان لێ بگرێ. دەبـــێ ئاوڕ لێدانەوەی پادشـــا لە هـــەر کەس، بە پێی قازانجێـــک بێ کە ئەو کەســـە بۆ وڵات هەیەتی. چون ئەگەر بێ هونەران خزمەتی بابو باپیران بکەنە نەردیوانی پێشـــکەوتنی خۆیان، کاروباری مەملەکەت لە گرێژەنە دەچێو پەکی کاران دەکـــەوێو ئەهلـــی هونەریش تێدا دەچێ. وە هیـــچ کەس بەقەدەر زاتی خودی ئەو لە خەڵک نزیک نییە. کاتێک کەسانێک لەو خەڵکە نەخۆش دەبن، بە دەرمانگەلێک عیلاج دەکرێن کە لە رێگای دوورو شاری بێگانەوە دەیانهێنن. وە مشـــک دەگەڵ جەماوەری خەڵکی هاوسا و هاوماڵن. چون ئازارو زیان گەیەنن، لـــە ماڵیان دەردەکەنو دەیانکوژنو بازیش، هەر چەند وەحشـــیو غەریبە چون حەوجەیان پێ هەیەو قازانج دەگەیەنێ بە رێزو حورمەتەوە رایدەگرنو دەســـتی پادشا دەبێتە جێگەی هەڵنیشتنی.

کاتێک دیمنە لەم وتارە بۆوە، سەرسامی شێر زۆرتر بوو، ئافەرینی پێگوتو پەســـنی وتەکانی دا و زۆری خۆش لێهاتو دیمنە لە دەرفەت کەڵکی وەرگرتو داوای خەڵوەتی لێکردو گوتی: ماوەیەکە پادشا دەبینم لە یەک شوێن دادەنیشێو مەیلی راو و شکارو جەولەی وەلاناوە، هۆیەکەی چییە؟ شێر دەیویست هەراسانیو نیگەرانی خۆی لە دیمنە بشـــارێتەوە. راست لەو کاتەدا شەنزەبە بۆڕاندیو ئەو بۆڕەبۆڕە وەها شـــێری زەندەقچوو کـــرد کە خۆی بۆ رانەگیرا و رازی خۆی بۆ دیمنە ئاشکرا کردو گوتی: هۆیەکەی ئەم دەنگەیە کە دەیبیسی. نازانم لە کوێڕا دێ، بەڵام وا تێدەگەم کە هێزو توانا و هەیکەلی خاوەنەکەی بەپێی ئەو دەنگە گەورە بێ. ئەگەر بەمجۆرە بێ مانەوەمان لێرە بە مەسڵەحەت نییە.

دیمنە گوتی: بێجگە لەم دەنگە پادشـــا هیچ شـــتێکی دیکەی لەودا شـــک کردووە؟ گوتی: نا. گوتی: نابێ ســـوڵتان بەو دەلیلە شـــوێنی خۆی خاڵی بکا و لە نیشـــتمانی خووپێگرتووی خۆی، کۆچ بکا. چون گوتوویانە: پەتای عەقڵ خۆبەزلزانینەو ئافەتی پیاوەتی، چاپلووسیو بەلای دڵی زەعیفو بێورە دەنگی دلێـــرو بەرزە. وە لە هێندێـــک پەندی کۆندا دەڵێن. نابێ لـــە هەر دەنگ زلو

لەندەمۆرلەشێک ترست هەبێ.

شـــێر گوتی ئەو نەزیلە کۆنە چۆنــە؟ دیمنە گوتی: دەگێڕنەوە ڕێوییەک ڕێی دە دارستانێک کەوت، لەوێ تەپڵێکی چاو پێکەوت کە لەبن دارێک فڕێ درابوو. هەر جارێک کە بایەک دەهات لقی دارەکە دەگەیشـــتە تەپڵو دەنگێکی سامناک دەگەیشـــتە گوێی مام ڕێوی. کاتێک ڕێوی زەلامیی جەســـتەی تەپڵەکەی چاو لێکرد کە ئەو دەنگە ترسێنەرەشی لێ دەهاتە دەر، تەماعی تێکرد، کە گۆشتو پێستەکەشـــی لەقەدەر دەنگو ئاوازەکەیەتـــی. هێندێکی دەگەڵ خەریک بوو تا دڕاندیو ئەلحەق بێجگە لە بڕووکە پێســـتێک چـــی دیکەی بەرچاو نەکەوت. جا ئەوجار دەنگی لێ هەڵێنا و گوتی: تێگەیشـــتم کە لە هەر شوێنێک هەر چەندی جەستە زەلامترو دەنگی بە سامتر بێ هونەری کەمتر دەبێو دەبێتە "زەلامی بێ هونـــەر". وە ئەم نەقڵەم بۆ ئەوە گێڕاوە تا بۆچوونی پادشـــا ڕوون کەمەوە کە خاتری مبارەکی نابێ بەو بۆڕەبۆڕە پەرێشـــانو پەشـــێو بێو ئەگەر ئیزنم بداتێ دەچمە لایو ڕاستیو دروستیو بەیانی حاڵو چەندو چۆنی مەسەلەکەی بۆ ڕوون دەکەمەوە. شێر ئەم پێشنیارەی پەسند کرد. دیمنە بە ئەمرو ئیشارەی سوڵتان هەســـتا و بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە وەرێ کەوت. کاتێک ڕۆیشـــتو لەبەرچاوان ون بوو، شـــێر بڕێـــک ڕاما و لە ناردنی دیمنە پەشـــیمان بۆوەو بە خۆی گوت: لە فەرمـــان دەرکردن بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەدا بە هەڵە چووم، چونکە هەر کەس لەبەر دەرکو دیوانی پادشادا، بێ تاوان سزا درابێو جەفای دیتبێو ماوەی ڕۆژەرەشـــیو ڕەنجو مەینەتەکەی درێژەی کێشابێ، یا ئەوەی ئەو کەسە دەست تەنگـــیو نەداری تەنگی پێ هەڵچنیبـــێ، یا ئەوەی ماڵو دارایيو ڕێزو حورمەتی بە با دابێ، یا لە کارێک کە پێی ئەســـپێردراوە دەرکرابێ، یا مرۆڤێکی ناجسنو زۆر خـــراپو خراپەکار کە نێوی بە خراپە ڕۆیشـــتووەو بۆ تەماعو شـــەڕەخۆری ئـــاژاوە دەگێڕێو ڕوو دەکاری چـــاک ناکا، یا خەتابارێک کە هاودەســـتەکانی، خۆشی لێبوردنو عەفوویان چێشتووەو ئەویش تاڵو تیژی سزادانی بەرکەوتووە، یا لە ســـزادانو تەمێکردندا ئەویان زۆرتر لەوانی دیکە ئازار دابێ، یا کەســـێک لـــە نێو هاوکاراندا خزمەتێکی شـــایانی کردبێو دۆســـتو هاوکارەکانی پاداشو

دەسخۆشـــانەی باشتریان وەرگرتبێ، یا نەیارێک لە قەدرو ڕێزگرتندا لێی وەپێش کەوتبێ‌و پێگەیشـــتبێ، یا لە ڕوانگەی دینو پیاوەتییەوە، شایســـتەی متمانەو ئەمانەت نەبووە، یا کەســـێک کە قازانجێکی لە زەرەرگەیاندن بە پادشـــادا پێ گەیشـــتووە، یا پەنای بۆ دوژمنی پادشا بردووەو پەنایان داوە، بە حوکمی ئەم بابەتەی سەرەوە پێش تاقیکردنەوەو ئەزموون، نەدەبووایە پەلە بکەم. نەدەبوایە بیکەمـــە مەحرەمی ڕازو نهێنی‌و بینێرمە لای دوژمن‌و ئەو ئەرکەی پێ بســـپێرم. ئـــەو دیمنەیە تێبینـــی دوارۆژی زۆرەو ماوەیەکی دووروودرێژ لـــە دەرگای مندا، دوورکەوتەو گۆشـــەگیرو خەمناک ژیاوە. ئەگەر لە دڵی خۆیدا ڕقێکی هەڵگرتبێ لەوانەیە لە نەکاو بیر لە خەیانەتێک بکاتەوە، ئاژاوەیەک هەڵایسێنێ. لەوانەشە، دوژمن لە من بەهێزترو لێهاتووتر بزانێ‌و دۆســـتایەتی‌و خزمەتی ئەوی پێ باشتر بێ‌و ڕازو نهێنی‌و ئەو شتانەی لەمەڕ من دەیزانی لای ئەو ئاشکرا بکا.

شـــێر بەو فکرو ئەندێشانەوە پەشۆکا بوو، هەڵدەستا و دادەنیشت‌و تۆقرەی لـــێ بڕابوو. چاوەڕوانی گەڕانەوەی دیمنە بوو. لەنەکاو دیمنە لە دوورەوە پەیدا بۆوە. هێندێک ئارام بۆوەو لەسەر جێگەی خۆی دانیشت‌و کاتێک دیمنە گەیشتە لای، پرســـی کە: ها، چت کـــرد؟ گوتی: گایەکم چاو پێکـــەوت کە بۆڕەبۆڕی دەگەیشـــتە گوێی پادشـــا، گوتی: زۆرو کەمی قەوەو قودرەتی چەندە؟ گوتی: هیچ شـــان‌و شکۆیەکەم تێدا نەدیت کە نیشـــانەی قودرەت‌و هێزو توانا بێ. کە گەیشـــتمە لای بە زبانی هاوتـــا و خۆمانە دواندم‌و چاوەڕوانی کڕنۆش‌و ســـەر دانەواندنی لێم نەبوو،‌و لە دەروونی خۆمدا هیچ ترس‌و سامێکم هەست پێ نەکرد کە زۆرتر لەوە ڕێزی بۆ دانێم.

شێر گوتی: نابێ ئەو حاڵەتە بە بێ دەسەڵاتی‌و داماوی ئەو لە قەڵەم بدەین‌و فریو بخۆین. کە ڕەشـــەبای بەهێز گیایەکی وردو لاواز ناشـــکێنێ‌و داری زەلام‌و ئەســـتوور بە زەویدا دەدا و کۆشـــکێ گەورە دەڕووخێنـــێ‌و پیاوی گەورەو بە تواناش، قەســـتی ئازارو ئەزیەتی ژێردەســـتان‌و بێدەسەڵاتان ناکەن‌و تا دوژمن بەهێـــزو قەدەرو گـــەورە نەبێ، قودرەت‌و توانایی‌و شـــکۆی خۆیان دەرناخەن. دەگەڵ هەر کەسە، بە بارستای حاڵ‌و ئەندازەی زۆرو قودرەتی خۆی، بەرەنگاری

دەکەن. چونکە لە پلەوپایەی بەرزدا، هاوپلەیی‌و بەرانبەربوون زۆر گرینگە.

کوللـــە نابێتە راوی بازو شـــەهێن
شـــێری برســـی دە رێوی رۆنایە[1]

دێمنە گوتی: پادشـــا با هێندە وەزنو قورســـایی بۆ کاری ئەو گایە دانەنێ، ئەگەر دەفەرموون با بچم وەپێش خۆمی دەمو بیهێنمە خزمەت پادشـــا و ببێتە عەبدێکی موتیعو نۆکەرێکی گوێ لەمستو خزمەتکار. شێر بەم وتەیە گەشاوەو ئەمری کرد ئەو کارە ئەنجام بدرێ.

دێمنە هاتە لای گا و بە دڵێکی قەویو بێ ترســـانو خەجڵان قسەی دەگەڵ کردو گوتی: شـــێر منی ناردووەو فەرموویەتـــی تۆ بەرمە خزمەتیو گوتوویەتی ئەگەر زوو بگەیە لای، لەو تەخســـیرو کۆتاییە کە تا ئێستە کردوویەتی ئەمانی دەدەم. لەوەی کە تا ئێســـتا نەچوویتە خزمەتـــیو دووریت لێکردووە تووڕەیە. ئەگەر رەگەڵم نەکەوی، فەورەنو بێ ماتڵبوون دەگەڕێمەوەو ئەوەی لە نێوانماندا رابردووە عەرزی دەکەم. گا گوتی: ئەو شـــێرە کێیە؟ دێمنە گوتی: پادشـــای دڕندەو جانەوەران. گا کە نێوی "پادشـــای دڕندان"ی بیست، ترسی رێ نیشتو بە دێمنەی گوت: ئەگەر، هێزو توانا بخەیتە دڵمو لە قەهرو غەزەبی ئەو ئەمینم بکەی دەگەڵت دێم. دێمنە پەیمانی دەگەڵ بەست، شەرتو عەهدی دەگەڵ دانا و هەر دووکیان بۆ خزمەت شێر وەرێ کەوتن.

کاتێک گەیشتنە لای، شێر بە گەرمی ئەحواڵپرسی کردو گوتی کەی هاتوویتە ئەم لایانەو چۆن بوو هاتی؟ گا حەکایەتی خۆی بۆ گێڕاوە. شێر فەرمووی کە: لێرە جێگیر بەو بمێنەوە کە لە دڵۆڤانیو پیاوەتیو بەخشـــندەیی ئێمە بەهرەو بەشی باشـــت گیردەکەوێ. گا مەتحو سەنای سوڵتانی کردو کەمەری خزمەتی پادشای بە مەیلو ئارەزوو بەست. شێر ئەوی لە خۆی نزیک کردەوەو زۆری رێز لێنا و میهرەبانی دەگەڵ کردو بە وردی حاڵو شێوەی کارو بۆچوونەکانی ئەوی خستە ژێر لێکۆڵینەوەو بارستای عەقڵو بیروڕای ئەوی بە تاقیکردنەوەو ئەزموون لێ حاڵی بوو. وە پاش فکر لێکردنەوەو مەشوەرتو تەدبیرو ئیستیخارەی زۆر،

[1]. نکند باز عزم صلح ملخ / نکند شیر قصد زخم شگال

کردی بــە مەحرەمی رازو باوەڕپێکراوی نزیکی خۆی. وە هەر چەندی ئەخلاقو عادەتو ئاکاری ئەوی زۆرتر هەڵســەنگاندو تاقــی کردەوە متمانەی زۆرتری بە کیفایەتو لێهاتوویی‌و زۆرفامی‌و کارزانی شــەنزەبە پەیدا دەکرد، بەمجۆرە رۆژ لە رۆژ زیاتر پلەوپایەو قەدرو قوتبی دەچووە ســەرو خێرو بەرەکەتی خەڵاتو بەراتو ئەنعامی پادشای بەسەردا دەڕژا، تا لە تەواوی فەرماندەو سپا و تەواوی نزیکانی سوڵتان تێپەڕی.

کاتێــک دێمنە دیتی کە شــێر دە نزیککردنەوەی گادا چەندە تێدەکۆشــی‌و رووی خۆشــی نیشان دەدا و سەعات بە ســەعات پلەوپایەی دەباتە سەرو بە شێوەیەکی شــاهانە ئاگاداری لێدەکا، دەستی ئێرەیی‌و حەسەد سورمەی تیژی وەخۆ هاتنەوەی دە چاوی کێشــا و گرفەی ئاگری تووڕەیی کەوتە نوێنو بانی ژیانی‌و خەوخۆراکی لێ حەرام کرد.

رۆیشــتە لای کلیلــەو گوتی: ئەی برای بەڕێزم. ئــاگات لە کزی‌و کەنەفتی‌و چارەرەشــی من هەیە؟ هەموو هێزو توانم بۆ ئاســوودەیی شێر تەرخان کردو لە بەش‌و تووشــی خۆم غافــڵ بووم‌و ئەو گایەم هێنــا خزمەتی، ئەوەتانێ بە پلەوپایەو دۆســتایەتی سوڵتان گەیشتووەو منیش فەرامۆش کرام‌و لە پلەوپایە کەوتم.

کلیلە گوتی: کە تۆش وەک کابرای دەروێش‌و خوداناست بەسەر هات. دێمنە گوتــی: چۆن؟ گوتی: زاهیدێک، پادشــا خەڵاتی کردو جلوبەرگێکی بەقیمەتی پێدا. دزێک ئەو خەڵاتەی دەبەر دەروێشــدا دیتو تەماعی تێکرد. بە ئیرادەتو رێز گرتنەوە رۆیشتە لای‌و گوتی: دەمەوێ دە خزمەت جەنابتدا بم‌و رێ‌وشوێنی تەریقــەت فێربم. بەمجــۆرە خۆی کردە مەحرەم. دە خزمەت دەروێشــدا حاوا بــۆوەو ژیانی زۆر خۆش بــوو تا ئەوەی دەرفەتی دەســت کەوتو جلوبەرگی هەموو تێکەوە پێچا و بــۆی دەرباز بوو. دەروێش کە دیتی جلوبەرگ نەماوە، زانی کە ئەو بردوویەتی. بۆ دیتنەوەی دزەکە رووی دە شــاری کرد. لە رێگادا دوو نێچیــری چاو پێکەوت کە شــەڕیان دەکردو بە شــاخان یەکتریان بریندار کردبــوو. رێوی فێڵباز هاتبوو خوێنی ئەوانی دەلســتەوەو دەیخوارد. لە نەکاو

نێچرەکان وەبەر شەقۆنیان دا و ڕێوی سلار بۆوە. دەروێش شەو گەیشتە شارو لە جێگایەکی دەگەڕا کە پێڵاوان بکاتەوەو بحەسێتەوە. وا هات ڕێی کەوتە ماڵی ژنێکی بەدکارەو ئەو ژنە چەندین کەنیزی لە بەردەستدا بوو کە سۆزانی بوون. وە یەکێک لەو کەنیزانە کە لە جوانیدا بووکانی بەهەشت ئێرەییان پێ دەبردو مانگەشەو لە بناگوێی نوورو تریفەی دەدزیو ڕۆژیش سوجدەی بۆ جەماڵی دەبرد، دڵڕفێنێک، گەلاوێژێک، شارشێوێنێک، ئاورپارەیەک کە ئەم شێعرانەی لایقە:

سینەی چ بڵێم سوبحدەمی فەسڵی بەهاریَ
یا بەفری هەوەڵ شەو کە بە زستانیَ دەباریَ
دوو مەمکی وەکوو جووتە هەناری لکی داریَ
دوو گوڵبەدەمی نارە وەکوو دەنکی هەناریَ
قەترەی عەرەقی پێوە وەکوو دانەیی گەوهەر[1]

ڕەش ئەسمەرێکی تازە خەت، ئاژاوەی ژنانو فیتنەگەری پیاوان، باڵابەرزی کەمەرباریک، قسەقندو بەداروبار.

نافو شکەمی وەک چ بڵێم نافەیی قاقوم
نافەی لە میان بەستەری قاقوم بە مەسەل قوم
وەک نافە کە بووبیَ لە غەزالی خوتەنی گوم
خۆی بیَئەسەرو ماوە لە ئاهوو ئەسەری سم
وەک نافە بە بیَنافە پەڕاکەندە بە کیشوەر[2]

ئەو ژنە مەفتوونو شەیدای کەسێک ببوو، نەیدەهێشت حەریفانی دیکە لەو نزیک ببنەوەو بە دەوریدا بگەڕێن.

ژنە خاوەن ماڵەکە لەوەی کە دەخڵو داهاتی کەمە وەجۆش هاتبوو و دەرەقەتی کەنیزەکە نەدەهات کە پەردەی حەیای دڕاندبوو و گیانی خۆی لەسەر بەری دەستی دانابوو. ژنەی خاوەنماڵ بە ناچار پیلانی داڕشت کە کوڕە جحێڵەی [دۆستی کەنیزە لەبارەکە] بکوژیَ. وە لەو شەوەدا کە دەروێش

---

١و٢. ئەم دوو پێنج خشتەکییە لە دیوانی میسباح (ئەدەب) وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

لەوێ دابەزی، تەدبیری کردبوو. چاوەڕوانی دەرفەت بوو کە پیلانەکەی بگێڕێو جحێلەکە لەناو بەرێ. [بۆ ئەم مەبەستە] مەجلیسی بۆ رازاندنەوەو شەرابی بەقیمەتو نایابی پێدان تا هەر دووکیان مەست بوونو کەلەلا لێی کەوتن. کە هەر دووکیان خەویان لێ کەوت. ژەهری دە ماسوورەیەکی[1] کردو سەرێکی ماسوورەی دە قوونی لاوەکە رۆکردو سەرەکەی دە زاری خۆیدا راگرت تا فووی پێدا بکا. پێش ئەوە فووی بکا، کاکی جحێڵ ترێکی لێ بەربوو کە تەواوی ژەهرەکەی دەگەرووی ژنەکەدا بڵاو کردەوە. ژنە بە ژەهرەکە لەجێی خۆی سارد بۆوەو گیانی دەرچوو. لە خۆرا نەیانگوتووە: جزاء مُقَبّلِ الإسْت اَلضُراطْ.[2] دەروێش ئەم رووداوەی بە چاوی خۆی دەبینی.

هەر کە کازیوەی بەیانو رووناکی سەحەر پانتایی گێتی بە جەماڵی خۆی روون کردەوە، دەروێش خۆی لە رەشایی فەسادو خراپەی ئەو جەماعەتە رزگار کردو مەنزڵێکی دیکەی گرت. کەوشدروویەک زیارەتی کردو لە ماڵی خۆی میوانی کرد. بە خێزانی ئەسپارد کە زۆریان ئاگا لێ بێو حورمەتی بگرنو خۆی بە میوانی رۆیشتە لای دۆستان. ژنەکەی حەزی لە پیاوێک دەکردو ژنێکی خوێنگر (حجام) دەڵالی نێوانیان بوو. بەو ژنەدا وەڵامی بۆ دۆستەکەی نارد کە ئەمشەو مێردەکەم لە شوێنێک میوانەو هەستە، وەرە.

کابرا شەوێ خۆی ئامادە کردبوو. کەوشدروو بە مەستی هاتەوەو ئەوی لەبەر دەرگای ماڵی خۆیان چاو پێکەوت، لەمێژ بوو لە ژنەکەی بەدگومان ببوو. تووڕەو تۆسن هاتە ژووری ماڵو ئەوەندی توانی ژنەکەی کوتا و پاش لێدانێکی خەست، مەحکەم لە کۆڵەکەی بەستو لێی نوست. کە ماڵ ئارام بۆوەو هەستو خوست نەما، ژنە خوێنگر هاتو گوتی: ئەو پیاوە بۆ هێندە لە چاوەڕوانیدا رادەگری؟ ئەگەر بۆی دەچی پەلە بکەو ئەگینا با خەبەری کەم بڕواتەوە. گوتی، ئەی خوشکەکەم، ئەمن دەسەر تۆ گەڕێم، ئەگەر منت خۆش دەوێ زوو بمکەوەو تۆ لەجێی خۆم ببەستمەوە، دەچم لە دۆستەکەم داوای لێبووردن دەکەمو زوو

---

[1]. ماسوورە: قامیش یا چیلکەیەکی کورتی کون کراوەو نەخو دەزووی لێ دەماڵێتن. لە جل دروونو ماشێنی خەیاتیدا هەیە.

[2]. پاداشی کەسێک قوون ماچ بکا، ترە.

دەگەڕێمەوە. ئەو چاکەم دەگەڵ بکە، هەمیشـــە مەمنوونت دەبم. خوێنگر رازی بوو، ئەوی کردەوەو خۆی بەستەوەو ژنی کەوشدرووی بەرێ کردە دەرەوە. لەو دەمەدا کەوشـــدروو خەبەری بۆوەو بانگی ژنەکەی کرد. ژنە خوێنگر لە ترسان جوابی نەداوە، نەوەک بناسرێ. چەند جاری دیکەشی بانگ کرد، هیچی نەگوت. توورەیی کەوشـــدروو هەڵچوو، چەقۆی چەرمتاشی هەڵگرتو هاتە لای کۆڵەکەو کەپۆی ژنەی بڕیو دە لەپی دەســـتی نا و گوتی وەک دیاری بۆ دۆســـتەکەتی بنێرە.

کاتێک ژنی کەوشدروو هاتەوە ژوور تەماشای کرد لووتی دەستەخوشکەکەی بـــڕاوە، دڵی تەنگ بوو و داوای لێبوردنی کردو ئەوی لە کۆڵەکە کردەوەو خۆی بەســـتەوەو ئەوی دیکەش لووت بەدەستەوە، بەرەو ماڵ گەڕایەوە. دەروێشیش لەولاوە ئەو رووداوانەی دەبیســـتو دەدیت. ژنی کەوشـــدروو سەعاتێک ماتەی هەڵگرتو دەســـتی دوعا و پاڕانەوەی بەرز کردەوەو گوتی: ئەی خوایە! ئەگەر دەزانـــی مێردەکەم زوڵمی لێکردوومو تۆمەتی لیداوم، تۆ بە گەورەییو کەرەمی خۆت ئەو ببەخشەو لووتی منیش بدەوە. کەوشدروو گوتی: ئەی بەدکاری غەیان ئەمە چ قســـەیەکە؟ ژن جوابی داوە: ئەی زاڵمی خوانەناس، هەســـتەو تەماشا کـــە با دادگەری دادارو رەحمەتی پـــەروەردگار ببینیو بزانی لە بەرانبەر زوڵمو توورەیی تۆدا چۆن بێگوناهی منی ئاشـــکرا فەرموو. خودای مەزن لووتەکەمی پێدامەوە تا لەبەر چاوی خەڵکان ریسوا و لووتبڕاو نەبم. پیاوەکە هەستا چرای هەڵگرساندو ژنی بە ساغو سڵامەتی دیتو لووتی لە جێی خۆی قیتو قنج! هەر لە جێ، ددانی بە گوناهی خۆیدا هێنا و داوای لێبوردنی کردو بەســـەر دەستو لاقیدا کەوت کە حەڵالی بکا و تۆبەی کرد کە لەمەودوا بێدەلیلو مەدرەک کاری لەو چەشـــنە نەکا و بە تێچاندنی دووزبانی بەدکاری زبانلووسی ماڵ وێرانکەری لە خـــودا بێخەبەر، ژنی لـــە خواترسو داوێنپاکی خۆی ئـــازار نەدات. وە بە پێچەوانەی رەزامەندی ئەو ژنە مەســـتووره مەحجووبەیە کە نازانێ مەکرو فریو چییە، دەست بۆ هیچ کارێک نەبا.

وە لەو لاوە، ژنی خوێنگر، لووتی بڕاو بە دەســـتەوە هاتەوە ماڵ. حەیرانو

سەرگەردان، کە بە مەکرو حیلە چ بە مێردەکەی بڵێو لای دەرو جیران چ عوزرو بیانوویەک بۆ ئەم بارە نالەبارە بێنێتە ئاراوەو ئەگەر پرسیان چ جواب بداتەوە. لـــەو کاتەدا کابرای خوێنگر لە خەو هەســـتا و بانگی ژنەکەی کرد کە ئامرازی خوێنگرتنەکەی بۆ بێنێ. دەیویســـت بڕواتـــە ماڵی دەوڵەمەندێک، ژن ماوەیەک خۆی مێلکاندو تەنیا گوێزانی بۆ برد. خوێنگر لە تاریکی شـــەودا گوێزانی تووڕ هەڵدا. ژن خۆی بە عەرزی دادا و هاواری کرد لووتم، لووتم! خوێنگر سەرســـام بوو، دەرو جیران داوەرووکانو دەستیان کرد بە لۆمەو جنێودان.

کە ســـپێدەی ســـەحەر بە نووری خۆی دنیای رووناک کردو پەردەی رەشی تاریکی لە ســـەر روخســـاری عالەم وەلا دا و جەماڵی رۆژی رووناکی خستە بەر چـــاوی ئەهلی عالـــەم، خزمو نزیکانی ژن کۆ بوونـــەوەو خوێنگری خوێنڕێژیان بردە لای قازی. قازی لێی پرسی: بە بێگوناهی ئاشکرا و خەتایەکی مەعلووم، لووتی ئـــەم ئافرەتەت بۆ بڕیوە؟ خوێنگری سەرلێشـــێواو، هیچ دەلیلو عوزرو بەهانەیەکی بۆ نەدۆزراوە. قازی حوکمی قەساسو تەمێکردنی بۆ دەرکرد.

دەروێش هەســـتا و گوتی: پێویستە جەنابی قازی وردتر بڕوانێتە بابەتەکە. دز جلوبەرگی منی نەبردو ڕێوی، نێچیرەکان نەیانکوشتو ژنە بەدکارەکە ژەهر نەیکوشتو خوێنگر لووتی خێزانەکەی نەبڕی، بەڵکوو ئێمە ئەم هەموو بەڵایەمان خۆمـــان بەســـەر خۆمان هێنا. قازی دەســـتی لە خوێنگر هەڵگـــرتو رووی لە دەروێش کرد تا گوێی لە قسەکانی بگرێ. دەروێش گوتی: ئەگەر من ئارەزووی شـــێخایەتیو کۆمەڵکۆمەڵ موریدو دەستو پێوەندم لەسەردا نەبوایەو بە درۆ و دەلەســـەی دز فریوم نەخواردبایە، ئەو دەرفەتەی دەست نەدەکەوت. وە ئەگەر ڕێوی تەماع نەیگرتبایەو دەســـتی لە خوێنخواردن هەڵبگرتایە، زەبری نێچیرانی بەرنەدەکەوتو ئەگەر ژنەی بەدکار قەستی گیانی جحێلەکەی نەکردبایە، گیانی شـــیرینی لە دەســـت نەدەدا. ئەگەر ژنی خوێنگریش بە دوای کاری ناشایستو فەسادو حیزیدا نەگەڕابا، لووتی بەبڕین نەدەچوو.

کلیلە گوتی: ئەم حەکایەتەم بۆیە بۆ گوتی تا بزانی ئەم مەینەتو زەحمەتە تۆ خۆت بۆ خۆت ساز کردو لە بەرهەمی کارەکانی خۆت غافڵ بووی.

دێمنه گوتی: [وایەو ئەم کارە من کردم ئێستا تەدبیرت چییە؟ چۆن رزگار دەبم؟] کلیله گوتی: تۆ چیت لە مێشک دایە؟

دێمنە گوتی: دەمەوێ بە مەکرو حیلەو رواڵەتسازی بە دوای ئەم کارەدا بڕۆمو بە هەر شێوەیەک بۆم بلوێ، بیروباوەری شێر بگۆڕم. چون کۆتاییکردنو پشتگوێ خستنی ئەرکی گرینگ بە پیاوەتی نازانم. وە ئەگەر غەفڵەتێک لە من سەر بدا لە لای پیاوی پیاو، بیانووم لێ قبووڵ ناکرێ. هەر وەها بە تەمای پلەوپایەی تازە نیمو قەدەم دەو رێگایە نانێم تا بە تەماعکارو زگپەرست نەناسرێم.

سێ مەبەست هەیە کە پیاوی عاقڵ، بۆ گەیشتن بە ئەوان، بە مافی خۆی دەزانێ هەموو چەشنە فێڵبازیو حیلەو کەڵەکو پیلانێک بە وردی دەکار بێنێ: کارکردن بۆ گەیشتنەوە بە سوودو قازانجو پلەوپایەی پێشوو تا دەگاتەوە هەمان دەرەجەو پلە، وە لە زەرەرو زیانی تاقیکراوەو ئەزموونکراو خۆی بپارێزێو پاراستنو ئاگاداری لە سودو قازانجەکانی ئێستایو رزگارکردنی نەفسو زات لە پەتا و ئافەتی زۆر؛ وە دە فکری داهاتوودا بوون بۆ گەیشتن بە خێرو سەلاحو دەفعی زیانو زەرەرو شەڕ.

وە من [دێمنە] چون هومێدی گەیشتنەوە بە بارودۆخو قەدرو قوتبی جارانم هەیەو دەمەوێ بەختو ئیقباڵم درەوشانەوەی جارانی وەدەست بخاتەوە، رێگە چارەم ئەوەیە بە پیلانو فێڵبازی بە دوای گادا بڕۆم تا ئەو کاتەی ماڵاوایی لە دنیا بکا و ماڵی خۆی لەژێر خاکدا ئاوەدان کاتەوەو لەسەر پشتی زەمین نەمێنێ.

مەسڵەحەتی کاری شێر لەوەدایە. چونکە زێدە لە ئەندازە ئەو گایەی گەورە کردووەو هەموو وا تێدەگەن شێر لە را و تەدبیردا سستو لەرزۆکە.

کلیلە گوتی: ئەوەی کە شێر زۆر پیاوەتیو دڵۆڤانی دەگەڵ گا کردووەو پلەوپایەی بردۆتە بان، بە عەیبی نازانم.

دێمنە گوتی: لە باڵ بەسەرکێشانو لە خۆ نزیککردنەوەی ئەودا زێدەرۆیی کردو بەرانبەر بە باقی هاوفکرانو دڵسۆزان کۆتایی فەرموو، تا ئەو جێگەی کە دڵئێش بوونو سوودو قازانجی خزمەتکاری ئەوان بۆ ئەو و قازانجی نزیکی لە ئەو

بۆ ئەوان، پچڕا و هەڵبڕا؛ وە دەڵێن پەتا و بەڵای شێواوی وڵات شەش بابەتن: بێبەشی، ئاژاوە، هەواوهەوەس، دژواری زەمانە، نێوچاوان گرژیو نەزانی.

مەبەست لە بێبەشی ئەوەیە خێرخوازانو مێرخاسان لە خۆت بێبەش بکەیو ئەوانــەی تێدەگەنو خاوەنبیرو ئەزموونن بە ناهومێدی لە خۆت دوور کەیتەوە. ئاژاوە ئەوەیە شەڕو پێکدادانی لەخۆڕا و چاوەڕوان نەکراو، یا کارو رووداوێک کە فکری بۆ نەکراوەتەوە، روو بدەنو شمشێرە دژو دوژمنەکان لە کالان دەرکێشرێن. هەوا و هەوەسیش ئەوەیە لە پێوەندی دەگەڵ ژنانو راو و شکارو بەزمو شەرابو کاری لــەم بابەتــە زۆر خەریک بی. دژواری زەمانــەش ئەوەیە، رۆژگار دەگەڵ خەڵکو مەملەکەت نەبان بێ، نەخۆشــی وەبا و قاتوقڕیو ســووتمانو بەڵای لەم چەشــنە روو بدەن. نێوچاوان گرژی؛ بــەوە دەڵێن لە توورەییدا زێدەرۆیی بکرێ، ســزای توندوتیــژو رقەبەرایەتی بێتە ئــاراوە. نەزانیش یانی؛ دلۆڤانیو دۆستایەتیکردن لە جێگایەک کە دژایەتیو دوژمنایەتی پێویستە، یا بە پێچەوانە دژایەتیو دوژمنایەتی لە جێگایەک کە دۆستیو برایەتی پێویستە.

کلیلە گوتی: تێگەیشــتم. بەڵام چۆن دەتوانی ئەو گایە تووشــی هیلاکەت بکەی کــە ئەو لەباری هێزو قەوەتەوە لە تۆ لەپێشــترەو دۆســتو هاودەردو یاریکاریشی زۆرترە؟

دێمنە گوتی: نابێ گوێ بدەیە ئەوانە، چونکە بنەمای کاران لەســەر بەهێزی کەسو دەسەڵاتی لایەنگران رانەوەستاوەو لەم بارەوە گوتوویانە:

الـرأیُ قَبْـلَ شَـجاعة الشُّـجعْانْ
هُـوَ اوّلٌ و هِـیَ المَحَـلُّ الثانـی[1]

ئەوەی بە را و تەدبیرو فێڵبازی دەکرێ، بە قەوەتو زۆر دەســت نادا. رەنگە نەتبیستبێ کە قەلەبەڵەکەیەک بە فێڵو حیلە مارێکی کوشت؟ گوتی چۆن؟ گوتی: دەگێڕنەوە کە قەلەبەڵەکەیەک لە چیا لەســەر دارێک هێلانەی دروست کردبوو. لەو دەورەوبەرە کونە مارێکی لێبوو، هەموو ساڵێ کە قەل جووجەڵەی هەڵدێنا، مار دەچوو دەیخواردن. ئەو زوڵمە لە ئەندازە تێپەڕی، قەلی عاجزو داماو رۆیشتە

---

١. را و تەدبیر دەکەوێتە پێش ئازایەتی ئازایان، ئەم لە جێگەی یەکەمو ئەو لە پێگەی دووهەمدایە.

لای چەقەڵێکی دۆستی خۆیو شکایەتی کردو گوتی: دەمەوێ خۆم لە دەست ئەم زاڵمە خوێنخۆرە رزگار بکەم. چەقەڵ پرسی: چۆن ئەم کارە دەکەی؟ قەل جوابی داوە، رادەوەستم تا مار خەو بیباتەوە، ئەودەم دەچمە جەستەیو بە دندووک چاوی دەکۆڵمو کوێری دەکەم تا بەمجۆرە نووری چاوەکانی منو میوەی جەرگو هەناوم [یانی بێچووە خرپنە جوانەکانم] لە ئەماندا بن.

چەقەڵ گوتی: ئەمە تەدبیرێکی عاقڵانە نییە. پیاوی زانا بە شێوەیەک قەستی لەناوبردنی دوژمن دەکا کە مەترسی تێدا نەبێ. ئەمان ئەمان، وەک ماسیگرەکەی کە ویستی سەری قرژاڵ بە فەتەڕات بدات، بەڵام خۆی سەری تێداچوو.

قەل گوتی: چۆن؟ گوتی: دەگێڕنەوە ماسیگرەیەک لەسەر لێواری پاشاوێک هێلانەی هەبوو. ئەم ماسیگرەیە هەموو رۆژێک ئەوەندەی پێویستی پێ بووایە ماسی دەگرتو رۆژگاری خۆی بە تێروتەسەلیو ئاسوودەیی رادەبوارد. وردەوردە بێهێزی پیری، توانا و بڕستی لێبڕیو نەیتوانی چیدی راو بکا. بەخۆی گوت: مەخابن تەمەن رکێفی لێدا و دەرباز بوو! بێجگە لە هێندێک تەجرەبەو ئەزمون چی بۆ بەجێ نەهێشتم. کە رەنگە ئەم ئەزموونانە بتوانن بە کاری زەمانی کڵۆڵیو هڵۆڵیم بێن. ئەمڕۆ کە هێزم دەبەردا نەماوە، دەبێ بەفێڵو تەڵەکە بژیویو قووتی ژیانم دابین بکەم.

پاش ئەوە، وەک داماوێکی لێقەوماو لە قەراغ ئاو هەڵکورما. قرژاڵ چاوی پێکەوت. لێی هاتە پێشو گوتی: زۆر داماوت دەبینم؟ گوتی: چۆن داماو نەبم، کە بژیویو بەرێچوونی من ئەوە بوو، رۆژانە یەک دوو ماسیم دەگرتو بەمجۆرە من ژیانم دابین دەبوو، ماسیش کەمی نەدەکرد؟ بەڵام ئەمڕۆ دوو راوکەر بێرەدا تێدەپەڕینو یەکیان بەوی دیکەی دەگوت: لەم پاشاوەدا ماسی زۆر هەیە. دەبێ فکرێکیان بۆ بکەینەوە. یەکێک لەوان گوتی: "لە فلان شوێن ماسی زۆرترە، کە ئەوانمان راو کرد دەگەڕێینەوە ئێرە". وە ئەگەر ئەوە رووبدا، دەبێ دەست لە گیانم بشۆمو خۆم بۆ برسیەتیو مردن ئامادە بکەم.

قرژاڵ رۆیشتو خەبەری دا بە ماسییەکان. ئەوانیش هاتنە لای ماسیگرەو

گوتیان: اَلْمُستَشارُ مُؤتَمَنٌ[1]و ئێمەش مەشوەرەت بە تۆ دەکەین. وە عاقڵو زانا لە مەشوەرەتدا، ئەگەرچی دوژمنیش لەشتێکدا پرسو مەشوەرتی پێ بکا، شەرتی نەسیحەت فەرامۆش ناکا، بە تایبەتی لە کارێکدا کە قازانجەکەی بۆ ئەو بگەڕێتەوە. مانەوەو ژیانی بەڕێزیشتان دەگرێوی مانو گەرادانانو زیادبوونی ئێمەدایە. ئێستا لە کاری ئێمەدا چ بە باش دەزانی؟

ماسیگرە گوتی: دە بەرانبەر راوکەراندا چ دەکرێ؟ دەرەقەتیان نایەنو من ناتوانم لەم وارەدا هیچ بڵێم. بەڵام لەم نزیکانە پاشاوێکی دیکەم پێ شک دێ کە ئاوەکەی لە سافیو زوڵالیدا ئابڕووی فرمێسکی عاشقی دڵسووتاو دەبا و لە گزینگی بەریەیان دڵڕفێنترە، دەنکە خیزەکانی تۆقی بنی بژمێرەو گەرای ماسی تێدا دەبیندرێ. ئەگەر بتوانن بۆ ئەوێ کۆچ بکەن، دەکەونە ئاسایشو ئاسوودەییو ناو نازو نیعمەت. گوتیان: فکرێکی باشە، بەڵام ئەم گوێزتنەوەیە بێ هاوکاریو پشتیوانی تۆ دەست نادا. گوتی: درێغی ناکەم بەڵام ئەو کارە زۆر دەکێشێو سەعات بە سەعات لەوانەیە راوکەرەکان بێنو فرسەت لە دەست بچێ. زۆر لاڵانەوەو پاڕانەوە تا ئەوەی قەرار داندرا کە هەر رۆژێک چەند ماسی راگوێزێ. بەمجۆرە رۆژانە چەند ماسییەکی دەبرد لەسەر کەنداڵێک دەنیشتو دەیخواردن. ئەوانی دیکەش لەسەر ئەوەی زوو نۆبەیان بگاتێ شەڕیان دەکردو کێبەرکێیان دانابۆوەو ماسیگرەی فێڵزانیش بە چاوی عیبرەت لە خەتا و غەفڵەتی ئەوانی دەڕوانیو بە زبانی پەندو مەوعیزە دەیگوت: هەر کەس بە درۆ و دەلەسەی دوژمن هەڵفریوێو باوەڕ بە سپڵەی درۆزنو بەدرەوشت بکا، سزاکەی ئەوەیە.

هەر وا کە چەند رۆژێک تێپەڕبوو، قرژاڵیش ویستی کۆچ بکا. ماسیگرە ئەوی لەسەر پشتی خۆی سوار کردو بەرەو ئاسمان هەڵکشا و بەرەو ئەو شوێنە کە کوشتارگەی ماسیان بوو، لوور بوو. قرژاڵ کە لە دوورەوە چاوی بەم گشتە ئێسکو بڕووسکی ماسییە کەوت، تێگەیشت چ باسە. فکری کردەوە کە پیاوی ئازا و زانا کاتێک پێی زانی کە دوژمن قەستی گیانی کردووە، ئەگەر دەست نەکاتەوەو بە گژ دوژمندا نەچێ، دە کوشتنی خۆیدا بەشداری کردووە. وە

---

١. مەشوەرەت پێکراو جێی متمانەیە.

کاتێک دەستی کردەوەو بە گژ دوژمندا چۆوە، ئەگەر سەرکەوێ نێوبانگی دەڕوا و ئەگەر پێچەوانەی ئەوە روو بدات، گەورەیی‌و ئازایەتی‌و پیاوەتییەکەی جێگەی سەربەرزی ئەوەو بەختەوەری شەهیدبوون‌و جیهادی بۆ دەمێنێتەوە. پاش ئەم بۆچوونە خۆی هاویشتە سەر ملی ماسیگرەو بە هەموو هێزەوە گەرووی کوشی. تا لەو حەوایەوە سەرەوبن هاتە خوارو لەجێ زیارەتی مەلکەمووتی کرد.

قرژاڵ سەری خۆی هەڵگرتو پێی دە رێگە نا و گەیشتەوە لای باقی ماسییەکان‌و سەرەخۆشی یارانی لە دەست چوویان‌و پیرۆزبایی رزگاری ژیانی ئەوانەی مابوون، لێکردن‌و ئەوەی دیتبووی بۆی گێڕانەوە. هەموویان زۆر شاد بوون‌و مردنی ماسیگرەیان بە عومری دووبارە زانی.

کە کوژرا دوژمنی نگریسی خوێنتاڵ
سەعاتێک ژینی خۆم نادەم بە سەد ساڵ[1]

وە من ئەم نەقڵەم بۆ ئەوە بۆ تۆ گێڕاوە کە زۆر کەس بە پیلان‌و حیلەو فێڵ خۆیان تووشی هیلاکەت کردووە، بەڵام من رێنوێنییەکت دەکەم ئەگەر بتوانی دەکاری بێنی دەبێتە مایەی مانی تۆ و نەمانی مار.

قەل گوتی: لە فەرمانی دۆستان لادان‌و تەدبیری زانایان وە پشتگوێ خستن، خیلافی عەقڵە. چەقەڵ گوتی: وا باشە. بە تەشقی ئاسماندا بفڕێو بنواڕییە سەحرا و بیابان‌و سەربانی ماڵان تا چاوت بە گەردنبەند یا شتێکی جوان دەکەوێ کە فڕاندنی ئاسان بێ. بۆی وەرە خوارو هەڵیبگرەو بە ئارامی بڕۆ، وابێ کە لەبەر چاوی خەڵک ون نەبی. کە گەیشتیتە نزیک مار، گەردنبەندی پێدادە تا ئەو کەسانەی بە دوای گەردنبەندەکەدا هاتوون، دە پێشدا تۆ رزگار بکەن‌و دوایەش گەردنبەند هەڵگرنەوە. قەل رووی دە ئاوەدانی کرد، ژنێکی چاو پێکەوت گەردنبەندی لە سووچی سەربانی داناوەو خۆی خەریکی خۆ شوشتنە. بەو جۆرەی کە چەقەڵ گوتبووی گردنبەندی فڕاندو بە سەر ماردا بەری داوە. ئەو خەڵکەی بە دوای قەلەبەڵەکەدا هاتبوون هەر لە جێ سەری ماریان پان کردەوەو قەل رزگاری هات.

---

١. مرا شربتی از پس بد سگال / بود خوش‌تر از عمر هفتاد سال.

دیمنە گوتی: ئەم حەکایەتەم بۆیە نەقڵ کرد تا بزانی ئەوەی بە فێڵو حیلە دەتوانی بیکەی بە هێزو قەوەت بۆت جێبەجێ ناکرێ.

کلیلە گوتی: ئەو گایە کە هەم پڕ زۆرەو هەم عەقڵو زانایی تێدا کۆبۆتەوە، بە فکرو بە فێڵ چۆنی پێ دەوێری؟

دیمنە گوتی: راســـتە، ئەوهایە کە دەڵێی، بەڵام متمانەی بە من هەیەو لێم خاترجەمـــە. بە غەفڵەتو فریودان دەیفەوتێنم، چون ئەگەر لە شـــوێنێکدا کە دوژمن لێی ئەمینە کەمینو بۆسەی بۆ دابنێی، باشترە. هەر وەک کەروێشک کە بە فێڵو بە غافڵاندن شێری بە هیلاکدا. گوتی چون؟

گوتی: دەگێڕنەوە لە مێرگێکدا کە شنەبایەکەی بەهەشتی، بۆنخۆشی کردبوو و وێنەکەی رووی فەلەکی نوورانی کردبوو، لە هەر لقێک هەزار ستێرە ئاوێزانو لە هەر ئەستێرەش هەزار فەلەک ماتو حەیران مابوون، گیانلەبەرو دڕندەو خزندەو پەرندەی زۆر پێکەوە بە تێروپڕی دەژیان. بەڵام لە جیرانەتی شێردا ئەو هەموو بەختەوەرییـــە تاڵو ناخۆشو ژەهری‌مـــار بوو. رۆژێک لێک خڕ بوونەوەو چوونە لای شـــێرو گوتیان: تـــۆ هەموو رۆژێک، بە زەحمـــەتو مەینەتی زۆر، دەتوانی یەکێـــک لە ئێمە راو بکەی‌و ئێمە هەمـــوو دەم لە بەڵادایـنو تۆش ماندوو مردوو بە دوای نێچرەوەی. ئێســـتا ئێمە فکرێکمان کردۆتەوە کە تۆ دەحەســـێنەوەو ئێمەش ئاســـوودە لە خۆمان ئەمین دەبین. ئەگەر دەســـتدرێژی خۆت بۆ سەر ئێمە بوەستێنی، هەر رۆژە، خۆمان نێچیرێکت بۆ دەنێرین. شێر بەوە رازی بوو، ماوەیەک بەمجۆرە بەسەردا تێپەڕی. رۆژێک قورعە بە نێوی کەروێشک دەرچوو. بە دۆســـتانی گوت: ئەگەر دە ناردنی مندا درەنگێک بکەن، من ئێوە لە جەوری ئەو زۆردارە خوێنخۆرە رزگار دەکەم. گوتیان: دەی زۆر باشە، ئیرادێکمان نییە. کەروێشـــک سەعاتێک خۆی وە پاش خست، تا کاتی فراوێنی شێر بەسەرچوو. پاشان وردەوردەو بێ پەلەکردن بەرەولانی شێر وەرێ کەوت. شێری بە داماوی چاوپێکەوت.

ئاگـــری برســـیەتی دە گیانی بەرببوو. بڵێســـەی تووڕەیی لـــە حەرەکاتو ســـەکەناتیدا خۆی دەنواند. ئاوی زاری وشـــک ببوو، لـــە حەژمەتی تووڕەیی‌و

پەیمانشکێنی خاکی بەرپێی بە چنگوڕکان هەڵدەکۆڵی.

کەروێشـــکی چاو پێکەوتو بانگی کرد: لە کوێـــوە هاتووی‌و باس‌و خەبەری جانەوەران چییە؟ گوتی: "دەگەڵ من کەروێشـــکێکیان بۆ ناردبووی، لە ڕێگادا شـــێرێک لە منی ئەســـتاند. من پێم گوت: ئەمە فراوینی پادشایە". گوێی پێ نەدام‌و زۆر ئازاری دام‌و گوتی: "ئەم نێچیرگا و نێچیرە بۆ من باشـــترە چونکە هێزو قەوەتی من زۆرە". منیش بە هەڕەمە هاتم تا پادشـــا ئاگادار بکەم. شێر هەستا و گوتی: "ئەو شێرەم پێ نیشان بدە".

کەروێشک کەوتە پێش‌و ئەوی بردە سەر چاڵاوێکی گەورە کە زوڵاڵی‌و سافی ئاوەکـــەی وەک ئاوێنـــە، بە وردی جوان‌و ناحەزی روخســـاری دەنواندو هەموو تایبەتمەندییەکـــی نیشـــان دەدا. گوتی: "لەم چاڵاوە دایەو من لێی دەترســـم. ئەگەر پادشـــا دە ئامێزم بگرێ نیشـــانی دەدەم". شێر دەئامێزی گرت‌و روانییە ناو چاڵاوەکە. عەکســـی خۆی‌و کەروێشکی دە ئاوەکەدا دیت. کەروێشکی دانا و خۆی دە چاڵاو هاویشـــت. بن ئاو بوو، دوو سێ قوڵتی دا و نەفسی خوێنخۆرو گیانی گڵاوی بە مەلکەمووت ئەسپارد.

کەروێشک بە ســـڵامەتی گەڕاوەو گیانەوەران حاڵو چۆنیەتی کاری شێریان لێ پرســـی، گوتی: نوقمم کردو وەک گەنجی قاڕوون خاک قووتی دا. هەموویان ســـواری سوارەبەر (مرکب)ی ســـواری بوون‌و لەو مێرغوزارەدا دەستیان کرد بە رمبازێن‌و تەقڵەی شادی‌و دوعایان بۆ کەروێشک کرد.

کلیلـــە گوتی: ئەگەر بتوانی، بێ ئەوەی شـــێر تووشـــی زەحمەتێک بێ، گا بـــە هیلاکەت بەری قەیدی نییەو قبووڵەو ئەگەر، شـــێر دە زەحمەت کەوێ‌و بە بێ‌زیان‌و زەرەرێک، کوشتنی گا دەست نەدا؛ نەکەی ئەوکارەی بکەی، چون هیچ عاقڵێک بۆ ئاسایشی خۆی، گەورەو سەروەری خۆی تووشی زەحمەت ناکا.

قســـەیان لێرە دوایی پێهاتو دیمنە بۆ ماوەیەک نەرۆیشـــتە لای شێرو خۆی لێ دەشاردەوە. تا رۆژێکیان هەلێکی بۆ رەخسا و لە خەڵوەتێکدا رۆیشتە لای. بـــەڵام وەک داماوێکی خەمگین. شـــێر گوتی: چەند رۆژێکـــە دیار نی، خێرە؟ گوتی: خێر دەبێ، خوا یار بێ. شـــێر دەرهەڵبوو، پرســـی: شتێک رووی داوە؟

گوتی: بەڵێ. شــێر گوتی: بۆم بگێڕەوە بزانم چ قەوماوە؟ دیمنە گوتی: ئەگەر تەنیا بووی عەرزت دەکەم. گوتی: هەر ئێستا کاتێکی گونجاوە، زووتر پێم بڵێ چــون کاری گرینگ نابێ درەنگــی تێدا بکەی‌و پیاوی عاقڵ‌و زانا کاری ئەمڕۆی ناخاتە رۆژی دوایی.

دیمنە گوتی: هەر قسەیەک کە دڵی بیسەر پێی ناخۆش بێ، گوتنی هەر وا ئاسان نییە. مەگەر ئەوەی کە متمانەیەکی تەواوت بە عەقڵ‌و تێگەیشتنی بیسەر هەبێ، بە تایبەت قازانجەکەشــی بگەڕێتەوە بۆ ئەو. چون بۆ ئەوەی قســەکە دەگێڕێتەوە بێجگە لە بەجێهێنانی ئەرکی ڕێنوێنی‌و نەسیحەت فایدەیەکی ناتوانێ ببێ. وە ئەگەر لە دواهاتە (تبعات)کانی بە سلامەتی دەرباز بێ، کارێکی شایان‌و فەتحێکی نومایانی کردووە. وە ئیزنی ئەم ئەرکە بەوە دەتوانم وەدەســت بێنم کە پادشا لە روانگەی بیروڕا و زاناییەوە لە نێو پادشایاندا جیاوازو هەڵواردەیەو بێ‌شــک دە بیســتنی ئەو بابەتەدا تێگەیشــتن‌و هەڵســەنگاندنی شاهانەی لە بەرچاوە. هەر وەها شاراوە نابێ کە قسەی من لایەنی ئەمانەت‌و دڵۆڤانی‌و باری دڵســۆزی تێدایەو لە غەرەزو رق‌و سوودخوازی بە دوورە. چون گوتوویانە الرائدُ لایَکذِبُ اَهْلَه[1]. وە مان‌و نەمانی جانەوەران بە دەوامی عومری ســوڵتانەوە گرێ دراوە. وە پیاوی زانا و تێگەیشــتوو ئەگەر کــوڕی بابی خۆی (حەڵاڵزادە) بێ دەبێ حەقخوازو راســتگو بێ‌و چون هەر کەس ڕێنوێنی‌و نەســیحەت لە پادشا درێغ بکا و نەخۆشی لە تەبیب بشارێتەوە یا فەقیری‌و نەداری خۆی بە دۆستانی راستینی خۆی نەڵێ، خەیانەتی بە خۆی کردووە.

شێر گوتی: بارستای دڵسۆزی‌و ئامانەتی زۆری تۆمان لێ عەیانەو ئاسەوارەکەی لە حــاڵ‌و قیافەی تۆدا دەبینم. ئەوەی تازە رووی داوە بۆ منی ئاشــکرا بکە. کە بە دڵســۆزی‌و هاودەردی لــە لایەن تۆوە لای ئێمە لــە قەڵەم دەدرێ. وە بەدگومانی‌و نیگەرانی لەم بارەوە لای من مەجالی پێ نادرێ.

دیمنە گوتی: شەنزەبە دەگەڵ فەرماندەکانی لەشکر بە نهێنی، چەندین جار کۆ بۆتەوەو هەر یەکەی بە جۆرێک لاواندۆتەوەو گوتوویەتی: "شێرم تاقی کردۆتەوەو

---

١. سەرقافڵە بە هاوڕێیان درۆ ناڵێ.

بارســتای زۆرو توانای ئەوم هەڵســەنگاندووەو بیروڕا و مەکرو سیاسەتی ئەوم بۆ روون بۆتەوە. وە لە هەر کام لەوانەدا گەندەڵیو سســتی تەواوی هەیە". وە بەداخەوە پادشــا لە ڕێزگرتنو گەورەکردنی ئەو نمەکنەناسە زاڵمەدا زێدەڕۆیی فەرموو. وە لە قەدرگرتنو دەســەڵاتپێداندا کە تایبەتمەندی ســوڵتانە، ئەوی کردە هاوتای نەفسی خۆیو دەستی ئەو مەلعوونەی دە بگرەوبەردە، وا بکەو وا مەکەو ئەمرونەهیدا ئاواڵە کردو دەسەڵاتی ڕەهای پێدا. تا وای لێهات دێوەزمەی ئاژاوە لە دڵی ئەودا هێلکەی کردو هەوای یاغیبوونو سەرکێشــی وەک ڕەشەبا کەوتە سەری. وە گوتوویانە کە "هەر کات پادشا یەکێک لە خزمەتکارانی خۆی لەباری قەدرو قوتبو پلەوپایە، لە ئاستی خۆیدا دیت، دەبێ زوو لە ناوی بەرێو لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، ئەگینا خۆی تێدا دەچێ". هەڵبەت، دیارە ئەوەی پادشا دەیزانــێ ئێمەمانان فکرمان بۆی ناچێ. بەڵام من لام وایە بەپەلە تەدبیرێک بۆ ئەم بابەتە بکرێ، پێش ئەوەی هەل لە دەســت بچێو کار بکێشــێتە جێگایەک کە نەکرێ هیچ هەنگاوێک هەڵبگری، وە گوتوویانە کە مرۆڤەکان دوو دەستەن. وشــیارو عاجزو خوێری. وشــیارەکانیش دوو جۆرن: یەکــەم ئەوەیە کە پێش ئەوەی گرفتاری روو بدا، ئاگادار بووبێتەوەو گرفتەکەی ناسیبێو ئەوەی دیتران لە کۆتایی ڕووداوەکاندا لێی حاڵی دەبن، ئەو بە بیری تیژی خۆی لە سەرەتادا لێی حاڵی بووبێو پلانو ڕێگەی چارەســەری هەر لەسەرەتادا داڕشتبێ. کاتێک گرفتاری رووی دا و ڕواڵەتی ئاژاوە خۆی نواندو کار لە کار ترازا، عاقڵو جاهیلو دووربین هەموو یەکســانن. ئەگەر خاوەن بیروڕا بەمجــۆرە ئاگای لە ئەحواڵی خۆی بێ لە هەر بارو دۆخێکدا دەتوانێ ملی کار بگرێو بەســەر هەموو شتیکدا زاڵ بێو پێش ئەوەی دە زەلکاودا گرفتار بێ دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە دەراو.

غافــڵ مەبە لــە دوژمنــی بــەدکارو فێڵەزان
بــۆ دز چرایە کەترەخەمیو خەونی پاســەوان[1]

وە ئەوجــار، بابەتــی دووهەم ئەوەیــە کە بەڵا هات، نابــێ ورە بەربدەیو بە ترسو خۆف ڕێگە بدەیو ســەرگەردانو پەشــۆکا و بێــرەو بەوێدا بکەوی.

---

١. در کار خصم خفته نباشی به هیچ حال / زیرا چراغ دزد بود خواب پاسبان.

دۆزینەوەی ڕێگە چارەو دەورگێڕانی دروســـت لە دەســـت بدەی. وە لەمەڕ ئەم دابەشـــکردنەی باســـم کرد، زۆر بەجێیە حەکایەتی سێ ماسییەکان بگێڕمەوە.
شێر پرسی: بڵێ بزانم ئەم حەکایەتە دەڵێ چی؟

دیمنـــە گوتـــی: دەگێڕنەوە لـــە پاناوکێکدا [لـــە دووره دەســـتێکی دوور لە دەســـتوبردی ڕێبواران] ســـێ ماســـی دەژیان. دوویان وریا و بە تێفکرین بوونو یەکیان عاجزو داماو. وا هات ڕۆژێک لە ڕۆژان دوو ڕاوکەر بەو شـــوێنەدا تێدەپەڕین. قەراریان دا، تۆڕ بێننو هەر ســـێکیان بگرن. ماسییەکان گوێیان لە قســـەی ڕاوکەرەکان بوو. ئەوەی کـــە زۆر دوورئەندێشو دووربین بوو وە زۆری دەســـتوبردی زەمانەی جەفاکار دیتبوو، باشـــی دەزانی ئەم گەردوونە چەندە پیلانگێڕو غەددارە، پیاوانەو بە هەنگاوی قورسەوە، دەستبەکار بوو، سووکێکی بـــەو لادا، بەو شـــوێنەدا کە ئاو دەهاتە نێو پاناوکـــە وە دەرکەوت، لەو کاتەدا ڕاوکەرەکان هاتنو هەر دوو لای پاناوکیان بەست.

ماسی دووهەمیش تێبینی خۆی هەبوو. نە لە زیوەری عەقڵ بێبەشو نە لە زەخیرەی ئەزموون بێبەهرە. بە خۆی گوت: غەفڵەتم کردو ئاکامی کاری غافڵان وەهایەو ئێســـتا کاتی فێڵبازیو حیلەتە. هەر چەند تەدبیر، لە کاتی بەڵادا کە کەوتیە گیر، ئەوەندی پێویســـتە، ســـوودی نییەو ناتوانێ لە هەنگاوی ئافەتو بەڵادا شیرینی عەقڵو تەجرەبە بچێژی. وە بەو حاڵەش عاقڵ لە قازانجی زانین هەرگیـــز ناهومێد نابێو دە بەرەنگاری پیلانو مەکـــری دوژمندا، خومێڵکاندنو ساوەســـاو بە باش نازانێ. کاتی وورەبەرزیو ڕۆژ، ڕۆژی مەردانە. ئەوجار خۆی مراندو لەســـەر پشت کەوتە سەر ئاو. ڕاوکەر هەڵیگرتەوەو کە بۆی ڕوون بۆوە مردووە تووڕی هەڵدا. بە زەحمەت خۆی گەیاندە جۆگەو بە سڵامەت دەرباز بوو.

وە ئەوی دیکە غەفڵەتو بێخەبەری بە سەریدا زاڵ بوو، داماوی دە کاروباریدا ئاشکرا خۆی دەنواند، واق وڕماو، سەرگەردانو سەر لێشێواو خۆی بێرە و بەوێدا دەکێشا، گرفتار بوو.

وە ئەم نەقڵەم بەو مەبەســـتە گێڕاوە تا بە پادشـــا بســـەلمێنم کە لە کاری شەنزەبەدا پەلەو دەستوبرد لازمە. وە پادشای سەرکەوتوو کەسێکە، کە پێش

لە دەســـتچوونی هەلو دەرفەت، تەدبیری پێویســـت رەچـــاو بکا و بە زەبری شمشـــیری تیژی تۆزو خۆلی دوژمن بگەیەنێتە عاسمانو گڕو بڵێسەی ئیرادەی دنیاسووتێنی ئاور دە ماڵو حاڵی دوژمن بەردا.

شـــێر گوتی: زانیم، بەڵام باوەڕ ناکەم شـــەنزەبە فکری خەیانەتی دە سەردا بێ. وە دە بەرانبەر ئەو چاکەو دڵۆڤانیانەی ئێمەدا، کوفرانی نیعمەتو خەیانەت بـــە ئێمە بکا. چون تا ئەم ســـاتەوەختە بێجگە لە خۆشەویســـتیو چاکەکردن کارێکم دەگەڵ نەکردووە.

دێمنە گوتی: فەرمایشت دروستە؛ لوتفـو کەرەمی زۆر ئەم هەوایەی خستۆتە مێشـــکی. وە پیاوی ناعەســـڵو بێبنەچەک تا ئەو کاتـــەی دەگاتە پلەوپایەی دڵخوازی خۆی، ســـەر بەڕێو خزمەتگوزارە، پاشـــان مەیلی گەیشتن بە پلەی بەرزی تێدا سەر هەڵدەدا کە ڕێی ناکەوێ پێی بگا. ئامرازی ئارەزووی چەپەڵو ســـەرمایەی ڕقو کینە وەگەڕ دەخا. خزمەتکاریو نەسیحەتو ڕێنوێنییەکان لە ســـەر بناغەی ترسو هیوا دادەنێ، کاتێک ئەرخەیان بوو، ئاوی خێرو بەرەکەت قوڕاو دەکا و دەستەچیلە بۆ ئاگری شەڕوشۆڕ کۆ دەکاتەوە. زانایان گوتوویانە کـــە: "پادشـــا نابێ، خزمەتکار لـــە دڵۆڤانیو بەزەیی خـــۆی بێبەش بکا، کە بەجارێک ناهومێد ببنو یا ئەوەندەیان پێ رابگا کە زوو دەوڵەمەند بنو هەوەسی فزوولیو دەســـەڵاتیان بکەوێتە مێشکو یاغی بن. بەمجۆرە لە نێو ترسو هیوادا دەمێننەوە. وە بیری سەرکێشی ناکەوێتە سەریان. دەبێ پادشا ئەوە بزانێ کە ئەوەی سروشـــتی خوارو ناڕاســـتە، هەرگیز چاوەڕوانی ڕاستبوونی لێ ناکرێو ئەوەی زاتی خراپو ناجســـنە لە ڕێگەی ڕاهێنانو زۆرەوە، ناچێتە سەر ڕێگەی ڕاســـت. هەر وەک کلکی دووپشک، هەر چەندی ببەستنو تەلاش بکەن ڕاست بێتەوە، هەر کە کردیانەوە دەچێتەوە ســـەر قەراری جارانو بە هیچ شێوەیەک چاری ناکرێ. وە هەر کەس، نەسیحەتی زانایان، هەر چەند تاڵو بێپەروایانەش بێ، گوێ نەداتێ وەک نەخۆشـــێک کە گـــوێ ناداتە ڕێنوێنی تەبیبو بە کەیفی خۆی بخوا و بخواتەوە ســـات بە سات نەساغترو نە خۆشییەکەی کۆنتر دەبێ. پادشـــایان ئەو مافەیان لەسەر خزمەتکاران هەیە کە ئەوان دەبێ هەر کات لازم

بوو رێنوێنیو نەســیحەتی پێویست بە عەرزی ســوڵتان بگەیەنن. دڵسۆزترین ژێردەست ئەو کەســەیە کە دە گەیاندنی رێنوێنیو نەسیحەتدا زێدەرۆیی بکا و خۆی بە کاری دیکەوە خەریک نەکا. باشــترین کار ئەوەیە کە ســەرەنجامێکی باشو دڵپەســندی لێبکەوتێەوە. دڵخوازترین مەتحو پەسندانیش ئەوەیەکە لە زارو زبانی هەڵکەوتەکانەوە بێتەدەر. وە باشــترین دۆســت ئەو کەسەیە کە لە دژایەتی دەست هەڵبگرێو لە هەموو کارێکدا هاوکاری بکا، جوانترین سفەتیش، تەقوا و پاکداوێنییە. دەوڵەمەندترین کەســیش ئەوە کە بە ماڵی دنیا بادیهەوا نەبێو دڵتەنگی زەحمەتو مەینەت بە سەریدا زاڵ نەبێ. چون ئەم دوو حاڵەتە ســیفەتی ژنانە. وە هەر کەســێک، جێگاوبانی لە ئاگرو ســەرینی لە مار ساز کرابــێ، خەوی خۆش نابێ. وە فایدەی عەقڵی دروســتو پتەو ئەوەیە کە هەر کات لە دۆستان دوژمنایەتیت هەست پێکردو لە خزمەتکاراندا هەوای گەورەییو ســەروەریت چاو پێکــەوت، لەجێدا، ئاگاداری دەورویــەرت بکەیو لەوان دوور بیتەوەو پێش ئەوەی دوژمن فرسەتی خواردنی فراوێنی بێ، شامێکی قورسی بۆ ئامادە بکەی. چونکە دوژمن بە مۆلەت بەهێزو بە زەمان ژماریان زۆرتر دەبێ.

بوونــە مار ئەو مێرووانەی دوژمنت
بیانکووژە ئەو مێرووانەی بوونە مار[١]

وە بێدەســەڵاتترین پادشــا ئەوەیە کە لە دەرەنجامی کاروباران غافڵ بێو ئەرکــە گرینگەکان بە هیچ بگرێو هــەر کات رووداوی گەورەو کاری دژوار بێتە پێش هەڵوێســتی وریاییو ئیحتیات وەلابنێ وە کاتێک دوژمن دەرفەتی هێنا و کار لە کار ترازا، نزیکانی خۆی تۆمەتبار بکا و خەتایان بخاتە سەر مل.

بــۆ بەڕێوەبردنی کاری دنیاداری فەرزە کە پێش ئەوەی دوژمن خۆی تۆکمە بکا و سەرکەوتن مسۆگەر بکا، قەرەبووی زیانو زەرەرو کەلەبەرەکان بکرێتەوە. وە تەدبیــری جێبەجێکردنی ئەرکەکان لەســەر بنەمای دەســەڵات دە بەرچاو بگیرێو ســەرنج نەدرێتە فێڵو تەڵەکەو درۆ و دەلەســەی دوژمنو کارەکان بە عەقڵی پیرو بەختی لاو، ئەنجام بدرێن، چونکە ســامانی بێ بازرگانیو زانستی

١. مخالفان تو موران بدند مار شدند / برآور از سر موران مار گشته و مار.

بێ لێدوانو باسو لێکۆڵینەوەو پادشای بێسیاسەت، پایەدار نابن.
شێر گوتی: زۆر هەژدەر هەژدەرو بێپەروا قسەکانت بەیان کرد. قسەی پیاوی دڵسـۆزو رێنوێن درشـتو تاڵیش بێ، دەبێ گوێی بۆ رادێرێو قبووڵی بکەی. وە شـەنزەبە ئەگەر دوژمنایەتی بکا، دیارە کە دەتوانێ چ بکا و چ ئاژاوەیەک بنێتـەوە. ئەو خواردنی منەو خواردنی ئـەو کە ماکەی جووڵەو هەرەکەتیەتی، گیایەو یارمەتیدەری هێزو توانای من گۆشتە.
وە هـەر وەها ئێمـە ئەومان کردۆتـە ئەمینی خۆمانو دە نـازو نیعمەتدا کردوومانەتە هاونشین. وە دە یاسای جوامێرێو پیاوەتیدا چۆن غەدرو خەیانەت پاسـاو دەدرێتەوە؟ زۆر جار لە نێو جەماعەتی حازراندا تاریفم کردووەو باسی عەقـڵو دینداریو ئیمـانو ئەمانەتو وەفاداری ئـەوم هێناوەتە گۆرێ. ئەگەر کارێکی ناڕەوای دەگەڵ بکەم بە دژوازی قەولو را و بۆچوونی سستو رووخەک تاوانبار دەکرێمو عەهدو پەیمانی من لە دڵی ئەو خەڵکەدا قەدرو قیمەتی نامێنێ.
دێمنە گوتی: پادشا، بەوەی کە دەفەرموێ "ئەو خۆراکی منە" نابێ هەڵفریوێ. چون ئەگەر بۆ خۆشی نەتوانێ بەرەنگارت بێ، عالەمێک دەکاتە هاورێی خۆیو بە فێڵو تەڵەکە دەست بەکار دەبێو لەوە دەترسێم کە جانەوەرانو کێوییەکان رەگەڵ خۆی بخاتو بە گژ پادشـایاندا بکات. بەو حاڵەشەوە هەرگیز ئەو کارە حەواڵەی کەسی دیکە ناکا و خۆی دێتە مەیدان.
کاتێک تێچاندنی دێمنە کاریگەری لەسـەر شێر بەجێهێشت، گوتی: بۆ ئەم کارە چ بە مەسڵەحەت دەزانی؟ جوابی داوە: ددان کە کرمێ بوو، هیچ چارەیەک نامێنێ بێجگە لە کێشـانو تەعامێک کە گەدە لە هەزمو وەرگرتنی سەرکێشـی کـردو دڵ دە خێڵەکەوە هاتو حاڵەتی هێنانەوەی سـەری هەڵدا، چارە تەنیا رشاندنەوەو فرێدانە.
وە دوژمـن کە بە مودارا و مێهرەبانی دەسـتەمۆ نەکرێو سەرکێشـتر بێ، رزگاری لە دەستی ئەو دوژمنە وەدەست نایە مەگەر ئەوەی لێی دوور کەوێتەوە.
شـێر گوتی: من لە جیرانەتی گا بێزار بووم، یەکێکی لێ رادەسـپێرم بچێ ئەوەی پێ رابگەیەنێو ئیزنی دەدەم بڕوا بۆ هەر جێگایەک کە دەیەوێ.

دێمنە زانی ئەگەر ئەم باسە لای شەنزەبە ئاشکرا بێ، هەر لە جێ، بێگوناهیو دڵپاکی خۆی باس دەکا و مەکرو درۆی ئەو ئاشکرا دەبێ. بە شێری گوت: ئەم کارە لە وریاییو ئیحتیات بەدوورە. تا کاتێک ئەم قســـەیە بڵاو نەبۆتەوە، جێگا بۆ بڕیـــاردان دەمێنێ، پاش گوتنی قەرەبوو ناکرێتەوە. [قســـە کەوتە زارێکی دەکەوێتە شـــارێکی]. وە هەر قســـەیەک لە زیندانـــیزار دەرپەڕیو هەر تیرێک لـــە کەوان دەرچـــوو، گەڕاندنەوەیان بۆ نییە. وەســـاهو هەیبەتی بێدەنگی بۆ پادشایان زینەتە.

لەوانەشـــە ئەگەر ئاگاداری ئەم حاڵەتە ببێتو بزانێ چ فەزیحەتێکی کردووە، شەڕو هەرا هەڵاییسێنێو ســـازو ئامادە بێتە مەیدان. وە ئەوانەی خاوەنئاوەزو هۆشـــیارن بۆ گوناەو خەتای ئاشکرا، سزای شاراوەو بۆ گوناەو خەتای شاراوە سزای ئاشکرا دەرناکەن.

شێر گوتی: تەنیا بە شکو گومانی بێدەلیل، لەدەستدانی یەقینو متمانەی نزیکانو فەوتاندنیان، خۆ دە عەزاب هاویشـــتنەو تەشوێ لە رەگو ریشەی خۆ دانە. بۆ پادشا لازمە دە هەموو کارێکدا بە تایبەت لە کاری سیاسەتدا بە سەبرو حەوسەلە بێو بێ تێفکرینی ورد کارێک نەکا.

دێمنـــە گوتی: فەرمان فەرمانی پادشـــایە. بەڵام هـــەر کات ئەم مەکربازە غەددارە دەســـت بەکار بوو، دەبێ ئامادەو تەیار بی. تا فرســـەتی زەبرلێدانی نەبێ. ئەگەر بە وردیش تێی بڕوانی، نگریســـیو پیسی نییەتو عەقیدەی ئەوت بەرچـــاو دەکەوێ. جیاوازی چاولێکردنی دوژمنو تێڕوانینی دۆســـتان بە روونی دیارە. چاوپۆشـــیکردنو خۆگێلکردن لەم حاڵە بۆ کەسێکی تێگەیشتنی هەبێ، ناڕەوایە، وە نیشانەی ناراستی دەروونی ئەو لەوەدا دیارە کە بە رەنگو حاڵەتی جۆراجـــۆرەوە خۆ دەنوێنێو دەڕوانیتە راســـتو چەپو بۆ پاشو پێش ســـەر دەکێشێو خۆی بۆ شەڕ تەیار دەکا.

شێر گوتی: مەسڵەحەت هەر ئەوەیە. وە ئەگەر لەم نیشانەگەلە شتێک بیندرا شکمان نامێنێ.

کاتێـــک دێمنە لە دڕدۆنگکردنو دنەدانی شـــێر خاترجەم بوو و زانی کە بە

ئەفسوونو تێچاندنی ئەو ئاگری ئاژاوە هەڵایساوە، ویستی بڕواتە لای گا و چاوی پێی بکەوێو فریوی بدا. بە ئەمری شێریش بچێتە لای بۆ ئەوە شێر بەدگومان نەبێ. گوتی: "ئەگەر بە مەسـەڵەحەتی دەزانی سـەرێک لە شەنزەبە هەڵدێنمو هەڵیدەسەنگێنم بزانم چی لە دڵی دایە". شێر ئیزنی پێدا و دێمنە بە رواڵەتێکی کزو داماو ڕۆیشـتە لای گا. شەنزەبە زۆر جوان بەخێرهاتنی کردو لێی پرسی، لە کوێی، ماوەیەکە ناتبینم؟ سـاغو سڵامەت بووی؟ دێمنە گوتی: کەسێک کە خاوەنی نەفسی خۆی نەبێ، چۆن دەتوانێ سڵامەت بێ؟ دیلو یەخسیری مەیلو موڕادی دیترانو هەر دەم لەترسو خۆفدا ژیان، چرکە ساتێک بێترسو نیگەرانی نەژیو قسەیەک نەوێری بکەی مەبادا باسی سەروماڵت بێ. [ئەوە کەی ژیانە؟]

گا گوتی: چ شتێک وا ناهومێدی کردووی؟ گوتی: تەقدیر، چارەنووسی دیاری کـردووە. کێ دەتوانێ لە بەرانبەر قەزای ئاسـمانیدا خۆ ڕابگرێ؟ کێیە بگاتە پلەوپایەو لە نیعمەتی دنیا شـەربەتێکی بدەنە دەسـت، کە سەرمەستو ئازاد بژیو بە هەوای دڵی خۆی ببزوێتەوەو نەکەوێتە گێژاوی هیلاکەتەوە؟ وە دەگەڵ ژنـان مەجلیس بگرێو مەفتوونو شـەیدا نەبێ؟ وە بـۆ حاجەتێک بچێتە لای چاوچنۆکانو ئابڕووی نەچێ؟ وە دەگەڵ ئاژاوەگێڕانو حەسـوودان دۆستایەتی بکا و نەکەوێتە زەلکاوی حەسرەتو پەشیمانییەوە؟ وە ببێتە هاودەمی سوڵتانو بە سڵامەت ڕزگاری بێ؟

شـەنزەبە گوتی: لە قسەکانترا وا دەردەکەوێ، لە لایەن شێرەوە نیگەرانیو نفرەتێـک هەبـێ؟ گوتی: وایە، بەلام، نەک بۆ من. وە تـۆ دەزانی منو تۆ لە سەرەتاوە بووینە دۆستو لەبیرت ماوە ئەو ڕۆژە شێر منی ناردە لای تۆ پێکەوە عەهدو پەیمانی دۆسـتایەتیمان بەست. بۆشت مەعلوومە کە من لە سەر عەهدو بەڵێن بووموو بە ئەرکی خۆمی دەزانم لە چاکو خراپ، هەر چی ڕوویدا ئاگادارت بکەمەوە.

شـەنزەبە گوتی: بڵێ بزانم، ئەی دۆسـتو هاوڕێی قەدیـم. دێمنە گوتی: لەباوەڕ پێکراوێک بیستوومە شێر گوتوویەتی شەنزەبە زۆر باش قەڵەو بۆتەوەو کارێکیشمان پێی نییەو چ قازانجێکی بۆ ئێمە نییە. دڕندەکان بانگهێشت دەکەمو

بە گۆشتی ئەو میواندارییان دەکەم. کە ئەوەم بیستو ملهوڕیو زۆرداری ئەویش دەناسـم. هاتم ئاگادارت کەمو دۆسـتایەتیو بەڵێنی خۆم بە تۆ نیشان بدەمو ئەوەی لە روانگەی دینو پیاوەتیو دۆسـتایەتی لە سەر من پێویستە ئەنجامی بدەم.

پیاوی پیـاو ناکا پەیمانشـکێنی
قـەت لەبیر ناکا عەهـدو بەڵێنی[1]

وە ئێستا، واباشە تەدبیرێک بکەیو بەپەلە روو دە فێڵو حیلە بکەی بەڵکوو رێگەی نەجاتێک بۆ خۆت بدۆزییەوە.

کاتێک شەنزەبە قسەکانی دێمنەی بیست، عەهدو پەیمانەکانی شێری وەبیر خۆی هێناوە ـ وە باوەڕی بە قسەکانی ئەو پتەو بوو، گوتی: پێویست ناکا شێر غەدرم لێ بکا. چونکە لە منڕا خەتایەک رووی نەداوە، بەڵام بە درۆ ئەویان لە من دڕدۆنگ کردووەو بە فێڵو درۆ منیان خسـتۆتە بەر شەپۆلی تووڕەیی ئەو. جەماعەتێک دە خزمەت ئەودان هەموویان لە بەدکرداریدا وەستان. لە خەیانەتو دەستدرێژیدا ئازا و نەترسن...

ئەوانـە هەر چی لەمەڕ دیترانەوە بیڵێن، شـێر گوێڕایەڵەو بڕوایان پێدەکا. هەمـوو لێمان روونە کە هاودەمی دەگەڵ کەسـانی خراپەکارو پیلانگێڕ دەبێتە هۆی دڕدۆنگیو بەدگومانیو ئەم شێوە بەڕێوەبردنە ئاکامەکەی بە هەڵە چوونە، وەک هەڵەی مراوی:

دەڵێن مراوییەک لە ئاودا عەکسـی ئەسـتێرانی دەدیـت، پێی وابوو ئەوانە ماسـین. حەولی دەدا بیانگرێو هیچی بۆ نەدەکرا. پاش ئەوەی چەند جار ئەو کارەی کردو هیچی دەست نەکەوت، ناچار دەستبەردار بوو. رۆژانی دوایی هەر کات ماسـی دەبینی، وای بۆ دەچوو کە هەمان نووری ئەسـتێرەنو حەولێکی نەدەدا بیانگرێ. بەرهەمی ئەم ئەزموونەی ئەوە بوو کە رۆژانە برسی دەمایەوە.

جا، ئەگەر لەمەڕ من شـتێکیان بە گوێی شـێر گەیاندبێو ئەویش باوەڕی کردبـێ، دیارە ویسـتوویەتی ئەوان ئازمایش بکا و تاقییـان بکاتەوەو تۆمەت

---

١. از عهده‌ی عهد اگر بیرون آید مرد / از هرچه گمان بری فزون آید مرد.

لێدانی من بە خەیانەتی ئەوان دابنێ. وە ئەگەر ئەوەش نەبێو بێدەلیل دڵی لە مــن پیس کردبێ هیچ بیانوویەک نامێنێ، چون تووڕەیی ئەگەر لە هۆکارێکەوە سەرچاوەی گرتبێ، داوای لێبوردن، ئەم تووڕەییە دەڕەوێنێتەوە. وە هەر شتێک کــە بە بوختانو درۆ هەڵبەســترێ، ئەگەر ئەنجام بــدرێ قەرەبوو ناکرێتەوەو ڕێگــەی عیلاج، تاریکو نادیــارە. کاری بێبنەما و زۆرداری هەرگیز بنەی نایەو هیچ ئەندازەو پایانێکی نییە.

نازانم، ئەوەی لە نێوان منو شــێردا رابردووە هیچ خەتایەک دە خۆمدا شک نابەم. کاتێک دوو کەس پێکەوە هاودەمنو شەو و ڕۆژو گاەو بێگاە لە شوێنێک بــن، لە غەمو شــادیو چاکو خراپدا پێکەوە راوێژ بکــەن، ئەوەندە ئاگادارنو بەسەر خۆیاندا زاڵن کە هەڵەیەک نەکەن، ئەوەش بزانین کە هیچ کەس لە هەڵەو لاڕێبوون بەری نییەو ئەگەر قەستو عەمدێک نەبێ، بۆ چاوپۆشیو بەدڵ نەگرتن دەست ئاواڵەیەو هیچ جوانیو رازاندنەوەیەک بۆ جەماڵی گەورەپیاوان لەوە جوانتر نییــە کە لە ناحەزیو درێوی گوناەو خەیانەتی ژێردەســتان ببوورن. وە ئەگەر مــن خەتایەکم کردبێ، هیچم بە فکردا نایە مەگەر ئەوەی لە بڕیارداندا، جاروبار ڕێنوێنییەکانم لەجێی خۆیدا نەبووبێو ئەوەی بە بێحورمەتیو جەســارەتی من لــە قەڵەم دابێ. وە هیچ قســەیەکم نەکردووە مەگەر ئــەوەی قازانجێکی تێدا بووبێ. وە ئەوجار هیچ کات لە نێو جەماعەتدا نەمگوتووەو لە هەموو قسەیەکدا لایەنی هەیبەتو شــکۆی ئەوم لەبەر چاو بــووەو حورمەتو گەورەیی بەڕێزیانم ڕاگرتووە. وە چۆن دەتوانین بیر بکەینەوە کە نەسیحەت ببێتە هۆی وەحشەتو خزمەت ببێتە سەبەبی دوژمنایەتی. وە هەر کەس لە دڵسۆزان دە ڕێنوێنیدا و لە تەبیبان دە شفا بەخشیندا و لە پیاوانی ئایینی دە ڕەواندنەوەی شکو گوماندا، لاساری بکا و گوێ نەداتە قسەیان لە سوودو قازانجی بڕیاری ڕاستو ڕزگاری لە نەخۆشیو هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاست دە عیبادەتدا بێبەهرە دەبێ.

وە ئەگەر ئەوەش نەبێ هەوا و غرووری ســەلتەنەتو دڵناســکیو ڕەنجانی پادشــایان بووبێتە هۆی ئەم تووڕەییە. وە یەکێــک لە هەڵەکانی خۆبەزلزانی پادشــایان ئەوەیە کە هەمیشــە خائینو درۆزنەکان دەلاوێننەوەو دڵســۆزانو

ڕێنوێنان دەخەنە بەر غەزەبو تووڕەیی خۆیان. زانایان گوتوویانە: بە دەستی بەستراوەوە بتخەنە ناو دەریا و بناو بی، بە مەستی دمی ماری کلکپەڕیو بمژی، زۆر مەترسیدارەو لەوانەش مەهلەکەترو سامناکتر خزمەتو نزیکی لە پادشایانە.

وە ڕەنگە ئەوش بتوانین دە بەرچاو بگرین کە هونەرو لێهاتوویی من بووبێتە هــۆی ئــەم رووگەردانییە، چون قــودرەتو بازو ڕەوتی ئەســپ، دەبێتە هۆی زەحمەتو دەردەســەری خۆیو داری پڕبەریش لەبەر میوە بەتامو خۆشــەکەی لقوپۆپی دەشکێو جوانیی کلکی تاوس دەبێتە هۆی ئەوەی پەڕکەندەبێو باڵو کلکی بڕووتێتەوە.

تاوسو ڕێــوی لەبەر کلکو کــەوڵ تێدا دەچن
عیلمو زانســـتیش لە من بۆتـــە وەباڵی گەردنم[1]

وە هونەرمەندان بە ئێرەیی پێبردنی بێهونەران دەکەونە واری تێداچوون. وە دوژمنی مێرخاسانو جوامێران، بۆرە پیاوی گولەکەو خوێریلەنو چون ژماریشان زۆرە زاڵ دەبن، چون لە هەموو شــوێنێک لاتولووتەکان زۆرترن، وە خەسیسی دەســتقووچاو لە دیداری پیاوی دەســتئاوەڵاو، نەزان لە هاونشینی پیاوی زانا و کەرەپیاو لە دۆســتایەتی پیــاوی زیتو وریا، وەرەزو بێــزارن. وە ئەوانەی بێهونەرن لە ناحەزکردنو نێوزڕاندنی ئەهلی هونەردا ئەوەندە تێدەکۆشــن کە لیباسی پەســتیو ناکەســی دەبەر هەموو هەڵسوکەوتو هەستان دانیشتنیان دەکــەنو وەک خائینو جینایەتکار بە پادشــایان دەناســێننو هونەر کە خۆی مایەی بەختەوەرییە، دەیکەنە ماکەی زوڵمو دڵڕەشی.

وە ئەگەر پیاوخراپەکان ئەو کارەیان کردووەو چارەنووسم ئەوە بێ کە ئەوان دەیانەوێ، کار دژوارتر دەبێ. چون تەقدیری ئاســمانی، شــێری دڕندە دەکاتە ئەســیری ناو سندووقو ماری گەزندە دەبێتە دیلی بن سەوەتەو زانای دووربین، گێژو ســەرگەردانو کەرەپیاوی بێعەقڵ، دەکاتە زانای زیرەکو، ئازای بێباک، ترسەنۆکو ترســەنۆکی لەخۆڕیاو، ئازای زراوتۆقێنو دەوڵەمەندی ماڵئاوەدان، دەکاتە ســواڵکەری بەردەرکانو، ڕەشوڕووتی بــێزەواد، دەکاتە دەوڵەمەندی

---

١. وبال من آمد همه دانش من / چو روباه را موی و طاووس را پر.

بەماڵوحاڵ.

دێمنە گوتی: ئەوەی کە شێر، لەمەڕ تۆ کەوتۆتە سەری لەو بابەتانە نین کە تۆ باست کردن؛ وەک تێچاندنی دوژمنانو رەنجانی پادشایانو ئەمجۆرە شتانە. نەخێر، بەڵام زۆر بێوەفایەو ئەهلی غەدرو زۆرداریییە، چونکە ملهۆرێکی غەدداره‌و هەتا بڵێی فێڵبازو لە بنەوبڕە. هەوەڵجار دۆستایەتیکردنی زۆر شیرینو خۆشەو، ئاخریەکەی گرژیو تاڵیو مەرگ.

شــەنزەبە گوتی: تامی هەنگوینم چێشت، ئۆرەی ژەهراوی مەرگە. بەڕاستی ئەجــەل بۆ ئێرەی پەلکێش کردم. دەنا منو دۆســتایەتی شــێریان نەگوتووە. مــن توعمەو پارووی ئەوهو ئەویــش دەیەوێ من بخوا. بەڵام تەقدیری ئەبەدیو تەماعکاری خۆم منی خستە ئەم گێژاوەوە. وە ئەمڕۆ ئیتر هیچ چارەو تەدبیرێک ناکــرێو عەقڵــم بە هیچ کوێ ناگا. وە مێشــهەنگوین لەســەر گوڵی لیلووپەڕ دەنیشــێو بۆنوبەرامەی خۆشو دڵڕفێنی مەستو بێهۆشی دەکا و لە خۆشیو شادیدا ئاگای لە خۆ دەبڕێو بە وەخت لەسەر گوڵ هەڵناستێ، پەڕەپەڕەی گوڵ وێک دێنەوەو ئەو دەوێدا دەمرێ. وە هەر کەس لە دنیا بەوەندە ماڵە رازی نەبێ کە پێی بەرێ دەچێو بە دوای ماڵو سامانی زۆرترەوە بێ، وەک مێش وایە کە بە مێرگو باغو مەزرای زەنوێرو پڕ لە گوڵو رێحان رازی نەبێو دەچێتە ســەر ئــەو ئاوە کە دە گوێی فیلدایــەو بە تەکانێکی گوێی فیل دەکوژرێ. هەر کەس خزمەتو دڵسۆزیو نەسیحەتی کەسێکی بکا کە قەدری نەزانێ، وەک ئەوە وایە کە بە هیوای بەرهەمێکی زۆر، لە شۆرەکاتاندا تۆو بچێنێو دەگەڵ مردوو ببێتە دۆستو راوێژی دەگەڵ بکا و غەمو شادی خۆی بۆ کەرێکی مادەرزاد بگێڕێتەوەو لەسەر ئاوی رەوان مەتەڵۆکە بنووسێو بۆ ئەوەی منداڵی بێ، ئەویندارى دەگەڵ ئەو عەکسانە بکا کە لە گەرماو(حەمام)دا هەڵیاندەواسن.

دێمنە گوتی: لەو قسانە بگەڕێو فکرێک بۆ حاڵی خۆت بکە.

شــەنزەبە گوتی: چ فکرێک بکەمەوە؟ من رەوشــتی شــێر دەناسمو تاقیم کردۆتــەوە، بۆ من بێجگە لە خێرو خۆشــی هیچی ناوێ. بەڵام نزیکانی ئەو بۆ کوشتنی من تێدەکۆشن. ئەگەر بەمجۆرە بێ، کارەکە دژوار دەبێ، چون زاڵمانی

پیلانگێڕ ئەگەر پشـــتی یەک بگرنو دەســـت لە دەســـتی یەک بنێنو پێکەوە بیانەوێ کەســـێک لەناو بەرن، زوو ســـەردەکەونو پشتی دەشکێنن. هەر وەک گورگو قەلەبەڵەکەو چەقەڵ، قەســـتی گیانی وشتریان کردو سەرکەوتن، دێمنە گوتی: چۆن بوو ئەم حەکایەتە؟

شـــەنزەبە گوتی: دەگێڕنـــەوە کە قالاوێکو گـــورگو چەقەڵێک دە خزمەت شێرێکدا بوون. ئەو شوێنەی لێی دەژیان نزیک ڕێگایەکی ئاوەدان بوو. وشتری بازرگانێـــک لـــە نزیک ئەوان لـــە کاروان بەجێ ما. بۆ لەوەڕ هاتە نێو مێشـــەو دارســـتان، کە گەیشتە نزیک شـــێر، ناچار کڕنۆشی کردو ئەوەندی توانی ڕێزی لێگرت، شـــێریش لە بەرانبەردا بەخێرهاتنی کردو زۆری لاواندەوەو لێی پرسی: بە چ مەبەستێک لێرە ماویتەوە، پێت خۆشە لێرانە بمێنییەوە یا دەڕۆی؟ جوابی داوە: هەر چی پادشا بفەرموێ وادەکەم. شیر گوتی: ئەگەر مەیلت لە مانەوەیە، لە لای من ئاســـوودەو بێترسو دڵەڕاوکێ بمێنەوە. وشـــتر خۆشحاڵ بوو، لێبڕا لەو مێشـــەیەدا بمێنێتەوە. ماوەیەک بەســـەردا تێپەڕی. ڕۆژێک شـــێر بە دوای نێچیرێکدا دەگەڕا. تووشی فیلێکی مەستی چاو سوور بوو، بە گژ یەکدا چوونو هەر دووکیان بەهێزو بێڕەزا بوونو یەکتریان هێنا و برد. شێر بە برینداریو بە ناڵەناڵ گەڕاوەو چەند ڕۆژان پەکی ڕاوی کەوت. گورگو چەقەڵ، برسی مانەوە. شێر هەستی بەو حاڵەتەیان کردو گوتی: ئایا لەو دەوروبەرانە ڕاوێک دەبینن تا بۆی وەدەر کەومو شتێکتان بۆ پەیدا کەم؟

ئـــەوان چوونـــە قوژبنێکو بە یەکتریان گوت: مانەوەی ئەم وشـــترە لە لای ئێمە چ قازانجێکی هەیە؟ نە ئێمە دۆســـتایەتیمان دەگەڵی هەیە، نە پادشـــاش ئاسایشـــێکی لێ دیوە. باشتر وایە شـــێر تێکی بشکێنێ، تا چیدی بێ خواردن نەبێو ئێمەش بەشـــێکمان پێ ببڕێ. چەقەڵ گوتی: ناتوانین ئەوە بکەین. شێر پەنای داوەو دە خزمەت خوێدا ڕایگرتووە. هەر کەس بۆ غەدرکردن هانی پادشا بدا و فکری پەیمانشکێنی بخاتە سەری، یارانو دۆستان دەخاتە نێو مەنجەنیقی بەڵاو ئافەتو فەوتان بە کەمەند بۆ لای خۆی ڕەکێش دەکا.

قالاو گوتـــی: بۆ ئەو عەهدو پەیمانە ڕێگە چارەیـــەک دەتوانین بدۆزینەوەو

شـــێر لەو بەڵێنو قەولە رزگار بکەین، ئێوە لێـــرە مەبزوون تا من دەگەڕێمەوە لاتان. رۆیشـــتە لای شێر. شێر پرسی هیچتان دیتەوە؟ قاڵاو گوتی کەس لەبەر برســـیەتی چاوی نابینێ. بەڵام چارەیەکی دیکە هەیە. ئەگەر پادشا رای لەسەر بێ هەمووەمان تێروتەســـەل دەبین. شـــێر گوتی: بڵێ بزانـــم. قاڵاو گوتی: ئەم وشترە لە نێو ئێمەدا بێگانەیەو بوونی بۆ پادشا هیچ سوودێکی نییە.

شـــێر دەرهەڵبوو، گوتی: ئەم قســـەیە لە وەفا و ئازادەگی بەدوورەو دەگەڵ پیاوەتیو کەرەم یەک ناگرێتەوە. وشترم پەنا داوە چۆن دەتوانم جەورو جەفای دەگەڵ بکەم؟

قـــاڵاو گوتی: زۆر باش ئاگاداری ئەو بابەتەم. بەڵام زانایان گوتوویانە: تاکە کەسێک، فیدای ئەهلی بەیتێک بێ، ماڵباتێکیش دەبێ بۆ عێلو قەبیلەیەک فیدا بکرێو عێلێکیش بۆ جەماوەری شـــارێک قوربانی بکرێو خەڵکی شارێکیش لە کاتی مەترسیدا بە قوربانی زاتی پادشا بێ.

بۆ ئـــەم عەهدو پەیمانەش کـــە دەفەرمووی رێگە چارەیـــەک دەدۆزینەوە، بەشـــێوەیەک کە هیچ عەیبو ئیرادێک نەگەڕێتەوە ســـەر پادشـــا. وە ئێســـتا خاوەنشکۆ لەبەر برسیەتی کەوتۆتە مەترسی هیلاکەتەوە. شێر سەری بەرداوە.

قاڵاو بە هەڕەمە گەڕاوە لای هاورێیانو گوتی: هێندێک سەرکێشی کردو تووڕە بوو. ســـەرەنجام رام بوو. ئێستا وا باشـــە هەمووەمان بڕۆینە لای وشترو باسی رەنجو مەرارەتی شێری بۆ بکەینو بێژین: "ئێمە لە ژێر سایەی گەورەییو شکۆی ئەم پادشـــایەدا رۆژگارێکی پڕ لە بەختەوەریو شادیمان بۆ دابین بووە. ئەمڕۆ کە ئەو تووشـــی زەحمەتو مەینەت بووە، ئەگەر بە هەموو چەشنێک خۆمان لە پێناویدا فیدا نەکەینو گیانو لەش بۆ ئاســـایشو حەسانەوەی قوربانی نەکەین، کوفرانی نیعمەتمان کردووەو لە لای مێرخاسانو ئەهلی پیاوەتی سووکو چرووک دەبین. چاک ئەوەیە بڕۆینە خزمەتیو سپاسی ئەو ئاسایشو نیعمەتانە بکەین کە لە سایەی ئەودا دەستمان کەوتووە. عەرزی بکەین کە هیچ کارێکمان لە دەست نایە، گیانو لەشـــمان قوربانی پادشـــا دەکەینو هەر کام لە ئێمە پێی دەڵێین: "با ئەمڕۆ پادشـــا من بکاتە فراوێنو خۆراکی خۆی. وە ئەوانی تر ئەو بۆچوونە

رەد بکەنـــەوەو بەهانەیەک بێننەوە، بەم دڵۆڤانیو مێهرەبانییە حەقێکمان ئەدا کردووەو هیچ زیانێکمان پێ ناگا".
ئەو قســانەیان بە وشــتری ملدرێژو باڵابەرز گوتو ئەو بێچارەیان بەو گوتە جادووگەرانەیە، خستە بنبەستو رێگەیان بۆ نەهێشتەوەو هەموویان چوونە لای شــێر. پاش پێهەڵگوتنو سپاسی گەورەیی پادشا، قاڵاو گوتی: ئاسوودەیی لە ژیانی ئێمەدا بە ســلامەتی زاتی پادشــاوە گرێ دراوە. وە ئێستا پێویستییەک هاتۆتە ئاراوە، ئەمڕۆ پادشا لە گۆشتی لەشی من ئاهێکی بێتەوەبەر، با من تێک بشــکێنێ. ئەوانی دی گوتیان: خواردنی تۆ چ سوودێکی هەیەو کێ بەو بڕووکە چەرمە چەقاڵتەیە تێر دەبێ؟ چەقەڵیش هەر بەم شــێوەیە قسەی خۆی کردو جوابیان داوە: تۆ گۆشــتت بۆگەنی لێدێو زەرەری هەیەو بۆ خواردنی پادشــا نابێ. گورگیش وەک ئەوانی دیکە ئامادەیی خۆی دەبڕی. گوتیان گۆشتی تۆ، دیفتری لێ پەیدا دەبێو چی لە زەهری هەلاهیل کەمتر نییە.
وشتر ئەو فریوەی وەک شەکرو قەند خواردو ئامادەیی خۆی راگەیاند. هەموو قســەیان کرد بە یەکو گوتیان: "راســت دەڵێیو دیارە لە گیانو دڵەوەو لەبەر خۆشەویستی زۆر ئەمە دەفەرموی". ئەوجار هەموو رژانە سەریو لەتو کوتیان کرد. وە ئەو مەســـەلەیەم بۆ ئەوە هێناوە کە بزانی فێڵبازیو پیلانی دۆستانی بەغەرەز، بەتایبەتی ئەگەر لەسەری کۆک بن. کاری خۆی دەکا.
دیمنە گوتــی: چون خۆت نەجات دەدەی؟ رای تۆ چییە؟ گوتی: بێجگە لە شــەڕو بەرەنگاری رێگایەک نییە. چون ئەگەر کەسێک تەواوی تەمەنی بە دڵو بە ئیمانەوە نوێژان بکا و لە ماڵی حەڵال ســەدەقە بدا، ئەوەندی خێر پێ ناگا کە ســەعاتێک لە رۆژێکدا بۆ پاراســتنی ماڵو گیانی خۆی جیهاد بکا. چون بە جیهــاد لە رێگای ماڵدا ئەگەر بکوژرێ شــەهیدی. لــە جێگەیەک کێرد بگاتە سەر ئێسقانو باسی گیان لەدەســـتدان بێ، ئەگەر لە روانگەی دینو عیزەتەوە خەباتێک بکەی، بەرەکەتو خێری ئەم کارە هیچ سنوورێکی نییەو فکرو خەیاڵ لە تێگەیشتنی بارستای ئەو خێرە تێماون.
دیمنە گوتی: پیاوی زانا دە شەڕکردندا پەلەو هەڕەمەو پێشدەستی ناکا. وە

ئەنجامی کاری گەورەو پرمەترسی بە باش نازانێ. پیاوی خاوەنڕا و بەتەدبیر تا ئەو جێگەی بۆی مومکین بێ بە مودارا و دڵۆڤانی لە دوژمن نزیک دەبێتەوەو لە ناوبردنی شەڕو ناخۆشی بە خۆشڕوویی‌و نەرمکێشی باشترە. دوژمنی بێهێزیش نابێ بە کەم بزانی. چون ئەگەر بە زۆرو توانا دەرەقەتیش نایە، بە پیلان‌و حیلە ئاژاوە دەنێتەوە. ئەوەش بزانە دەسەڵات‌و قودرەت‌و دەستوبردی شێر لە ئەندازە بەدەرەو هەر کەس دوژمن بە کەم بگرێ‌و لە هیلاکەتی شەڕو پێکدادان غافڵ بێ، پەشیمان دەبێتەوە. هەر وەک وەکیلی دەریا پەشیمان بۆوەو دۆڕاندی.

شەنزەبە گوتی: چۆن؟ دیمنە گوتی: دەڵێن چەشنێک مراوی هەیە، ناوی "تەیتەوی"یە. جووتێک لەم مەلانە لە قەراخ دەریا بوون کە مێیەکە وە هێلکەهات گوتی: دەبێ شوێنێک بۆ هێلکەکردن بدۆزینەوە. نێرەکە گوتی: ئێرانە زۆر خۆشەو جارێ بەجێهێشتنی ئێرە مەسەلەحەت نییەو دەبێ هێلکە بکەی. مێیە گوتی: مانەوە لێرە جێگەی وردبوونەوەو بەراوردکردنە. ئەگەر دەریا هەستێ‌و شەپۆلەکان جووجەڵەکانمان رەپێچەک بدەن، قوڕی کوێ وەسەر خۆمان کەین! نێرە گوتی بڕوا ناکەم وەکیلی دەریا ئەو جەسارەتە بکا و لایەنی من رانەگرێ. ئەگەر، بێشەرمی بکا و حورمەتی من رانەگرێ، دەتوانم تەمێی بکەم. مێیە گوتی: خۆناسین کارێکی عاقڵانەیە. تۆ بە کام زۆرو تواناتەوە بە خۆت دەخوڕێ‌و هەڕەشە لە دەریا دەکەی؟ لەو کەللە شەقییە بگەڕێ‌و جێگەیەکی قایم بۆ هێلانە دیاری بکە. چون هەر کەس گوێ نەداتە قسەی دڵسۆزان، ئەوەی بەسەردێ کە بەسەر رەقە هات. گوتی چۆن؟ جوابی داوە:

دەگێڕنەوە دە پاشاوێکدا دوو مراوی‌و رەقەیەک دەژیان. لە نێوانیاندا، بە حوکمی جیرانەتی، پێوەندی دۆستانە بەرقەرار بوو. لە نەکاو، دەستی رۆژگاری غەددار روخساری حاڵ‌و ژیانی ئەوانی داڕووشاندو گەردوونی ئاوێنەسا بەستێنی لێک هەڵبڕانی بۆ پانکردنەوە. ئەو ئاوەی کە مایەی ژیان‌و بەرێچوونیان بوو لە کەمیدا، هەڵچۆڕا. مراوییەکان کە وایان دیت، چوونە لای رەقەو گوتیان: بۆ ماڵاوایی هاتووین، خواحافیز ئەی دۆستی راستگۆی وەفادار. رەقە لەتاو دەردی* دووری دەستی کرد بە گریان‌و گەوهەری فرمێسکانی هەڵوەراند.

لَـولاٰ الّدمـوعُ وَ فیضُهُـنَّ لأَحْرَقَـتْ
اَرْضَ الْـوَداعِ حَـرارَتُ الاکبـادِ[1]

گوتی: ئەی دۆســتان، ئەی هاوڕێکانم. زەرەرو زیانی بێئاوی بۆ من زۆرترە. من بە بێ ئاو بەرێچوونم نابێ. ئێســتا بە حوکمی دۆســتایەتیو پیاوەتی، دەبێ بۆ راگوێزتنی من رێگە چارەیەک بدۆزنەوە. گوتیان دەردی دووری لە تۆ بۆ ئێمە ســەنگینەو بچینە هەر شــوێنێک، با دە خۆشیو زۆری رسقو رۆزیشدا بژین، بێ تۆ وە گیانمان ناکەوێو خۆشــی لێ نابینین. بەڵام تۆ گوێ نادەیە نەســیحەتی دڵسۆزانو رەفیقانو نازانی قازانجو زەرەری تۆ لە چیدایە. وە ئەگەر دەتەوێ تۆش دەگــەڵ خۆمان بەرین، مەرجی ئەوەیە کــە تۆمان هەڵگرتو چووین دە حەواوە، خەڵــک هەر چی گوتیان تۆ لێوت نەکەیتــەوەو هیچ گوێت لێ نەبێ دەڵێن چی. گوتی: بەسەرچاو، هەر چی ئێوە بڵێن وا دەکەم. ئەوەی ئێوە دەگەڵ من دەیکەن ئەوپەڕی پیاوەتییەو منیش قبووڵ دەکەمو سکوت بمو بێدەنگ دەگەڵتان کەوم.

مراوییــەکان دارێکیان هێنا و رەقە نێوەراســتی دارەکەی مەحکەم بە ددان گرت. مراوییەکان ئەم سەرو ئەو سەری دارەکەیان بە دندووک گرتو لە شەقەی باڵیــان دا و رەقەیان برد. وەختێک تەواو بڵند بوونو خەڵک چاویان پێکەوت، سەریان سووڕما و هاواریان دەکرد: "تەماشا کەن مراوی رەقەی دەبەن!". رەقە ســەعاتێک ددانی بە جەرگی خۆی داگــرتو چی نەگوت، ئاخری وەگیان هاتو گوتی: "کوێراییتان بگاتێ!" زارکردنەوە هەمانو بەرەوخوار بەربوونەوە هەمان. مراوییەکان قڕاندیان: با نەسیحەت بێ بۆ دۆستان.

بەختــەوەر ئــەو کەســەی کە گــوێ دەگرێ
زۆر بــە وردی لــە پەنــدی خێرخــوازان[2]

رەقە گوتــی: ئەوانە هەمووی خەیاڵی بەتاڵن، چون کاتێک ئەجەل داســی خۆی تیژ کردو وەک هاران رووی دە کەسێک کرد، زنجیر پساندن هیچ فایدەی نییــەو هیچ عاقڵێک بەرەنگاری نابێتەوە. خۆ لە مەرگ پاراســتن لە دوو رۆژی

---

١. ئەگەر فرمێسکەکانو بەرەکەتی وان نەبوایە، سۆزی جەرگو مەناوان، شوێنی لێکهەڵبڕانی دەسووتاند.
٢. نیک‌خواهان دهند پند و لیک / نیک‌بختان بوند پندپذیر.

تایبەتدا رەوا نییە. رۆژێک کە قەزا و قەدەر دەیەوێ کەسێک لەناو بەرێو رۆژێک کە نایەوێ.

تەیتەوی نێر گوتی: ئەو پەندەم بیستووە، بەلام مەترسەو لە جێی خۆت مەبزوو، مێیە هێلکەی کردو وەکیلی دەریا گوێی لەو قسانە بوو. لە خۆبەزلزانیو ترۆتۆپی تەیتەوی توورە بوو. دەریا رووی گرژ کردو شەپۆلەکان جووجەڵەکانیان برد. مێیەکە ئەوەی دیت زۆر پەشۆکا و شڵەژا و گوتی: من دەمزانی ئاو گاڵتەی پێ ناکرێو تۆ بە کەریەتی خۆت سەری بێچووەکانت بە فەتەڕاتو فەوتان دا و ئاورت دە گیانی من بەردا. ئەی قوڕبەسەر، ئێستا فکرێک، تەدبیرێک. تەیتەوی نێر گوتی: ئاگات لە خۆت بێ، بزانە دەڵێی چی. من لە عۆدەی قەولی خۆم دێمە دەرو تۆڵەی خۆم لە دەریا دەکەمەوە. لەجێوە رۆیشتە لای باڵندەی دەوروبەرو گەورەو دەمڕاستی هەر تایفەیەکی کۆ کردەوەو رووداوی بۆ باسکردنو لە قسەکانیدا وەبیری هێنانەوە ئەگەر هەموو دەست نەدەنە دەستی یەکو لە تەدارەکی ئەم کارەدا پشتی یەک نەگرن، وەکیلی دەریا بە هیچمان دانانێو کاتێک ئەم رەسمو دابونەریتە درێژە پەیدا بکا، هەموو تێدا دەچن. باڵندەکان بە کۆمەڵ چوونە خزمەت سیمورغو ئەوەی رووی دابوو بۆیان گێڕاوە. وە بە ئاشکرا و بێپەردە گوتیان کە ئەگەر لە تۆڵەسەندنەوەدا یارمەتی نەدا، چیتر بە پادشای باڵندەو پەلەوەرانی نازانن. سیمورغ وەجووڵە کەوتو بە ورەی بەرزەوە هەنگاوی هەڵگرت. باڵندەکان بە یارمەتیو پشتیوانی ئەو، پشتئەستوور بوونو بڕیاریان دا بۆ تۆڵەسەندنەوە پەلاماری دەریا بدەن. وەکیلی دەریا ئاگاداری هێزو قودرەتی سیمورغو پەلەوەرەکان بوو، ناچار، جووجیلەکانی دایەوە بە دایکو باوکی.

وە ئەم نەزیلەیەم بۆ گوتی تا بزانی کە هیچ دوژمنێک نابێ بە کەم بگری.

شەنزەبە گوتی: لە شەڕدا من نابمە یەکەمو شەڕ هەڵنایسێنم، بەلام خۆپاراستن لازمەو چارە نییە، دەبێ دەست بکەیتەوە.

دێمنە گوتی: ئەگەر چوویتە لای، نیشانەی شەڕ دەبینی. ئەویش ئەوەیە، کە قیتو قنج دانیشتبێو کلکی دە عەرزی بکوتێ.

شەنزەبە گوتی: ئەگەر ئەم نیشانەگەلە ببیندرێ، حەقیقەتی غەدرو زۆرداری ئەو لە تۆزو غوباری شکو گومان دەردەکەوێ.

دیمنە شادمانو رووگەش گەڕاوە لای کلیلە. کلیلە پرسی: کارەکەت بە کوێ گەیاند؟ گوتی: ئاســوودەیی‌و ئاســایش بە هەموو جوانییەوە رووومان تێدەکا. پاشان هەر دووکیان چوونە لای شێر، بە هەڵکەوت تووشی گاش هاتن. کاتێک شــێر چاوی بە گا کەوت، زەق راوەســتا و نەعرەی دەکێشا و کلکی وەک ماری ســوجەی، گا ئەنگێو، هەڵدەسووڕاند. شــەنزەبە زانی قەستی گیانی کردووەو بــە خۆی گوت: خزمەتکاری ســوڵتان لە ترس‌و هەراســدا وەک هاوماڵی مارو هاوخەوی شــێرە کە هەر چەند مار خەوتبێ‌و شێر دەبن لێفەدا بێ‌و دیار نەبێ، ئاخرسەر ئەم سەر دەردێنێ‌و ئەو دەمی دادەپچڕێ.

دەو فکرانــەدا بــوو و خۆی بۆ بەرگــری ئامادە دەکرد. شــێر کە حاڵەتی هەڕەشەو ئامادەیی لە گادا هەست پێکرد، لەجێی خۆی دەرپەڕی‌و هەر دووکیان بەگژ یەکدا چوون‌و خوێن لە لەشــیان دادەچــۆڕا. کلیلە کە ئەوەی دیت رووی دە دیمنــە کردو گوتی: کەری نەفام بزانە بە درۆ و دەلەســەی تۆ، چ شــەڕو هەرایەک هەڵایساوە؟ دیمنە گوتی: کام شەڕو هەرا، کام ئاکامی خراپ؟ گوتی: زەحمەت‌و ماندوو بوونی شێر، ئاکامی ناحەزی پەیمانشکێنی، بە هیلاک چوونی گا و بە هەدەرچوونی خوێنەکەی، شــێواوی جەماعەتی لەشکرو تەفرەقەی سپا و ناکاممانەوەی تۆ لەوەدا کە قەرار بوو ئەم کارە بە سوڵح‌و ئاشتی بە ئەنجام بگا و ســەرنەکەوتی‌و کارەکەت گەیاندە ئێــرە. وە نەزانترین کەس ئەوە کە لە خۆڕا و بێ‌دەلیل، گەورەی خۆی بخاتە نێو گێژاوی شــەڕ وە زانایان لە حاڵێکدا ئەوپەڕی هێزو قودرەتیان بووە، وەک قرژاڵ کشــاونەتە دواوەو لە بەرپاکردنی شەڕو هەرا و تێکهەڵچوون خۆیان پاراستووە. وەزیرێک کە پادشا بۆ شەڕ هان دەدا، ئەویش لەسەر مەسەلەیەک کە بە هێمنی‌و بە ئاشتی چارە دەکرێ، دەلیلە لەســەر نەفامی‌و کەریەتی ئەو. ئەوەش لەبیر نەچێ، کە مەشوەرەت‌و بیروڕای دروســت، لە ئازایەتی‌و نەترسی زۆر بەکەڵکترە. چونکە کاری شمشێر بە رای‌و تەدبیر ئەنجام دەدرێ‌و ئەوەی بە تەدبیر دەکرێ بە شمشــێر هەرگیز جێبەجێ

نابێ. یانی شمشــێر بە چوارناڵەش تۆزی تەدبیر ناشــکێنێ. لە هەر جێگایەک رایو تەدبیر سســـتو شـــکەتۆک بێ، ئازایەتی کەڵکی نابێ. ئەوەی دڵی بەهێز نییەو ترسەنۆکەو تەدبیری نییە لە قسەکردندا، لاڵەپەتەی دەگرێو ناتوانێ زبان چەور و قسە پاراو بێ. ئەمن لە مێژە، خۆپەسندیو مەغروربوونت، بە وەی کە خـــۆت زۆر پێ عاقڵو زانایەو مەفتوونی پلەوپایەو ماڵی ئەو دنیایەی، کە وەک ســـیحرو جادووی غوولو تروســـکەی تراویلکە وایە، هەموویم بۆ روون بۆتەوە. بـــەڵام خۆم راگـــرتو دەگەڵتم باس نەکرد، بە هیوای ئـــەوە لە خەوی غەفلەت بێـــدار بیتەوە. وە چون لە ئەندازە دەرچـــووە، کاتی ئەوە هاتووە کە لە زۆری نەفامیو جەهلو کەریەتیو سەرلێشێواوی تۆ کەمێک بدوێمو هێندێک لە عەیبو عـــارو هەڵەو کارە ناحەزەکانت بـــۆ ئەژمار بکەمو ئەویش قەترەیەک لە دەریا و زیپکەیەک لە شاخێکە.

وە گوتوویانە: هیچ مەترســـییەک بۆ پادشـــا لەوە زلتر نییە کە وەزیرەکەی قسەی لە کردەوەی لەسەرترو گوتاری لە کردار زۆرتر بێ. وە تۆ ئەم ئەخلاقەت هەیەو قســـەت لە هونەرت باڵاترەو شـــێر بە پیلانی تۆ هەڵفریوا. وە دەڵێن کە قەولی بێعەمەلو رواڵەتی بێناوەرۆکو ماڵو سامانی پیاوی بێعەقڵو دۆستایەتی مرۆڤی بێوەفا، زانســـتی پیاوی ناشایستەو سەدقەی بێنییەتو ژیانی بێئەمنو ئاســـایشو سلامەتی، هیچ کامیان سوودێکیان نییە. وە پادشا هەر چەند خۆی دادگەرو دڵۆڤانو بێئازار بێ، ئەگەر وەزیر، زاڵمو بەدکردار بێ، قازانجی عەدڵو دڵســـۆزی ئەو ناگاتە رەعیـــەت. وەک ئاوێکـــی روونو زوڵاڵ کە نەهەنگی تێدا ببینـــن، هیچ مەلەوانێـــک، ئەگەر زۆریش تینوو بێ، یا پێویســـت بێ لەو ئاوە بپەڕێتەوە، نە دەستی بۆ دەبا و نە پای تێدەنێ.

زینەتی پادشـــایان، خزمەتکارانی بە پارێزو دروســـتکارو دەستو پێوەندی لێهاتووی کارزانو شـــارەزان. تۆ دەتەوێ کەســـی تر مەجالی خزمەتی شـــێری نەبـــێ. وە تەنیا متمانەی بە تۆ بێو هەر تۆ لە لای بی. وە ئەوەی کە قازانجی خـــۆت دە زیـــانو زەرەری دیتراندا دەبینی دەلیلی نەزانیتـــە. وە بە ئارەزووی ئەوەی، بێوەفاداریو زەحمەتێک دۆستانی وەفادارو گیانفیدات هەبێو چاوەڕوانی

خێراتی قیامەت بە عیبادەتی ریاکارانەو ئەویینداری ژنان بە تووڕەیی‌و زبان‌شڕی‌و فێربوونی زانست بە رەحەتو بێ‌زەحمەت. بەڵام ئەو قسانە هیچ سوودێکی نییە، چون دەزانم کارت لێ ناکەن‌و ناچن دە مێشکتەوەو حاڵوباڵی من دەگەڵ تۆ وەک ئەو پیاوەیە کە بە باڵندەیەکی دەگوت: "بۆ نەخۆشییەک کە عیلاجی ناکرێ، خۆت ماندوو مەکە، چون گوتوویانە: وَ داءُ النُّوکِ لَیْسَ لَهُ دواءٌ[1].

دیمنە پرسی: چۆن؟ گوتی: دەگێڕنەوە جەماعەتێک مەیموون لە کێوێکدا بوون. کاتێک پادشای ئەستێران گەیشتە ئاسۆگی رۆژاوا و جەماڵی دنیاڕازێنەوەی خۆی بە چارشێوی رەشایی داپۆشی، سپای زەنگی لەشکری رۆمی بەزاندو شکاند، شەوێک وەک کاری کافری سەرکێش لە رۆژی مەحشەردا، باڵی رەشی بەسەر دنیا کێشا، بای شەماڵ رکێف کوت، پەلاماری مەیموونانی دا. ئەو بێچارانە بە سەرما کەسیرە بوون، لە پەناگایەک دەگەڕان. لەنەکاو چاویان بە گوڵئەستێرەیەک (کرم شبتاب) کەوت کە لەولاتر کەوتبوو. پێیان وابوو پۆلووی ئاگرە. چڕوچیلکەیان لەسەر کۆ کردەوەو فوویان لێدەکرد کە گڕ بگری.

رووبەروویان لەسەر دارێک باڵندەیەک هەڵکوورمابوو. هاواری دەکرد، ئەوە ئاور نییە. ئەوانیش گوێیان پێ نەدەدا. لەو کەین‌و بەینەدا کەسێک بەو شوێنەدا تێدەپەڕی. بە باڵندەی گوت: خۆتیان دەگەڵ ماندوو مەکە، بە قسەی تۆ باوەڕ ناکەن. رێنوێنی‌و روونکردنەوەی ئەم جۆرە کەسانە وەک ئەوە وایە کە شمشێر بە بەرد تاقی بکەیەوەو شەکر دەژێر ئاودا بشارێتەوە. باڵندەکە بە قسەی کابرای نەکردو لە دار هاتە خوار تا مەیموونەکان باشتر حاڵی بکا کە ئەوە ئاورینە. گرتیان‌و سەریان لێ هەڵکەند. کارو ئەخلاقی تۆش هەر شتێکە لەم بابەتە. گوێ لە پەندی کەس ناگری‌و مەوعیزەی پیاوچاکان نابیسی، لێم روونە لەسەر ئەم کەللەڕەقی‌و لەخۆباییبوونە سەرت دادەنێی‌و لەم ئاژاوەنانەوەو کەڵەکوکوڵەکەت، کاتێک پەشیمان دەبیەوە کە فایدەی نییەو زبانی عەقڵ بە گوێتدا دەچرپێنێ کە: تَرَکْتَ الرَّأیَ بِالرَّیِّ[2]. ئەودەم پشتی دەستی خۆت دەگەزی‌و

---

١. نەخۆشی کەریەتی‌و نەفامی دەرمانی نییە.
٢. رای خۆت لە شاری رەی بەجێهێشت.

سینگ دادەڕووشێنی، هەر وەک کابرای شەریکی، غافڵی ئاگا لەخۆبڕاو، کردیەو فایدەشی نەبوو.

دیمنـە گوتی: چۆن؟ گوتی: دوو شـەریک بوون، یەکیـان زانا و ئەوی تر نـەزان. کاریـان بازرگانی بوو. لە ڕێگادا کیسـەیەکی پڕ لـە زێڕیان دیتەوە. گوتیان سوودی بێڕەنجو زەحمەت لە دنیادا زۆرە. با بەوەندە قەناعەت بکەینو بگەڕێینەوە. کە گەیشتنە نزیک شار، گوتیان با بەشی بکەین. ئەوەی خۆی پێ زیرەک بوو گوتی: چ دابەش کەین؟ ئەوەندەی بۆ خەرجو مەخاریج پێویستە لێی هەڵدەگرینو باقییەکەی لە جێگایەک دەشـارینەوەو نێوانێوان کە حەوجەمان پێـی بـوو دەگەڕێینەوەو لێی هەڵدەگرین. لەسـەر ئەم قـەرارە ڕێک کەوتن. هێندێکیان هەڵگرتو ئەوی دیکەیان لە بن دارێک شاردەوەو چوونەوە بۆ شار.

ڕۆژی دواتر ئەوەی بە زانا و زرنگی ناوی دەرکردبوو، وەدەرکەوتو زێڕەکەی برد. چەندین ڕۆژ بەسـەردا تێپەڕی شـەریکی گێلو حـۆل، حەوجێ بە پووڵ بوو. ڕۆیشـتە لای شـەریکەکەیو گوتی: وەرە بابچین هێندێک لەو ژێرخاکییە هەڵبگرین، پێداویسـتیم پێی هەیە. پێکەوە هاتنو زێڕیان نەدیتەوە. سـەریان سـووڕما. زیرەک دەسـتی بە هەراوهوریا کردو یەخەی گێلـەی گرتو گوتی: کـە زێڕەکە تۆ بردووتە. بێجگە لە تۆ کەس پێی نەدەزانی. بێچارە سـوێندی دەخـوارد کە نەمبـردووە، ئەڵبەتە فایدەی نەبوو. کەشانکەشـان هێنایە لای قازیو ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە.

قازی پرسی: شاهیدو دەلیلت هەیە؟ گوتی ئەو دارەی کە خەزێنەکەی لەژێر شـارابۆوە شایەدی دەدا کە ئەم غەیانە بێئینسـافە بردوویەتیو منی بێبەش کردووە. بە بیستنی ئەم قسەیە سەری سووڕما و پاش دەمەقاڵەیەکی زۆر قەرار درا کە ڕۆژی دوایی قازی بڕواتە لای دارەکەو گوێ بداتە شایەدی دارەکەو حوکم بدا.

ئەو زیرەکە لە خۆ دەرچووە ڕۆیشتەوە ماڵو بە باوکی گوت: مەسەلەی ئەم زێڕە بە لوتفـو خۆڕاگریەکی تۆ بەستراوەتەوە. من بە هیوای تۆ گوتوومە دارەکە شایەدی دەدا. ئەگەر بە قسەم بکەی زێڕەکە دەبێتە ماڵی ئێمەو ئەوەندەی دیش

دەستێنین. گوتی: من چم لە دەست دێ؟ گوتی دارەکە نێوی هێلۆلە، بەجورێک کە دووکەس دەتوانن خۆی تێدا بشارنەوەو کەس نەیانبینێ. دەبێ ئەمشەو بچی خۆی تێدا حەشار بدەی، سبەی کە قازی هات ئەو جۆرەی لازمە شایەدی بدە. پیرەپیاو گوتی: کوڕی باش، زۆر فێڵو حیلە هەن کە دەبنە وەباڵی گەردنی پیاوی فێڵبازو حیلەگەر، نەکا مەکرو فێڵی تۆش وەک هی بۆقەکە بێ؟ گوتی چۆن؟ بابی گوتی: بۆقێک لە جیرانەتی مارێکدا نیشتەجێ بوو. هەموو جارێک کە بێچووی دەبوو، مار دەیخواردن. ئەو بۆقە دەگەڵ قرژاڵێک دۆست بوون. ڕۆیشتە لایەو گوتی: برای بەڕێز، فکرێک لە گرفتاری من بکەوە، کە دوژمنێکی زاڵمو بەدەسەڵاتم لێ وەخۆ کەوتووە. نە دەتوانم لە بەرانبەریدا راوەستمو نە دەشتوانم ئێرە بەجێ بێڵم، چون شوێنێکی خۆشو زەنوێرە، پانتایەکەی بە فەرشی سەوزی زمرووت داپۆشراوەو بە کارەبا و میتا و یاقووت رازێنراوەتەوە.

ئاوەکەی ئاوی زەمزەمو کەوسەر
خاکی بۆنخۆشە هەر وەکوو عەنبەر[١]

قرژاڵ گوتی: دەگەڵ دوژمنی بەدەسەڵاتو زۆردار، تەنیا چارە فێڵکردنو پیلانگێڕانە. لە فلان شوێن سمۆرەیەک دەژی، چەند ماسییەک بگرەو لە هێلانەی مارەوە تا دەگاتە بەر دەرکی سمۆرە، نێواننێوان فڕێیان بدە. سمۆرە، یەکیەک دەیانخوا تا دەگاتە مارەکە، ئەویش دەخوا و رزگار دەبی. بۆق بەم پیلانە ماری لەناو برد. چەند رۆژێک بەسەردا تێپەڕی. سمۆرە بە عادەتی جاری پێشوو وەڕێ کەوت. چون عادەتو خووگرتن وەک عاشقبوون وایە. ئەوجاریش بە هیوای ماسی خواردن رۆیشتە ئەو شوێنە، ماسی دەست نەکەوتو بۆقو بێچووەکانی خوارد". ئەم مەسەلەم بۆ نەقڵ کردی کە بزانی زۆر پیلانو ئاژاوەنانەوە بۆتە هۆی تێداچوونی خاوەن پیلانەکە. گوتی: باوکە کورتی ببڕەوەو لەسەری مەڕۆ کە ئەم کارە کەمزەحمەتەو پڕمەنفەعەتە. تەماعی ماڵو خۆشەویستی ئەولاد، پیرەی وەخۆ خست. دینو ئیمانی لەو لا دانا و خۆی بۆ ئەم کارە ناشەرعیو دژ بە تەریقەتە ئامادە کرد. وە ئەو جۆرە کوڕەکە گوتبووی، کەوتە رێ. رۆژی

١. آب وی آب زمزم و کوثر / خاک وی خاک عنبر و کافور.

دووایی قــازی وەدەرکەوتو جەماعەتێکی زۆر لە دەوری دار کۆببوونەوە، قازی رووی دە دار کردو باســـی زێڕی لێ پرسی. دەنگێک لە نێو دارەکەوە هەستا و گوتــی گێلە بردوویەتی. قازی واقی وڕما و بـــە دەوری دارەکەدا خولێکی لێدا. تێگەیشـــت کــە یــەکێــک دەوێدا خۆی حەشــار داوە. ـ کەس بە بەرەکەتی خەیانەت ناگاتە کەشــفــو کەرامـــەت ـ فەرمووی دارو بارێکـــی زۆر لە دەوری دارەکـــە کۆ بکەنەوەو ئاوری تێبەردەن. پیرەپیاو ســـەعاتێک خۆی ڕاگرت. کە دیتی خەریکە تێدابچێ هاواری لێ هەســـتا و ئەمانی خواست. قازی فەرمووی، دەریانهێنـــا و لاواندیەوە. راســـتییەکەی بە قازی گــوت. بەمجۆرە بێگوناهی گێلەو خەیانەتی کوڕی پیرەپیاو ئاشـــکرا بوو. پیرە هەر لەوێ گیانی دەرچوو، بە شـــایەدی دارو سەعادەتی تۆبەو پەشـــیمانی. کوڕەکە پاش سزادان، تەرمی باوکی بە کۆڵیدا دا و بردیەوە ماڵ. گێلەش بە بەرەکەتی راستگوێیو ئەمانەتو دیانەت زێڕەکەی ئەستاندەوەو گەڕاوە. وە ئەو مەسەلەم بۆ هێنایەوە تا بزانی کە عاقیبەتی مەکرو فێڵ، ناپەسندو بەرهەمی غەدرو خەیانەت تێداچوونە.

وە تۆ ئەی دێمنە لە سستی تەدبیرو پیسی دەروونو زۆری تەماع، لە پلەیەک دای کـــە زیان لە بەیانی عاجـــزەو عەقڵ دە وێناکردنیدا تێمـــاوە. وە فایدەی مەکرو حیلەی تۆ بۆ پادشـــا ئەوە بوو کە دیتت. ئاخریش وەباڵی دەگەڕێتەوە ســـەر ملی خۆت. وە تۆ وەک گوڵی دووڕوو وای، هەر کەس دەســـتت بۆ بێنێ دڕووی تێڕادەچـــێو بریندار دەبێو لە وەفای تـــۆ بەهرەیەک نابا. تۆ وەک مار دووزمانی، بەڵام مار لە تۆ باشـــترە. کە لە هـــەر دوو زمانی تۆ ژەهر دەبارێ. راستیان گوتووە ئاوێ کەرێزو کانیو جۆگە ئەوەندە خۆشە تا نەگەیوەتە دەریا و بنەماڵە تا زەمانێک ئارامە تا مرۆڤی دێوسیفەتی تێدا نییە، دڵسۆزی برایانەو خۆشی دۆستایەتی ئەوەندە پایەدارە تا دووزمانی بەدسروشت لە نێوانێدا قسەو باسان ناهێنێو نابا و هەمیشە من لە جیرانەتیو تێکەڵاوی دەگەڵ تۆ هەراسان بوومو قســـەی زانایانم وەبیر دەهێناوە کە دەفەرموون: لەوانەی ئەهلی فەسادو بێڕەوشتن، دەبێ دووری بکەی، هەر چەند دۆستایەتیو خزمایەتیشت دەگەڵیان هەبێ، چون نزیکی لەفاســـقان وەک پەروەردەکردنی مارە، کە ئەگەرچی مارگر

لە پەروەردەکردنو بەخێوکردنیدا زەحمەت دەکێشــێ، سەرەنجام ڕۆژێک زاری لێ دادەپچڕێ. وە حاڵەتی شــەرمو حەیا و وەفا وەک تاریکە شــەو لێدەکا. وە دۆســتایەتی پیاوی عاقڵ دەبێ بکەی هەر چەند بەشــێک لە ڕەوشــتەکانی بە ڕواڵەت جێی ڕەزامەندی نەبێ. لە جوانییەکانی عەقڵو ئاوەز دەبێ بەشی خۆمان وەربگرینو لە ئاست پیاوی جاهیلو تێنەگەیشتوو دەبێ دوورەپەرێز بین. چونکە زاتی پیاوی جاهیل لە خراپە نەبێ چی دیکە ناکا، کە وابوو لە تێکەڵاوی دەگەڵ ئەو چ ســوودێکت دەست دەکەوێ؟ وە لە جەهالەتی ئەو بێجگە لە لاڕێ بوونو ڕێ ونکردن بەهرەیەکت نابێ.

وەتۆ لەوانەی کە لە سروشتی نەحسو خووی خراپت دەبێ هەزار فەرسەنگ هەڵێــیو دوورکەویتەوە. ئاخر چۆن دەتوانم لە تــۆ، چاوەڕوانی وەفا و کەرەم بم؟ چۆن دەگەڵ پادشا، کە تۆی خۆش دەوێو قەدرو قوتبت لێدەنێ، گەورەی کــردوویو پلەوپایــەی پێداوی، تا ئەو جێگەی لە ســایەی ئەودا دەســتت بە کەلەکەی گەورە پیاوان دەگرتو پێت لەسەر ئاسمان دادەنا، ئەو موعامەلەیەت بەڕەوا زانی، وە بزانە کە مافی ئەنعامو پیاوەتییەکانی ئەو لەوکارەدا تووشــی زەجرو ئەشکەنجەت دەکا.

حەیــا تــکاوی، نەتمــاوە وەفــا
دڵو دەروونت ســەرچاوەی جەفا[1]

وە مەسەلەی دۆستان دەگەڵ تۆ حەکایەتی ئەو بازرگانەیە کە گوتبووی: "لە وڵاتێک کە مشــک سەد مەن ئاسن بخوا، کوێی سەیرە ئەگەر باز، منداڵێکی دە مەنی بفڕێنێ؟" دیمنە گوتی چۆن؟ گوتی: "دەگێڕنەوە بازرگانێک ماڵو سامانی کەم بوو. دەیەویست ســەفەرێک بکا. سەد مەنی ئاسن هەبوو، بە ئەمانەت لە ماڵی دۆســتێکی دانا و ڕۆیشــت. کە گەڕاوە، ئەمین ئاســنەکەی فرۆشتبوو و پووڵەکەشی خەرج کردبوو. بازرگان ڕۆژێک بۆ وەرگرتنەوەی ئاسن ڕۆیشتە لای. کابرا گوتی: ئاســنم لە ژێرخانێکی ماڵێدا لەســەر یەک دانابوو، لێی بێخەبەر مامەوە، تا وەخۆ هاتمەوە مشــک هەمووی خواردبوو. بازرگان گوتی: "ڕاستە،

---

۱. یک قطره ز آب شرم و یک ذره وفا / در چشم و دلت خدای داناست که نیست.

مشک ئاسنی زۆر پێ خۆشەو ددانی دەتوانێ ئاسن بپچڕێ. ئەمینی نادروستکار زۆر خۆشحاڵ بوو، پێی وابوو بازرگان دەستی لە ئاسنەکە هەڵگرتووە". گوتی: "ئەمڕۆ میوانم بە" گوتی:"سبەێنێ دێمەوە".

وەدەر کــەوتو کوڕێکـــی کابرای دەگەڵ خۆی برد. بە شـــوێنیدا گەڕانو لە شـــاریدا جاڕیان کێشا و ســـۆراغی کوڕەیان دەگرت. بازرگان گوتی: من بازێکم دیـــت کە منداڵێکی هەڵگرتبوو دەیبرد. ئەمین هاواری لێ بڵند بوو کە قســـەی مەحاڵ بۆ دەکەی؟ باز چۆن منداڵ دەفڕێنێ؟ بازرگان پێکەنیو گوتی: بۆ تووڕە دەبی؟ لە شارێکدا مشک بتوانێ سەد مەن ئاسن بخوا، بازیش دەتوانێ منداڵێک هەڵبگرێ. ئەمین لێی حاڵی بوو چ باسە. گوتی: مشک ئاسنی نەخواردووە. لە لای منە. کوڕەکەم بدەوەو ئاسنەکە بەرەوە.

جا، ئەم مەســـەلەم بۆ هێنایەوە تا بزانی کە چون دەگەڵ پادشا ئەو کارەت کـــرد، لەمە بەدوا کەس بە هیوای وەفاداریو راســـتگۆیی لێت نزیک نابێتەوە. وە هیچ کارێک بێفایدەتر لەوە نییە کە دەگەڵ کەســـێک دۆستایەتی بکەی کە لە مەیدانی پیاوەتیدا پیادەو لە شـــوێنی وەفاداریدا سەرشـــۆڕو شەرمندە بێ. هەر وەها چاکەکردن دەگەڵ کەســـێک کە دە مەزهەبی خۆیدا شـــوکرو پێزانین فەرامۆش بکا، وە نەســـیحەتکردنی کەســـێک کە نە گوێت لێدەگرێ، نە بەدڵ قســـەکەت وەردەگرێ، وە رازو نهێنی بە کەسێک گوتن کە رازدار نییەو قسەی تێدا ڕاناوەستێ.

وە بۆ من وەک ڕۆژ ئاشـــکرایە کە لە رەشـــی بەدکرداریو غەدری تۆ دەبێ خۆم بپارێزم، کە دۆستایەتی ئەشرار مایەی دڵڕەقییەو تێکەڵاوی دەگەڵ پیاوی هەڵکەوتە کیمیای ســـەعادەتە. وە ئەم بابەتە وەک ســـروەی بەیان وایە ئەگەر بەســـەر گوڵاندا تێپەڕێ بۆنی خۆش بڵاو دەکاتەوەو ئەگەر بەســـەر پەینوپاڵدا بڕوا، بۆگەن دەگەڵ خۆی دێنێ. دەزانم ئەم قسانەت بەلاوە تاڵو قورسە. قسەی حەق تاڵەو کارتێکردنی لە گوێی لەخۆڕازیو ملهۆڕاندا ناخۆشە.

وەختێک وتووێژی ئەوان گەیشـــتە ئێرە، شێر گای کوشتبوو، کەلاکی لەوێ دە خوێندا شـــەلاڵ، بەسەر زەویدا کەوتبوو. شـــێر کە رقی نیشتبۆوە، کەمێک

راما و بەخۆی گوت: حەیف بۆ شەنزەبە، بەو هەموو عەقڵو تەدبیرو هونەرەوە. نازانم لەو کارەدا بە هەڵە چووم یا نە. وە ئەوەی دەربارەی ئەو بەمنیان گوت، راســـتیو ئەمانەتی تێدابوو، یا رێگەی غەیانی بێباکیان گرتەبەر. هەر چی بوو، مـــن خۆم ماڵوێرانو بێچارە کرد، تازە غەم خواردنو ئاەو ناڵە چ ســـوودێکی نابێ.

کاتێک ئاسەواری پەشیمانی تێدا بیندرا و شکو گومان نەما و دێمنە ئەوەی چاو پێکەوت، قســـەی کلیلەی بڕیو رۆیشـــتە بەرەوە. گوتی: هۆی دە فکرەوە چوونت چییە؟ کاتێک لەوە شـــادترو رۆژێک لەوە پیرۆزتر چۆن دەبێ؟ پادشـــا لە پلەی ســـەرکەوتنو بەزاندندا شادو کەیفخۆشو دوژمن لە مەیدانی تێشکاویو بەزیویدا خەڵتانی خوێن، بەیانەی ســـەرکەوتنی تۆ شمشێری دەرکێشاوە رۆژی دوژمنت تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاوە.

شێر گوتی: هەر چەندی دۆستایەتیو هاودەمیو خزمەتو زانایيو لێهاتوویی شـــەنزەبەم دێتەوە بیر، خەمو پەژارە دامدەگرێو ئەلحەق پشتو پەنای سپا و شەریفترین رێڕەوی من بوو. لە چاوی دوژمناندا درِوو، لەسەر روخساری دۆستان خاڵ بوو.

دێمنـــە گوتی: پادشـــا نابـــێ بەزەیی بەو ســـپڵە غـــەددارەدا بێتەوە. ئەو ســـەرکەوتنە کە دەســـتی دا جێی شادمانیو شـــانازییەو دەبێ وەک ملوانکەی جەواهیرات بە گەردنی زەمانەوە هەڵاوەسرێ. کە رۆژنامەی ئیقباڵ بەم بابەتانە دەڕازێتەوەو کارنامەی بەختەوەری بەکاری لەم چەشنە درەوشاوە دەبێ. وە دە عەقڵیشـــدا ناگونجێ کەسێک ببەخشی کە لێی ئەمین نەبیو بۆ دوژمنی پادشا هیچ زیندانێک لە قەبر باشـــترو هیچ تازیانەیەک وەک شمشێر نییە. پادشایانی عاقڵو زانا زۆر جاران دۆستانو نزیکانێک، چون نەزانو بێکیفایەتن، لە خۆیان دوور دەخەنەوەو لە کەسانێک، با نەناسو غەریبەش بن، بەڵام زانا و لێهاتوون، نزیک دەبنەوە. هەر وەک دەزانین دەرمانی تفتو تاڵ، نە لەبەر مەیلو ئارەزوو، بەڵکە بۆ چاکبوونەوە دەخۆن. وە قامک کە زینەتی دەستەو ئامرازی بەستنەوەو کرانەوەیە، ئەگەر مار پێوەیدا، بۆ بەقای جەســـتە دەبێ بیبڕنو زەحمەتی لە

دەستدانی بە رەحمەت بزانن.

شـــێر هێندێک بەم قسانە هاتەوە ســـەرخۆ، بەڵام رۆژگار تۆڵەی شەنزەبەی کردەوەو دێمنەی ریســـوا و بێئابڕوو کردو درۆ و پیلانو دژایەتی ئەو بۆ شـــێر روون بۆوەو بە تۆلەی گای بەستەزمانی بێگوناە بە زەجرو ئەشکەنجە کوشتی. چون شـــەتڵی کردارو تـــۆوی گوتار، ئەگەر بچێندرێو خزمەت بکرێ حاســـڵو سەمەرەی زۆری لێ دەکەوێتەوە.

وە بەرهەمی غەدرو زوڵمو بێئینسافی هەمیشە پیسو چەپەڵ بووەو کۆتایی بەد رەوشـــتیو فێڵو پیلان نامبارەک. وە هەر کەس روو دەو عەمەڵە چەپەڵانە بکا و قەدەم دەو رێگایە بنێ، سەرەنجام تووشی بەڵا و مسیبەت دەبێو پشتی وە عەرز دەکەوێ.

بێزارە لە تۆ ئێســـتە، هەماغووشـــی عەدووتە
دونیـــا کە دوێنێ حەرەمـــی موحتەڕەمەت بوو[1]

---

١. نالی.

## ٢
# لێکۆڵینەوە لە کاری دیمنە

رای بە بەرهمەنی گوت: روون بۆوە چیرۆکی ئەو دووزمانە، تێچێنەرە کە چۆن حەماڵی یەقینی بە خەیاڵی دردۆنگی داپۆشـــی تا ئەو جێگەی کـــە پیاوەتیو مروەتی شـــێر برینی تێکەوتو لایەنی پەیمانشکێنیشـــی رەگەڵ کەوتو دوژمنایەتی جێگەی دۆســـتیو ترسو دڵەڕاوکێ جێگەی ئاشـــنایەتیو دڵپاکی گرتەوەو خەزنەدارو وەزیری پادشا سەریان لەسەر دانا.

ئێســـتا ئەگەر دەکرێ، کۆتایی کاری دیمنەو چۆنیەتی عوزرو تکاکاری ئەو لە لای شـــێرو باقـــی جانەوەران بگێڕیتەوە، کـــە زەمانێک پاش ئەو رووداوە، کاتێک شـــێر دەســـت بە داوێنی عەقڵی خـــۆی بوو و لە دیمنە وەشـــک کەوت، بۆ تێگەیشـــتنی رووداوەکان چ پلانێکی دارشتو چۆن لە غـــەدرو درۆی دیمنە تێگەیشـــت. وە دیمنە پەنای بۆ چ دەلیلو هۆکارێک بردو بۆ نەجاتی خۆی چ عوزرو بیانوویەکی هێناوەو بە کام رێگەدا داوای لێبوردنی کرد.

بەرەهمـــەن گوتی: خوێن هەرگیز نانیشـــێتەوەو بێدارکردنـــەوەی ئاژاوە بە هیـــچ جۆرێک خۆشـــی لێ نابینـــدرێ. وە دە کتێبەکانی مێـــژوو و ریواتەکاندا خوێندوومەتەوە کاتێک شـــێر گای کوشـــت، لەو پەلەپەلـــەی کە کردبووی زۆر پەشیمان بۆوەو بە ئەژنۆی خۆیدا دا و گوتی:

چەنـــدە بێـــزارم لـــە کارو کـــردەوەم
شـــێتو پەیتـــارەم نەمـــاوە عەقـــڵو هـــۆش[1]

وە هەمیشـــە، خزمەتکاریو ئاکاری باشو رەفتاری جوانی ئەوی وەبیر خۆی دێنـــاوەو دڵتەنگیو زەجرو پەشـــیمانی زۆرتر تەنگی پـــێ هەڵدەچنی، چونکە شەنزەبە خۆشەویستترین هاوڕێو عەزیزترین لایەنگری بوو و ساتێک نەبوو یادی ئـــەو لەبیر بکا و دەگەڵ هەر یەک لە گیاندارانی دەورو بەری خەڵوەتی دەکردو باسی رابردووی شەنزەبەی لێ دەپرسین.

شەوێک پڵینگ تا شەو لایەلایە لە لای ئەو بوو. دە گەڕانەوەدا پڵینگ راوەستا و گوێی راگرت. قسەی کلیلە گەیشتبووە ئەو جێیە کە: "وەک گێژەڵووکە هاتیو کارەساتێکت خولقاندو بۆ ئەو غەدرو زوڵمە رێگایەکی زۆر وردو باریکت دیتەوە. وەک شـــەیتان پیلانی خۆت بە ئەنجام گەیاندو خەیانەتێکی گەورەت بە پادشا کرد. لە خۆت ئەمین مەبە، ســـەعات بە ســـەعات لەوانەیە، ئەو غەدرو جنایەتە ملـــت بگـــرێ. وە ئەوەش بزانە هیـــچ کام لە جانەوەران لێـــت نابوورن، وە بۆ رزگاربوونت یارمەتیت نادەنو پشـــتت ناگرن. وە یەکجێ هەموویان بۆ کوشتنو لەتوپەتکردنت دەبنە هاودەنگ. منیش پیویستم بە جیرانەتی تۆ نییە. لە من دوور کەوەو دۆستایەتیو هاتوچۆت ببڕەوە. دیمنە گوتی کە:

قەســـەم بـــەو شـــەریەتی دیـــداری پاکـــت
شـــەرابم عەینـــی ژەهـــری مـــارە بـــێ تـــۆ
لـــە لای مـــن بـــا وجـــوودی نـــاسو ئەجناس
کەســـی تێـــدا نییـــە ئەمشـــارە بـــێ تـــۆ[2]

هەر وەها بۆ کاری رابردوو، تەدبیرو چارەســـەر بەهرەی نییە. خەیاڵو فکری فەســـادو ئاژاوە لە دڵت دەر بکەو لە چاکو خراپ دەست هەڵگرەو بە خۆشیو ئاســـوودەیی رایبوێرە کە دوژمن سەرەوبن بووەو دنیای موراد لە ملۆزمان چۆل بووەو ئارەزووەکانت وەدیهاتوون.

---

١. نیک بە رنج اندرم از خویشتن / گم شدە تدبیر و خطا کردە ظن.
٢. لە دیوانی نالی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
گر برکنم دل از تو و بردارم از تو مهر/ آن مهر بر کە افکنم آن دل کجا برم.

سـەر هەڵێنەو بە خۆشی رایبوێرە
بحەسێوە، بنوو، بخۆ، لێرە[1]

لەسـەر قسەکانی رۆیشـتو گوتی: "خراپیو نگریسـی ئەم پیلانە، لەسەر مروەتو دینداری لای من شـاراوە نەبوو. بەڵام ماڵی تەماعو زێدەخوازی وێران بێ، منیان وادار بەو کارە کرد".

کاتێک پڵینگ ئەو قسـانەی بە تەواوی بیسـت، رۆیشـتە لای دایکی شێرو بەڵێنی لێ وەرگرت، ئەوەی بۆی دەگێڕێتەوە بە نهێنی بمێنێتەوە. پاش متمانەو پێداگری، هەر چی بیسـتبووی، گێڕایەوەو نەسیحەتەکانی کلیلەو دانپێداهێنانو ئیقراری دێمنەی بە تەواویو بێ کەمو زیاد، بۆ دایکی پادشا خستە روو. رۆژی دوایی مێیە شـێر، رۆیشـتە لای کوڕەکەی. کوڕ خەمناکو پەرێشـان دەهاتە بەرچاو. پرسـی: هۆی چییە وا پەرێشـانی؟ گوتی: کوشتنی شەنزەبەو یادی خزمەتو کارە باشـەکانیو ئەو هەموو خۆشەویستییەی بەرانبەر بە ئێمە بووی، ئـاورم دە جەرگو هەناوان بەردەدا. هەر چەندی حـەوڵ دەدەم لە بیر خۆمی بەرمەوە، ناتوانم. وە هەر کات بیر لە رێنوێنو دڵسـۆزی میهرەبانو زانا و ئاگا دەکەمـەوە، ئەو دێتـەوە بەرچاومو دڵم بۆ لای ئەو دەچێو جوانی رەوشـتو ئەخلاقباشی ئەوم بۆ بەیان دەکا.

دایکی شـێر گوتی: شـایەدی هیچ کەس، بە قەدەر ئـەوەی پیاو بۆ خۆی هەسـتی پێدەکا، بەهێز نییە. وە فەرمایشتی پادشـا دەلیلی ئەوەیە کە دڵی شـایەدی دەدا کە شـەنزەبە بێتاوان بوو. وە هەر سـاتێک دەبێتە هۆی ژانو دڵەراوکێو دەروونی پادشـا دەشـێوێنێو بیری دەخاتـەوە کە ئەو کارەی بێ متمانەو یەقینی راسـتو بەڵگەی حاشـا هەڵنەگرِ ئەنجام داوە. وە ئەگەر لەو شـتانەدا کە بە عەرزی پادشایان گەیاندووە، وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەیەک کرابا و پادشا بەسەر تووڕەییو رقی خۆیدا زاڵ بوایەو ئەو قسانەی حەواڵەی عەقڵو را و بۆچوونی خۆی کردبا، راسـتیو دروسـتی مەسەلەکە روون دەبۆوە. چون هیچ رێنیشـاندەرێک لە ئەنگوستەچاوی شکو گوماندا وەک بۆچوونی دروستو

---

١. سرفراز و بە خرّمی بگُزار / لهو جوی و بە فرّخی می خور.

زەینی رووناکی پادشـــا نییە. چونکە تیژهۆشی پادشایان نهێنییەکانی دەروونی گەردوون دەبینیو پێشەنگی رازە شاراوەکانی غەیبە.

بـــێ گومانـــم ئەگـــەر دڵـــت بیـــەوێ
عەرشوقورشـــیش دەخەینـــە بـــەر نـــەزەرت[1]

شـــێر گوتی: لەبابەت کوشـــتنی گا، زۆرم فکر کردەوەو حەولم دا، عەیبێک، خەیانەتێـــک بدۆزمەوەو بیدەمە پاڵ ئەو، تا لە کوشـــتنی ئەو، بەلای دیترانەوە عوزرو بەهانەیەکەم بە دەستەوە بێ. هەر چەند زۆرتر ورد دەبمەوە، هیچ شتێک نابینمو بە گەورەتری دەزانمو هەر دەم حەســـرەتو پەشیمانیم لە هیلاکەتی ئەو زۆرتر دەبێ. هەر وەها ئەم بەســـتەزمانە خاوەنڕایەکی رۆشنبیرو رەوشتی پاک بوو. تۆمەت لێدانی حەســـوودانو ئارەزووی بێعەقڵان لەو بارەوە کە رەنگە دە فکری ئەوە کەوێ لە من راست بێتەوەو بیهەوێ بەگژمدا بچێ، هەمووی درۆ بوو. وە دەرحەق بەو هیچ کۆتاییم نەکردبوو کە ببێتە هۆی دژایەتیو نێوان ناخۆشی. ئێســـتا دەمەوێ لەو کارە بە وردی بکۆڵمەوەو بە واجبی دەزانم هەموو کارێک بکەم تا خاترجەم دەبم. هەر چەند فایدەشی نەبێو مەجالی قەرەبووکردنەوەشم نەهێشـــتبێتەوە. بەڵام ئەگەر بزانم لە کوێـــدا بە هەڵە چووم، فایدەیەکی زۆری دەبێ. ئەگەر تۆش شتێک دەزانی یا بیستووتە ئاگادارم کەوە.

گوتی: بیســـتوومە، بەڵام ناتوانم پێتی بڵێم، چون یەکێک لە نزیکانی تۆ لە شـــاردنەوەیدا پێداگری کردووە. دەشزانین زانایان لەقاو دانی رازو نهێنی خەڵک بە باش نازاننو بە تەئکید پێمان دەڵێن ئەو کارە نەکەین. ئەگەر وانەبا هەموویم پێ دەگوتی.

شێر گوتی: فەرمایشی عالمانو زانایان رەهەندو لێکدانەوەی جۆراجۆری هەیە. وە زانایانو عاقڵان بەپێی مەســـڵەحەتو لەســـەر بنەمای حیکمەت پێڕەوی لە فەرمایشـــتەکانیان دەکەن. وە شاردنەوەی نهێنییەکانی بەدکاران بەشداریکردنە دە کردەوەی خراپی ئەواندا. رەنگە ئەو کەســـەی خەبەری پێداوی، ویستبێتی خۆی لە بەرپرســـی ئەم باســـە رزگار بکا و بیخاتە ســـەر ملی تۆ. لەم بارەوە

---

١. گر ضمیرت بخواهدی بی شک / از دل آسمان خبر کُندی.

بەوردی فکر بکەوەو ئەوەی شایستەی دۆستیو خێرخوازییە ئەنجامی بدە.

دایکی شێر گوتی: ئەم فەرمایشتەت دروستە، بەڵام بڵاوکردنەوەی رازو نهێنی دوو عەیبی هەیە. یەکەم دوژمنایەتی ئەو کەسەی کە بڕوای پێ کردووی، ئەوی دیکەش ئەوەیە، هیچ کەس لەمەودوا قسەم لە لا ناکاو بە مەحرەمم ناناسێ.

شـــێر گوتی: قسەکانت بە تەواوی راستنو منیش ئەوە بە دروست نازانم کە بۆ دەرهێنانی خۆم لەم خەتایە، تۆ تووشـــی خەتایەکی دیکە بکەم. وە ئەگەر ناتەوێ ناوی ئەو کەســـەم پێ بێژیو رازی ئەو لەقاو بدەی، لانیکەم بە کورتی ئاماژەیەکی پێ بکە.

دایکی شـــێر گوتی: قســـەی زانایان لە گەورەیی لێبوردنو جوانی ئیحسانو خێراتدا بۆ هەمووومان ئاشـــکرایە، بەڵام ئەم لێبوردنە بۆ خەتاکارییەکە زەرەری بۆ هەمووولایەک نەبێو نەبێتە هۆی فەســـادی گشـــتی. چون لە هەر شوێنێکی زیانو زەرەری بەربڵاو ببیندرێو عەیبو عارەکەی داوێنی پادشـــاش بگرێتەوەو ببێتە هۆی رووداماڵاوی بەدکارانی دیکەو دەلیلی بێشـــەرمانو بێحەیایان بەو هۆیەوە بەهێزتر بێو هەر کامیان بۆ بەدکاریو دژایەتی بیکەنە قانوونو یاسای باوەڕپێکراو، ئیدی مەجالێک بۆ لێبوردنو بەخشـــین نامێنێو ســـزادان دەبێتە کارێکی رەوا، بەڵکوو فەرزی واجیب. وَ لَکُـــمْ فـــی القصـــاص حیاةٌ.[1]

وە ئەو دیمنەیە کە ئەو کارەی بە پادشا کرد، قسە راگوێزێکی شەیتانو نێوان تێکدەرێکی ئاژاوەگێرە. شێر بە دایکی گوت، تێگەیشتم. وەختی گەڕانەوەیە.

پاش رۆیشتنی دایک، شێر فکری کردەوە. چەند کەسێکی نارد کە لەشکری بۆ حازرکەنو بە دوای دایکیشـــیدا نـــارد بێتە کۆبوونەوەکە، ئەو جار فەرمووی دیمنەی بێنن. کە هات رووی لێ وەرگێڕاو وای نیشـــان دا کە فکر لە شـــتێک دەکاتەوە. دیمنە کە درگای بەڵای لەسەر گازی پشت دیتو رێگەی دەربازبوونیش بەســـتە. رووی دە کەسێکی تەنیشت خۆی کردو بە سرتە پرسی: شتێک رووی داوە؟ گرژیو دە فکرداببوونی پادشا و کۆبوونەوەی ئێوە هۆیەکەی چییە؟

دایکی شـــێر گوتی: ژیانی تۆ فکری پادشـــای پەرێشـــان کردووە. وە چون

---

١. ژیانتان بە تۆڵەوە بەندە.

خەیانەتی تۆ ئاشـــکرا بووەو ئەو درۆیانەی لەمەڕ قارەمانی نســـیحەتکاری ئەو، هەڵتبەســـتن وەدەر کەوتوون، نابێ بە قەدەر ماوەی چاوترووکاندێک درێژە بە ژیان بدەی.

دیمنە گوتی: پێشـــینیانی دونیا هیچ قسەیەکی حیکمەتو بەناوەرۆک نەماوە نەیانگوتبێو هیچ زەحمەتێکیان لەم بەســـتێنەدا بۆ داهاتووان نەهێشتۆتەوە. لە قەدیمەوە گوتوویانە: هەموو تەدبیرێک لەیستۆکی تەقدیرە. هەر چەندی پیاوی عاقڵ زۆرتر خۆی بپارێزێو دە ســـڵامەتی خۆیـــدا زێدەڕۆیی بکا، لە داوی بەڵا نزیکتر دەبێتەوە". وە لە نەسیحەتکردنی پادشادا بە دوای سڵامەتییەوە بوونو هاونشـــینی پیاوی شـــەروور کردن بە ئامرازی بەختەوەری، وەک ئەوە وایە کە شـــتێک لە سەر ئاوی کەوسەر بنووســـیو کای وردی دابێژراو لە بەرانبەر بای سەرسەڕ هەڵڕێژی. وە هەر کەس دەگەڵ پادشا یەکدڵو دڵسۆز بێ دە مەترسی زۆرتر دەکەوێ، چون دۆســـتانو دوژمنانی پادشـــا هەمـــوو لێی دەبنە دوژمن: دۆستان لە رووی حەسوودیو رکەبەری لە پلەوپایەدا و دوژمنانیش لەبەر ئەوەی ئەو کەســـە بە رێنوێنیو دڵپاکی یاریدەدەری پادشا و موڵکو میللەتە. وە هەر بەو هۆیەوەیە کە حەقیقەتناســـان پشـــتیان بە دیواری ئەمنەوە داوەو روویان لەم دنیا ناپایەدارە وەرگێڕاوەو دەســـتیان لە حەزو خۆشـــییەکانی هەڵگرتووەو تەنیاییو دووری لە خەڵکو عیبادەتی خودای تەعالایان هەڵبژاردووە. چونکە لە خزمەت خودای مەزندا هەڵەکردنو غەفڵەت، بوونی نییەو جەزای باشی، خراپیو پاداشی عیبادەت، سزادان نییەو دە فەرمانو ئەمری ئافرێنەردا بێجگە لە عەدڵو داد هیچ شـــتێک نییە. بەڵام کاری مەخلووق بە پێچەوانە بە شکڵی جۆراوجۆر بە شێوەو رێگای جیاوازدا دەڕواتە پێشو رووداوی چاوەڕوان نەکراوی تێدا دێتە پێش کە دوورن لە حەقو عەداڵەت. جاری وایە خەتاباری بەدکار پاداشی پیاوی دڵسۆز وەردەگرێو جاریش هەیە، دڵسۆزی رێنوێن، سزای خەیانەتو غەدری پێ دەدرێو دەکەوێتە عەزاب. وە هەوا و هەوەس بەسەر رەفتارو کرداریاندا غەڵەبە دەکا و خەتا و هەڵە دەکردەوەیاندا ئاشـــکرایە. وە چاکو خراپو خێروشـــەڕ بەلایانەوە یەکسانە.

وە پادشـــای سەرکەوتوو ئەو کەســـەیە کە کارەکانی لە خێرو چاکە نزیکو لە توندوتیژیو ســـەختگری دوور بێ. نە کەسێک لەبەر پێداویستی باربێنێو نە لەبەر ترس ســـزای بدا. وە پەسندترین رەوشتی پادشایان ئەوەیە دەستیان بۆ کاری خێـــرو باش بچێو خزمەتکاری کرداریاشو لێهاتـــوو، عەزیز بکەنو قەدر بگرن. وە پادشا دەزانێو ئامادەبووانیش لە شاهیدیی دان، درێغی ناکەن کە لە نێوان منو گادا، هیچ شتێک کە ببێتە ئەسبابی دەمەقاڵەو شەڕەدندووکەو هیچ دوژمنایەتی کۆنو رقو کینەی میراتی کە ئاژاوەی لێ هەڵستی لە ئارادا نەبووە. لاشـــم وانەبووە کە بتوانێ تێمڕۆبێو نیازی خراپـــەی دەگەڵم بێ، یا پیاوەتیو دۆســـتایەتی بۆ من لە دەســـت بێ، کە ئەوەش حەسادەتو ئێرەییپێکردنی لێ بکەوێتەوە. بەڵام نەسیحەتێکی پادشام کردو ئەوەی بە واجیبم دەزانی ئەنجامم دا. ئەویش راستیو دروســـتی ئەو قسانەی منی هەڵسەنگاندو بە پێی بیروڕای خـــۆی کاری کرد. وە زۆر کەس لـــە خەیانەتکارانو ئەهلی تۆمەتو دوژمنایەتی لەمن هەراسانن. دیارە ئەوانە پێکەوە بۆ رژاندنی خوێنی من تێدەکۆشنو هەموو بە یەککگرتوویی لە دژی من خرۆشـــاون. وە هەرگیز فکرم لەوە نەدەکردەوە کە پاداشـــی نەســـیحەتو ئاکامی خزمەتی من ئەوە دەبێ کە مانەوەم ببێتە هۆی نارەحەتیو خەمناکی پادشا.

کاتێک شـــێر وتەکانی دێمنەی بیست گوتی: ئەوەی دەبێ بە قازیو داوەران بسپێرن تا لە کارەکانی بکۆڵنەوە. چون دە ئەحکامی سیاسەتو مەملەکەتداریدا، بە شێوەی ئینسافـو دادپەروەری، بە بێدەلیلو بەڵگەی روونو حاشاهەڵنەگر، بڕیاردان رەوا نییە. دێمنە گوتی: کام فەرمانبەرو حاکم دروســـتکارترو عادڵترە لە عەقڵی پتەوو عەدڵی پادشـــا؟ هەر فەرمانێک دەر بـــکا نە رۆژگار دەتوانێ رەخنەی لێ بگرێو نە گەردون مەجالی لێپێچینەوەو لێپرسینەوە.

بۆ رێوەبردنی ئەو حوکمە کە واژۆی دەکەی جەوان
گەردوون لـــە چاوەڕوانییـــە، گوێڕاگرە زەمان[1]

وە بـــۆ تێڕوانینی مەتینی خاوەنشـــکۆ شـــاراوە نییە، کە هیچ شـــتێک بۆ

---

١. گردون گشاده چشم و زمانه نهاده گوش / هر حکم را که رای تو امضا کند همی.

ڕەواندنەوەی شکو شوبهەو گەشانەوەی نووری ئاگایی، لە وردبوونەوەو تێکۆشانو سەبرو حەوسەلە باشتر نییە. وە من ئەرخەیانم ئەگەر لێکۆڵینەوە بە دروستی بەڕێوە بچێ، من لە ڕقو تووڕەیی پادشا ڕزگار دەبم. وە لە هەموو بوارێکەوە، بێگوناهیو زۆری دڵسۆزیو ڕاستیو دروستیو لە ئاکامیشدا سەربڵندی من، ئاشکرا دەبێ. بەڵام لە لێکۆڵینەوەو تەفتیشی کاری مندا، چاری ناچار زێدەڕۆیی دەکرێ، چونکە ئاگر لە دەروونی چێو و دڵی بەرد بە بێ تێکۆشانو ماندووبوونی زۆر، دەرناکێشرێ. وە ئەگەر من گوناهێک دەخۆمدا شک بەرم، بۆ لێبوردن ناپاڕێمەوە. بەڵام خاترجەمم کە ئەم لێکۆڵینەوەیە وەفاداری من دەردەخا.
وە هەر شتێک کە بۆنی خۆشی هەبێ، ئەگەر بڵاوی بکەیەوەو بیپژێنی، ئەو بۆنە خۆشە زووتر دەوروبەر دادەگرێو ئەگەر لەو کارەدا سوودو قازانجێکم هەبووایە. پاش ئەنجامی کارەکە هەڵودەرفەتم زۆر بوو، لەبەر دەرگای بارەگای پادشا نەدەمامەوەو بە قاچی شکا و لە چاوەڕوانی بەڵادا نەدەمامەوە. ئێستاش چاوەڕوانیم لە خاوەنشکۆ ئەوەیە کە ئەم کارە حەواڵەی کەسێکی ئەمین بکا کە ئەهلی غەرەزو بەدگومانی نەبێ. وە دەستوور بفەرموون کە هەموو ڕۆژێک ئەوەی بەڕێوە دەچێ بە گوێی پادشای بگەیەنێو پادشاش بە بیروبۆچوونی جیهاننومای خۆی کە ئاوێنەی فەتحو جامی زەفەرە، بڕوانێتە بابەتەکان، تا من بە هەڵەو شکو گومان تێدا نەچم. چون هەمان دەلیل، کە کوشتنی گای بۆ پادشا حەڵاڵ کرد، کوشتنی من بۆ ئەو حەرام دەکا.

ئەوجار من خۆم بۆ دەبێ بیر لە خەیانەتی ئاوا بکەمەوە؟ کە هێندە پلەوپایەی بەرزم نییە کە لە پێگەی عەبدایەتی خۆم شەرم بکەمو تەماعی کاری گەورەو پلەی بەرز بەمێشکمدا تێپەڕێ، هەر چەند بەندەیەکی ناقابیلی پادشام، بەو حاڵەشەوە دەبێ لە دادپەروەری ئەو کە دنیای پێ ڕازاوەتەوە بێنسیب نەبم. چونکە بێبەشکردنم لەم عەدڵو دادە ڕەوا نییە. وە هەتا لە ژیاندا ماومو پاش ئەویش ئەم هیوایەم هەر دەمێنێ.

یەکێک لە ئامادەبووان گوتی: ئەوەی دیمنە دەیڵێ بۆ ڕێزگرتن لە گەورەیی پادشا نییە، بەڵام دەیەوێ بەو قسانە خۆی بپەڕێنێتەوە.

دیمنە گوتی: کێ لە خۆم بۆ خۆم دڵسۆزترە؟ وە هەر کەس لە کاتی نیازو پێداویستیدا خۆی فەرامۆش بکا و بۆ پاراستنی نەفسی خۆی حەوڵ نەدا، خەڵکی دیکە هیچ هیوایان بەو نامێنێ. ئەو قسەی تۆ کردت، نیشانەی بێعەقڵیو نەفامیو کەریەتی تۆیە! نەکەی پێت وابێ ئەم درۆ و تەزویرانەت پادشا هەڵدەخەڵەتێنێ، چون کاتێک سەرنجی دا و بە بیروڕای شاهانەی خۆی تەزویرو درۆی تۆی هەڵسەنگاند، ئەودەم ریسواییو شەرمەساری تۆ دەردەکەوێو دڵسۆزیو دژایەتی لێک جیا دەبنەوە. چون بیروڕای ئەو کاری تەمەنێک بە شەوێک رادەپەڕێنێ، سپا و لەشکری قورسو گران بە مۆرەیەک تێک دەشکێنێ.

دایکی شێر گوتی: لە رابردووی پڕ لە مەکرو فریوی تۆ زۆر سەرسووڕما و نیم کە لەم وەعزو نسحەتانە بکەیو لەم حاڵەتەدا لەسەر بابەتی جۆراوجۆر بڕۆی.

دیمنە گوتی: ئێستە جێگەی مەوعیزەیە ئەگەر قبووڵ بکرێو کاتی پەندو مەسەلە ئەگەر بە گوێی عەقڵ ببیسترێ.

دایکی شێر گوتی: ئەی غەددار، هێشتا هیواداری بە فێڵو تەڵەکەو مەکرو حیلە رزگاریت بێ؟

دیمنە گوتی: ئەگەر کەسێک چاکە بە خراپەو خێر بە شەڕ جواب بداتەوە، کارێکم پێی نییە. بە هەر حاڵ من وعدەو بەڵێنی بە کردەوەو، پەیمان بە وەفام، بە ئەنجام گەیاندووە. پادشا دەزانێ کە هیچ خەیانەتکارێک لە لای ئەو دە خۆی رانابینێ قسان بکا. وە ئەگەر دەرهەق بە من ئەوە بکا، زەرەرو زیانەکەی بۆ لای خۆی دەگەڕێتەوە. وە گوتوویانە هەر کەس دەکاراندا پەلە بکا و لە قازانجو فایدەی لەسەرەخۆبوونو سەبرکردن غافڵ بێ، ئەوەی بەسەر دێ کە بەو ژنە گەیشت. ژنێک کە لەبەر چڵێسیو حەشەری، پەلەپەلی کردو دۆستەکەی خۆی دەگەڵ غولامێک لێ تێکچوو. شێر پرسی: چۆن؟

گوتی: دەگێڕنەوە لە شاری کەشمیر بازرگانێک بوو بە ناوی "حەمیر" کە ژنێکی وەک مانگی شەوی چاردەی هاوسەر بوو. چ ژنێک؟ نە چاوی چەرخی گەردوون روخساری ئاوای دیتبوو، نە قاسیدی ئەندێشەو بیری تیژ، جوانێکی لەو چەشنەی بەرچاو کەوتبوو. روخسارێک وەک رۆژی سەرکەوتن درەوشانو

پەرچەمو زولفێک وەک شەوی هەڵبڕان پەرێشانو بێ پایان.

زولفت بە قەدتدا کە پەرێشانو بڵاوە
ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆزو بەداوە[1]

وێنەگەری وەستای شارەزا، بێوێنە، لە چیرەدەستی لە جیهاندا، لە قەڵەمی روخسار کێشی ئەو رۆحی "ئازەر" دە عەزابدا بوو. لە چێژو سەلیقەی دەکارهێنانی رەنگدا دەرروونی مانی لە حیرەتدا سەرسام. [ئەم وێنەگەرە] جیرانیان بوو. لە نێوان وێنەگەرو ژنی بازرگاندا پێوەندی دڵداری دەستی پێکرد. رۆژێک ژن پێی گوت: "جاروبار زەحمەت دەکێشیو ماڵی ئێمە بە حزووری خۆت دەڕازێنیتەوە، دیارە مەودا دەکەوێتە نێو ئەم دیدارانە، تا بە بەردهاویشتن یا بانگکردن [خەبەرم کەی]. ئاخر ئێمە دەبێ لە هونەرو سەنعەتی تۆ بەهرە وەربگرین. ئایا دەتوانی شتێکی دروست بکەی کە لە نێوان منو تۆدا نیشانەو ئیماژێک بێ".

گوتی: "چارشێوێکی دووڕەنگ دروست دەکەم کە رەنگی سپی لەسەری وەک ئەستێرە لە نێو ئاودا بدرەوشێتەوەو رەشایی لەودا وەک کاکۆڵی زەنگی لە سەر بناگوێی تورکان بێتە بەرچاو. تۆ هەر کات ئەو چادرەت دیت زوو وەرە دەرەوە".

وە غوڵامێک گوێی لەم سرتوخورتە بوو.

چارشێو، دروستکرا و ماوەیەک تێپەڕی. رۆژێک وێنەگەر بە دوای کارێکدا رۆیشتبوو و تا درەنگانێک نەهاتەوە. غوڵام ئەو چارشێوەی بە ئەمانەت لە کچی وێنەگەر وەرگرتو ژنی پێ فریو دا و کاری خۆی دەگەڵ کرد. پاش ئەو عەیشونۆشە چارشێوی بردەوە بۆ ماڵی وێنەگەر. کاتێک وێنەگەر هاتەوە ئارەزووی دیداری یاری کرد. چارشێوەکەی بە شانی خۆیدا دا و رۆیشتە شوێنی دیاریکراو. ژن بە هەڵاتن کەڕاوەو گوتی: "خۆشەویستەکەم هێشتا سەعاتێک نابێ لەلام بووی. خێرە؟ بۆ وا زوو هاتیەوە؟ کابرا زانی چ رووی داوە. کچەکەی بە توندی سزادا و چارشێوی سووتاند".

وە ئەو نەقڵەم گێڕاوە تا پادشا بزانێ کە لە بارەی مندا پەلە نەکەن. وە بە

---

١. لە دیوانی نالی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
خود ز رنگ زلف نور روی او برساختند / کفر خالی از گمان و دین جمالی از یقین.

راســـتی دەبێ بزانن کە من لەبەر نەجاتی خۆم ئەم قسەیە ناکەم. چون مەرگ، هەر چەند خەوێکی ناپەسندو حەسانەوەیەکی نابەدڵە، بە هەر حاڵ روودەدا و زۆر سەردارو زۆرداری گەورە لە دەستی هەڵاتنو نەیانتوانی. وە ئەگەر من هەزار گیانم هەبێو بزانم لە دەســـتدانیان بۆ پادشا سوودێکی هەیەو ئەمر بکا، بە سەعاتێک دەســـت لە هەمووی هەڵدەگرمو بەختەوەری دنیا و قیامەت لەوەدا دەبینم. بەڵام بۆ پادشا وا باشە چاوێک بە بەرهەمی ئەم کارەدا بخشێنێ. چون مەملەکەت بە بێ رەعیەتو بەندەی دڵسۆز راناوەستێ. وە لەناوبردنی خزمەتکارانی لێهاتوو بە قسەی ئەمو ئەو، زیانی لێ دەکەوێتەوە. خزمەتکاری جێگەی متمانەش هەمیشە دەست ناکەوێو بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی باوەڕپێکردن، پەروەردە ناکرێو هەموو رۆژێک خزمەتکاری خۆڕاگرو نسحەتکاری مەحرەم وەگیر ناکەوێ.

سالو مانگی پێدەوێ تا بەردی بەر تینی هەتاو
ئالوگۆڕی تێکەوێ لەعلی بەدەخشان بێتە دەر[1]

دایکی شێر کە دیتی قسەی دێمنە بە گوێی رەزامەندی دەبیسترێ، نیگەران بوو، فکری کردەوە نەکا لە نەکاو پادشا بەو قسە فێڵبازانەو درۆ رازاوانە کە بە جوانی زێڕکفت کراون، باوەڕ بکا. چون دێمنە زۆر زبانچەورو پیتۆڵو قســـەزان بوو، بە جوانیو فەساحەتی خۆی دەنازیو دەیگوت.

ئاســـن کە دەڵێن ســـەختە، گەر بێمە قســـەو باسان
نەرمی دەکەم ئەم سەختە، وەک مێوی لەسەر دەستان[2]

رووی دە شـــێر کـــردو گوتی: بێدەنگی عەلامەتی تەســـدیق کردنە. لێرەوە گوتوویانە "خامۆشـــی یانی هاوبیریو رەزامەندی" ئـــەوەی گوتو بە توورەیی هەســـتا و رۆیشت. شێر فەرمووی کە دێمنە دەبێ بکەوێتە زیندانو بە داوەرانی ئەسپارد لێکۆڵینەوە لە بارەی کارەکانیدا بکەن. پاش ئەوە دایکی شێر گەڕایەوە گوتی: "من هەمیشە فێڵبازی دێمنەم دەبیست. بەڵام ئێستا بە بیستنی درۆکانی یەقینم پەیدا کرد کە حەرامزادەی وەک خۆی کەمە! دیوتە عوزرو بیانووی چەند

---

١. سالها باید که تا یک سنگ اصلی ز آفتاب / لعل گردد در بدخشان یا عقیقی اندر یمن.
٢. جایی که سخن باید / چون موم کنم آهن.

شیرین دێنێتەوەو چەند فێڵبازانە بەرگری لە خۆی دەکا و ڕێگەی باریکو شوێنی دەربازبوونی دەگمەن بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. ئەگەر پادشـــا مۆڵەتی قســـەکردنی زۆرتری پێبدا، بە یەک وشـــە خۆی لە شـــەپۆلانی هیلاکـــەت ڕزگار دەکا. وە کوشتنی ئەو بۆ پادشا و سپا و لەشکر خێری گەورەی تێدایە. زووتر دردۆنگی لە دڵ دەرکەو مۆڵەتی پێ مەدە".

شـــێر گوتی: کاری ئەوانەی لە پادشـــا نزیکن، ئێرەیی‌و دەمەقاڵەو دژایەتی یەکترو ڕەشـــبینی‌و ناتەباییە. شـــەو و ڕۆژ بە دوای سەری یەکترینەوەن. بەڵێ خەریکی ئەم کارانەن. وە هەر کەس هونەری زۆرتر بێ، قەستی سەری دەکەن. پیـــاوی وا بەدخوازو دوژمنی زۆرترە. وە جێگەو پێگـــەو نزیکی دیمنە لە من، ســـپای دڵگران کردووە. نازانم ئەو گەلەکۆمەی لە دژی ئەو کراوە، بۆ ســـەلاحو مەســـڵەحەتی منە یا لەبەر دوژمنایەتی دەگەڵ ئـــەوە. نامەوێ دە کاری ئەودا پەلـــە بکرێ کە بـــۆ قازانجی هێندێکان، زەرەرو زیان بـــە خۆم بکەیەنم. وە تا لێکۆڵینەوەو لێپرســـینەوەی تەواوی دەگەڵ نەکەن فەرمانی کوشـــتنی نادەم، چونکـــە وە دوای هەوای نەفس کەوتن‌و ئیتاعەتی ئەمری ئەوان ڕای دروســـتو تەدبیری ڕاســـت دەشـــارێتەوە. ئەگەر بە گومانی خەیانەت ئەهلی هونەر لەناو بـــەرم، تۆفانی تووڕەییم ڕەنگـــە زوو دابمرکێ بەڵام زەرەرو مەغموونییەکەی بۆ خۆم دەگەڕێتەوە.

پاش ئەوەی دیمنەیان بردە زیندان‌و بەندی گرانیان خستە سەر ملی، سۆزی برادەری‌و دۆســـتایەتی کلیلەی هان دا و بە نهێنی ڕۆیشتە لای. کە بەو حاڵەوە چاوی پێکەوت لە قڵپەی گریانی دا و فرمێســـکی هەڵڕشـــتو گوتی: ئەی برای بەڕێز، چۆن دەتوانم تۆ لەم حاڵەدا ببینم. تازە بۆ من ژیان چ تامێکی ماوە. وە چون کار گەیشتە ئێرە، ئەگەر لێت تووڕە بهو قسەی کاڵت پێ بڵێم، باکم نییە. ئاخر من ئەو ڕۆژەم لە بەرچاو بوو. چەندەم نەســـیحەت کردی‌و گوێت پێنەدا. ناماقووڵترین شـــت لای تۆ نەســـیحەتە. وە ئەگەر لە کاتی پێویستدا و زەمانی ســـڵامەتدا لە ڕێنوێنیکردن‌و نەســـیحەتدا کۆتاییم کردبا، ئەمڕۆ لەم جینایەتەدا دەگەڵ تۆ شـــەریک دەبووم، بەڵام تۆ وەها شـــیفتەی بیروڕای خۆت بووی کە

عەقڵو زانستی تۆ تێشکاو و لە مەیدان دەرچوو. وە ئاماژەی زانایانم پێگوتووی کە دەڵێن: "قســـەبەرو قسەهێنی دووڕوو بەر لە ئەجەل دەمرن" وە مەبەستیان لە مردن کۆتایی پێهاتنی ژیان نییە، بەڵکە مرۆڤی جاسووسو دووزمان ئەوەندە ناخۆشـــیو ناڕەحەتی دەبینێ کە ژیانی لێ دەشـــێوێ. وەک تۆ کە دەو حاڵە کەوتوویو دیارە مردن خۆشـــترە. وە راســـتیان گوتووە: مَقْتَلُ الرَّجُلِ بَيْنَ فَكَّيْهِ[١].

سەر گوتیە زمانی، هەتا تۆم جیرانی، خۆشیم نایەتە گیانی[٢].

دێمنە گوتی: هەمیشـــە ئەوەی راست بوو دەتگوتو شەرتی رێنوێنیت بەجێ دێنـــا. بەڵام هەوای نەفسو هێزی تەماعی گەیشـــتن بە پلەوپایە، بیروڕای منی کز کردو نەسیحەتەکانی تۆی لە دڵی مندا سووکو چرووک کرد. وەک نەخۆشی چڵێسو زۆرخـــۆر، ئەگەرچی، دەزانی خـــواردن زەرەری بۆی هەیە، گوێی پێ نادا و لەبەر چڵێســـیو پێ خۆشبوون دەخوا. وە هەر وەها بە شادیو بێدوژمن ژیـــانو بە دڵی خۆشو بە ئەمینی، رۆژگار تێپەڕاندن، جۆرێکی دیکەیە. لە هەر جێگایـــەک بڵندهیممەتـــی یا ورەبەرزی هەبێ، لە رەنجو زەحمەتو چاوپیســـی کوشندە دە ئەماندا نیت.

وە دەزانـــم ئەم تۆوی بەڵایە من چاندوومە، هەر کەســـیش شـــتێک بچێنێ دەیدروێتـــەوە. هەر چەند پەشـــیمان بێتەوەو بزانێ کـــە کەکرەی چاندووە. وە ئەمرۆ کاتی ئەوەیە کە بەرهەمو حاسڵی قسەکانی خۆم هەڵگرمەوە. ئەم رەنجو مەرارەتە لەســـەر من قورستر دەبێ، ئەگەر بەهۆی دۆستیو هەواڵەتی نێوانمان تۆش تۆمەتبار بکەن.

پەنا بۆ خودا، ئەگەر تۆ وادار بکەن تا ئەوەی لەمەڕ من دەیزانی بیدرکێنی، ئەودەم عەزابو دەردی من دەبێتە دوو. یەکیان عەزابی ویجدانی تۆ و شەرمەساری لـــەوەی لەبەر من دە زەحمەت بکەویو دووهەمیان ئەوەی کە هیوای رزگاربوون بۆ من نامێنێ. لە دروستی بەڵێنی تۆدا هیچ شکو شوبهە نییە کاتێک دەرهەق بە بێگانان شـــایەدی بدەی. لەســـەر من بەو هەموو یەکبوونو دۆستایەتییە کە

١. شوێنی کوژرانی پیاو، لە نێوان شەویلکەکانیدایە.

٢. گر زبان تو راز دارستی / تیغ را بر سرت چکارستی.
ئەم پەندە فۆلکلۆرە لە ئایشەخانم شیراهیمی هاوسەرم وەرگرتووە.

لە نێوانماندا هەیە، شــکم نییە [لایەنگــرم دەبی] وە ئەمڕۆ حاڵی من دەبینی، وەختی بەزە پێداهاتنو روحمپێکردنە.

کلیلە گوتی: ئەوەی گوتت، بۆم روون بۆوە. زانایان گوتوویانە "هیچ کەس دە عەزابدا خۆی بۆ راناگیرێو هەر چەندی بۆی بکرێ لە قســەی حەق یا ناحەق، بــۆ رزگاربوون لە عەزیەت دەیڵێ". وە مــن چ رێگەچارەیەکم بۆ تۆ وەبەرچاو نایە. ئێستا کە تووشی ئەم بارودۆخە بووی باشتر ئەوەیە ئیقرار بکەیو ئەوەی کردووتــە ددانی پێدا بێنەو خۆت لە جەزای قیامەت بــە گەڕانەوەو تۆبەکردن رزگار بکە. چون شــک نییە لەم کارەدا دەکوژرێی، بەهەر حاڵ دنیا و قیامەت دەگەنەوە یەک".

دیمنــە گوتــی: بیر لەو بابەتانــە دەکەمەوەو ئەوەی بە فکرم گەیشــت بە مەشوەرەت دەگەڵ تۆ پێشکەشی دەکەم.

کلیلــە، کلۆڵو خەمناک گەڕاوە، بە دەردو پەژارەی زۆرەوە لەســەر پشــت راکشا و جینگڵی دەدا و سەرەنجام خەوی لێکەوت. وە درندەیەک دەگەڵ دیمنە پێکەوە گیرابوونو لە نزیکی ئەو خەوتبوو. بە قسەکانی کلیلەو دیمنە بەخەبەر هاتبوو، گوێی لە تەواوی قســەکانیان بوو، هەمووی بە زەینی خۆی ئەسپاردو هیچی بە کەس نەگوت.

رۆژی دوایی دایکی شێر ئەم باسەی نوێ کردەوەو گوتی: زیندووهێشتنەوەی خەتاکاران دەگەڵ کوشــتنی خێرخوازان یەکســانە. وە هــەر کەس نابەکارێک بە زیندوویی رابگرێ دە فەســادو خراپەدا دەگەڵی دەبێتە شــەریک. پادشا بە داوەرانی ئەمر کرد لە پێڕاگەیشــتنی کاری دیمنەدا، پەلە بکەنو خەیانەتی ئەو دە کۆبوونــەوەی تایبەتیدا و هەر وەها بۆ هەمــوو جەماعەتی روون بکەنەوە. دەستووری دا رۆژ بە رۆژ لەوەی بەڕێوە دەچێ گوزارشتی بدەنێ.

قازیو داوەر، داوەرووکانو خاسو عامیان کۆ کردەوە، ئەوجا، وەکیلی قازی دەنگی بەرز کردەوە رووی دە ئامادەبووان کردو گوتی: پادشا لە کاری دیمنەدا و لە لێکۆڵینەوەو لێپرســینەوەی کاری ئــەودا و تەفتیشو لێپێچینەوەیەک کە حەواڵەی ئەو کراوە، ئیحتیاتی تەواوی بە پێویست زانیوە تا حەقیقەتی کاری ئەو

لە تۆزو غوباری شـــوبهەو گومانبەری بێ، تا حوکمێک کە لەسەر ئەو دەردەچێ لە عەدڵو ئینساف دوور نەبێ. وە نەیخەنە ئەستۆی دەستڕۆیشتوویی‌و غیرەتو هەیبەتی پادشـــایان. وە هەر شتێک لەسەر گونا و تۆمەتباری ئەو دەزانن دەبێ باســـی بکەن. لەبەر سێ فایدە: یەکەم ئەوەیە، لە دادوەریدا یاریدەدانو دەلیلو بەڵگە بەدەســـتەوەدان لە روانگەی دینو پیاوەتی‌و مروەتدا پێگەیەکی گەورەی هەیە. دووهەم ئەوەیە ســـزادانی یەکێک لەوانەی خەیانەت دەکەن دەبێتە هۆی زەجرو خۆفی ئەوانەی گومڕاو لاڕێ بوون. سێهەم ئەوەیە کە سزادانی ئەوانەی ئەهلی فەســـادو مەکرو فێڵبازین دەبێتە هۆی ئاســـوودەیی گشـــتی‌و قازانجی هەمووانی لێدەکەوێتەوە.

کە ئەو قســـانە هاتنە تەواوبوون. تەواوی حـــازران بێدەنگ بوون. وە هیچ کەس هیچی نەگوت. چون ئەوان لە کاری ئەودا یەقینیان نەبوو. رەوایان نەزانی تەنیـــا بە گومانی رووتو رەها شـــتێک بڵێنو لەمەڕ گوتـــەی ئەوان حوکمێک دەربچێ‌و خوێنێک برژێ.

کاتێک دێمنە ئەوەی دیت، گوتی: "ئەگەر من خەتابار بووایەم، لە بێدەنگی ئێـــوە خۆشـــحاڵ دەبووم. بـــەڵام بێگوناهم، وە هەر کەس گوناهێکی لەســـەر نەناسراوەو ســـابیت نەکراوە، هیچ حوکمێکی نادرێتێ. وە ئەو بە لای ئەوانەوە کە ئەهلی دینداری‌و عەقڵو زانایین، بێگوناهەو ئەو عوزری لەسەر نییە. چارەش نییە لەوەی کە هەر کەس بە قەدەر زانستی خۆی لە کاری مندا قسەیەک دەکا. بەڵام لەودا لایەنی راستی‌و ئەمانەت رابگرێ، کە هەر گوتەیەک پاداشێکی هەیە، لە دنیا و قیامەتو گوتەی ئەو دەبێتە حوکمێک لە زیندووکردنەوەی کەســـێکدا، یـــا لەناو بردنی ئـــەو. وە ئەگەر بە گومـــانو گۆترە، بێمتمانـــەی تەواو، من بخاتە بواری تێداچوون، ئەوەی بەســـــەر دێ کە بەسەر کابرای کۆرین هات، ئەو کابرایەی بە بێ زانستی تەواو، یا ئاگاداری‌و ناسینی دروستی نەخۆشییەکان، یا ئەزموونێک لەسەر ناسینی دەوا و دەرمان، یا پەیبردن بە هۆی عیللەتو ناسازی، یا لێزانی‌و لێکدانەوەی ساختارو پێکهاتەی لەشو لەشکاری جەستە، هەنگاوی نا مەیدانو خۆی بە تەبیب دانا و گوتی تەبیبم". داوەران گوتیان، چۆن؟ گوتی: لە

شارێک لە شارەکانی عێراقدا، تەبیبێکی زۆر زانای لێبوو. بە تەبیبێکی نەخۆشی ناسو شـــفادەرێکی باش مەشهوور، وە ناســـراو بە ناسینی نەخۆشیو دەرمان. هاوکاری هەمەلایەنو ڕێنوێنیی تەواو، مایە زۆرو ئەزموون بێئەژمار، دەســـتێک وەک وڵمی مەســـیحو وڵمێک وەک پێو قەدەمی حەزرەتی خدر درووودی خودای لێ بێ. ڕۆژگار، هەر وەک عادەتی خۆیەتی، لە وەرگرتنەوەی نیعمەتانو ڕفاندنی بەقیمەتان، ڕووشی تێهاڵاندو هێزی جەستەو حوکمی چاوی لێ ئەستاندەوە. وە کەمکەم چاوی جیهانبینی نووســـاندو کوێری کرد. ئەوجار ئەو نەزانە بێحەیایە مەیدانی خاڵی دیتو ئیدعای زانســـتی تەبابەتی دەست پێکردو باسی ئەو کارە کەوتە سەر زبانان.

پادشای ئەو شارە کچێکی بوو، دابووی بە برازای خۆی، ئەو کیژە لە حاڵی بەدنیاهێنانی منداڵدا تووشـــی نارەحەتی بوو. تەبیبی پیری زانایان حازر کرد. بە وردی لە چۆنیەتی نارەحەتییەکەی پرسی. کە جوابەکانی بیست، بە تەواوی هۆی نارەحەتی کیژەکەی بۆ ئاشـــکرا بوو، دەســـتووری دەرمانێکی دا کە ناوی "زامهـــەران" بوو. گوتیان دروســـتی بکە. گوتی: چاوم کـــزو کەمحوکمە، ئێوە دروســـتی بکەن. لەو حاڵەدا ئەو کابرای دەیگوت تەبیبم سەروکەللەی پەیدابوو، گوتی: کاری منەو دەزانم لەچی دروســـت دەکرێ. پادشـــا بانگی کردە بەرەوەو گوتی کـــە بڕواتە خەزێنەو هەر چی شـــتێکی دەرمانەکەی پێ ســـاز دەکرێ، هەڵبگرێ. بەپەلە خۆی گەیاندە خەزێنەو بە بێ زانیاریو ئاگاداری دەست بەکار بوو. ئەزقەزا، کیسەی زەهری هەلاهیلی بە دەستەوە هات، ئەوەی دەگەڵ چەند شـــتی دیکە تێکەڵ کردو دای بە کچەکە. خواردن هەمانو مردن هەمان! پادشا شەربەتێکی لەو دەرمانە دەرخواردی کابرا دا و لەجێ سارد بۆوە".

وە ئەو نەقڵەم بۆ ئێوە گێڕاوە تا بزانن کە کار بە نەزانیو عەمەل بە شوبهەو گومانەوە، بەرهەمی مەترســـیداری لێ دەکەوێتـــەوە. یەکێک لە حازران گوتی: ئەوە لەو کەسانەیە کە مەکری ئەو لە عەوام نابێ بپرسی. وە دەروونپیسی ئەو بۆ زانایانی پســـپۆڕ دڕدۆنگی تێناکەوێو جێگەی گومان نییە، ئەو بەدبەختەیە کە نیشـــانەی بەدنیهادیو دەروونپیســـییەکەی لە ناحەزیو دزێوی ڕوخساریدا

دەبیندرێ، قازی پرسی: ئەم نیشانە چییە؟ دەبێ پێمان بێژی کە هەموو کەس ئەوە نازانێ. گوتی: عالمان دەڵێن کە هەر کەس برۆکانی لێک دوور بێو چاوی راستی لە چاوی چەپی وردتر بێو چاوی دایم بپەڕێو لووتی بۆ لای راست خوار بوویێتەوەو لە سەر هەر زیپکەیەکی سێ موو روابێو چاویشی هەمووکات دە عەرزی ببڕێ، زاتی نگریسی ئەو مەکۆی فەسادو مەکرو کاری ناپەسندو غەدرو فێڵەو ئەم نیشانگەلە لەودا کۆبۆتەوە.

دێمنە گوتی: لەمەڕ بەندەگانی خودا دەکرێ بە مەیلو ئیشتیای خۆت گەپو گاڵتە بکەی، ئیرادەی خوای مەزن عەینی مەسڵەحەتەو لەودا هەڵەو خەتا و غەفلەت روو نادا. وە ئەگەر ئەم عەلامەتانەی باست کردن رێنوێنی دادگەرێو دەلیلی راستی بێو بتوانین بە هۆی ئەوانەوە هەق لە ناهەق جیا بکەینەوە، کەوابوو خەڵکانی ئەم جیهانە لە هیچ باسێکدا پێداویستییان بە دەلیلو بەڵگە نامێنێ. وە لەمەودوا نابی هیچ کەس لەبەر چاکەکردن ستایش بکرێ یا لەبەر خراپەکاری سزا بدرێ، چون هیچ کەس ناتوانێ ئەم تایبەتمەندییە جەستەییانە لە خۆی دوور بخاتەوە. کەوابوو بەو حوکمە جەزای ئەهلی خێرو چاکەو سزای شەروورو خراپەکار مەفع دەبێتەوە. ئەگەر منیش، ئەم کارەم کردبێ، نَعوذُ باللهِ، ئەم نیشانەگەلە پێیان کردووم. وە چون گۆڕینیان لە دەست من نایە، نابێ بە دەلیلی بوونی ئەوان، سزا بدرێم. چون ئەوانە دەگەڵ من خولقێندراون، وە چون ناتوانم خۆیان لێ دوور خەمەوە، حوکم چۆن لەسەر کاری من دەردەکەن؟ وە تۆ بەمجۆرە دەلیلی جەهلو نەفامیو لاساییکردنەوەی خۆت دەرخستو بەو قسە بێ مەعنایەو خورافاتێکی بێتام، خۆتێهەڵقوتانێکی بێجێت نیشان دا.

چون دێمنە بەم شێوەیە جوابی داوە. باقی ئامادەبووان بێدەنگ بوونو هیچیان نەگوت. قازی فەرمووی بیگەڕێننەوە بۆ زیندان.

کلیلە دۆستێکی بوو بە ناوی "رۆزبێ" هاتە لای دێمنەو هەواڵی مەرگی کلیلەی پێدا. دێمنە پەژارە دایگرتو ماتو سەرسووڕماو بوو. وە لە ئاورگەی دڵی ئاخێکی سووتێنەری کێشا و لە ئاوپژێنی (فوارە) چاوی، ئاوی بەسەر روخساریدا هاتەخوارو گوتی: مەخابن، دۆستی خێرخوازو میهرەبان کە دە

لێقەوماویـــدا رام دەکردە خزمەتی‌و لە کاری گەورەو گراندا جێی بانگو هاوارانم بوو، چاوم لە رێنوێنی‌و نەســـیحەتەکانی بوو. وە دڵی ئەو دۆســـتە گەنجینەی رازی دۆستانو حەشارگەی نهێنی برادەران، کە رۆژگار نەیدەتوانی لێیان ئاگادار بێتەوەو چەرخی گەردوون بێ‌خەبەر دەمایەوە. لەمەودوا، بۆ من چ ئاسایشێکو لـــە گیانو بینایی چ فایدەیەک؟ وە ئەگەر ئەو کارەســـاتە بە دۆســـتایەتی تۆ قەرەبوو نەکرابایەوە، هەر ئێستا خۆم دەکوشتو شوکری خودا، کە مانو بوونی تـــۆ، جێی هەموو مردنێک پڕ دەکاتەوەو هەر کەموکووڕییەک کە بە مردنی ئەو رووی‌داوە بـــە ژیانی تۆ قەرەبـــوو دەکرێتەوە. وە ئەمڕۆ تۆ بۆ من هەمان برای، هەمان کلیلەی. دەســـتم بدەیەو برایەتیم قبووڵ بکە. رۆزبێ خۆشـــحاڵی خۆی دەربڕی‌و گوتی: بە دەســـپێکی ئەم دۆستایەتییە قەرزداری لوتفـو مەرحەمەتی تۆم. وە هەموو خاوەن مروەتو پیاوەتی‌و ئەهلی عەقڵو تێگەیشـــتنو تەجرەبە، فەخر بە دۆســـتایەتی تۆ دەکەن. وە ئەیکاش من کارێکم لە دەســـت هاتبایەو بمتوانیبایە یارمەتییەکی شایانت بدەم. دەستی یەکتریان گرتو شەرتی پەیمانو بەڵێنییان بەجێ هێنا.

ئەوجـــار دیمنە پێی گوت: لە فلان شـــوێن خەزێنەیەکـــی منو کلیلە هەیە، ئەگەر زەحمەت بکێشی‌و بیهێنی، جێگەی سپاسو پێزانینە. رۆزبێ بەو نیشانەی دابووی رۆیشـــتو دەفینەکەی هێنا. دیمنە بەشی خۆی هەڵگرتو بەشی کلیلەی بە رۆزبێ دا. وە پێی ئەســـپارد کە هەمووکات لە لای پادشـــا بێ‌و لەوەی کە لەمەڕ کاری ئەو باسی لێدەکرێ ئاگاداری بکاتەوە. وە رۆزبێ تا ئەو رۆژی دیمنە وەفاتی کرد ئەم ئەرکەی راپەڕاند.

رۆژی دوایی گەورەی داوەران پەروەندەی بردە لای شـــێرو پێشکەشی کرد. شـــێر پەروەندەی وەرگرتو قازی مەرەخەس کردو فەرمووی دایکی بانگ بکەن. کاتێک دایکی شێر دۆسیەکەی خوێندەوەو لە ناوەرۆکی تێگەیشت پەریشان بوو، گوتی: ئەگەر قسەی ناحەز بکەم پادشا پێی ناخۆش دەبێ، ئەگەر خۆشم رابگرم لایەنی نەســـیحەتو دڵسۆزی ژێر پێ دەبێ. شێر گوتی: "لە بەیانکردنی بابەتی رێنوێنی‌و نەســـیحەتدا، پەروا و مولاحەزەکردن پێویســـت نییە" گوتی: "پادشا

لە نێوان راســـتو درۆدا جیاوازی دانانیو قازانجو زەرەری خۆی لێک ناکاتەوە.
دێمنە بەو مۆڵەتو دەرفەتەی کە دەیدەنێ ئاژاوەیەک دەگێڕێ کە فکرو تەدبیری
پادشا بۆی قەرەبوو نەکرێتەوەو شمشێری سوڵتان لە تۆڵەکردنەوەدا هیچی پێ
ناکرێ". ئەوەی گوتو بە تووڕەیی هەستا و رۆیشت.

رۆژی دوایی دێمنەیان هێنا دەرەوەو قازییەکان کۆ بوونەوەو لە کۆبوونەوەی
گشتیدا دانیشتن. وەکیلی قازی (منشی دادگاه) هەمان قسەکانی رۆژی یەکەمی
دووپـــات کردەوە. چون هیچ کەس دەرهەق بەو هیچی نەگوت ســـەرۆکی دیوان
رووی تێکردو گوتـــی: "هەر چەند ئامادەبووان بە بێدەنگی خۆیان یارمەتی تۆ
دەدەن، بەڵام دڵی هەموویان رایان لەســـەر خەیانەتی تۆ شایەدی دەدا. وە تۆ
بـــەو ســـووکوچرووکیو عەیبو عارەوە لە نێو ئەو عالەمـــەدا ژیانت بۆ چییە؟
مەســـڵەحەتی ئێســـتا و داهاتووت لەوەدایە ددان بە گوناهانی خۆتدا بێنیو بە
تۆبەو پەشـــیمانی خۆت لە عەزابو ســـزای قیامەت رزگار بکەی. ئەودەم دوو
گەورەیی بۆ تۆ دەمێنێتەوە. وە هەتا دنیا دنیایە لە سەر رووبەری رۆژگار باسی
لێدەکـــرێ. یەکەم ئیقرار بە جینایەت بـــۆ رزگاری لەو دنیا و هەڵبژاردنی ماڵی
قیامەت بەســـەر ماڵی دنیادا. وە دووهەم ئەوەی کە نێوبانگی ئەم زیانشیرینیو
راوێژجوانی لەو پرسیارو وڵامانەدا و ئەو هەموو عوزرو بیانووە دڵبزوێنو ناوازانە
کە هاتنە بەرباسەوە، هەر دەمێنێ. ئەو راستییەش بزانە کە مردن بە ناوبانگی
باشەوە چاترە لە ژیان بە بەدناوی جاشەوە!

دێمنە گوتی: "قازی نابێ لەســـەر بنەمای شکو گومانی خۆیو ئامادەبووان
بە بێ لە دەستدا بوونی بەڵگەو دەلیلی پتەو، حوکم بدا. وە هەر وەها ئەگەر بۆ
تۆ ئەم شـــوبهەیە هاتۆتە پێشو فکری هەمووان لەسەر خەتاباری من لەنگەری
گرتووە، ئاخر من خۆم باشـــتر دەزانم. وە شاردنەوەی یەقینو متمانەی خۆ، بۆ
خاتری شکو شوبهەی دیتران، لە عەقڵو پیاوەتیو تەقوا و دینداری بە دوورە.
وە بەدگومانی ئێوە کە گۆیا عَیاذَبِالله دە کوشتنی بێگانە (گا)دا و رژاندنی خوێنی
ئەودا لە لایـــەن منەوە کارێک کراوە،زۆر گفتوگۆ دەکرێو بیروبڕوای هەمووتان
جیاوازەو یـــەک ناگرێتەوە. ئەگەر بێدەلیل خۆم بە کوشـــتن بدەم چ عوزرێک

بۆ ئەم کارە بێنمەوە. چون هیچ گیانلەبەرێک ئەو هەقەی لەســـەر من نییە کە خـــۆم هەمە. وە ئەوەی دەرهەق بە کەمترین کەس لە بێگانان بە رەوای نەزانمو لـــە روانگەی مروەتەوە ئیزنم نەبێ بیکەم، چون لەســـەر خۆم بەرێوەی بەرم؟ لەم فەرمایشـــتە بگەڕێ، ئەگەر نەســـیحەتە شتێکی باشـــتر بێژە، ئەگەر فێڵو تەڵەکەشە پاش ریسوابوونی، درێژەپێدانی کارێکی عاقڵانە نییە. وە فەرمایشی داوەران وەک حوکمی شـــەرعی وایەو نابێ لەودا هەڵەو خەتا روو بدا. وە ئەوەم بەلاوە ســـەیرە، تۆ هەمیشە وردو بە سەرنجو راســـتگۆ بوویت، لە بەدبەختیو رۆژەرەشـــی من لەم رووداوەدا توند دەرۆیو ئیحتیاتو مەحکەمکاریت وەلاناوەو بە تێچاندنی ئەوانەی رقیان لێمەو تەنیا لە رووی گومانی رەهای خۆت خەریکی حوکم لەســـەر من دەربکەی. وە هەر کەس ئاگاداری تەواوی لەســـەر بابەتێک نەبیو شایەدی بدا، ئەوەی بەسەردێ کە بە کابرای نەزان گەیشت. قازی پرسی. ئەو بەسەرهاتە چییە؟

دێمنە گوتی: ســـنووروانێک (مرزبان) بوو نێوبەدەرەوە. ژنێکی بوو بە ناوی "بەهارووپە". رووی وەک مانگ، گوڵەندام، چەناگە ســـێوی زێوی، لە ئەوپەری جوانیدا، وەک فریشتە خاوێنو پاکداوێن. بەژنو باڵا رێکوبەدەو، دەنگ چریکەو قاســـپەی کەو، شـــۆخو لەبار، بە لەنجەولار، رەوتی ئاسک، هەتا بڵێی لووسو ناسک.

هەر چەندە کە ئینســـانە لەبـــەر چاوی منو تۆ
مومکین نییە ئەم حوسنە لە ئەبنایی بەشەردا[1]

غولامێکی بێشەرمی هەبوو بازی شـــکاری راو پێدەکرد. ئەم بازدارە چاوی بەو مەســـتوورەیە کەوت، زۆر حەولی دەگەڵ دا رامی بکا، بەڵام خاتوون رووی پێنـــەدا و جوابی نەداوە. بازداری ناهومێدو هیوابڕاو، لێ بڕا بەڵایەکی بەســـەر بێنێو ئابڕووی بەرێ. دوو تووتی لە راوکەرێک کڕی. یەکیانی فێر کرد بڵێ "من دەرکەوانم دە ئامێزی کەیبانوو، لە نێو جێگەوبانی ئەربابدا دیت" بەوی دیکەشی فێـــر کرد بڵێ: "من لەم بارەوە هیچ ناڵێم". لە ماوەی دوو حەوتوودا فێری ئەم

١. نالی.

دوو رستەیە بوون. رۆژێک سنووروان لەگەڵ خێزانی شەرابی دەخواردەوە. غولام هاتو تووتییەکانی لە بەردەم دانــا. تووتییەکان بەپێی عادەت گوتەکانیان بە زبانی بەڵخی دووپات دەکردەوە. سنووروان لە مانای رستەکان تێنەدەگەیشت، بەڵام بە دەنگو دیمەنیان زۆر کەیفی سازبوو. تووتییەکانی بە ژنەکەی ئەسپارد تا باشتریان خزمەت بکا.

ماوەیەک بەســـەردا تێپەڕی، رۆژێک چەند کەسێک لە بەڵخەوە هاتنو بوونە میوانی ســـنووروان. پاش نان خواردن بەزمی شەراب خواردنەوەیان رازاندەوە. ســـنووروان داوای قەفەســـی تووتییەکانی کرد. وە ئەوان بە عادەتی پێشـــوو رســـتەکانیان دووپات کردەوە. میوانەکان ســـەریان داخستو ماوەی سەعاتێک لە ژێرەوە چاویان تێک بڕی. ئاخری لە ســـنووروانیان پرســـی ئایا دەزانی ئەو مەلانە دەڵێن چی؟ گوتی: نازانم دەڵێن چی، بەڵام دەنگیان خۆشە. یەکێک لە بەڵخییەکان کە رێزو حورمەتی زۆرتر بوو، ماناکەی بە میواندار گوتو دەســـتی لە خواردنەوە هەڵگرتو عوزری خواســـتو گوتی: لە شاری ئێمە رەسم نییە لە ماڵی ژنی ناراستو نادروســـت شتێک بخۆین. لەو ئانەدا نۆکەر بانگی کرد کە: منیش زۆر جار دیتوومەو شـــایەدی دەدەم. سنووروان لە جێی خۆی دەرپەڕیو ئەمری کرد ژنەکەی بکوژن. ژن کەســـێکی ناردە لایو گوتی: مەمکوژە، من بۆ هیچ کوێ هەڵنایەمو لە دەســـتت دام. پەلەپەل لە تۆ ناوەشێتەوە. وە پیاوانی زانا و بەئەزموون دە کاراندا، ئەویش کە کوشتنی تێدا بێ، تالوکەو پەلە ناکەن. پێویستە بە کاری من رابگەی. وە کاتێک مەسەلەکە روون بۆوە، ئەگەر شایانی کوشتن بووم، لەحزەیەک رامەوەستن. وە ئەوەندەت پشوو لەسەرخۆ بێ کە لە خەڵکی بەڵخ بپرســـن کە ئەو باڵندانە بێجگە لەم دوو رستەیە لە زبانی بەڵخی چیتـــر دەزانن. ئەگەر نەیانزانی ئەوە بزانە ئەو بێشـــەرمە بە تووتییەکانی فێر کردووە. کە چون تەماعی تێکردمو جوابم نەداوەو دینو ئیمانی من لە نێوانماندا بوو بە پەرژین، ئەو پیلانەی گێڕا. ئەگەر شتێکیان بەو زبانە گوت بزانە کە من خەتابارمو خوێنی من حەڵاڵت بێ.

سنووروان شەرتی ئیحتیاتی بەجێ هێنا و مەعلووم بوو کە ژن بێگوناهەو لە

کوشتنی پاشکەز بۆوەو فەرمووی بازدار بێننە خزمەتی. بازدار بە شادمانی هاتە ژوور، پیی‌وابوو خزمەتێکی کردووە. بازێکی لەسەر دەستی بوو. ژن لێی پرسی کە: تۆ چاوت پێوەبوو کەمن ئەو کارەم دەکرد؟ گوتی: بەڵێ دیتم. ئەو بازەی لەسـەر دەستی بوو، خۆی بە چرچاویدا دا و چاوەکانی هێنایەدەر. ژن گوتی: سـزای کەسـێک کە نەبینراو بە بینراو بزانێ ئەوەیە. وە لە عەدلو رەحمەتی پەروەردگار هەر ئەوە چاوەروان دەکرێ.

وە ئەم نەقڵەم بۆ ئەوە هێناوە تا روون بێتەوە کە پەلەکردن لە تۆمەتبارکردندا، لە دنیادا بێخێرو بەرەکەتو ئاکامی خراپی لێ دەکەوێتەوە.

تەواوی ئەم باسو خواسـەیان بە وردی نووسیو بۆ لای شێریان نارد. شێر هەمووی بە دایکی نیشاندا، کاتێک دایکی لە بابەتەکان تێگەیشت گوتی: پادشا بەرقەرار بێ، من ئەوەی لە دەستم هات کردمو هیچ فایدەی نەبوو. ئەو مەلعوونە بەدگومان بوو، وە ئەمڕۆ هەموو توانای خۆی بۆ کوشـتنی پادشا دەکار دێنێ. وە کاروباری وڵات دەشێوێنی. وە بەرهەمی ئەم بارودۆخە لەوەش تێدەپەڕێ، کە دەرهەق بە وەزیری دڵسۆزو قارەمانی پادشا ئەنجامیدا، ئەم گوتەیە کارکردنێکی گەورەی لە سـەر دڵی شێر بەجێهێشتو هەژاندی. بەدایکی گوت: "پێم بڵێ لە کێت بیسـت، تا من بۆ کوشـتنی دێمنە بیانوویەکم بەدەسـتەوە بێ". گوتی: دشوارە، سـەختە، ناتوانم رازی کەسێک بدرکێنم کە بڕوای بە من کردووە. وە من بە کوشتنی دێمنە زۆر خۆشحاڵ نابم. چۆن ئەم کارە بکەمو رازێک کە لای من وەک ئەمانەت داندراوە بڵاوی بکەمەوە؟ بەڵام لەو کەسـە دەپرسـم، ئەگەر ئیزنم پێبدا پێت دەڵێم.

لە لای شـێر رۆیشتو پڵنگی بانگ کردو گوتی: بۆخۆت دەزانی پادشا تۆی چەنـدە بە لاوە عەزیزەو لـە بارهێنانو پێگەیاندنی تۆدا زەحمەتی کێشـاوەو ئەوەش لەو پلەوپایەو مەقامە گەورانەی کە پێی داوی، بە تۆوە دیارە. پێویست ناکا بە دوورودرێژی باسـی ئەو شـتانە بکەین. پاشان گوتی: لەسەر تۆ فەرزە کە شـوکرانەی نیعمەتی ئەو بەجێ بێنیو خۆت لە عۆدەی ئەم شـایەدی‌دانە بێنیتـەدەر. وە هەر وەها یارمەتیدانی سـتەملێکراو؛ تێگەیاندنی ئەو لە حاڵی

مەرگدا، لە دەلیلی مردنەکەی، بۆ پیاوی جوامێر فەرزی عەینو ئەرکی سەرشانە. چون هەر کەس شـــایەدی مردوو بشارێتەوە، رۆژی قیامەت دەلیلی خۆی لە بیر دەچێتەوە. لەم چەشنە قسانە زۆری بۆ گوت.

پڵنگ گوتی: ئەگەر من هەزار گیانم هەبێ بە قوربانی ســـەعاتێک ئاسوودەیی خەیاڵی پادشای دەکەمو بەوەش تەنیا یەک لە هەزار چاکەکانی ئەوم نەداوەتەوە. مـــن خۆم وا دەزانم دە خزمەتکردندا کۆتاییم کردووە. من خۆم لایق بەوە نازانم کە لێم رازی بنو شـــوکرانەی زەحمەتم بکەن. وە هۆی ئەوەی کە لە شایەدیدان رووگەردانم ئەوەیە کە دەزانم پادشـــا بەدگومانو دووربینو وردە. وە ئێســـتا کە کار گەیوەتە ئێرە، مەسڵەحەتی پادشا ناخەمە پشت گوێو هەر چی فەرمان بێ ئەنجامی دەدەم. پاش ئەوە وتووێژی کلیلەو دێمنەی بە وردی بۆ پادشا گێڕاوە. وە لە کۆرو کۆبوونەوەی جانەوەرانیشـــدا ئەوەی بیســـتبووی پێی گوتن. کاتێک ئەو قسانە کەوتنە ســـەر زبانان، ئەو درەندەیە کە لە زینداندا قسەکانی ئەوانی بیســـتبوو کەسێکی نارد کە: منیش شایەدی دەدەم. شـــێر فەرمانی دا بیهێننو ئەوەی لە زینداندا لە نێوان کلیلەو دێمنەدا رابردبوو، شایەدی لەسەر دا.

لێیان پرسی کە: هەر ئەو رۆژە بۆ نەتگوت. گوتی: بە تەنیا شایەدێک حوکم ناچەســـبێ. من بە بێ فایدەیەک، عەزیەتکردنی گیاندار بە رەوا نازانم. بەو دوو شایەدییە حوکمی سزادان بۆ دێمنە دەرچوو. شێر فەرمووی دە زیندانی باوێژنو زۆر وریا بن.

خواردنی لێ بڕیو بە چەندین جۆر عەزابو زەجریان دەدا تا لە برســـانو لە تینوایەتی مرد. وە سەرەنجامی مەکرو زوڵم هەر ئەوەیە.

واللهُ يَعْصِمُنا وَ جَميعَ المُسلِمينَ من الخَطا والزَّلَلِ بِمنِّه وَ رَحْمتهِ وَ حَوْلهِ وَ قُوَّتهِ[1]

---

١. خوای مەزن ئێمەو سەرجەمی موسوڵمانان لە خەتا و خلیسکان بەدوور کا بە کەرەمو رەحمەتو توانایىو قودرەتی خۆی.

## ٣

# دۆستایەتی کۆترو قالاو و مشکو رەقەو ئاسک

رای بە بەرەهمەنی گوت کە داستانی دوو دۆستم بە گوێ گەیشت کە بە تێچاندنی کەسێکی نەمامو قسەهێنو قسەبەرو پاشملە بۆ تێچاندنی ئاژاوەگێڕێک، لێک هەڵتەزینەوەو، بوونە دوژمنو دژبەری یەکترو کار کێشایە کوشتنو بڕین، تا بێئەنوایەک لەو نێوەدا کوژرا و رۆژگار تۆڵەی ئەستاندەوە. چونکە وێرانکردنی بینایەک کە خوای مەزن دروستی کردبێ مبارەک نابێو ئاکامەکەی لە وەباڵو عەزاب، خاڵی نابێ. ئێستا ئەگەر پێت دەکرێ، داستانی دۆستانی یەکدڵو چۆنیەتی خۆشەویستیو دەسپێکی دۆستایەتیو چێژو خۆشی وەرگرتن لە بەرهەمو میوەی نیازپاکیو سوودبردنیان لە ئاکامەکانی راستگۆیی ئەوان بۆ من بگێڕەوە.

بەرەهمەن گوتی: هیچ شتێک لە لای عاقڵان، بە قەدەر پێوەندی دۆستانی یەکدڵ بەقیمەت نییەو هیچ شتێک ناگاتە ئاستی دۆستایەتی یارانی فیداکار، کە لە زەمانی ئاسوودەییو خۆشیدا، هەڵسوکەوتی باشیان لێ چاوەڕوان دەکرێو لە کاتی نەهامەتیدا پشتیوانیو لایەنگری راستگۆیانە. لە نموونەی ئەم شێوە دۆستایەتییە حەکایەتی کۆترو قالاو و مشکو رەقەو ئاسکە. رای گوتی: ئەم داستانە چۆنە؟

گوتی: دەگێڕنەوە کە لە وڵاتی کەشمیر، شکارگایەکو مێرگو مێرغوزارێکی خۆش هەبوو. کە لە رەنگدانەوەی گوڵو ریحانییەڕی قالاو لە چەشنی کلکی

تاوس دەدرەوشــاوەو لە ئاســت جوانی ئەو مێرغوزارە کلکی تاوس وەک پەڕو باڵی قالاو دەچوو.

نەمامی داری ســەروە، یا قەدی نەمامی دڵبەرە
شەمیمی عەترێ یاسە یا بخووری عوودو عەنبەرە
لە بۆنی یاسو یاســەمەن، چڕو چیا موعەتتەرە
دەمێ بە داری سێوەوە، شکۆفە میشکی ئەزهەرە
دەمێ عەقیقی خاڵییە، بــەدەم لقی هەنارەوە[1]

لــەو مێرغوزارەدا نێچیــرو راو گەلێک زۆر بوو. راوکــەران زۆر دەهاتنە ئەم شکارگا بژوێنە. قالاوێک لەم دەڤەرە لە سەر دارێکی گەورەی تێهەلاچوو هێلانەی کردبوو. لەو ســەرەڕا چاوی بە دەوروبەریدا دەگێڕا و چەپو راســتی خستبووە ژێر چاوەدێری. لەپڕ چاوی بە راوکەرێکی ســەحەتگرانی جلوبەرگ شــڕ کەوت کە تۆڕێکی بە شــانەوەو عەسایەکی بە دەستەوە بوو، کە راست بەرەو دارەکە دەهات. ترســی لێ نیشــتو بەخۆی گوت: وا باشە لە ســەر جێی خۆم ماتە هەڵگرمو چاوی لە سەر هەڵنەگرم، بزانم چ دەکا.

راوکەر هاتە بەرەوەو تۆڕی کردەوە و، دانی تێدا بڵاو کردەوەو خۆی حەشار دا. سەعاتێک رابرد. پۆلێک کۆتر گەیشتنە جێ. سەردەستەکەیان کۆترێک بوو کــە پێیان دەگوت "گەردنبەخاڵ"و هەمــوو کۆترەکان دە ئەمرو فەرمانی ئەودا بوون، کە چاویان بە دانەکان کەوت بێخەبەر هاتنە ناو تۆڕەکەو دە داو کەوتن. راوکەر، کەیف خۆشو شــادمان، بە هەڵاتن بۆیان چوو. تا بیانگرێ. کۆترەکان وە هەڵبەزهەڵبەز کەوتنو ســەریان لێ شــێوا بوو، هەر یەکەو بۆ دەربازکردنی خۆی تێدەکۆشا. گەردنبەخاڵ گوتی: جێگەی باسو دەمەقاڵە نییە. هەر کەس دەبێ رزگاربوونی یاران لە رزگاری خۆی بە پێویستتر بزانێ. وە ئێستا باش وایە کە هەموو پێکەوە هێزو توانامان بکەینە یەکو تۆڕ وە حەوا خەین. کە نەجاتی ئێمــە بەمجــۆرە وەدی دێ. کۆترەکان فەرمانی ئەویان بەجــێ هێنا و تۆڕیان لە شــوێنی خۆی هەڵکەندو ســەری خۆیان هەڵگرت، راوکەر لەسەر جێی خۆی

---

١. حەقیقی.

ڕاوەســـتا و چاوەڕوان بوو بکەونە خوارەوە. قالاو فکری کردەوە. با بە دوایاندا بڕۆمو بزانم ئەو بەزمە بە کوێ دەگا. چونکە منیش لەوانەیە وام بەسەر بێو لە ئەزموونان بۆ ڕزگاری لە ڕووداوان، دەتوانین چەک دروست بکەین.

گەردنبەخـــاڵ کە دیتی ڕاوکەر هەر وا بە دوایانەوەیە، بە دۆســـتانی گوت: ئـــەم چەختییە دەســـتبەردارمان نابێو تا خۆمانی لێ نەدیو نەکەین، دەســـت هەڵناگرێ. ڕێگەچارە ئەوەیە کە ڕوو دە ئاوەدانیو دارستانان بکەین کە نەتوانێ بمانبینێـــو بە ناهومێدیو سەرشـــۆڕی بگەڕێتەوە. لەو نزیکانە مشـــکێک هەیە دەگەڵ من دۆستە. پێی دەڵێم ئەو بەندو داوانە بقرتێنیو هەڵپسێنێ. کۆترەکان بە فەرمانی ئەو جووڵانەوەو ڕۆیشتنو ڕاوکەر گەڕایەوە. قالاو هەر وا بە دوایانەوە بوو تا شـــێوەی ڕزگاربوونی ئەوان دە بەرچاو بگرێو بیکاتە زەخیرەی ڕۆژگاری خۆی.

گەردنبەخاڵ گەیشـــتە بەر ماڵی مشـــک. بە کۆترانی گوت بەرەوخوار لوور بن. بە فەرمانی ئەویان کردو هەموویان نیشتنەوە. ئەو مشکە ناوی "زبرا" بوو. زیرەکو وریا و عاقڵ، ســـاردو گەرمی ڕۆژگار چێشتوو، لە کڵ دەرهاتوو، خێرو شـــەڕی ڕۆژگار دیتوو. لەو شوێنە لە ترسی بەڵای زەمانە سەد کونو ڕەهەندی ســـاز کردبوو، هەمووی بەسەر یەکەوەو هەموو شـــتێکی دە بەرچاو گرتبوو تا تووشـــی لێقەوماوی نەبێ. گەردن بەخاڵ بانگی کرد: وەرە دەر! زبرا پرســـی: کێیە؟ نێوی خۆی گوتو مشک بە پەلە دەرپەڕی.

کە ئەوی لە تۆڕو داودا دیت، دەستی کرد بە گریانو لە خۆ دانو جۆگەلەی فرمێســـکانی ڕەوان کردو گوتی: ئەی دۆســـتی خۆشەویستو یاری دڵسۆزم کێ تـــۆی بەو ڕۆژە گەیانـــدووە؟ گوتی: هەموو هاتو نەهاتێک دەســـتی تەقدیری تێدایـــەو هەر چی دە ئەزەلدا دیاری کرابێ، هـــەر چۆنێک بێ ڕۆژێک لە ڕۆژان وەدی دێو دووری لێکردنو خۆلێپاراستنی دەست نادا.

وە من قەزای ئاســـمانی خســـتمیە ئـــەو هیلاکەتە، وە دانـــەی ناو داوی بە منو یاران نیشـــان دا و لە بەر چاومان خۆی دەنواند تا تۆزوخۆڵی ئەو چاوی داپۆشـــینو پەردەی بە سەر عەقڵماندا کێشا و هەموومان کەوتینە ناو دەستو

چەنگاڵی بەڵا. وە کەســانێک کە بە قەوەتو شــەوکەت لەمن سەرترنو لەباری پێگەو قەدرەوە لە پێشــترن، ناتوانن لە بەرانبەر قەزا و قەدەری ئاسمانیدا خۆ رابگرن. وە ڕووداوی لەم چەشنە دەرهەق ئەوانیش سەیروسەمەرە نییە. وە هەر کات فەرمانێــک دێتە خوار، کــوورەی ڕۆژ تاریک دەبێو خەرمانی مانگ، ڕەش دادەگەڕێ. وە خواستی باریتەعالا عَزَّت قُدْرَتُهُو عَلَّتْ كَلِمَتُهُ[١] ماسی لە تەرکەگۆمی قووڵەوە دێنێتە ســەر ئاو و باڵندەش لە تەشــقی عاسمانەوە دەکێشێتە سەر زەوی. هەر وەک پیاوی نەزان سەردەکەوێو دەبێتە بەربەستێک لە نێوان زانا و ئەو بابەتانەی کە دەیانزانێ.

مشــک ئەو قســانەی بیستو دەســتی کرد بە بڕینی بەندی دەستو قاچی گەردنبەخاڵ. گوتی: دە پێشــدا دەســتو باڵی یاران بکەوە. مشک گوێی نەدا ئەم قســەیە. کۆتر گوتی: دۆســتی خۆشەویست، دە پێشــدا هەڵبڕینی داوی دەستو باڵی دۆستان پێویستترە. مشک گوتی: ئەو قسەیە پەیتاپەیتا دووپات دەکەیەوە، مەگەر تۆ پێداویســتیت بە نەفســی خۆت نییەو ئەم ویســتنە بە مافــی خۆت نازانی؟ گوتی نابێ لەبەر ئەو مەبەســتە لۆمەم بکەی، چونکە من ســەرۆکایەتی ئەم کۆترانەم قبووڵ کردووە. لەبەر ئەوە هەقیان بەســەر منەوە هەیــە. وە چون ئەوان ســەرۆکایەتی منیان قبووڵــەو ئیتاعەی ئەمرو ڕێنوێنی منیان کردو بە یارمەتیو پشتیوانی ئەوان لە داوی ڕاوکەر ڕزگاریم هات، منیش دەبێ ئەوەی وەک ســەرۆک دەبێ بیکەم، ئەنجامی بدەم. دەترســم ئەگەر بە کردنەوەی دەســتو باڵی من دەســت پێ بکەی ماندوو ببیو هێندێک لەوان لە تــۆڕو داودا بمێننەوە، بەڵام ئەگەر من لەو بەندەدا وەمێنم هەر چەند ماندووش بــی، بە خاتری من تەنبەڵی ناکەی. وە بە خۆت ئیزن نادەی بە دەســتو پێ بەســتراوی بەجێم بهێڵــی. وە لە کاتی بەڵاو نەهامەتیدا بەشــداریکردن دەبێ هەبێو ئەوە باشــترە لەوەی لە کاتی ئاسوودەییدا ڕێککەوتن بکرێ، ئەگەر نا، ڕەخنەگرانی بە لۆمەو لەقەم، هەلیان بۆ دەرەخسێ.

مشک گوتی: عادەتی ئەهلی پیاوەتیو جوامێری ئەوەیەو بڕوای خاوەنڕایانو

---

١. هێزو توانایی‌و قسەی ئەو سەرکەوتوو بێت.

خۆشەویستان بەم خەسڵەتە باشەی تۆ و سفەتە پەسندکراوەتەوە پتەوتر دەبێ. وە متمانەی دۆستان بە جوامێری تۆ زۆرتر دەبێ. پاش ئەو قسانە، بە هەموو تواناوە، داوی هەمووانی بڕیو گەردن بەخاڵو دۆستەکانی ئازادو سلامەت گەڕانەوە. قالاو کە ئەم یارمەتییەی مشکی چاو پێکەوت، ئارەزووی دۆستایەتیو برایەتیو راستگۆیی ئەو لە دڵیدا چەکەرەی کرد. وە بە خۆی گوت: منیش لەوەی بۆ کۆترەکان هاتە پێش ناتوانم ئەمین بم. ناشتوانم لە دۆستی کارلێهاتوویەکی لەم چەشنە بێنیاز بم. هاتە بەر دەمی کونە مشکو بانگی کرد. مشک پرسی: کێیە؟ گوتی: منم قالاو. ئەوجار، ئەوەی دەگەڵ کۆترەکانی کردبوو، ئاگادار بوونەوە لەو هەموو بەڵێنو پەیمان بەجێهێنانە، ئەو وەفادارییەی بۆ باس کردو گوتی: چون پیاوەتیو فیداکاریو پابەندی تۆم چاو پێکەوتو تێگەیشتم کە بەهرەی دۆستایەتی کۆترەکان دەگەڵ تۆ چەندە شیرین بوو، وە لە بەرەکەتی راستگۆیی تۆ چۆن رزگاریان هات، بڕیارم دا دۆستایەتیت دەگەڵ بکەمو هاتووم تا شەرتی دەسپێکی ئەم دۆستایەتییە بەجێ بێنم.

مشک گوتی: شێوەی پێک گەیشتن. تاریکو کوێرەرێی هاودەنگی باریکو بەستراوە. وە عاقڵان قەدەم دە رێگایەک نانێنو بە دوای شتێکدا نارۆن کە بە دەستهێنانی بە هەموو بارێکدا نامومکینە. چونکە نایانەوێ بە نەزان بناسرێنو لە بەر چاوی خاوەن ئەزموون لە باری عەقڵەوە بە ناتەواو بێنە ئەژمار. چون هەر کەس بیەوێ لە وشکانیدا کەشتی سواری بکا و لە دەریادا ئەسپ سواری، بە خۆی پێکەنیوە، چون لە کەسایەتی زانایان بەدوورە. قەبر هەڵکەن لە دەریادا و پاپۆڕیش لە وشکانی.[1]

وە لە نێوان منو تۆدا بە چ لێکدانەوەیەک رێگەی دۆستایەتی دەتوانێ بکرێتەوە، کە من خواردنی تۆمو هیچ کات ناتوانم لە خۆم ئەمین بم. قالاو گوتی: بڕۆ لای عەقڵی خۆتو باش فکر بکەوە. کە عەزیەتو ئازاری تۆ، یا خواردنی تۆ بۆ من چ سوودێکی هەیە. مانەوەی زاتی تۆ، دەسکەوتنی دۆستایەتی تۆ بۆ من دە رووداوەکانی رۆژگاردا، بەکارم دێو دە فریام دێو کەرەمو پەیمانو

١. گورکن در بحر و کشتی در بیابان داشتن.

لوتفـــی تۆ، لە نەهامەتی زەمانەدا دەبنە مەدەدکارم. ئەوەش پیاوەتی نییە کە، بۆ نزیکبوونەوە لە تۆ رێگایەکی دوورم پێواوە، دەســـتی رەدم لە سەر سینگی دابنێیـــو وەرم نەگـــری. چون جوانی ئاکارو پاکی رفتاری تۆ، لە لای ســـوورو خولی رۆژگار، بۆ من مەعلووم بوو. وە هونەر هەرگیز بە شـــاراوەیی نامێنێتەوە تەنانەت ئەگەر زۆریش نیشان نەدرێ. وەک بۆنی میشکو عەنبەر، هەر چەندیش بیشاریتەوەو دایپۆشی بۆنی هەر دەڕوا و دنیایەک بۆن خۆش دەکا.

چۆن دەتوانی خۆت وەشـــێریو شوێنەونکەم بۆ بکەی

تۆ بە دەســـتت مەشـــعەڵو باوەش پڕی عەترو گوڵاو[1]

وە لە گەورەیی تۆ ناوەشـــێتەوە کە مافی دوور کەوتنەوەم لە ماڵو حاڵ زایە بکـــەیو بە ناهومێدی لەم درگایە وەدەرم بنێیو لە بەرەکەتی دۆســـتایەتی خۆت بێبەشم بکەی. مشک گوتی: هیچ دوژمنایەتییەک وەک دوژمنایەتی سروشتی نییە. چون ئەگەر دوو کەس نێوان ناخۆشـــییان کەوتبێتە نێـــوانو لە درێژایی زەمەندا لـــە هەر دوو لاوە جێگر بووبێو کۆنو تازەی تێکـــەڵ بووبێو رابردوویو دواهاتی ســـەریان وێک هێنابێ، پێش ئـــەوەی بۆ خۆیان کۆچبار بن، ئـــەو دوژمنایەتییە برانەوەی بۆ نییەو نەمانی بە نەمانی ئەوانەوە بەســـتراوەتەوەو ئەو دوژمنایەتییە دوو جۆرە: یەکەمیان وەک دوژمنایەتی نێوان شـــێرو فیلە، ئەوانە مومکین نییە، هەر تووشی یەک بوون بە شەڕ نەیەن. ئەم دوژمنایەتییەش لەوانەیە چارە بکرێ، چون سەرکەوتن لەودا هەر بۆ لایەنێک نییە. جاری وایە شێر سەردەکەوێو جاری واش هەیە فیل، شـــێر دەبەزێنێ. وە ئەم نەوعە هێندە ریشـــەدار نییە کە نەکرێ لەنـــاو بچێ. دەکرێ بە فێڵو تەڵەکەو جامەلووســـکیو بـــە زبانی خۆش بنەبڕی بکەی. دووهەمین چەشـــنی دوژمنایەتی ئەوەیە کە لە نێوان مشکو پشیلەو قالاو و قشـــقەڵەو غەیری ئەوانەیە. کە لەودا هەرگیز زبانلووســـی پەسندکراو نییە. وە لە جێگایەکدا کە قەســـتی گیانو تەماعی نەفس لە لایەنێکەوە ئاشـــکرا بوو، بێ ئەوەی لایەنەکەی دیکە، هەرگیز چ لە رابردوودا و چ ئێستادا ئەو کارەی کردبێو لە داهاتووشدا نەیکا، ئاشتیو برایەتی بە چ بۆچوونێک جێگەی دڵ پێ خۆشکردنە؟

---

[1] ١. بد توان از خلق متواری شدن، پس برملا / مشعله در دست و مشک اندر گریبان داشتن.

وە بە راستی دەبێ بزانین کە ئەم جۆرە دوژمنایەتییە ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبێو زۆرتر تازە دەبێتەوە، کە نە خولی ڕۆژگار دەتوانێ تازەییەکەی بستێنێتەوەو نە جیاوازی شەو و ڕۆژ ئەم گرێپووچکەیە دەکاتەوە، کە زیانو زەحمەت بۆ لایەنێک دیاری کراوەو ئاسوودەییو ڕەحمەتو مەنفەعەت بۆ لایەکەی تر. وە لە جێیەک دوژمنایەتی راستی وەک باسم کرد مسۆگەر بوو، ئاشتیو یەکدڵی دە خەیاڵدا ناگونجێ. وە ئەگەر بە تەعاروفو ڕوودەربایستی پێک بێ، زۆر زوو لە گرێژەنە دەچێو وەک خۆی لێ دێتەوە. فریوی ئەم جۆرە دۆستایەتییەش لە عەیبو زیان دوور نییە. وە هیچ کات پیاوی زانا، متمانە بە مەحکەمی پایەو بناغەی ئەم دۆستایەتییە ناکا. کە ئاو هەر چەند دە زەرفێکدا زۆر بمێنێتەوەو تامو بۆنی بگۆڕێ، ئەگەر بە ئاوریدا بکەی لە کوژاندنەوەیدا تێ نامێنێ. وە ئاشتیکردن دەگەڵ دوژمن وەک دۆستایەتی مارە. بە تایبەتی ئەگەر دە سەلەیدا بە باسکەوە هەڵیاوەسی. وە پیاوی عاقڵ چۆن دەتوانێ دەگەڵ دوژمنی زیرەک هاودەم بێ؟

قالاو گوتی: بیستنی گوتەیەک کە لە سەرچاوەی حیکمەت دێتەدەر، لە فایدە خاڵی نییە. بەڵام بۆ پیاوەتیو کەرەمو جوامێری تۆ ئەوە باشترە کە لەسەر باری پیاوەتیو ئازادەگی خۆت برۆیو باوەڕ بە قسەکانم بکەی. وە ئەو فکرە لە دڵی خۆتدا گەورە نەکەیەوەو لەو قسەیە کە "لە نێوان ئێمەدا ڕێگەی ڕێککەوتن بەستراوە" بگەڕێ، چونکە مەرجی بەخشندەییو پیاوەتی ئەوەیە کە بۆ هەر کارێکی باش ڕێگە بدۆزیتەوە. وە حەکیمان فەرموویانە: دۆستایەتی لە نێوان ئازادەگانو خێرخوازان زوو سەردەگرێو درەنگ هەڵدەبڕێ. وەک دەفرێک کە لە زێڕ دروست کرابێ درەنگ دەشکێ [وە ئەگەر بقوپێو خواروخێچ بێ] زوو راست دەکرێتەوە. بەڵام لە نێوان شەڕخوازانو سەرکێشاندا درەنگ سەر دەگرێو زوو خاو دەبێتەوە، وەک دەفری گڵێنەو سواڵەتێ کە زوو دەشکێو هەرگیز چاک نابێتەوە. وە پیاوی کەریمو مێرخاس بە سەعاتێک دیدارو ڕۆژێک ئاشنایی، هەموو جۆرە دلۆڤانیو دڵدانەوەو خۆشەویستییەک پێشکەش دەکا و دۆستیو برایەتی دەگەیەنێتە ئەوپەڕی خۆی. بەڵام دیسان باسی پیاوی پەستو نامەرد بکەین، هەر چەند دۆستایەتیو پێوەندیت دەگەڵی لە قەدیمەوە بووبێ،

ناتوانی چاوەڕوانی پیاوەتیو چاکەت لێی هەبێ. مەگەر بکەوێتە هەورازو نشێوی هەراسانیو ترسو هومێد. وە ئاسەواری پیاوەتی تۆ ئاشکرایەو منیش موحتاجی تۆم. وە لەم بەر درگایە ناڕۆمو ناگەڕێمەوە. وە هیچ شـتێک ناخۆمو ناخۆمەوە تا بە دۆستایەتی خۆت گەورەو سەرفیرازم نەکەی.

مشک گوتی: برایەتیو هەڤاڵەتی تۆ بە گیان دەکڕمو ئەو قسانەی لە سەرەتا بۆ بەرگری لە خۆم کردم بۆ ئەوە بوو ئەگەر غەدرێک بکەی، عوزرێکم هەبێو بە خەیاڵ نەبێژی کە ئەوم سـاویلکەو رامو سستو خوێرێلکە هاتە بەرچاو. ئەگینا لە مەزهەبی مندا، ئەوەی شتێکی لە من بوێ، بەتایبەت ئەگەر دۆستایەتی منی بە ویست و دڵخوازی خۆی بوێ، سەرم دە رێدایە.

پاشـان هاتە دەر. لە بەر دەرکی کونی ماڵ راوەستا. قاڵاو گوتی: بۆچی نایە دەشتاییو دەگەڵم ئاشنا بی؟ مەگەر هێشتا شکو گومانێک لە ئارادا ماوە؟ مشک گوتی: ئەهلی دنیا هەر کات مەحرەمێکیان بوێو نەفسی عەزیزو گیانی خۆشەویست بـە فیدای ئـەو هاودەمییە بکەن، تـا بەهرەو داهاتی ئەو هاودەمییە شـامیلی حاڵیان بـێو بەرەکەتو مبارەکی ئەو لەسـەر دەوری رۆژگار بمێنێتەوە؛ ئەوانە دۆسـتانی بەراسـتیو برای باوەڕپێکراون. وە ئەو تایفە کە لوتفو خۆشەویستی بۆ تێپەڕاندنی حاڵو ئاگاداری لە کات بە لازم دەزانن‌و مەسڵەحەتی دنیایی لەودا دە بەرچاو دەگرن، وەک راوکەرانێکن کە دانە بۆ قازانجی خۆیان بڵاو دەکەنەوە، نە بۆ تێرکردنی باڵندان. وە کەسـێک کە لە دۆستایەتیدا بەگیانو دڵ حەول بدا، پلەوپایەی بەرزترە لەوانەی بە ماڵو سامان ئەو کارە دەکەن.

وە ئەوەش با نەشارینەوە کە قبووڵی دۆستایەتیو کردنەوەی رێگەی برایەتیو دیـدار دەگەڵ تۆ، گیانم دە مەترسـی دەخا. وە ئەگـەر دڕدۆنگو بەدگومان بووایـەم هەرگیز وا بە مەیلەوە نەدەهاتمەدەر. بەڵام متمانەم بە دۆسـتایەتیت پەیدا کردووەو سـەداقەتی تۆ دە ویسـتنی راسـتگۆیی مندا، لە پلەی شکو گومان تێپەڕیوە. منیش زۆر لەوە زیاتر خوازیاری ئەم دۆستایەتییەم. بەڵام تۆ دۆستانێکت هەیە کە سروشتی ئەوان لە دژایەتی دەگەڵ مندا وەک سروشتی تۆ نییە. وە بیروڕایان بۆ دۆستایەتی من دەگەڵ بیروڕای تۆ نایخوێنێتەوە. دەترسم

کەسێک لەوان چاوی پێم بکەوێو تێم ڕۆبێ. قالاو گوتی: نیشانەی خۆشەویستی دۆستان ئەوەیە کە دەگەڵ دۆستانی خەڵک دۆستو دەگەڵ دوژمنان دوژمن بن. وە ئەمڕۆ بنەما و پایەی دۆستایەتی نێوان منو تۆ وەها دارێژرا کە دۆستی من ئەو کەسە دەتوانێ ببێ کە لە ئازاری تۆ خۆی بپارێزێو ڕەزامەندی تۆ بە پێویست بزانێ. وە بۆ من مەترسی نییە لە کەسێک کە دەگەڵ تۆ ڕێک ناکەوێ، پێوەندی ببسێنمو ئەوەی دوژمنایەتی ناکا پێوەندی دەگەڵ بگرم. بۆ ورەو ئیرادەی پیاو ئەوە گرینگە، چاو و زیان، کە دیدەبانی جەستەو دەمڕاستی دڵن، ئەگەر خەتایەک بکەن، بە یەک ئیشارە هەر دووکیان لەناو بەرێ وە ئەگەر لەم ڕووەوە نارەحەتییەک ببینێ بە عەینی ڕەحەتیو ئاسوودەیی بزانێ.

ئەندامێ لە تۆ ئەگەر ببێتە دۆستی دوژمن
دوژمن بە دوو دانێ، بیانکە ئەنجن ئەنجن[1]

وە باغەوانی شارەزا ئەگەر دە نێو گوڵاندا بژارێک ببینێ، هەڵیدەکەنێ. مشک بە تێڕادیتوویی، بە دڵی قەوی هاتە دەرو بە گەرمی ئەحواڵپرسی قالاوی کردو هەر دووکیان بە دیداری یەکدی شادو شوکر بوون.

پاش ئەوەی چەند ڕۆژێک تێپەڕ بوو، مشک گوتی: ئەگەر هەر لێرە نیشتەجێ بیو ماڵو مناڵت بێنی، زۆر پێ خۆشحاڵ دەبمو بۆ ئەو کۆچکردنەت زۆر منەتبار دەبم. ئەم جێگایەش زۆر زەنوێرو خۆشە، زۆر دڵگوشایە. قالاو گوتی: هەر وایەو لەمەڕ خۆشیو سەفای ئەم شوێنە قسەیەکم نییە. بەڵام لێرە خۆشتر مێرغوزارێک لە فڵان شوێنە کە دەوراندەوری هەمووی گوڵو گوڵغونچەو گوڵی خەندانەو زەوی دەڵێی ئاسمانی ئەستێرەبارانە.

وردە ئەڵماسی پریشکی قەڵبەزەی
ئاوی هەڵدێران کەژی کردن خەنی[2]

وە ڕەقە، دۆستی من، ماڵی لەوێیە. وە خواردنی من لەوێ زۆر دەست دەکەوێ.

---

١. عضوی ز تو گر دوست شود با دشمن / دشمن دو شمر تیغ دوکش زخم دوزن.
٢. لە دیوانی حەقیقی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
ز بس کش گاوچشم و پیل‌گوش است / چمن چون کلبهٔ گوهرفروش است.

بێجگە لەوەش نێرەکانە لەسەر ڕێگا هەڵکەوتووەو لەوانەیە ڕێبواران بەڵایەکم بە سەر بێنن، ئەگەر مەیلت لێ بێ، دەچینە ئەوێو دە نازو نیعمەتدا رایدەبوێرین.

مشــک گوتی: کامە ئارەزوو دەتوانێ هاوسەنگی جیرانەتیو دۆستایەتی تۆ بێ؟ وە ئەگــەر بە قســەی تۆ نەکەم، بۆ کوێ بچم؟ بە ئیشــتیای خۆم نەهاتوومە ئێرەو ســەربردەی من دووردرێژەو پڕە لە ڕووداوی سەیروسەمەرە، ئەگەر جێم بۆ دابین کرا و نیشتەجێ بووم، بۆت دەگێڕمەوە.

قالاو کلکی مشکی گرتو بەرەو شوێنی دڵخواز کەوتە ڕێ. کە گەیشتە ئەوێ، رەقە لە دوورەوە چاوی پێی کەوت. ترســا و خۆی دە ئاو هاویشتەوە. قالاو بە ئەســپایی مشکی لە سەر زەوی دانا و رەقەی بانگ کرد. رەقە بە هەڕەمە هاتە وشــکانیو حاڵی قالاوی پرسیو خەبەرو باســی لێ وەرگرتو پرسی لە کوێوە دێتو حاڵو ئەحواڵی چۆنە. قالاو داستانی خۆی لەو ساتەوەختەوە کە بە دوای کۆترەکاندا ڕۆیشــتبوو و پیاوەتیو جوانی عەهدو پەیمانی مشکی لە نەجاتدانی ئەواندا چاو پێکەوتبوو، وە بەو دەلیلە پێوەندی پتەوی دۆستایەتی لە نێو هەر دووکیانــدا پێــک هاتبوو، وە چەند ڕۆژ لەوێ ماوەتەوەو پاشــان بڕیاری ئەوی بۆ هاتنو زیارەت، هەمووی گێڕاوە. رەقە کە داســتانی مشکی بیستو راستیو وەفاداریو پیاوەتی ئەوی ناســی، مەرحەبایی گەرمی بە پێویست زانیو گوتی: بەخــتو ئیقباڵــی ئێمە تۆی گەیاندە ئێرەو ئەم شــوێنەی بــە گەورەیی زاتی بەڕێزتانو سفەتو ئاکاری جوانتان ڕازاندەوە.

ڕۆژ نایەتــەدەر لــەماڵــی ئێمە  
تــا تۆ نەیــەدەر لە ماڵــی ئێمە[1]

قالاو پاش بەیانکردنی ئەم قســانەو پیشکەشکردنی ئەم خۆشەویستییانە بە مشکی گوت: ئەگەر پێت باش بێ، ئەو حەکایەتو بەسەرهاتانەی وەعدەت دابوو، بۆمــان باس بکە تا رەقەش گوێی لێ بێ. کە پێگەی ئەویش لە دۆســتایەتی تۆدا وەک هی منە. مشک دەستی پێکردو گوتی: زێدو ئاخێزگەی من لە شاری مــارووت بوو لە حوجرەی زاهیدێکدا. ئەو زاهیدە مــاڵو منداڵی نەبوو. هەموو

---

١. خورشید سر از سرای ما برنارد / تــا تــو ز در ســرای مــا درنایی.

رۆژێ لە ماڵی مریدێکەوە سـەلەیەکیان خۆراک بـۆ دێنا. برێکی لێ دەخواردو ئەوی دەماوە رایدەگرت بۆ شـام. وە من چاوەڕوانی دەرفەت دەبووم، هەر کە وەدەر دەکەوت، ئەوەندەی پێویست با دەمخواردو باقییەکەم بۆ مشکەکانی دیکە دەهاویشت. زاهید، لە دەستانم تێمابوو، زۆر فێڵی دە کار هێنا و سەلەکەی لە بڵندی هەڵداوەسی. بەڵام فایدەی نەبوو، نەیتوانی دەستم لە خۆراک کۆتا بکا. تا ئەوەی شەوێک میوانێکی بۆ هات. پاش ئەوەی شامیان خوارد، زاهد پرسی: لە کوێـوە هاتوویو بۆ کوێ دەچی؟ ئەو پیاوە کەسـێکی دنیادیتەو گەڕیدەو سـاردو گەرمی رۆژگاری چێشـتبوو. وە هەر چی شـتی سەیروسەمەرەی ئەو دنیایەی دیبووی بۆ زاهیدی دەگێڕاوە. وە زاهید لە هەمان کاتدا کە گوێی دابووە قسـان، بە دەست تەقەی دەکرد تا مشـکان بڕەتێنێو بترسێنێ، میوان تووڕە بوو گوتی: من قسە دەکەمو تۆ دەستان لێک دەدەی! گاڵتەم پێدەکەی؟ زاهید عوزری خواسـتو گوتی: دسـتپێکدادانی من بۆ دەرکردنی مشکانە کە وەختە سـواری سەرم بن. هەر چی دایدەنێم زوو دەیخۆن. میوان پرسی: هەموویان وا سـەرەرۆن؟ گوتی: یەکیان لە هەمووان نەترسترە. میوان گوتی: نەترسی ئەو یەکەیان سەبەبێکی دەبێ هەبێ. وە حەکایەتی ئەو، تاھو بۆنی ئەو حەکایەتەی هەیـە کە پیاوێـک گوتبووی: "ئاخر دەلیلێکی هەیە کـە ئەم ژنە کونجدی بێ پێست دەگەڵ کونجدی بە پێستەوە سەربەسەر سەودا دەکا".

شـەوێک لە فلان شار لە ماڵە ئاشـنایەکم دابەزیم. پاش ئەوەی شام خورا، جێگاویانیان بۆ داخسـتم. خاوەن ماڵ رۆیشتە لای خێزانیو من گوێم لە قسەو گفتوگۆیـان بوو. چون لە نێوان منو ئەواندا حەسـیرێک حەشـاردەر بوو. بە ژنەکەی دەگوت کە: دەمەوێ سـبەینێ عالەمێکی میوان بکەمو زیافەتێک بدەم چونکە خۆشەویسـتێک هاتووە. ژن گوتی: خەڵکی چۆن بانگهێشتن دەکەی لە حاڵێکدا بۆ بژیوی ماڵو منداڵ هیچ شتێک لە ماڵماندا شک نابەین؟ تۆ هیچ کات دە فکری سبەینەدا نیو چاوەدێری ماڵو منداڵت ناکەی. پیاوەکە گوتی: ئەگەر تەوفیقی ئیحسـانو چاکەو مەجالی بەخشین بێتە پێش، پیاو نابێ کۆتایی بکا و لێی پەشـیمانو رووگەردان بێ. چونکە کۆکردنەوەو زەخیرەکردن نامبارەکەو

سەرەنجامەکەی شـــوومو ناخۆشە. هەر وەک سەرەنجامی گورگێک. ژن پرسی: ئەم نەقڵە چۆنە؟

گوتـــی: دەگێڕنەوە راوکەرێک رۆژێک رۆیشـــتە راو و ئاســـکێکی کوشـــتو هەڵیگرتەوەو بەرەو ماڵ بۆوە لە رێگادا دەگەڵ بەرازێک تێک هەڵەنگووتن. بەراز پەلاماری دا، کابرا تیرێکی هاویشتو لە خالیگەی کەلەکەی بەرازی دا. بەرازیش کابرای بە توندی بریندار کردبوو. هەر دووکیان کەوتنو ساردبوونەوە. گورگێکی برسی گەیشـــتە ئەو شوێنە. ئاسکو بەرازی چاوپێکەوتو کەیفی ساز بوو. لەو هەموو رسقو رۆزییە، متمانەی ژیانێکی خۆشی تێدا پەیدا بوو. بە خۆی گوت: وەختـــی ئەوەیە ئاگام لە خۆ بـــێو زەخیرە کۆ بکەمەوە. ئەگەر تەمبەڵی بکەم لە عەقڵو ئیحتیات بەدوورەو بە کەریەتیو نەزانی تاوانبار دەکرێم. مەسڵەحەت لەوەدایە ئەمرۆ ژێی ئەم کەوانە بخۆمو هەر بەوەندەش قانیع بمو ئەو گۆشـــتە تازەیانە ببەمو لە کەلێنێکدا بۆ رۆژی برســـیەتیو بێڕاوی بشـــارمەوە. هەر کە دســـتی کرد بە خواردن، ژێ پسا و دوو جەمسەری کەوان وە بنانگوێی کەوتو دە ملیدا گیریان کردو لەجێی خۆی سارد بۆوە.

وە ئەم نەقڵەم بۆ کردی تا بزانی کە تەماعی زۆر بۆ زەخیرەکردنو کۆکردنەوە نامبارەکەو سەرەنجامی شوومی هەیە. ژن گوتی: اَلرِّزْقُ عَلَى اللهُ.[١] راست دەڵێی. لە ماڵێ هێندێکمان برنجو کونجد هەیە. بەیانی خۆراکێک ســـازدەکەم، شەش، حەوت کـــەس هەر یەکـــەی پارووەکیان بەرکەوێ. کێت پێ خۆشـــە، بانگی بکە. رۆژی دوایی کونجدی هێنا و دە ئاوی کردو پێســـتی لێوەکردو لەبەر خۆرەتاو هەڵیخست تا وشـــک بێتەوە. بە مێردەکەی گوت، ئاگات لێی بێ، دەعبا و پەلەوەری لێ دەر بکە تا وشـــک دەبێتەوەو خۆی بە دوای کارێکی دیکەدا چوو. کابرا خەو دایگرتو ئاگای لە خۆی نەما. سەگێک دمی دە کونجد وەردا. ژن ئەوەی دیتو بێزی نەهات کە چێشـــتی پێ ســـاز بکا. بردیە بازارو سەربەسەر دەگەڵ کونجدی بە پێستەوە سەودای پێ کرد. من لە بازار خۆم شاهیدی ئەم سەودایە بووم. کابرایەک گوتی: ئەو ژنە بە دەلیلێک کونجدی پێست لێوەکراو بە کونجدی بەپێستەوە دەگۆڕێتەوە".

---

١. رسقو رۆزی بە دەست خودایە.

وە من وام بە دڵدا دێ کە ئەم مشـــکەش ئـــەم کەڵەگاییەی لە خۆڕا نییەو پشتی بە شتێک بەستووە، ئێزن بفەرموون من کونەکەی هەڵدڕمو بزانم زەخیرەو پشـــتیوانی چ هەیە کە بە قەوەتی ئەوانـــەوە ئەم هەڵتۆزەهەڵتۆزە دەکا. ئەوەی گوتو لە جێوە دەستی دا پاچ. من لەو سەعاتەدا لە کونێکی دیکەدا بوومو گوێم لەو قســـانە دەبوو. وە لە کونەکەی مندا هـــەزار دینار هەبوو. نازانم کێ لەوێی دانابوو. بەڵام من لە سەر ئەو خەزێنەیە جینگڵم دەدا و خۆم تێدەگەوزاندو ئەو بەزمـــەم زۆر پێ خۆش بوو، کەیفم پێدەهات. وە هـــەر کات بیرم دەکەوتەوە، شـــادی لە مندا دەبزووت. میوان عەرزەکەی قەڵاشـــتەوەو گەیشتە زێڕەکانو بە زامیدی گوت: لەمە بەدوا ئەو کەڵەگاییە ناکا. من ئەم قسانەم دەبیستو هەستم بە بێهێزیو تێکشکانو سستی دە خۆمدا دەکرد. وە بە ناچار دەبوایە لە کونی خۆم کۆچ بکەم. وە زۆری نەکێشا کە دابەزینی پلەوپایەی خۆمو بە چاوی کەم چاو لێ کردنو بە سووک زانینم لە دڵی ئەواندا بەرانبەر بە خۆم هەست پێکرد. ڕێزگرتنو بەقســـەکردنو بە گەورەزانیـــن وردەوردە بەرەونەمان چوون، کار لە بێشەرمیو بێحەیاییدا گەیشتە زاڵبوون. وە دەستووری بێقاعیدەیان پێدەدامو بەشـــێوەی جاران لێیان دەویســـتم خۆم هەڵباوێمە سەر سەلە، چون نەمتوانی دەســـتیان لە پێرەویکردنو هاودەمی من هەڵگـــرتو بە یەکتریان گوت " کاری تەواوەو زۆر زوو حەوجەی بە ئێمە دەبێ". سەرت نەیەشێنم منیان بەجێهێشتو پاڵیان دا بە دوژمنانی منەوە. دەســـتیان کرد بە باسکردن لە عەیبو عارەکانی منو پاشـــملە هەر چی توانیان باسی بێهێزیو کەمایەسیو لەنگو لۆری منیان کردو ئیدی کەس بە چاکە باسی نەکردمەوە.

وە مەســـەلی مەشـــهوورە دەڵێ مَنْ قَلَّ مالُهُ هانَ عَلیٰ اَهْلِهِ[1]. پاشـــان بەخۆم گـــوت هەر کەس فەقیری رووی تێکرد لای خـــزمو قەومو کەسو کار حورمەتی نامێنێو بێکەس دەبێ. وە نیشـــان دانی هاودەردیو قورســـی قسەو ماقووڵیو رووەدرەبایســـتی بێ ماڵی دنیا دەســـت نادەن. وە بە حوکمی ئەم سەرەتایانە، دەتوانین بزانین کە دەســـت بەتاڵی بێسەرمایە ئەگەر بیەوێ بە دوای کارێکدا

١. هەر کەس ماڵی دنیای کەم بێتەوە لە لای ئەهلو عەیاڵ قەدریشی کەم دەبێتەوە.

بڕوا، فەقیری دایدەنیشێنێتەوەو ناچار لە گەیشتن بە ئاوات دەمێنێتەوە. هەر وەک بارانی هاوینی لە بیاباندا لەناو دەچێ. نە دەگاتە دەریا و نە تێکەڵ بە جۆگەلە ئاوان دەبێ، چون یارمەتیدەرێکی نییە کە پاڵی پێوەبنێ. وە راستیان گوتووە کە هەر کەس برای نەبێ غەریبەو هەر کەس منداڵی نەبێ زوو ناوی فەرامۆش دەکرێو هەر کەس ماڵێکی نەبێ لە فایدەی عەقڵو بیروڕا بێبەش دەبێ. لە دنیا و قیامەت بە مورادێک ناگا. چون لە کاتی فەقیریو نەداریدا کۆمەڵی دۆستان وەک تۆزی بەر با بڵاو دەبنەوەو لەشکری غەمو پەژارە لە دەوری شڵغە دەکەنو لە لای نزیکانو خزمو ئەقرەبا و ژێردەستان بێڕێز دەبێ.

بێپارە ئەگەر ڕۆستەمی زالیش بی، زەلیلی
پووڵت کە هەبوو پاکی دەڵێن، نەسلی خەلیلی[1]

وە زۆر هەڵدەکەوێ کە بۆ دابینکردنی بژیوی خۆیو عەیالی ناچار دەبێ روو دەکاری خراپ بکا و بەرهەمی ئەو کارەی دەبێتە پەردەو حیجابی نیعمەتەکانی قیامەتو چارەڕەشی ئەبەدی لێ دەکەوێتەوە. خَسِرَ الدنیا و الاخِره[2]. وە بەراستی دارێک کە لە شۆرەکاتدا رواوەو لە هەموو لاوە سەدەمەی پێ دەگا، حاڵی خۆشترە لەو فەقیرەی کە چاو لەدەستی خەڵکە. بەراستی سەرشۆڕی و چاو لەدەستی ناخۆشو دژوارە. وە گوتوویانە: عِزُّ الرَّجُلِ اِسْتِغْناؤهُ عَنِ النّاسِ[3]. وە دەروێشیو فەقیری بناغەی بەڵایەو باعیسی دوژمنایەتی خەڵک، رووخێنەری شەرمو حەیا، قاتڵی زۆرو غیرەت، مەکۆی شەڕو ئافەتو هەر کەس تووشی هات، پەردەی حوجبو حەیاش بەناچار دەبێ بدرێنێ. وە کاتێک پەردەی شەرمی لادا، هەموو دەیبوغزێننو تووشی ئازارو ئەزیەت دەبێو خۆشیو شادی لە دڵیدا هەڵدەپرووکێ. زاڵبوونی غەمو پەژارەش عەقڵ زایل دەکا و زەینو تێگەیشتنو خۆڕاگریو وریاییو لێزانی بەگشتی لە کورتی دەدەن. وە کەسێک کە تووشی ئەم بەڵا و پەتایانە بوو، هەر چی بێژێو بیکا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. وە قازانجو سوودی بیروڕا و تەدبیری دروست بۆ ئەو زەرەری لێ دەکەوێتەوە.

---

١. بی پول اگر رستم زال است ذلیل است / با پول اگر گبر بود نسل خلیل است.
٢. زەرەرمەندی دنیا و ڕۆژی پەسلانە.
٣. گەورەیی مرۆڤ لە بێنیازیو حەوجێ نەبوون بە خەڵکدایە

کەســـانێک کە ئەویان بە ئەمیــن دەزانی، تۆمەتی بۆ هەڵدەبەســـتنو گومانی بەخێری دۆســـتان، پێچەوانە دەبێتەوە. گوناهی دیترانی دەکەوێتە ئەستۆ، وە هەر واژەو دەســـتەواژەیەک کە بۆ دەوڵەمەندان مەتحو پێ هەڵاگوتنە بۆ پیاوی فەقیر ســـووکایەتیو جنێوە. ئەگەر فەقیرێک ئازا و دلێر بێ، دەڵێن نەفامە، وە ئەگەر ســـەخیو بەخشـــندە بێ، دەڵێن ماڵی خۆی شەنە بە با دەکا. وە ئەگەر بیەوێ ئارامو گرانو ســـەنگین بی، بە بێوورەییو زەعیفی بۆ حیســـاب دەکەن. وە ئەگەر زباندارو قسەزان بێ، نێوی چەنەوەرو زۆر بلێی لێ دەنێن. وە ئەگەر بڕواتە شوێنی بێدەنگی دەڵێن ترساندوویانەو بێدەنگیان کردووە. وە مەرگ لە هەموو بارێکەوە لە ســـواڵو دەستدرێژکردن بۆ لای خەڵکان، خۆشترە. چونکە دەســـت دە زاری ئەژدەها رۆکردنو لە دەمو پووزی شێری برسی لوقمە فڕاندن، بۆ پیاوی کەریم ئاسانترە لەوەی لە پیاوی لەچەرو بەغیلو دەستقووچاو داوای شتێک بکا.

وە گوتوویانە: "ئەگەر کەســـێک بە جۆرێک تووشـــی نەخۆشـــییەک بێ کە هومێـــدی چاکبوونەوەی نەبێ، یا دوورکەوتنەوەیەک کە پێککەیشـــتنەوە تەنیا بەخەیاڵ مەیسەر بێ، یا غەریبێک کە نە هیوای گەڕانەوەی هەبێو نە هەلومەرجی مانـــەوەی بۆ بلوێ، یا نەدارییەک کە بگاتە ســـواڵکردن، ژیانی ئەو کەســـە لە راستیدا مەرگەو مردنەکەی عەینی ئاسوودەییە".

وە زۆر جـــار وا دێتـــە پێش کە شـــەرمو پیاوەتی دەبنە کۆســـپو پێش بە لاڵانـــەوەو پاڕانەوە دەگـــرن. لەبەر ناچاری زۆر هانـــی دەدەن بۆ خەیانەت، تا دەست بۆ ماڵی خەڵک درێژ بکا، هەر چەند لە هەموو تەمەنیدا خۆی پاراستووە وە زانایـــان دەڵێن "عەیبو عاری لاڵی باشـــترە لە درۆکردنو ناخۆشـــی لاڵیو پسکی لە فەساحەتی قسەی ناحەز کردنو کوێرەوەرییو زیللەتی فەقیری چاکترە لە گەورەییو عیززەتی دەوڵەمەندی بە کەسبی حەرام".

وە کاتێک زێڕەکەیان لە کونەکە هەڵگرتو زاهیدو میوان بەشـــیان کرد، من چاوم پێوەبوو، کە زاهید بەشی خۆی دە کیسەیەک کردو دەبن سەرینەکەی نا. تەمـــاع گرتمی کە هێندێکی لێ بدزمەوە، بـــەو هیوایەی کەمێک لە هێزو توانام

وەک خۆی لێ بێتەوەو دۆســـتانو برادەران دیســـان بێنەوە گەڕی دۆستایەتیو هاودەمـــی من. کاتێک خەوت، بۆی چووم. میوان بێدار بوو، دارێکی گەیاندمێ. لەبەر ئێشو ئازاری ئەو زەبرە بە شەلەشـــەل گەڕامەوەو لەســـەر زگ خۆم دە کونەکـــەم را کردەوە. هێندێک راوەســـتام تا ئێشو ئازار هێـــور بوونەوە. ئەو تەماعە دیســـان وەخۆی خســـتمەوەو دووبارە هاتمەوە دەر. میوان هەر وا دە کەمیندا بوو، دارێکی بە ســـەرمدا کێشـــا. بەجۆرێک کە لە پێ کەوتمو بێهۆش بـــووم. بە هەر فێڵو کەڵەکێک بوو خۆم رزگار کـــردو گەڕامەوە نێو کونەکەمو بە خۆم گوت: ئاخری بۆ تەماعی دنیا خۆت بە هیلاک دەدەی. وە بە راســـتی دەردو ئـــازاری ئەو هەموو برینانـــە، هەموو ماڵی دنیای لە بەرچاو رەش کردم. وە نارەحەتی دڵو پەژارەی دەروون گەیشـــتە ئاســـتێک، کە ئەگەر لە پشـــتی چەرخی گەردوونی بارگەی لە جموجووڵو خولانەوە دەکەوێو وەک کێو بێدەنگ رادەوەستێو ئەگەر ســـۆزی ئەو بکەوێتە گیانی چیا، وەک گەردوون دەکەوێتە خول دانو سووڕانەوە.

وە ســـەرەنجام بۆم روون بۆوە کە سەرەتای هەموو بەڵایەکو سەردەستەی هەموو ئافەتـــان، تەماعەو هەموو عالەمیش بێئەندازە پێوەی پابەندن. تەماعو زێدەخوازی لەغاوی کردوونو هەڵیاندەســـووڕێنێ. چۆن منالێک وشتری مێ بە دوای خۆیدا بۆ هەر لایەک دەکێشـــێ. وە ئەنواعی مەترســـیو خۆفـو خەتەری حزوورو زەحمەتی سەفەر بۆ پاروەوە نانێک بە لای کەسی بەتەماعو زێدەخوازەوە ئاسانترە لەوەی کە پیاوی سەخی دەست درێژ بکا بۆ ماڵو یارمەتی وەرگرتن. وە بە تەجرەبە دەتوانین بزانین کە رەزا بە قەزا و خۆڕاگریو سەبرو قەناعەت، ئەسڵی دەوڵەمەندیو عومدەی سەروەرییە.

دەتـــوێ پـــاکو ســـەربەفرازو دلێرانـــە بژی
بـــە قەناعەت بژی، رێوی مەژی، شـــێرانە بژی[1]

وە زانایانو حەکیمان گوتوویانە یَکفیکَ نَصیبُکَ شُـحَّ القَوْمِ[2] و هیچ زانســـتێک

---

١. گرت نزهت همی بایـد بـه صحرای قنـاعـت شـو/ که آنجا باغ در باغ است و خان در خان و با در با.
٢. بۆ تۆ بەسە ئەو بەهرەو نسیبەی لە قەومی بەغیل دەستت دەکەوێ.

وەک تەدبیری راســتو هیچ رزگارییەک ناگاتە دووربوونەوە لە کەسبی حەرام.
وە هیچ رەوشتێک وەک خۆشخولقیو هیچ دەولەمەندییەک وەک قەناعەت نییە.

وە شایستەترین زەحمەتێک کە دەبێ سەبرو حەوسەلەت تێیدا هەبێ ئەوەیە کــە دە رادانو لابردنیدا حەولو تەقالا مومکین نەبێ. وە گوتوویانە "گەورەترین چاکە رەحمەتو میهرەبانییەو ســەرمایەی دۆســتی راهاتــن دەگەڵ رەفیقانەو ئەسڵی عەقڵ، ناســینی دەبێو نابێو پیاوەتیو جوامێری دەروون لەوەدایە کە بــە دوایدا نەڕوا" وە کاری من وردەوردە گەیشــتە پلەیەک کە قانیع بووبمو بە تەقدیری ئاسمان رازی بووم.

با، وەدەرنێ لە سەرت، رەق بە وەکوو بەردی بنار
خۆڵەپۆتینــە مەبە، با هەڵیــکا دەبیە غوبار[1]

ناچارماڵی زاهیدم بەجێهێشتو رووم دە سەحرا کرد. کۆترێک دەگەڵم دۆست بوو، خۆشەویســتی ئەو بوو بە رێنوێنی دۆســتایەتی قالاو. پاشان قالاو باسی پیاوەتیو جوامێری تۆی گێڕاوە، وە شــنەبای روخســاری جوانی تۆ لە وتوێژ دەگەڵ ئەو بە من گەیشت. وە باسی کەرەمو چاکی جەنابت هاندەری سەداقەتو زیارەت بوو. چون بە گێڕانەوەو باسکردنی سیفەتو تایبەتمەندی کەسێک هەمان دۆستایەتی پێک دێ کە خۆت ئەو کەسە ببینی. وە لەو کاتەدا ئەو دەهاتە لای تۆ ویســتم بە ئیزنی ئەو بێمو بەختەوەری چاوپێکەوتنی تۆ بە نســیبم بێو لە خۆفو خەتەری تەنیایی رزگاریم بێ. کە تەنیایی گەلێک سەختەو لە دنیادا هیچ شــادییەک ناتوانێ وەک هاونشینی دۆســتان بێو دەردی دووری بارێکی گرانە. هەر گیاندارێک تاقەتی ئەو بارەی نییەو شــۆرو شەوقی پێکگەیشتن شەربەتێکی گەوارایە کە هەر کەســێک ناتوانێ لە بەرانبەریدا خۆڕاگر بێ وە بە حوکمی ئەم ئەزموونانــە روون دەبێتەوە کە پیاوی عاقڵ لە ماڵــی دنیا دەبێ بە ئەوەندەی پێویستە رازی بێ. وە بەو بارستایە کە پێداویستی ژیانە قانیع بێ. ئەوەش زۆر کەمە، رســقێکو جێگەی حاوانەوەیەک. چون ئەگەر تەواوی دنیا بدەن بە یەک نەفــەر، فایدەکەی هەر ئەوەندەیە کە حاجەتو پێداویســتییەکان دابین بکا. وە

---

١. باد بیرون کن ز سر تا جمع گردی، بهرآنک / خاک را جز باد نتواند پـریشان ساختــن.

هەر چی لەوە زیاتر بێ، لە ئەنواعی نیعمەتو خرتوپرتی جوان، تەنیا هەوەسی دڵو حەزی چاو دەمێنێتەوەو بێگانەش دەتوانن تێیدا ببنە شەریک. وە من ئێستا لە جیرانەتی تۆدامو بە دۆستایەتیو برایەتی تۆ سەرفرازم. وە خواستی من ئەوەیە کە پێگەی منیش لای تۆ و لە دەروونی تۆدا وەهابێ.

کاتێک مشک ئەو بەسەرهاتانەی بە کۆتایی گەیاند، رەقە بە جوابی دڵخۆشکەرو نەرمو نیان لاواندیەوەو حاڵەتی غەریبیو ناخۆشی ئەوی کرد بە دۆستیو پێکەوە بوونو گوتی: قسەکانتم بیستو هەر چی گوتت رازاوەو دڵنشین بوو. بەو ئاماژەو ئیشاراتە دەلیلی پیاوەتیو جوامێریو ئازادیو بڵندنەزەری تۆمان بۆ دەرکەوت. بەڵام بە هۆی غەریبییەوە تۆ بە خەمناکی دەبینم. ئامان نەکەی میوانداری ئەو خەمە بکەی. کە گوتەی باش، زەمانێک جوانی خۆی دەر دەخا کە دەگەڵ کردەوەی پەسندکراو تێکەڵاو بێ. وە نەخۆش کە رێگەی عیلاجی ناسی، ئەگەر دەکاری نەهێنێ لە بەهرەی زانست بێبەش دەبێ. زانستی خۆت دەبێ دەکار بێنیو لە بەهرەی عەقڵ قازانج بکەیو لەبەر کەمداهاتی غەمناک نەبی. خاوەن مروەت ئەگەرچی دەوڵەمەند نەبێ، هەمیشە بە خۆشیو سەربەرزییەوە ژیان تێپەڕ دەکا. وەک شێر کە لە هیچ جێگایەکدا هەیبەتو گەورەییەکەی کەم نابێتەوە، هەر چەند دە سندووقدا دەستو پێی بەسترابێ. دەوڵەمەندی کەمهیممەت، زەلیلو رەزیل دێتە بەرچاو. وەک سەگ کە لە هەموو جێگایەک بێقیمەتە هەر چەند قەڵادەو خەڵخاڵی زێڕینی دەملدا بێ.

ئەم غوربەتە لە دڵت دەرباوێژەو زۆر گرینگی پێ مەدە، کە عاقڵ بڕواتە هەر شوێنێک پشت بە عەقڵی خۆی دەبەستێ. وە شوکر لە هەموو حاڵێکدا پێویستە. وە هیچ جلوبەرگێک لە رۆژانی شەوەزەنگو مەینەتیدا ناگاتە خشڵو زێوەری سەبرو خۆڕاگری. دەبێ خۆڕاگر بیو سەبرت هەبێو لەگەڵ دڵی خۆت پەیمان گرێ بدەی، چون ئەگەر ئەم بابەتە ئەنجام بدەی، قاسیدانی بەختەوەریو خێرو بەرەکەت رووت تێدەکەنو فەوجی شادی تۆیان دەوێو بە دواتدا دەگەڕێن. هەر وەک ئاو کە جێی قووڵو نەوی دەوێو مراویش ئاو. هەموو چەشنە فەزیلەتێک بە نسیب خاوەن بیروڕایان دەبێ. وە هیچ کاتێک روو دە پیاوی تەوەزەلو

خوێڕی ناکا و لە دەســـتانی هەڵدێ، وەک چۆن ژنی حەکەدارو جحێڵ لە پیاوی بێهێـــزو بێتاقەت. غەمگین مەبە لەوەی دەڵێی ماڵو ســـامانێکت هەبووەو لە دەســـتت داوە. چونکە ماڵو دارایـــی دنیا پایەدار نابـــێ. وەک تۆپێک کە دە حەوای دەکەوێ، نە رۆیشتنەکەی کەلکی هەیەو نە هاتنەخوارەوەی گرینگییەک.

وە زانایان گوتوویانە: "چەند شـــت هەن بەقایان نییە: سێبەری هەور، دۆستی بەدفەڕو پیاوخراپان، عەشـــقی ژنانو پێهەڵاگوتنی زۆرو ماڵو سامانی زۆر". وە رەوا نییە پیاوی عاقڵ بە زۆربوونی ماڵی دنیا لە خۆی دەرچێو کەیفی سازبێو بە نەبوونەکەی غەمناک بێو داماو بێ. وە دەبێ ئەو شتە بە ماڵی خۆی بزانێ کە هونەرێکی پێ وەدەست بێنێ. وە کرداری باش کەڵەکە بکا، چون هەموو باش دەزانین ئەم دوو شتە لە کەس ناستێندرێ. وە رووداوەکانی رۆژگارو خولانەوەی چەرخی زەمان کاری تێناکەن.هەر وەها ئامادەکردنی تۆشـــەی قیامەت لە کارە گرینگەکانە. کە مەرگ هەمیشـــە لە نەکاو دێو هیچ کەس مۆڵەت نادا و کاتو ساتی بۆ دیاری ناکا.

وە ئەوەش با بزانینو نەیشـــارینەوە کە تۆ پێداویستیت بە وەعزی من نییەو قازانجو زەرەری خۆت باش دەزانی، بەڵام ویســـتم تۆ بۆ ئەخلاقی پەسندکراو و عادەتگەلی باشو ستایشـــکراو هان بدەمو هەقی دۆستایەتیو برایەتیمان بەجێ هێنابێ. وە تۆ لەم رۆژەوە برای ئێمەیو لە هەر کارێکدا یارمەتییەک لە دەست ئێمە بێ پێشکەشتان دەکەین.

قالاو، کاتێک رەحمو بەزەی رەقەی بەرانبەر بە مشـــک دیتو بیســـت. زۆر بە خۆشـــی هەڵیدایەو گوتی: منت خۆشـــحاڵ کردو هەمیشـــە هەر ئەوە لە تۆ چـــاوەڕوان دەکرێ. وە تۆش بە چاکیو پاکی خۆت بنازەو بە کەیفـو شـــادی بژی، چون شـــایانترین کەس بۆ شـــادبوونو کەیفخۆشـــی ئەو کەسەیە کە لە دەوروبەری، دۆســـتان زۆر بنو هەموو کات جەماعەتێک لە دۆســـتانو برایان، خەریکی پێڕاگەیشـــتنو خزمەتکردنو دۆســـتایەتیکردنو ئاگاداری لێکردنی ئەو بـــن. وە ئـــەو درگای کەرەمو پیاوەتی خۆی بەســـەر ئەوانـــدا بکاتەوە. وە لە قبووڵکردنی خواهیشتو ئەنجامدانی حاجەتی ئەوان بە رووی خۆشو گوشادەوە

پێشـــوازی بکا. هـــەر وەک فیل، ئەگەر لـــە زەلکاوێکدا تێبگیـــرێ، بێجگە لە فیلان کەس ناتوانێ لەوێی نەجات بدا. وە عاقڵ هەمیشـــە بۆ وەدەستخســـتنی گەورەیی‌و شـــەرەف تێدەکۆشـــێ‌و ناوبانگی باش بەجێ دێڵـــێ. وە ئەگەر لەم بوارەدا مەترســـییەک ببینێ، مەسەلەن باسی سەردانان بێ، مەیدان خاڵی ناکا، بۆ ئەوەی بۆ باقیمانەوە بەقایەکی کڕیبێ‌و کەمی بە زۆر فرۆشتبێ.

خۆشناوترین کەس ئەوەیە کە لە دەورووبەری پەنادراوانی ئەمینکراو زۆر بێ‌و لەبەر درگای ئەو سواڵکەرانی شوکرانەبژێر، گەلێک ببیندرێن. وە هەر کەس دە نیعمەت‌و سامانی خۆیدا موحتاجان بەشدار نەکا بە دەوڵەمەند ناناسرێ‌و ئەوەی کە ژیانـــی بە بەدناوی‌و دوژمنایەتی خەڵک تێپەڕ دەکا، ناوی ناچێتە نێو ناوی زیندووان.

قالاو دەو قسانەدا بوو کە لە دوورەوە ئاسک بە هەڵاتن پەیدابوو. وای بۆ چوون کە کەسێک بە دواوەیەتی. رەقە خۆی دە ئاو هاویشتەوەو قالاو هەڵفڕییە سەر دارو مشـــک خۆی دە کونێک را کرد. ئاسک گەیشـــتە قەراغ ئاو، هێندێکی خواردەوەو هەراسان‌و نیگەران راوەستا. قالاو کە ئەم حاڵەتەی چاو پێکەوت، چوو دە هەواوە بۆ ئەوەی بزانێ کەسێکی بە دواوەیە یا خێر. بۆ هەموو لایەکی روانی‌و کەسی چاو پێ‌نەکەوت. بانگی رەقەی کرد کە لە ئاو بێتەدەرو مشکیش هاتەدەر.

پاشـــان، رەقە کە دیتی ئاســـک نیگەرانەو چاوی دە ئاو بڕیوەو ناخواتەوە، گوتی: ئەگەر تینووی بخۆوەو مەترسە. هیچ مەترسییەک لە ئارادا نییە. ئاسک هێندێک پتر رۆیشـــتە بەرەوە. رەقە زۆر میهرەبانی نواندو پرســـی: مەســـەلە چییەو لە کوێوە هاتووی؟ گوتی: من لەم دەشـــتانەدا بووم. وەختو بێ‌وەخت تیرەندازان لەم سەر بۆ ئەو سەر رەتاندوویانم‌و ئەمڕۆ پیرەپیاوێکم چاو پێکەوت، بە راوکەری تێگەیشتم، هەڵاتم بۆ ئێرە. رەقە پێی گوت: مەترسە لەم دەڤەرە تا ئێستا راوکەر نەبیندراوەو ئێمەش دە خزمەتدا دەبین‌و لەوەڕگاشمان لێ نزیکە.

ئاســـک، مانەوە بەلای ئەوانەوەی پێ‌خۆش بـــوو، لەو مێرگەدا ئاکنجی بوو. لـــەوێ کەندرێک بوو کە تێیدا کۆ دەبوونەوەو سەرگوریشـــتەو نەقڵ‌و نەزیلەیان دەگێڕاوە، رۆژێکیان مشـــکو رەقەو قالاو هاتن‌و ســـەعاتێک چـــاوەڕوان بوون

ئاسـک نەهات. دڵنیگەران بوونو هەر وەک عادەتی دۆسـتانی خۆشەویستە، خاترپەرێشان بوونو فکریان بۆ هەموو لایەک دەچوو. مشکو رەقە بە قالاویان گوت: زەحمەت بکێشەو چاوێک بەم دەوروبەرانەدا بگێڕە بەڵکوو ئاسک وەبینی. قالاو فەرمانی بەجێ هێنا و ئاسـکی لە بەنـدو داودا چاو پێکەوت. هەر لەجێ گەڕاوەو دۆسـتانی ئاگادار کردەوە. رەقەو قالاو بە مشکیان گوت لەم رووداوەدا هیوامان تەنیا بە تۆیە. ئێمە هیچمان پێ ناکرێ.

راپەڕە تـا هەلو دەرفـەت ماوە
یاری خۆت بێنـە دەرێ لەم داوە[1]

مشـک بە هەڕەمە خـۆی ئامادە کرد. هاتە لای ئاسـکو گوتی: ئەی برای دڵۆڤان، بەو هەموو زیرەکیو زاناییەوە، چون دەو داوە کەوتی؟ جوابی داوە: لە بەرانبەر تەقدیری ئاسـمانیدا کە نە دەتوانی بە چاو ببینیو نە بە فێڵو حیلە کاتو سـاتەکەی بزانی کەیە، زیرەکی چ سـوودێکی هەیە؟ لەم کەینوبەینەدا رەقە گەیشـتە لایان، ئاسـک پێی گوت: برای بەڕێزم هاتنـی تۆ بۆ ئێرە، بۆ من تاڵترە لەم رووداوە، کە ئەگەر راوکەر بگاتە سـەرمانو مشـک بەندو داوی دەسـتو قاچی منی کردبێتەوە، من دەردەپەڕمو راوچی تۆزم ناشکێنێو قالاو هەڵدەفڕێو مشـک دەخزێتە نـاو کونێک. وە تۆ نە لاقـی هەڵاتنت هەیەو نە دەستی بەرگریو دەستکردنەوە. ئەو زەحمەتەت بۆ وەبەرخۆت نا؟ رەقە گوتی: جـا چۆن نەهاتبایەمو بە چ لێکدانەوەیەک راوەسـتابام؟ وە لەو ژیانەی کە لە دووری دۆسـتاندا رادەبرێ چ خۆشـییەک هەیـە؟ وە کام پیاوی عاقڵ ئەوەی بـە عومر زانیـوە؟ وە یەکێک لە هاریکارییەکان بۆ شـادمانیو هێمنی نەفس، لە دیداری یـارانو برادەراندایەو هاودەمی ئەوان دەبێتە هۆی ئارامیو سـەبرو ئاسوودەییو رزگاری لە پەژارە. چون کەسێک تووشی دووری بوو، هەرێمی دڵو دەروونـی دەبێتە مەکۆی غەمـانو چاو و بینایی کەم حوکم دەبنو دیدەو دیتن بێکەڵک دەبنو بە کورتی، هەر ئێستا رزگارێت دێو ئەم گرێیە دەکرێتەوەو لە هەموو حاڵێکدا شـوکرانە لازمە، کە ئەگەر بریندار بووایەیو بەڵایەکت بەسـەر

---

1. دریاب که از دست تو هم درگذرد.

هاتبا، قەرەبووکردنەوەی لــە مەیدانی خەیاڵدا نەدەگونجا و تۆڵەکردنەوەی دە نیگارخانەی عەقڵو هۆشدا بە فکری کەسدا نەدەهات.

ڕەقە هەر وا لەو قسـانەی دەکرد کە ڕاوکەر لە دوورەوە دەرکەوت. مشـک هەڵبڕینـی بەندەکانی تەواو کردبوو، ئاسـک دەرپەڕی، قاڵاو هەڵفڕیو مشـک دەکون خزی. ڕاوکەر گەیشـتەجێ، تۆڕو داوی بە هەڵپساویو هەڵبڕاوی دیت. سـەری سووڕما. چاوی بە چەپو ڕاستدا گێڕا، لە نەکاو چاوی بە ڕەقە کەوت. گرتیو مەحکەم بەسـتیەوەو گەڕاوە دواوە. بە دوای ئەوە، دۆستان کۆ بوونەوە بزانن ڕەقە چی بەسەر هاتووە. مەعلووم بوو کە لەناو داوی بەڵادایە.

مشـک گوتی: قەت وادەبێ کە ئەم بەختە نووستووە بیدار بێو ئەم ئاژاوەیە بخەوێ؟ وە ئەو زانایە ڕاسـی گوتووە کە دەڵێ: "پیاو هەمیشـە حاڵی باشە، تـا ئەو دەمەی قاچـی دە بەردێک هەڵنەنگواوە، هەر کـە جارێک دە گێژاوی زەحمەت کەوتو بەربەسـتی مەینەتو نەکبەت بە سـەریدا شـکا، سەعات بە سـەعات سـێڵاوی ئافەت خرۆشـانترو ماڵوێرانکەرتر دەبێ. وە ئەگەر دەست بە لقەدارێک بگرێ، دیسان سـەرەوبن دەبێتەوەو تێدەکەوێتەوە. وە مەسەلەن بەردی سەر ڕێگاش لە هەر هەنگاوێکدا، لێی دەبنە تۆڕو تەڵەو داو". وە ئەوجار کام مسیبەت دەتوانێ دەگەڵ دەردی دووری لە دۆستان بەرانبەر بێ؟ کە سۆزی دووری ئەگـەر ئاور دە قووڵایـی دەریا بەربدا تۆزو خۆڵی لێ هەڵدەسـتێنێ. وە ئەگەر دووکەڵ بگەیەنێتە ئاسـمان، ڕوخسـاری سـپیو ڕووناکی ڕۆژ ڕەش هەڵدەگێڕێو ئەم بەختە خەوتووە، هەدای نەدا تا دەستەشکاوی نەکردمو پاش ئەوەی جودایی خسـتبووە ناو منو ژنو منداڵو ماڵو سـامان، دۆستێکیش کە بەو بایە دەژیام کە لە لای ئەوڕا دەهاتو لە سـایەی دۆسـتایەتی ئەودا مابووم لە دەسـتم دەرچوو، بەختی خەوتوو فڕاندیو لە دەسـتی دەرێنام. باشـترین دۆسـتو ئاڵقەی پێوەندی برادەران کە دۆسـتایەتی ئەو لەبەر تەماعو قازانجی خۆی نەبوو، بەڵکوو بناغەی ئەم دۆسـتایەتییەی لەسەر کەرەمو عەقڵو وەفا و زانین دارشـتبوو. بەجۆرێک کە هیچ ڕووداوێک زیانی پێ نەدەگەیاند. وە ئەگەر ئەوە نەبوایە کە جەسـتەی من خووی بەو زەحمەتانە گرتووەو بە ناخۆشـیو

مەرارەت راهاتووە. لە نێو ئەم هەموو رووداوەدا ژیان چۆن مومکین دەبێو بە چ توانایەک خۆڕاگری دەکرێ. وای، هاوار بۆ حاڵی ئەم کەسە داماو و گرفتارە لە چەنگاڵی بەڵادا، دیلی ژێروژووربوونی گەردوونی گەردانو پێبەستەی ئاڵوگۆڕی ئەحواڵ، بە ئافەتو بەڵا داتەپیو و خێراتی ئەو دابڕاو. وەک هەڵاتنو ئاوابوونی ئەستێرەیە یەک لە هەورازەو ئەوی دی لە نشێو. کەندولەندی، تەرازو رێک؛ بڵندو نەوییەکەی بەرانبەر. وە غەمی دووری وەک زامێکە کاتێک خەریکە سارێژ دەبێتەوە، برینێکی دیکە سەری لێ هەڵدەدا و هەر دوو ئێشو دەرد یەکاڵا دەبنو هومێدی شفا نامێنێ. وە زەحمەتو کوێرەوەری دنیا بە دیداری دۆستان کەم دەبێتەوە. کەسێک کە لەوان دوور کەوێتەوە، چۆنو لە چ رێگایەکەوە ئارامی وەدەست دەکەوێتەوەو بە کام دڵخۆشی دەبووژێتەوە؟

رەقەو ئاسک گوتیان: هەر چەندی قسەکانی ئێمە جوانو رازاوەش بن بۆ جەنابی رەقە هیچ سوودێکی نابێ، پەیمانو بەڵێنی، پێمان دەڵێ، بیر لە رێگەچارەیەک بکەینەوە کە لەو بەندو داوە بێتە دەر. کە گوتوویانە ئازا و دلێر لە رۆژی شەڕدا تاقی دەکرێتەوە. پیاوی ئەمین لە ئاڵووێردا، وە ژنو منداڵ لە رۆژانی دەستەنگیدا. وە دۆستو برادەر لە کاتی لێقەوماویدا".

مشک گوتی تۆ بە فێڵو فریو برۆ پێش راوچیو خۆت وەک بریندار نیشان بدەو جارجار خۆت بەربدەوەو قالاو لەسەرت هەڵنیشێ وەک بلێی خەیاڵی خواردنی تۆی هەیە. کاتێک راوکەر چاوی پێت کەوت، تەماع هەڵیدەگرێو بە دواتدا دێو رەقەی دەگەڵ سرپوسیپاڵ بەجێ دێڵێو روو دە تۆ دەکا. کە لێت نزیک بۆوە بە شەلەشەل، کەمێک دوور بەوە، بەڵام ئەوەندە نا کە تەمابڕاو بێو منیش دوای ئەوە خۆم دەگەیەنمە رەقەو هیوام ئەوەیە تا ئێوە لەو گەمەیە تەواو دەبن منیش بەندو داوی دەستو قاچی رەقە هەڵپسێنمو رزگاری بێ.

هەر وایان کرد. راوکەر بەدوای ئاسکدا شەکەتو ماندوو بوو، کاتێک گەڕاوە رەقەی نەدیتو تۆڕو داویشی پسپسو هەڵبڕاو چاوپێکەوت. واقی وڕما! دە فکرەوە چوو. دە پێشدا هەڵبڕانی بەندو داوی ئاسک، ئەوجار خۆنەخۆشکردنی ئاسکو نیشتنی قالاو لە سەری، دوایی بڕینی تۆڕو داوی رەقە! ترسی لێ نیشت.

وەک مێژۆکە دەستی کرد بە لەرزینو وەک زەعفەران زەرد هەڵگەڕا. بەخۆی گوت ئێرە وڵاتی پەریو جادووانەو واباشە زووتر بۆی دەربازبمو ئەو شێعرەی خوێندەوە.

اِیابُـکَ سـالماً نصـفُ الْغَنیمَـهْ
و کُلُّ الْغُنـمِ فـی النَّفْـسِ السَّـلیمَهْ[1]

ئاسکو مشـــکو رەقەو قالاو، لێک کۆبوونەوە. چوونەوە ماڵی خۆیانو لەوە بەدوا، ئەمینو ئاسوودەو تێروپڕ دەژیانو ئیتر نە دەستی بەڵا گەیشتە داوێنیانو نە چاوی پیس، روخساری گەشی ئەوانی زەرد هەڵگێڕا. بە بەرەکەتی یەکیەتیو هاودەنگی، عەیشو شـــادی ئەوان هەر رۆژ لە زیادبووندا بوو، حاڵو ئەحواڵیان سەعات بە سەعات رێکوپێکتر دەبوو.

ئەوەیە داستانی رەفاقەتی دۆستانو هاودەنگیو هاوڕایی برادەرانو پشتیوانی ئەوان لە یـەکتـر لـە شـادیو غـەمو تەنگانەو گرفتاریدا. وە ئەوپەڕی خۆڕاگری هەر کامەیان دە رۆژانی تفتوتاڵی زەمانەدا. وە لە ئاکامدا لە ســایەی یەکدڵیو خۆشەویستیو بەرەکەتی پشـــتیوانیو هاوکاری لە چەندان کارەساتی کوشندە رزگاریان هاتو لە بەڵاو ئافەتان دەربازبوون.

وە پیـــاوی ژیـــرو زانا دەبێ بـــە وردیو لە بەر نووری عەقـــڵ بڕوانێتە ئەم حەکایەتانە، بزانن دۆستایەتی گیاندارانی زەعیفـو دڵپاکی ئەوان دەگەڵ یەکتر، دەبێتە هۆی ســـەرکەوتنیان بە سەر کەندوکۆسپی گەورەدا و بەرهەمی شیرینو تەژی لە رەزامەندی وەدەســـت دێنن. ئەگەر ئەوانەی خۆیان بە عاقڵو ماقووڵ دەزانن، هاوپەیمانی راســـتگۆیانەی لەم چەشنەیان دە نێودا هەبێو بەم شێوە شـــیرینە پەیمان بەرنە ســـەر، بزانە فایدەی ئەم کارە چۆن بە سەر هەمووشاندا دەبارێو قازانجو سوودەکەی لە سەر لاپەڕەی ژیانی هەر کامیان خۆی دەردەخا.

خوای مـــەزن تەواوی کوردان بەختەوەر بکا و ســـەرکەوتنیان پێ کەرامەت بفەرموێو درگای زانینو حیکمەت بە روویاندا بکاتەوە.

بِمنّهِ وَ طَوْله وَ قوّته وَ حَوْله

---

[1]. گەڕانەوەت بە سلامەتی نیوەی غەنیمەتە، وە هەموو نیعمەتێک لە جەستەی ساغدایە.

٤

# کوندو قالاو

رای بە بەرەهمەنی گوت کە: چیرۆکی دۆستانی هاوڕێو هاودەنگو برادەرانی دڵۆڤانم بیست. ئێستا ئەگەر دەکرێ باسی دوژمنێکم بۆ بکە کە نابێ فریوی بخۆی. هەر چەند ئەوپەڕی لوتفو مەرحەمەتو ڕێزو حورمەتو خۆبەکەمزانی نیشان بدا و بە پێچەوانەی دەروونی نگریسی، خوی پاکو رازاوە بنوێنێو بە وردەکاری زۆرەوە پەردەپۆشی عەیبو ناحەزییەکانی خۆی بکا.

بەرەهمەن گوتی: پیاوی عاقڵ قسەی دوژمن بە هێند ناگرێ. وە فێڵو فریوی ئەو لە دڵدا راناگرێو هەر چەندی لە دوژمنی وریا و زانا و نەیاری فێڵزان خۆشەویستی زۆرتر ببینێ، زۆرتر بەدگومان دەبێو زۆرتر خۆی دەپارێزێو دووربییان لێ دەکا. چون ئەگەر غەفڵەتێک بکا و کەلێنی زەبریک بێڵێتەوە. بێگومان رێگە بۆ پەلامارو کەمینی دوژمن دەکرێتەوە. پاش لەدەستچوونی دەرفەتو نەمانی کات بۆ خۆئامادەکردن، پەشیمانی بەکار نایەو ئەوەی بەسەر دێ کە لە دەست قالاو بە کوند گەیشت.

رای پرسی: چۆن؟ گوتی: دەگێڕنەوە لە چیایەکی بەرزدا، دارێکی گەورە بوو، لقی بەرەو ئاسمان تێهەڵچووبوونو گەلا و بەرگی ئەستووری دەرکردبوو. نزیکەی هەزار هێلانەی قالاوی لە سەر بوو. ئەو قالاوانە پادشایەکیان بوو کە هەموو دە ژێر فەرمانیدا بوون. وە فەرمانی ئەویان دە جێبەجێکردنی کاراندا بەڕێوە دەبرد. شەوێک پادشای کوندان، بە هۆی دوژمنایەتییەک کە لە نێوان کوندو قالاودا هەیە، وە دەرکەوتو هەڵمەتێکی شەوانەی بردە سەر

قالاوانو سەرکەوتنی گەورەی وەدەست هێنا و بە سەرکەوتوویی‌و خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە شوێنی خۆی.

ڕۆژی دوایی پادشای قالاوان لەشکری کۆ کردەوەو گوتی: هەڵمەتی شەوانەی کوندو خیرەسەری ئەوانتان دیت؟ ئەمڕۆ لە نێو ئێوەدا چەند کوژراو و باڵشکاو و بریندار هەیە. لەوەش خراپتر ڕووداماڵاوی ئەوانو پێزانینی ئەوان بە شـــوێنو مەسکەنی ئێمەیە. شکم لەوەدا نییە کە دەگەڕێنەوەو دووبارە دەستبردو پەلاماری یەکەم دووپات دەکەنەوەو تالاومان بە گەروودا دەکەن، ئەم بارودۆخە بخەنە بەر سەرنجو بزانن مەسڵەحەت لە چیدایە.

دە نێو قالاوەکاندا پێنج کەس هەبوون کە لە ڕوانگەی تەدبیرو ڕا و بۆچوونو عەقڵـــەوە بەناوبانگ بوون. قالاوەکان لە کاراندا مەشـــوەرەتیان پێ دەکردنو لە ڕووداوانـــدا دەچوونە لایان. پادشـــاش ڕا و بۆچوونی ئەوانی بەلاوە گرینگ بوو و لە کاروباراندا لە قســـەیان دەرنەدەچوو. لە یەکێکیانی پرســـی تەدبیری تۆ لەم کارەســـاتەدا چییە؟ گوتـــی: ئەمە ڕێگەچارەیەکە زانایانی پێش ئێمە لەســـەری کۆکبوونو فەرموویانە کە "ئەگەر کەسێک لە بەرانبەر دوژمندا خۆی بۆ ڕانەگیرا. واباشـــە ماڵو مەســـکەنو زێدی خۆی بەجێ بێڵێو ســـەری خۆی دەرکا و بڕوا. چون شـــەڕکردن مەترســـییەکی گەورەیە، بەتایبەتی پاش تێکشکانو هەر کەس بـــێ فکرکردنەوە پێ دەو ڕێیە بنێ وەک ئەوە وایە لە ســـەر ڕێی لافاو جێوبانی پـــان کردبێتەوەو دە توندداودا خشـــتی بڕیبێ. چونکە لەســـەر هێزو توانای خۆ، حیسابکردنو بە زۆرو ئازایەتی خۆ، فریوخواردن، لە وشیاریو ئیحتیات بەدوورە. کە شمشـــێر دوو ڕووی هەیە. وە ئەم گەردوونە پشتکووڕە، بێشەرمە زلکوێرە، جوامێران ناناسێو قەدریان نازانێو نابێ باوەڕ بە خولو سووڕی بکەی.

ئەی ئەوەی پشـــتت بـــە گەردوون بەســـتووە
جێـــت لەســـەر پێڵـــی لەهـــی ڕاخســـتووە[١]

پادشـــا ڕووی دە یەکی دیکە کردو پرسی: تۆ بیروڕات چییە؟ گوتی: ئەوەی ئەم بەڕێزە ئیشـــارەی پێکرد، لەمەڕ هەڵاتنو ناوەند بەجێهێشـــتن، من هەرگیز

١. ای کە بر چرخ ایمنی زنهار / تکیە بـر آب کـردەای هشـدار.

دەگەڵیا نیم. وە چۆن دە عەقڵدا دەگونجێ، لە یەکەم تێشکاندا تۆ وڵاتی خۆت چۆل بکەیو ئەو ڕەزاڵەتە قبووڵ بکەی؟ وا باشترە کە دەوروبەرمان دابگرینو ڕوو لە خەبات بکەین. کە پادشای دەستڕۆیشتوو ئەوەیە کە ئەسپی ورەو هیممەتی، بە تەشقی ئاسماندا، بڕوا و شەهابی گەورەییو هەیبەتی، دێوی ئاژاوەگێڕ بسووتینێ. وە ئێستا مەسڵەحەت لەوەدایە کە دیدەبانانو سنووردااران زۆرتر بکەینو لە هەر شوێنێک هێزی بەرگریمان کەمە خۆمان قایم بکەین. تا ئەگەر هێرشمان بۆ بکەن ئامادەو پەرداخ بینو کارەکەکان بە دروستی بەڕێوەبەرینو ڕۆژگارێکی دوورودرێژ بەو پێکدادانەوە خەریک بین یا سەرکەوتن دەستکەوێ، یا بشکێنینو پشت بکەینەوە. چونکە پادشایان دەبێ ڕۆژی جەنگو کاتی تەنگو پاشەکشە بیر لەوە نەکەنەوە چ ڕوو دەدا و لە کاتی شەڕو تێکهەڵچووندا، بەرژەوندی ئێستا و داهاتوو بێمەترسی بزانن.

دوژمنت ڕێی نەکەوی، ڕێت دەکەوێ
ڕێی کەوە تا سمی ئەسپت دەسوێ[1]

پادشا بە وەزیری سێهەمی گوت: ڕای تۆ چییە؟ گوتی: من نازانم ئەم بەڕێزە، دەڵێ چی. بەڵام وا باشترە جاسووسان بنێرینو ڕاسپاردان زۆر بکەینو بزانین دوژمن لە چ حاڵو بارودۆخێکدایەو ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئایا دوژمن مەیلی ئاشتیو سوڵحی هەیەو حازرن بە خەراجو باج لێمان ڕازی بنو لە نەرمی نیشاندانی ئێمە پێشوازی بکەن. ئەگەر لەم ڕێگەوە، کار مەیسەر ببێو ڕەزامەندی پێک بێ، بە ئاشتی پێک دێینو باجو خەراجێکیش وە ئەستۆ دەگرین تا لە دوژمنایەتیو ڕقو تووڕەیی ئەوان ئەمین بینو بحەسێینەوە. چونکە ڕێگەیەکی دروستو تەدبیرێکی کاریگەر، بۆ پادشایان ئەمەیە کاتێک دوژمن دەسەڵاتو توانای زۆرتر بوو، وە شەوکەتو قودرەتی ئاشکرا بوو، وە ترسی ئەوە کە فەسادو گەندەڵی لە وڵاتاندا پەرەی بگرێ، وە ڕەعیەت دەو میانەدا تێدابچێو بکووژرێ، پادشا دەبێ پیلانی دوژمن پووچەڵ بکاتەوەو ماڵی دنیا بکاتە مەتاڵو قەڵغانی ملکو ڕەعیەت. چونکە لە کاتێکدا شەشدەر گیراوە، داو

---

١. از غرب سوی شرق زن، بدخواه را بر فرق زن / بر فرق او چون برق زن، مگذار از او نام و نشان.

دانو بەستەدۆڕاندن لە عەقڵو زیرەکی ئەزموون بەدوورە. ئەگەر زەمانە نەسازا، بسازێ تۆ دەگەڵی.[1]

پادشا بە وەزیری چوارەمی گوت: تۆش ئاماژەیەک بکەو ئەوەی بە نەزەرت دەگا، بیخە روو. گوتی: ماڵاوایی لە وەتەنو دەردی غەریبی بەلای منەوە باشترە لەوەی هەر چی هەمانەو نیمانە هەڕاجی بکەینو سـەر بۆ دوژمنێک دانەوێنین کە هەمیشـە لە ئێمە کەمتر بووە. ئەگەر زۆریش خزمەتیان بکەینو زەحمەت بـە خۆمان بدەین، رازی نابنو بۆ قەتڵوبڕکردنمان تێدەکۆشـن. لە قەدیمەوە گوتوویانە: "تا ئەو جێیە لە دوژمن نزیک بەوە کە مەبەسـتت وەدی بێ، نابێ زیدەڕۆیـی تێدا بکەی. کەسـایەتی تۆ بەوە دێتە خـوارو دوژمن رووهەڵمالاو دەبێ. وە نموونەی ئەوە وەک دارێکە لە بەرانبەر رۆژدا راوەسـتابێ کە ئەگەر کەمێک خواربێتەوە سێبەری درێژتر دەبێو ئەگەر زۆری خوارکەیەوە سایە کەم دەبێتەوە". وە ئەوان هەرگیز بە باجو خەراجی کەم لێمان رازی نابن، تەدبیری ئێمـە خۆڕاگریو جەنگە. هەر چەند زانایان لە شـەڕ دوورییان کردووە، بەڵام دووریکردن بە شێوەیەک کە مردن لە بەرانبەریدا باشتر بێ، پەسندیدە نییە.

پادشا بە پێنجەمی گوت: بڵێ بزانم تۆ دەڵێی چی؟ شەڕ، ئاشتی، کۆچکردن، کامیان باشـترە؟ گوتی: مـادام رێگەی دەربازبوون لـەو گرفتارییە بتوانین بدۆزینەوە، شـەڕ پێویست نییە. چون ئەوان لە شەڕدا لە ئێمە ئازاترنو هێزو توانایـان زۆرترە. وە پیاوی عاقڵ دوژمن بـە کەم ناگرێ، کە بکەوێتە هەوا و غروور، هەر کەس بادیهەوا بێ، تێدا دەچێ، من پێش ئەوەی ئەم کارەساتە روو بدا، لێیان دەترسـامو لەوەی دیتم دەترسام، هەر چەند ئەودەم لە دەستدرێژی بۆ سـەر ئێمە خۆیان دەپاراست. چونکە، خاوەن ئیحتیات لە هیچ حاڵەتێکدا لە دوژمن ئەمین نابێ، لە کاتی نزیکبووندا لە هێرشی لەنەکاو دەترسێو ئەگەر مەوداش بکەوێتە نێوان لە گەڕانەوە، وە ئەگەر هەڵاتن هەبێ لە کەمینو ئەگەر تەنیا بمێنێتەوە لە مەکرو فێڵبازی، وە عاقڵترین کەس ئەوەیە خۆی لە شـەڕ بپارێزێو بە پێویسـتی نەزانێو لێی بێنیاز بێ، چون دە شەڕدا دەبێ لە گیان

١. اگر زمانه نسازد تو با زمانه بساز.

مایــه دابنێی. له کاری دیکه‌دا له ماڵو کالا. وه نابێ پادشــا بڕیار بدا ده‌گه‌ڵ کوند شه‌ڕ بکا. که هه‌ر که‌س به‌گژ فیلدا بچێ تێدا ده‌چێ.

پادشا گوتی: ئه‌گه‌ر شه‌ڕت پێ چاک نییه، ئه‌ی چ تێبینییه‌که‌ت هه‌یه؟ گوتی: له‌م کاره‌دا ده‌بێ تێفکرێنو ســه‌برت هه‌بێو هه‌مــوو لایه‌نێک به وردی چاو لێ بکه‌ی. چونکه پادشایان، به ته‌دبیرو بیروڕای دڵسۆزان به ئامانجگه‌لێک ده‌گه‌ن که به له‌شکرو سپای قورسو گران وه ده‌ستیان ناکه‌وێ. وه بیروڕای پادشایان، به مه‌شــوه‌ره‌تی وه‌زیرانی عاقڵو دڵســۆز زۆرتر رووناک ده‌بێته‌وه. وه‌ک چۆن ده‌ریا به ئاوی جۆگه‌و رووباران زۆرترو قووڵتر ده‌بێ. وه بارســتای هێزو توانای خــودیو ئه‌ندازه‌ی فێڵو پیلانو بیروڕای دوژمن، له پیاوی زانا شــاراوه نییه‌و هه‌میشه هه‌ر دوو لایه‌ن ده‌خاته به‌ر داوه‌ری عه‌قڵو بۆ ئه‌نجامی کارانو دره‌نگو زووی چالاکییه‌کان، ده‌چێته لای دۆستانو یارمه‌تیده‌رانی ئه‌مینو راستگۆ. چون هه‌ر که‌س به پاڵپشــتی دڵسۆزانی قسه‌دروستی زۆرزانو فه‌رزانه هه‌ڵنه‌سووڕێ، زۆری پێ ناچێ ئه‌وه‌ی له سایه‌ی به‌ختو ئیقباڵه‌وه وه‌ده‌ستی هێناوه له ده‌ستی ده‌چێ. چونکه هه‌ر چه‌شــنه خێرو خۆشییه‌ک به ره‌سه‌نایه‌تی ره‌گه‌زو جه‌ماڵو جوانی نایه‌ته ده‌ســت. به‌ڵام به عه‌قڵو شــعوورو گوێدان به رێنوێنی که‌سانی به‌ئه‌زموونو دڵسۆز وه ده‌ست ده‌که‌ون.

وه هــه‌ر که‌س به تیرێژی نــووری عه‌قڵی سروشــتی ده‌وڵه‌مه‌ند بێو گوێ راگرتن بۆ ئه‌وانه‌ی په‌ندو نه‌سیحه‌ت ده‌ده‌ن بکاته دروشمی ژیانی خۆی، به‌ختو یه‌غباڵی وه‌ک نیســێی چالاو پایه‌داره. نه‌وه‌ک مانگه‌شــه‌و که له که‌می ده‌دا و نامێنێ. وه ده‌ستی ئه‌ستێره‌ی گه‌لاوێژ (مریخ) چه‌کی سه‌رکه‌وتنی بۆ تیژ ده‌کا و قه‌ڵه‌می ئه‌ستێره‌ی عوتارید، مه‌نشووری ده‌وڵه‌تی واژۆ ده‌کا. وه پادشا ئه‌مڕۆ به جوانیو جه‌ماڵی وڵاتڕازێنه‌وه‌ی خۆی له مه‌یداندایه.

ناگاته تــۆرێ عه‌قڵی تۆ ئه‌ســپی خه‌یاڵی من
ناچێته به‌ر ســه‌رنجی تۆ فکــری مه‌حاڵی من[1]

وه چون پادشــا شانازی هاوفکریو مه‌شوه‌ره‌تی پێدام، ده‌مه‌وێ هێندێک له

---
۱. نرسد عقـل اگـر دو اسبـه کنـد / در تـک وهـم بـی غبـــار ملـک.

جوابەکانـــم دەنێو کۆبوونەوەدا بدەمەوەو هێندێکیش تەنیا لە خزمەت خۆتاندا. وە من هەر وەک لایەنگری شـــەڕ نیم، دانوانـــدنو زیللەتو بەرعۆدەبوونی باجو خـــەراجو قبووڵی عەیبو عاریش قبـــووڵ ناکەم، چون زەمانە تێپەڕ دەبێ بەڵام عەیبو عار بە تازەیی هەر دەمێنێ.

گەر سەریشـــی بگاتە ئەســـتێران
نابمە ژێردەســـتی دوژمنم حاشـــا
شـــێر چلـــۆن دانوێنێ بـــۆ ڕێوی
بـــازو فەرمانـــی چۆلەکە حاشـــا[1]

پیاوی کەریمو گەورە، تەمەندرێژی بۆ زیکری خێرو جوانی ئاســـەوار دەوێ، وە ئەگەر ناکام بێو عەیبو عارێکی بێتەوە سەر، کورتی تەمەنی پێ لەو ژیانە باشـــترەو گۆڕیچەی تەنگ وەک پەناگایەکـــی پانو بەرین دێنێتە ئەژمار. وە بە مەســـڵەحەتی نازانم پادشا کزیو بێدەســـەڵاتی لە خۆی نیشان بدا، کە ئەوە سەرەتای هیلاکەتو تێداچوونی مۆلکو ماڵو ماڵاتو کەسایەتییە. وە هەر کەس خۆی رادەست بکا، درگای خێرو بەرەکەتی بە روودا دەبەسترێو لە سەر ڕێگەی کارو پیلانی ئەو کەندوکۆسپی گەورە قوت دەبنەوە.

وە باقی ئەم بابەتانە، پێویســـتی بە خەڵوەتێک هەیە تا بە نەزەری پادشـــا بگەینرێ. چونکە سەرمایەی ســـەرکەوتنو زەفەرو بەشی زۆرو متمانەپێکراویو بەختـــەوەری، دوورئەندێشـــیو قایمەکارییـــە. وَ اوّلُ الْحَـــزمِ الْمَشـــوَرَةَ.[2] وە بەو هاوفکرییانەی پادشـــا فەرمووییو خزمەتکارانی خۆی بە مەحرەم زانی، نیشانیدا کـــە خاوەن تێبینی دوا ڕۆژو خۆڕاگریو لێهاتوویی تەواوە، وە تێگەیشـــتوویی و عەقڵو گەورەیی هەر چی زۆرتر نیشان دا.

با ئەوەش شاراوە نەبێ کە هاوفکریو مەشوەرەت، دەرخستنی را و بۆچوونە. وە بڕیار دانی دروست بە دووپاتبوونەوەی بۆچوونو شاردنەوەی رازو نهێنی دێتە دەست. وە ئاشکراکردنی نهێنییەکان لە دەوروبەری پادشایان ڕەنگە رووبدا. یا

---

١. نشوم خاضع عدو هرگز / ورچە بر آسمان کند مسکن
باز گنجشک را برد فرمان؟ / شیر روباە را نهد گردن؟
٢. راوێژکاری یەکەمین پلەی دوورئەندیشیو قایمەکارییە.

له لایەن پەیامهەڵگرانو قاسـیدان، یا کەسانێک کە قەستی خەیانەتیان هەیەو بـە دژی گوێ هەڵدەخـەنو ئەوەی بە گوێیان دەگا، دەکەوێتە سـەرزاران. یا تایفەیەک کە دە بڵاوبوونەوەی بۆچوونو هەڵکەوتی شوێنەواردا فکرکردنەوە بە پێویست دەزاننو دەگەڵ وێچووەکانی ئەو لە رواڵەتو زاهیری ئەحواڵ بەراوردی دەکـەنو هەر رازێک لەم بابەتانە بپارێـزێ رۆژگار ناتوانێ لێی ئاگادار بێتەوەو چەرخی گەردوون ناتوانێ دەسـتی تێوەردا، وە داپۆشینی رازەکان دوو فایدەی ئاشکرای هەیە. ئەگەر فکرو ئەندێشە وەگەڕ بکەوێ سەرکەوتن دەست دەکەوێ. وە ئەگەر تەقدیر یارمەتی نەکا، بە سڵامەتی لە عەیبو نوقسان رزگاری دەبێ.

وە پاشـا پێویسـتی بە راوێـژکاری باوەڕپێکراو و هەر وەهـا خەزنەداری ئەمیـن هەیە، کە خەزێنەی نهێنییـەکان لای ئەو بکەنەوەو گەنجینەی رازەکان بە ئەمانەتو رێنوێنییەکانی ئەو بسـپێرن. وە دە پەسـندکردنی کاری گرینگدا یارمەتی لێ وەربگرن. کە پادشا هەر چەند لەباری پێکانی فکرو رای دروستەوە لە وەزێری خۆی لە سەرتر بێو لە هەموو روانگەیەکەوە سەرەتی بەسەردا هەبێ، دیسـانیش لە رێنوێنیو رادەربڕینی ئەو سوودی پێدەگا. هەر وەک نووری چرا بە نەفتو گڕی ئاگر بە دەسـتەچیلەو دارەوە زیاد دەبن. وە هەر کەس بیروڕای پتەو و پشتیوانی پیاوانی بەکیفایەتو لێهاتووی دەگەڵ بێ، بەم قاتە سەرکەوتن دەست دەخا و بەو دەستە خەتەرو مەترسی تێکەوە دەپێچێ.

وە پێویسـتە لە سـەر خزمەتکاران، کاتێک خاوەنشـکۆ فکر لە بابەتێک دەکاتـەوەو رایەک دەردەبـڕێو لەو روانگەوە خێرو مەسـڵەحتێک وەدی دێ، هاوفکـرێو یارمەتی بـدەنو ئەگەر لە بڕیاری ئـەودا کەموکورتی دەبینن بۆی دیاری بکەنو بە مودارا و هاوهەنگاوی بیروڕای خۆیان دەرببڕن. ئەوجار هەموو بیروڕاکان تاوتوێ بکەنو پێکگرتنو بەراوردکردن بێتە ئارا و هەر دوو لا لەسەر بڕیارێـک بە یەک بگەن، وە هەر وەزیرو موشـیرێک، خزمـەت پێکراوی خۆی بەم چەشـنە یارمەتی نەدا و دە کاراندا حەقی بڕواپێکراوی ئەنجام نەدا، دەبێ بە بێگانە بناسـرێ. وە دەگەڵ وەها کەسـێک راوێژکاریکردن وەک مەسەلەی کابرایە کە ئەفسـوونێ بخوێنێ تا دێو یەکێک بگرێ، چون ناتوانێ بە دروستی

بیخوێنێ‌و شــــەرتو شێوەی بابەتەکان باش ئەنجام بدا، سەرکەوتوو نەبێ‌و دێو دەگیانی بەربێ. وە پادشـــا لە بیســـتنی ئەم ترپەهاتە بێنیازە، کە بە کەماڵی زانایی‌و قایمەکاری‌و دروســـتی ئیرادەو دەستڕۆیشتوویی خۆی چاوی پادشایانی کوێر کردووە. هەر وەها هەیبەتو سیاســـەتی خۆی لە دەوروبەری وڵات کردۆتە دیدەبان‌و پاسەوانی زیتو وریا و دووربین. تا ئەو جێگەی کە لە ترس‌و هەیبەتی ئەو، ڕووداوەکان پەنایان بردۆتە ژێر سایەی ئاسایش‌و ئەمن‌و ئاژاوە دە چاوەدێری خەودا ئارامی گرتووە.

تـــا تـــۆ ئـــاگادارو بێـــداری وڵاتو مەوتەنـــی
کێشەیەک ســـەرناگرێتو فیتنە رانابێ لە خەو[1]

وە ئەگەر پادشا نهێنییەکانی خۆی بەم شێوازە شاردەوەو وەزیری لێهاتووی هەڵبژاردو لە دڵی عەوامدا بە هەیبەت بوو، حیشـــمەتو شکۆشـــی نەهێڵێ دە نهێنی‌و دەروونی بگەن، وە پاداشـــی کرداریاشان‌و بەرهەمی خزمەتی دڵسۆزان لە یاســـای جیهانداریدا بە واجیب بزانی‌و جەزرەبەو زەجری زاڵمان‌و ســـزادانی خەتابـــاران بە فـــەرز دابنێ، وە لە ڕووداواندا حوســـنی تەقدیـــر بەجێ بێنێ، شـــایانی ئەوەیە کە موڵکو وڵاتی ئەو پایەدار بێ‌و دەســـتی ڕەشی کارەسات، نیعمەتەکانی زەمانەی ناتوانێ لە دەســـت دەربێنێ‌و چەرخی زەمانە بە قازانجی ئـــەو خول دەخـــوا، چون قەرارو مـــەدار وا داندراوە کە هەمـــوو مەخلووق دە کەسبی خۆشبەختی‌و تەڵەبی ماڵی دنیادا جموجووڵێک بکەن‌و هەر کەسیش بە پێی وەزع‌و حاڵی خۆی ســـەودایەکی دە ســـەردایە، بەڵام گەیشتن بە ئامانج بە هیممەتو پتەوی بڕیار، دەست دەدا.

وە نهێنییەکان پادشـــایان جێگەو هەڵوەســـتەی جیاوازیـــان هەیە. هێندێک لەوانەن کە ناکرێ دوو کەسیان تێدا بەشدار بکەی، لە هێندێکیاندا ڕەنگە بتوانی جەماعەتێک ئاگادار بکەیتەوە. ئەم ڕازەش لەوان ڕازانە کە تەنیا دوو سەرو چوار گوێ دەتوانن تێیدا مەحرەم بن.

پادشا ڕووی دە لایەک کردو وەزیری بە ئیشارە بانگ کرد. ئەوەڵ، لێی پرسی:

---

[1] از خواب گران فتنه سبک بر نکند سر / تا دیدۀ خرم تو بود روشن و بیدار.

هۆی دوژمنایەتیو نەفرەت لە نێوان ئێمەو کونددا چییە؟ گوتی: قسەیەک کە بەسەر زبانی قالاوێکدا تێپەڕی. گوتی: چۆن؟

گوتی: جەماعەتێک لە مەلان کۆ بوونەوەو رێک کەوتن کە کوند بکەنە ئەمیری خۆیان. لەم بابەتەدا خەریکی فکرکردنەوەو ئالوگۆڕی بیرورا بوون، قالاوێک لە دوور پەیدا بوو. یەکێک لە مەلەکان گوتی: با راوەستین قالاویش بگاتیو لەم کارەدا مەشوەرەتی پێ بکەینو ئەویش هەر لە ئێمەیەو تا گەورەو پیاوماقوولانی هەر چینو تایفەیەک نەبنە یەکدەنگ، کۆدەنگی پێک نایە. کاتێک قالاو گەیشتە لایان، باڵندەکان باسی مەسەلەکەیان بۆ کردو بیروڕای ئەویشیان ویست. قالاو جوابی دانەوە: ئەگەر هەموو باڵندە ناودارەکان هیلاک بوونایەو تاوسو بازو هەڵۆ و باقی ناودارەکان ون بوونایە، پێویست بوو باڵندەکان، بێ سەروەرو پادشا رۆژگاریان تێپەڕ کردبا و سەد بریا پێرەوی لە کوندو سیاسەتی چەپەڵی ئەویان بە کەرەمو پیاوەتی خۆیان بە مێشکیان رێ نەدابایە. روخساری قێزەونە، رەوشت ناحەز، عەقڵ سووک، وە کەریەتی لە رادەبەدەرە. تووڕەیە، بێڕەحمە، لە سەر ئەوانەشڕا لە جەماڵی رۆژی دنیا روونکەرەوە رووگەردانو لە هەموو ئەوانەش خراپتر، کەم چیکڵدانەییو توندوتیژی بەسەر ئەحواڵی ئەودا زاڵەو جنێوفرۆشیو ناسازگاری دە کارەکانیدا ئاشکرایە. لەو چەواشەکارییە بگەڕێنو کارەکان بە عەقڵو تێگەیشتوویی خۆتان جێبەجێ بکەنو بەپێی مەسڵەحەت ئامادەکاری بۆ هەموو شتێک بکەن. هەر وەک کەروێشک کە خۆی بە پەیامهەڵگری مانگ ناساندو بە بیروبۆچوونی خۆی کارێکی گەورەی راپەراند. مەلەکان پرسیان: چۆن؟

گوتی: لە وڵاتێک لە سەرزەمینی فیلاندا، وشکەساڵیو بێبارانی روویدا، بە جۆرێک کە سەرچاوەکان هەموو هەڵچۆڕانو فیلەکان لە لای پادشا لە دەردی بێئاوی هاواریان لێ هەستا. پادشا ئەمری کرد بۆ دۆزینەوەی ئاو بە هەموو لایەکدا برۆن. سەرەنجام کانییەکیان دیتەوە کە ناوی "قەمەر" بوو. زۆر پڕئاو و کانییەکی بەقەوەت بوو. پادشا و هەموو جەماوەری فیلان روویان دەو سەرچاوەیە کرد. ئەوێ وڵاتی کەروێشکان بوو. دیارە کەروێشک دە باڵ ئەو

هەموو فیلەدا حاڵیان حاڵی سەگ بوو. ئەگەر کەوتبانە ژێر پێی فیلان پانو فلچ دەبوونەوە، هەر واشبوو، زۆریان وەبەر پێیان کەوتنو لاقو دەستو شانو ملیان تێک شکا. ڕۆژی دوایی، هەموویان ڕۆیشتنە لای پادشای خۆیانو گوتیان: پادشا ئاگای لە حاڵمان بە دەست فیلانەوە هەیە. زووتر دەبێ فکرێکمان بۆ بکەن، کە سەعات بە سەعات دێنەوەو ئەوەی ماویشن، دەژێر پێیان دەنێن.

پادشا گوتی: هەر کەس لە ئێوە تێبینیو ئەزموونو شارەزاییەکی هەیە با ئامادە بێ ڕاوێژکاری بکەین، کە وازۆکردنی بڕیار بەر لە ڕاوێژکاری، لە ڕەوشتی گەورە پیاوانی زانا، بەدوورە. یەکێک لە کارزانانی زیرەکو وریا، بە ناوی "پیرۆز" ڕۆیشتە بەرەوە. پادشا ئەوی بە گەورەیی عەقڵو تێگەیشتووییو خاوەنی بیروڕای پتەو، دەناسی. پیرۆز گوتی: ئەگەر پادشا بە مەسڵەحەتی بزانێ وەک قاسیدو پەیامبەر من بنێرێو کەسێکی ئەمینیشم ڕەگەڵ بخا تا هەر چی دەڵێمو دەیکەم بە ئاگاداری ئەو بێ. پادشا فەرمووی: دە ڕاستگۆییو دروستیو ئیمانی تۆدا گومان نییەو ئێمە قسەی تۆ تەسدیقو ڕەفتاری تۆ وازۆ دەکەین. بە مبارەکی بڕۆ، ئەوەی بە مەسڵەحەتە بیکە. ئەوەش بزانە کە ڕاسپاردە زبانی پادشا و نوێنەری دڵو دەروونی ئەوە. وە ئەگەر ڕاسپاردە عاقڵ بێو کرداری دروست ئەنجام بدا، ئەوە دەبێتە دەلیل کە پادشا مرۆڤناسەو دەزانێ کێ بنێرێتە مەیدان. وە ئەگەر هەڵەو خەتایەک ببینن، لۆمەو لەقەمی لۆمەکاران دەست پێدەکا و دوژمنان دەرفەتی چەنە درێژی یان بۆ دەرەخسێ. وە زانایان لەمەڕ ئەم بابەتە زۆریان نەسیحەتو ڕێنوێنی کردووین. بڕۆ بە ئارامیو خۆشڕەفتارییو هاریکاری دەست بەکار بە. کە ڕاسپاردە بە نەرمیو بە خۆشی، کاری دژوار بە ئاسانی ئەنجام دەدا. وە ئەگەر ملهوڕی دە کار بێنێ لە ئەنجامی کاردا دەمێنێتەوەو کاری ئەنجامدراو دەکاتەوە گرێ پووچکە. وە ڕێوڕەسمی ڕاسپێری ئەوەیە: کە قسە بە توندی شمشێر بوەشێنرێ، گەورەیی پلەوپایەو مولکو هەوای پادشایی وەلا بنرێ. بەڵام دڕاندنو دروونەوە لە ئارادا بێ. هەر قسەیەک کە لەسەرەتادا بە توندوتیژی دەستی پێ دەکا بە نەرمیو ئاشتی کۆتایی پێ بێنێ. وە ئەگەر کۆتایی بابەتێک بە توندوتیژی گەیشتبێ،

بابەتێکی تــازە کە دڵدانەوەی تێدابێ بێتە گۆڕێ، تا تەرازیو هاوســەنگی لە نێوان، ملهوڕیو میهرەبانیو سەرکێشــیو دۆســتایەتیدا بەرقەرار بێ. وە هەم ئابــڕوو، گەورەییو شــکۆی جیهانداریو پاشــایەتی دە بەرچــاو بگیرێ. هەم مەبەستی پیلانگێڕیو فێڵو تەڵەکەی دوژمنو مەبەستەکانی روون بێتەوە.

پاش ئەوە، پیرۆز لەو کاتەدا کە مانگ، نووری روخســاری خۆی بە ســەر چوارگۆشەی دنیادا بڵاو کردبۆوەو رووکاری زەوی بە جەماڵی خۆی رازاندبۆوە، کەوتە رێ. کە گەیشــتە شوێنی فیلان، فکری کردەوە کە نزیکی لە فیل باسی ســەروماڵە، هەر چەند لە لای ئەوانەوە قەســتی خراپیش لە ئارادا نەبێ، چون هەر کەس مار بە دەســت بگرێ، ئەگەرچی پێوەی نەدا، بە کەمترین ئاوی زارو تفــی مارەکە کابرا دەمرێ، وە خزمەت پادشــایانیش هــەر ئەو عەیبەی هەیە. کە ئەگەر کەســێک زۆر ئــاگاداری خۆی بکا و بڕواپێکــراویو ئەمانەتی خۆی بسەلمێنێ، دوژمنان لێی وەخۆ دەکەونو بە خراپە باسی دەکەنو بە غەیانی لە قەڵەم دەدەنو هەرگیز گیان بە سلامەت دەرنابا، وە ئێستا بۆ من وا باشە بچمە بەرزاییەکو لەوێوە راســپاردەی خۆم بڵێم. هەر وایکردو لەو بەرزاییەوە بانگی پادشای فیلانی کردو گوتی: من راسپاردەی مانگمو راسپاردەش گوناهی لەسەر نییە. وە قســەی ئەو ئەگەرچی تاڵو بێپەرواش بــێ، دەبێ بە رەزامەندییەوە گوێی لێ بگیرێ. فیل پرســی: چیان راسپاردووی؟ بیڵێ، گوتی: مانگ دەڵێ: هــەر کەس زۆرو قەوەی لە دیتران زۆرتر بــوو، بەوەی بادیهەوا دەبێ، دەیەوێ ئەوانــی دیکە، هەر چەند بەهێزتریش بن، بیانکاتە ژێرچەپۆکەی خۆی، ئەوەش دیــارە دەبێتە هۆی هیلاکەتو تێشــکانی خۆی، وە تۆ، بــەوەی کە خۆت لە گیاندارانی دیکە لە ســەرتر دەبینی، تووشــی غرووری ئیفادەیەکی زۆر بووی. کارت گەیوەتە ئەو جێگایە کە پەلاماری ســەرچاوەیەکت داوە کە ناوی منی لە ســەرە. لەشکرت بۆ ئەوێ بردووەو ئاوەکەت لێڵو قوڕاو کردووە. بەو قاسیدەی ناردوومە ویستم ئاگادارت بکەمەوە، ئەگەر لە سەر جێی خۆت دانیشیو لەو کارە پاشــگەز بیتەوە فَبِها و نِعمتَ، ئەگینا دێــم هەر دوو چاوت دەردێنمو بە زەلیلی دەتکوژم. وە ئەگەر پێت وایە ئەم پەیامە گومانی تێدایە. هەر ئێســتا وەرە کە

من لە نێو ســەرچاوەدا ئامادەم". پادشای فیلان بەو قسانە واقی وڕما و بەرەو کانی ڕۆیشــتو نووری مانگی تێدا چاو پێکەوت. کەروێشک پێی گوت: هێندێک ئاو بە خرتوومت هەڵگرە، روخســارت بشــۆرەو کرنۆش بەرە. کاتێک خرتووم گەیشــتە نێو ئاوەکەو شەپۆلی تێکەوتو فیل پێی وابوو کە مانگ تووڕە بووە، ترسا و بە پیرۆزی گوت: مەگەر پادشا بەوەی کە من خرتوومم گەیاندە ئاوەکە، وا دەرهەڵبــووە؟ گوتی: بەڵێ، هەر وایە، زوو کرنــۆش بکە! فەرمانبەری کردو بەرعۆدە بوو کە چیدی نەیەتە ئێرەو پێش بە فیلان بگرێ.

ئەم حەکایەتەم بۆ باسکردن تا بزانن لە نێو هەر چینێک لە ئێوەدا زیرەکێک وەدەست دەکەوێ کە دەتوانێ بەگژ کارێکی دژواردا بچێو لە ڕەتاندنی دوژمنێکدا سەرکەوتوو بێ. وە باشــتر لە سەرووی هەمووان ئەوەیە، عەیبو عاری وڵاتی کوندان وەخۆ بگرێ. کوندیش دەگەڵ ئەو هەموو ســیفەتە ناپەسندانەی باسم کردن مەکرو فێڵو کەڵەکیشــی هەیە. وە هیچ عەیبێک بۆ پادشــا وەک غەدرو بێبەڵێنی نییە. کە ئەوان سێبەری پەروەردگارن لەسەر زەویو دنیا بێ عەدڵو دادی ئــەوان ڕووناکی بەخۆیەوە نابینێو حوکمو فەرمانی ئەوان دە گۆشــتو خوێــنو گیانو ماڵــی ڕەعیەتدا کارتێکردنی هەیە. وە هەر کەس تووشــی بە تووشــی پادشــای زاڵمو حاکمی فێڵبازەوە بێ، ئەو بەڵایەی بەسەر دێ کە لە ســەلاحو کەم ئازاری گوڕپەی بەپۆژوو بەســەر کەوهەنجیرو کەروێشــک هات. باڵندەکان پرســیان: ئەو نەقڵە چۆنە؟ قاڵاو گوتی: کەوهەنجیرێک جیرانم بوو، لە نێواندا بە حوکمی جیرانەتی دۆســتایەتیمان گەرم بوو. ماوەیەکی زۆر بوو نەمدەدیت. ون بوو، پێم وابوو مردووە. پاش ماوەیەکی زۆر کەروێشکێک هاتو ڕۆیشــتە ناو هێلانەکەیەوە، من دژایەتیم نەکرد. ماوەیەک بە ســەردا ڕۆیشت، کەوهەنجیر هاتەوە. کە چاوی بە کەروێشک دە هێلانەی خۆیدا کەوت، نارەحەت بوو و گوتی: جێگام بۆ چۆڵ بکە، ئێرە موڵکی منە. کەروێشــک جوابی داوە. کە من لێرەدا نیشتەجێمو موڵکی منە، ئەگەر مافت بە سەریەوە هەیە، سابیتی بکــە. گوتی: جێگــەی خۆمەو دەلیلم گەلێک هەن. گوتــی: داوەرێکی دادگەر پێویســتە گوێ لە قســەی هەر دوو لامان بێو بە پێی ئینساف کۆتایی بەم

داوایـــه بێنێ. کەوەنجیر گوتی: لەم نزیکانە لە ســـەر لێواری ئاو گورپەیەکی خودانـــاس دەژی، بە ڕۆژ، بەڕۆژووەو بە شـــەو نێوچاوانی بە نوێژانەوە چووە. هەرگیز خوێنی نەرشتووەو هیچ گیاندارێکی لە خۆی نەرەنجاندووەو بە قومێک ئـــاو و چڵێک گیا ئیفتار دەکاتەوە. قازی لەوە باشـــترمان دەســـت ناکەوێ، دەچینـــە لای بـــا کاری ئێمە ببڕێتەوە. هەر دووکیان بـــەو بڕیارە ڕازی بوونو منیش بۆ چاولێکردن بە دوایاندا ڕۆیشـــتم تا کتکی بەڕۆژوو ببینمو ئینســـافـو دادپەروەری ئەو تاقی کەمەوە. هەر کە گەیشـــتنو زبان بەڕۆژووی صائِم الدَّهْر چاوی پێیان کەوت، هەستا سەر پێو رووی دە میحراب کردو نوێژی دابەست. کەروێشک سەری سووڕمابوو، ڕاوەستان تا لە نوێژ بۆوە. بە ئەدەبەوە سڵاویان کـــردو تکایان لێکرد کە لە نێوانیاندا داوەری بکا و دوژمنایەتی لەســـەر خانوو کۆتایی پێ بێنێ. فەرمووی: بڵێن بزانم مەســـەلە چییە؟ گوێێ پێدانو گوتی: پیری کاری تێکردووم، هۆشو حەواسم بە گشتی لە کورتی داوە، ئەوەش کاری چەرخی ســـتەمکارە. جحێلان پیـــر دەکا و پیران لە کار دەخا، وەرنە نزیکترو بڵندتر قســـەم دەگەڵ بکەن. چوونە پێشترو قســـەی داواکەیان تازە کردەوە. گوتی: زانیم، بەڵام پێش ئەوەی حوکم بدەم پێم خۆشـــە نسحەتێکتان بکەم. ئەگـــەر گوێی پـــێ بدەن لە دنیا و قیامەت دەبێتە هـــۆی بەرچاوڕوونیتان، وە ئەگەر بە شـــکلێکی دیکە دەربێ خەتای من نییەو لە لای ویجدانو دینی خۆم ســـەرنەوی نابم. فَقَدْ اَعْذَرَ مَنْ اَنْذَرَ.[1] باش ئەوەیە کە هەر دووکتان لایەنگری لە حـــەق بکەن. کە ئەوەی لایەنگـــری هەقە، با حوکمیش بە زەرەری درابێ، هەر سەرکەوتووەو لایەنگری ناهەقو باتڵ دۆڕاوە، هەر چەند حوکم بە قازانجی ئەو دەرچووبێ اِنَّ الباطِلَ کانَ ذَهُوقا.[2] وە بۆ ئەهلی دنیا لە مەتاعو مڵکو ماڵی دنیا هیچ شـــتێک نابێتە موڵک، مەگەر کرداری باش کە بۆ قیامەتی کۆ دەکەنەوە. زانای تێگەیشتوو دەبێ وە دوای ماڵی دنیا نەکەوێو توانایی خۆی بۆ خێراتی باقـــی دە کار بێنێو عومرو جەلالو گەورەیی دنیا وەک هەوری هاوینو شـــنەو

---

۱. کەسێک کە هۆشداری دەدات ئەرکی لە سەر شان نامێنێت.
۲. باتڵ بڵقی سەر ئاوە.

فێنکایی گوڵزاری زەنوێر، بێنێتە ئەژمێر.

لــەم کەلاوە کە تاکوو ســەر ناژی
ساڵی‌عومرت، چ دە، چ سەد، چ هەزار[1]

وە قــەدری ماڵی دنیــا لە ورکە بەرد تێنەپەڕێنێ. کــە ئەگەر خەرجی بکا تەواو دەبێو ئەگەر زەخیرەی بکا، لە نێوان سواڵەتو بەردو دارو ماڵدا جیاوازی نامێنێ. وە هاونشینی دەگەڵ ژنان وەک دۆستایەتی ماری سوجەی سوور بزانێ کە ناتوانێ لێی ئەمین بێو کیسەیەک بە هیوای وەفای ئەو هەڵدروێ. وە خاسو عامو دووڕو نزیکی خەڵک وەک نەفســی خۆی بە عەزیز بزانێو هەر شتێکی بۆ خۆی پەسند ناکا بە وانیشی رەوا نەبینێ. لەم چەشنە ئەفسوونو دەمدەمانەی بۆ هەڵڕشــتن تا ترســیان لێی شــکا و بە جارێک لێی نزیکبوونەوەو خۆشیان لێــی هات. بە پەلامارێک هــەر دووکیانی گرتو کوشــت. بەرهەمی عیبادەتی دەغەڵبازانــەی زبانبەڕۆژوو، چون دەروونێکی چەپەڵو نگریســی هەبوو، بەم شــێوەیە خۆی دەرخســت. وەکاری کوندو دووڕووییو غــەدری ئەو، هەر ئەم سروشــتەی هەیەو عەیبو عاری بێبڕانەوەیــە. ئەوەندی باس کرا، جورعەیەکە لە بەحرو بلێســەیەکە لە ئاگری دۆزەخ. مەبادا بیرو بڕیاری ئێوە لەســەر ئەوە دابــەزێ. چون هەر کات تاجی پادشــایی بە دیدارو روخســاری کرێتو دزێوی کوند، گڵاوبێ؛ مانگو رۆژی ئاسمانیش بەردەبارانی دەکەن.[2]

باڵندەکان، وێکڕا لەو کارە پاشگەز بوونەوەو بڕیاری فەرمانبردن لە کوندیان هەڵوەشــاندەوە. کوند خەمگینو واق وڕما و، بە قاڵاوی گوت: منت ئازار دا و رقو قینت خســتە دڵمو لە نێوان منو تۆدا وەحشــەتو ترسێک سەریهەڵدا کە رۆژگار ناتوانــێ کەونی بکا و لــە بیرمانی بەرێتەدەر، وە نازانم لە لایەن منەوە ئــەم بابەتە پێشــینەیەکی هەبــووە، یا لە خۆوە، بۆ یەکــەم جار ئەم لوتفو دۆستایەتییەت پێ رەوا دیتم! ئەوەش بزانە ئەگەر دارێک ببڕن لە بنەوەڕا شین دەبێتــەوەو لقێکی دەر دەکا کە گــەورە دەبێ تا وەک جاری جارانی لێدێتەوە.

---

١. کلبه‌ای کاندرو نخواهی ماند / سال عمرت چه ده، چه صد، چه هزار.
٢. مهر و ماه از آسمان سنگ اندران افسر گرفت.

ئەگەر بە شمشێریش زامێک دەجەستەدا پەیدا بێ، چارە دەکرێو سارێژ دەبێ. وە نووکی پەیکانی دووســـەر، ئەگەر بچێتە ناو لەشـــی کەسێک دەکرێ دەری بکێشن، بەڵام زامی زبانو گوتن بە هیچ شتێک چارە ناکرێ. وە هەر تیرێک کە لە ژێی زبان دەرچوو و گەیشتە دڵ، دەرکێشانی نامومکینەو بۆ هەتاهەتا لەوێدا دەمێنێتەوە، رُبَّ قَوْلٍ اَشَدُّ مِنْ صَوْلٍ.[1]

هەر ســـۆزو برژانەوەیەک دەرمانێکی هەیە: ئاو بۆ ئاگر، تریاک بۆ ژەهر، بۆ غەم ســـەبر، بۆ ئەوین دووری لە یەکتر. وە ئاگری رقو کینە ماکەی لە ئەندازە بەدەر زۆرە، بە جۆرێک ئەگەر هەموو دەریاکانی دنیا بەســـەریدا تێپەڕن لە ناو ناچـــێو نامرێ. وە لە نێوان ئێمەو قەومی تـــۆ چقڵی دوژمنایەتی وەهای رەگ داکوتا کە ریشەی گەیشتە قووڵایی زەوی‌و لقو پۆپی دەگاتە تەشقی ئاسمان.

ئەو قســـانەی کردو هیوابڕاو و دڵشـــکاو، رۆیشـــت. قالاو لەوەی گوتبووی پەشـــیمان بۆوەو بیری کردەوە کە نەفامیم کرد، ئابڕووی خۆم برد لای ئەوانی دیکـــە. دوژمنم بۆ خۆمو بۆ گەلەکەم پەیدا کرد. دوژمنی چیرەدەســـت، هەموو چاوسوورو مەست، بۆ شەڕو هەرا بێ‌غەمو دەربەست. وە بە هیچ لێکدانەوەیەک، لە مەلەکانی تر بۆ ئەم رێنوێنی‌و نســـحەتانە لایقتر نەبووم. وە تایفەیەک کە لە من لە ســـەرتر بوون ئەم خومخۆرییەیـــان نەنواند. هەر چەند عەیبەکانی کوندو مەســـڵەحەتەکانی ئەم راوێژکارییەیان لە من باشتر دەزانی، بەڵام دواهاتەکانی دوارۆژیان دە بەرچاو گرتو فکریان لێکردەوە، کە فکرو تێبینی من نەگەیشـــتە ئـــەم رادەیە. وە زیانو ناحـــەزی‌و خەتاکاری‌و گوناهی ئـــەم کارەم نەزانی. لە هەمووشـــی خراپتر ئەوە بوو کە رووبەڕووی خۆی ئەو قســـانەم گوت. وە شک لەوەدا نییە کە رقو قینی ئەو رەفتارە زۆرترە.

عاقڵ هەر چەند متمانەی بە زۆرو قەوەتی خۆی هەبێ، سازکردنی دوژمنایەتی‌و شـــەڕەدندووکە بە باش نازانی‌و پاڵەوەدان بە شەوکەتو دەستڕۆیشتوویی خۆی رەوا نابینـــێ. وە هەر کەس دەرمانو تریاکی زۆرروزەوندیشـــی لە بەردەســـتدا بێ، ناچی ژەهر ناخواتەوە. وە هونەر دە کارجوانیدایە کە بە قســـەجوانی ئەو

---

[1] . زۆر قسەی وا هەیە لە پەلاماردان گورچووبڕترە.

ســـەرەتییە دەست ناکەوێ. چونکە ئاکامی کاری باش، هەر چەند بە قسە باس نەکرێ، لە ســـەرەنجامی کاراندا بە ئەزموونی جوانو رازاوە خۆی دەنوێنێ. لە لایەکی ترەوە ئەو کەســـەی قەولی بەسەر عەمەلیدا دەشکێ، کاری نەکردوو بە قسەی جوانو رازاوە دەچەسپێنێو لەبەر چاوی خەڵک بە زبانی شیرین خۆشی دەکا. بەڵام ئاکامەکەی دەکێشێتە موزەمەتو سەرکۆنە. وە من ئەو خورتوێژە، کورتفێلە ســـەرگێژەم کە بیر لە ئاکامـــی کردەوەو کاران ناکەمەوەو هەر پێدا دەدەم. ئەگینا لەم بێعەقڵییە بێنیاز دەبووم‌و ئەگەر تۆســـکاڵێک عەقڵم بووایە، دەبوایە دە پێشـــدا دەگەڵ کەسێک مەشـــوەرەتم بکردایەو پاش دە کارهێنانی عەقڵو راوێژکاریو ســـاغبوونە لەســـەر بڕیارێک باســـێکی بەپارێزو رەمزاویم، بەشێوەیەک کە پای ئەو نەگرێتەوە، بکردایە. چون دەکاری گرینگدا، بە ئاشکرا خۆتێهەڵقوتانـــدن لە زانایی‌و وریایی‌و توانایی زۆر دوورەو هەر کەس بێڕێنوێنی دڵســـۆزانو راوێژکردن دەگەڵ پسپۆڕان، دەســـت بەرێ بۆ کاران دەچێتە ریزی شـــەروورانو مۆری نەزانی دەدرێ لە نێوچاوانی، وە من بەراســـتی بێنیاز بووم لەم دوژمنیو دڵچڵکنییە.

ئەم قسەو باسە، عەقڵی دە دڵی هاویشتو ئەم مەسەلەی بە گوێیدا چرپاند: زۆربڵێ وەک کەســـێکە کە بە شـــەو چرۆچیلکە خڕ دەکاتەوە. ســـەعاتێک بەم چەشنە دڵی کوتایو خۆی بەم شێوەیەو ئەم قسانە سەرکۆنە کردو لە شەقەی باڵانـــی دا و فڕی، ئەوەبوو ســـەرەتای دوژمنایەتی ئێمـــەو کوند کە بە عەرزت گەیشت.

پادشـــا گوتی: روون بۆوە. ئاگاداری لەم بابەتە قازانجی زۆرە. باســـی ئەو کارەی کە دە پێشـــماندایە، دەســـت پێ بکە. وە فکر لە تەدبیرێک بکەوە کە ئاســـوودەیی خەیاڵو نەجاتی لەشـــکرو خێڵو ماڵو رەعیەتی تێدا مسۆگەر بێ. وەزیـــر گوتی: لەمەڕ تەرکی شـــەڕو بەرگری لە خـــەرجو مەخاریجی زۆرو جێ نەهێشـــتنی وڵات ئەوەی پێویست بوو گوترا، بەڵام هیوام وایە بە شێوەیەک لە فێڵو پیلان دەراوێکی روونمان بۆ بکرێتەوە. کە زۆر کەس بە ئەنگێوەیی عەقڵ، بەسەر کەندوکۆسپاندا زاڵ بوون کە بە یارمەتی هێزو سپا و شەڕو هەرا جێبەجێ

نەدەبـــوو. هەر وەک جەماعەتێک کە بە مەکرو فێڵ پەزیان لە دەســـت زاهیدی خواناس دەرهێنا. پادشا پرسی: چۆن؟

گوتی: زاهیدێک پەزێکی بۆ قوربانیکردن کڕیبوو؛ لە ڕێگادا چەند دەستبڕێک چاویان پێکەوتو تەماعیان تێکردو قەراریان دانا فریوی بدەنو پەزی لێ بستێنن، یەکیان هاتە بەرەوەو گوتی: جەنابی شـــێخ ئەو سەگەت بۆ کوێ وەپێش خۆت داوە؟ ئەوی دی گوتی: شـــێخ مەیلی شکاری هەیە، کەوا سەگی بەدەستەوەیە. ســـێهەمی ڕەگەڵ کەوتو گوتی: ئەو پیاوە جلوبەرگی ئەهلی ئیمانی پۆشیوە، بەڵام وە زاهیدان ناچێ. چونکە زاهیدان دەگەڵ ســـەگ یاری ناکەنو دەســـتو پەلو لیباســـی خۆیان گڵاو ناکەن. لەم جۆرە قســـانەیان هەڵدەڕشت تا شکو گومـــان کەوتــە دڵی زاهیدو خـــۆی خەتابار کردو گوتی: شـــکی بۆ دەچێ کە فرۆشیاری ئەمە جادووگەر بووبێو چاوی بەستبێو سەرتان نەهێنمە ئێش زاهید پەزی بەجێهێشتو دەستبڕەکان گرتیانو بردیان.

ئەو مەســـەلەم بۆ ئەوە هێناوە تا لەســـەر ئەوە ســـاغ بینەوە کە بە مەکرو فێڵبازی هەنگاو هەڵگرینو پاش ئەوە سەرکەوتن بێ یەکو دووکردن ڕوو دەدا. بەڵام واباشە کە پادشا لە بەرچاوی جەماوەر لێم تووڕە بێو دەستووری لێدانو کوتانـــم بدەنو سرشـــکاو و بریـــندارو خوێناوی لە بن دارێـــک فڕێم بدەن. وە پادشا دەگەڵ تەواوەتی لەشکر بڕواتە فڵان شوێنو لەوی بمێننەوەو چاوەڕوانی گەڕانـــەوەی من بن. تا من کاری فێڵو فریوی خۆم تەواوکەمو بێمەوەو پادشـــا ئاگادار بکەمەوە. پادشـــا، فەرمانی دا ئەوەی دەڵێ بیکەنو خۆیو لەشـــکری چوونە ئەو شوێنەی دیاری کرابوو. ئەو شەوە کوندەکان گەڕانەوەو قالاوەکانیان نەدیتەوە. ئەویش کە ئەو هەموو شەقشـــەقێنەی پێ کرابوو نەبیندراوە. ترسا کوند بگەڕێنەوەو زەحمەت بە خەســـار بێ. سەبرسەبر، جینگڵی دا و نەرمەنەرم دەستی کرد بە ناڵەناڵ تا کوندەکان گوێیان لە دەنگی بوو و خەبەریان بۆ پادشا برد. پادشـــا دەگەڵ چەند کوندێک ڕۆیشتە لایو پرسی: تۆ کێیو قالاوەکان لە کوێن؟ نێوی خۆیو باوکی گوتو درکاندی؛ ئەوەی لە بابەت قالاوانەوە پرسیارم لێدەکەن، حاڵی من خۆی هاوار دەکا کە من مەحرەمی ڕازی ئەوان نیم. پادشا

گوتی: ئەمە وەزیری پادشـــای قالاوانە. ئـــاگای لە رازو نهێنییەکانی ئەو هەیەو راوێـــژکاری ئەوە. دەبـــێ بزانین بۆچیو بە چ غیرەتێک ئەو بەلایەیان بەســـەر هێناوە.

قالاو گوتی: پادشا لێم بەگومانە. پرسی: بە چ هۆیەک؟ گوتی: کاتێک ئێوە ئەو پەلاماری شـــەوانەتان هێنا سەرمان، پادشا ئێمەی کۆ کردەوەو فەرمووی، بیروڕای خۆمان لەسەر ئەم رووداوە دەرببڕین. وە من لە نزیکانی ئەو بووم. گوتم ئێمـــە ناتوانین دە بەرانبەر کوندانەدا راوەســـتین. چونکە لە ئێمە ئازاترنو هێزو سپا و شەوکەتو شکۆیان زۆرترە. بڕیار ئەوەیە راسپاردە بنێرینو داوای ئاشتی بکەین، ئەگەر جوابمان بدەنەوە، کارێکە شـــایانی رێز، ئەگینا بە شـــاراندا بڵاو دەبینەوە. چونکە شەڕ بۆ ئەوان قازانجی زۆرترەو بۆ ئێمە ئاشتی باشتر، دەبێ دانوێنین، کە دوژمنی چیرەدەستی بە توانا تەنیا بە دانواندنو دۆستایەتیکردن، دەسبەردار دەبێ. نەتاندیوە کە گیای وشک لە گەردەلوولو تۆفاندا رزگار دەبێ چـــون دەگەڵ با مودارا دەکا و خۆی رێک دەخا و بە پێی جموجووڵی با خۆی بـــەم لا و ئەو لادا دەخا؟ قـــالاوەکان دەرهەڵبـــوونو تاوانباریان کردم کە "تۆ لایەنگری لە کوند دەکەی" وە پادشا لە قبووڵی رێنوێنی من رووگەردان بوو، وە بەمجـــۆرەی دەبینن عەزابی دام. وە لە ئیرادەی ئەودا وای بۆچووم کە دیانەوێ بۆ شەڕ ئامادە بن.

پادشـــای کوندان کە قسەکانی قالاوی بیســـت، لە وەزیرێکی خۆی پرسی. بیروڕات لەســـەر ئەم قالاوە چییە؟ گوتی: هیچ فکری پێ ناوێ. زووتر رووکاری زەوی لە پیســـی فکروڕای ئەو، دەبێ پاک بکرێتەوە. کە بۆ ئێمە ئاســـوودەییو قازانجـــی گەورەی تێدایە. تا لە پیلانو فرووفێڵی ئەو دە ئەماندا بینو قالاوەکان مەرگی ئـــەو بە زیانێکی گشـــتیو کەلەبەرێکی گەورە دەزانـــن. وە گوتوویانە "هەر کەس هەلێک بفەوتێنێ، چیدی ئەو هەلە نابینێ، پەشـــیمانیش ســـوودو بەهـــرەی بۆ ناهێنێ. وە هەر کەس دوژمن بە لێقەوماوی ببێنیو فرســـەتی لێ نەهێنیو گیانی لێ نەســـتێنێ، تێدەشکێو دەدۆڕێنێ. وە دوژمن کە لەو قۆرتە رزگاری هـــات. قەوەی دێتەوەبەرو پیلان دەگێڕێو لە دەرفەتێک دەگەڕێو زیان

دەگەیەنێ". ئامان! نەکا پادشـــا گرینگی بە قسەکانی بدا و ئەفسوونی ئەو دە گوێ بگرێ. چون باوەڕکردن بە دۆستانی تاقی نەکراوە، لە بەرژەوەندی دوورە، تا چ دەگا بە دوژمنی غەددارا!

پادشـــا لە وەزیرێکی دیکەی پرسی: تۆ چ دەبێژی؟ گوتی: من ناتوام بڵێم. بیکوژن. چون دوژمنی کزو داماو کە نە لەشکری هەیەو نە هێزو توانا، جێگەی روحمو زگپێ‌ســـووتانە. وە عاقڵان دەستگرتنی کەســـێکی لەم چەشنە لەخوا دەخوازنو چاکەکاری خۆیان بە لێبوردنو ئیحسان بە عالەمیان نیشان دەدەن. وە پەنابەری هەراســـانو نیگەران دەبێ پەنا بـــدرێ، کاتێک ئەو دوژمنە لایقی ئـــەم پەنادانە بێ. وە هێندێک کار دەبێتە هۆی دلۆڤانی خەڵک بۆ دوژمن. هەر وەک ئـــەو دزە کە بوو بە هۆی دلۆڤانی ژنی بازرگان بۆ مێردەکەی، هەر چەند ئەوەشی دە فکردا نەبوو. پادشا پرسی: چون؟

گوتی: بازرگانێک بـــوو زۆر دەوڵەمەند، بەڵام لە رادەبەدەر ســـەحەتگرانو گرانجان. ژنێکی بوو روخســـاری وەک حاســـڵی چاکەکارانو زولفی وەک نامەی عەمەلی گوناهکاران. مێرد دە عیشـــقی ژندا دەسووتا، ئەویش بێزارو هەراسان، ملی نەدەدا و سەعاتێک بە مەیلو مرادی ئەو نەدەجووڵاوە. مێردیش رۆژ لە رۆژ پتر عاشـــق دەبوو. تا وا هەڵکەوت شەوێک، دزێک رێی دە ماڵی ئەوان کەوت. بازرگان دە خەودا بوو، ژن لە دز ترســـا و خۆی دە ئامێزی مێردەکەی کوتا و دە باوەشـــی گرت. کابرا لە خەو راپەڕیو گوتی: ئـــەوە چۆنە ئاوا میهرەبانیو چۆنـــەو بە چ هۆیەک شـــایانی ئەو رەحمەتو نیعمەتـــە بووم؟ کە چاوی بە دز کـــەوت، بانگی کرد: ئەی کەڵەپیاوی مبارەکقەدەم، هەر چی دەتەوێ هەڵگرەو حەلاڵـــت بێ کە بە بەرەکەتی هاتنی تۆ ئەو ژنـــە بەزەیی پێمدا هاتو دەگەڵم میهرەبان بوو.

پادشـــا لە وەزیری سێهەمی پرســـی: تۆ چۆنی بۆ دەچی؟ وەزیر گوتی: وا باشترە کە لە لای خۆت بمێنێو ئەنعامو خەلاتی پێ ببەخشیو ئەویش دەرهەق بە پادشـــا خزمەت بکا و ئەرکی رێنوێنیو نەســـیحەت بەجـــێ بێنێ. وە عاقڵ لێک جیاکردنەوەی دوژمنانو دووبەرەکی خســـتنەوە لە نێوانیاندا بە سەرکەوتن

دەزانێ. کە جیاوازی قسەی دوژمنان دەگەڵ یەکتر، ببێتە هۆی ئاسوودەیی دڵو ڕێکوپێکی کاروبار. هەر وەک دە نێوان ناخۆشـــی دزو دێودا، ئەم ئاسوودەییە بۆ کابرای خوداناس دەستیدا. پادشا پرسی چۆن؟

گوتی: شـــێخێک مانگایەکی لە مریدی خۆی کڕیبوو، دەیبردەوە بەرەو ماڵ. دزێک چاوی پێکـــەوت، بەدوایدا چوو کە مانگاکە بدزێو دەرباز بێ. دێوێک بە شـــکڵی ئادەمزاد ڕەگەڵی کەوت. دزەکە لێی پرسی: تۆ کێی؟ گوتی: دێوم! وە دوای ئەو شێخە کەوتووم تا دەرفەتی لێ بێنمو بیکوژم، تۆش باسی خۆت بکە. گوتـــی: من پیاوێکی جەردەم، دەمەوێ مانگاکـــە بدزم. بەمجۆرە هەر دووکیان هاوفکر بوونو بە شـــوێن شێخدا گەیشـــتنە خانەقاکەی. شەو گەیشتنە ئەوێ. شێخ مانگای بەستەوە تفاقی دە بەرکردو خۆی بۆ حەسانەوە ڕۆیشت. دز فکری کردەوە. ئەگەر دێو، پێش ئەوەی مانگاکە بدزێ، بیەوێ شـــێخ بکوژێ لەوانەیە شـــێخ بێدار بێو هاوار بکا، خەڵک کۆ ببنەوەو نەتوانێ مانگاکە بدزێ. دێویش دەیگوت: ئەگەر دزە مانگا بەرێتە دەر. درگاکان دەکاتەوەو بەو تەقوکوتە شێخ بەخەبەر دێو کوشتنی دەست نادا. بە دزەی گوت: تۆ ڕاوەستە تا من ئەو پیاوە دەکوژمو پاشان تۆ مانگا بەرە. دز گوتی: تۆ جارێ سەبر بکەی باشترە، با من مانگاکە بەرمو تۆ ئیشـــی خۆت ئەنجام بدە. ئەم دەمەتەقەیە لە نێوانیاندا بەرز بۆوەو کار گەیشـــتە شەڕەجنێو. دزە بانگی شێخی کردو گوتی: دێوێک لێرەیە، دەیەوێ بتکوژێ. دێویش هاواری کرد: دز هاتووە مانگا بەرێ. شـــێخ بەخەبەر هات. خەڵک داوەرووکانو دزو دێو دەرباز بوون. وە گیانو ماڵی شێخ لە سایەی دووبەرەکیو ناکۆکی دوژمنان، پارێزرا.

کاتێک وەزیری سێهەم لەم حەکایەتە بۆوە، یەکەم وەزیر کە فتوای کوشتنی دەدا گوتی: دەبینم کە ئەم قالاوە، بە مەکرو حیلە ئێوەی فریو داوە! وە ئێستا دەتانـــەوێ بەرژەوەندیو ئیحتیات بنێنە ئەو لاوە. بە پێداگرییەوە پێتان دەڵێم، لەخەوی غەفڵەت هەڵستنو لۆکەی گوێتان دەرکێشن. لە دواهاتەکانی ئەو کارە بترســـن، کە عاقڵان بنچینەی کاری خۆیانو کاری دوژمن لە ســـەر بارێکی باش دادەمەزرێننو قســـەی دوژمن بە گوێی تێگەیشتن دەبیسنو لەچەشنی کەمتیار

به گوتاری درۆ هەڵناخەڵەتێن‌و هەر وەها ئەوانەی غافڵن کەمتر سەرنج دەدەنە ئەم بابەتەو بە هێندێک جامەلووسکی‌و کلکەسووتەو پێ‌هەڵاگوتن دڵیان نەرم دەبێ‌و دوژمنایەتی‌و رق‌و کینەی قەدیم فەرامۆش دەکەن‌و بە بیستنی درۆ و دەلەسە لە حەقیقەت‌و راستی دوور دەکەونەوەو درۆی دوژمن باوەڕ دەکەن‌و ئامادەی سوڵح‌و ئاشتی دەبن. وە سەیرتر ئەوەیە لە بەرچاوی ئێوە دزی بەسرە، تورفەی[1] بەغدا دەنوێنێ‌و دروست وەک ئەو دارتاشە وان کە بەقسەی ژنەکەی هەڵفریوا. پادشا پرسی: چۆن؟

گوتی: لە شاری سەرەندیب دارتاشێک ژنێکی بوو، وەک رێوی فێڵباز‌و چەشنی شێر لە شکاری دڵاندا. روخساری وەک نووری ئیمان گەش‌و زولفی وەک خەیاڵی بەتاڵی دڵی بێ‌ئیمان، رەش. وە ئەلحەق شێت‌و شەیدای ئەو ژنە بوو. سەعاتێک بێ ئەو هەڵی نەدەکرد. جیرانێک چاوی بەو خاتوونە کەوت‌و کەمکەمە نێوانیان پێکەوە خۆش کرد. خزم‌و سۆرەو تۆرەو خەسوو، لەو خەینوبەینە ئاگادار بوونەوەو دارتاشیان ئاگا کردەوە. ویستی متمانەیەکی زۆرتر وەدەست بێنێ‌و پاشان کارێک بکا. بە ژنەکەی گوت: من دەچمە گوند، هەر وا فەرسەخێک لێرەوە دوورە، بەڵام چەند رۆژێکم پێدەچێ. نان‌و پێخۆرێکم بۆ ئامادە بکە. دەستبەجێ ئامادەی کرد. دارتاش ماڵاوایی لە ژن کردو فەرمووی: وریابە. درگای ماڵ مەحکەم دابخە، ئاگات لە کەلوپەل‌و ئەسباب بێ، تا لە نەبوونی مندا زیانێکمان پێ نەگا. کاتێک ئەو رۆیشت ژنەکە حەریفەکەی ئاگا کردەوەو قەراری ژوانی دەگەڵ دانا. دارتاش درەنگانێک لە رێگەیەکی شاراوەوە خۆی دەماڵ راکردەوە. کەڵەگای ژنەکەی لەوێ چاو پێکەوت. سەعاتێک خۆی حەشاردا. ژن‌و حەریف چوونە شوێنی خەو، لەسەر تەخت راکشان. دارتاش خۆی گەیاندە بن تەختەکە تا باقی رووداو بەچاوی خۆی ببینێ. لە نەکاو ژن چاوی بە قاچی مێردەکەی کەوت‌و زانی بەڵا نازڵ بووە، بە خۆشەویستەکەی گوت: دەنگت هەڵبێنەو لێم بپرسە "منت زۆرتر خۆش دەوێ یا مێردەکەت؟!"

---

۱. دزی بەسرەو تورفە (طرفە)ی بەغدا: مەبەست لە پیاوی خراپ‌و پیاوی چاکە لە ئەدەبی عەرەبی‌و فارسیدا دەکار کراوە. (دزد بصره را طرفه بغداد داشتن).

کە لێی پرسی جوابی داوە کە: "ئەوە چ پرسیارێکە؟ هیچ لازم ناکا لێم بپرسی". لەم پرسیارانەدا زۆری لەسەر ڕۆیشتن‌و ژن گوتی: بۆ ژنان لە ڕووی بەهەڵەداچوون‌و زەللەی شەتیان، یا لە ڕووی شەهوەتەوە، لەم جۆرە ڕووداوانە دێنە پێش. وە لەم چەشنە دۆستانە هەڵدەبژێرن‌و کاریان بە عەسڵ‌و نەسەبی کابرا نییەو گوێ نادەنە ڕەوشتی ناپاکو عادەتی ناپەسندی ئەوان. وە کاتێک قەوەتی شەهوەت لە کورتی دا، ئەم دۆستانە دەچنەوە ریزی بێگانان، بەڵام مێرد لە جێگەی باب‌و برا و ئەولادە. وە هەرگیز بەختەوەر نەبێ ئەو ژنەی مێردی خۆی هەزار بەرانبەی گیانی خۆی خۆش نەوێ‌و گیان‌و ژیانی خۆی بۆ ئاسوودەیی‌و ڕەزامەندی ئەو نەوێ.

دارتاش کە گوێی لەم قسانە بوو، دڵی وە ڕوحم هات‌و بە خۆی گوت: گوناهم گەیشتێ کە لێی بەدگومان بووم. ئەو هەژارە لە غەمی مندا بێ‌قەرار‌و لە عەشقی مندا سووتاوە. ئەگەر شێت‌و شەیدایەک خەتایەک بکا نابێ زۆری بەدڵ بگری. هیچ ئافەریدەیەک نییە مەعسووم بێ‌و هەڵە نەکا. من بێهوودە خۆم گوناهبار کرد. وە ئێستا واباشە عەیشیان نەشێوێنم‌و لێیان تێک نەدەم‌و لە لای ئەم پیاوە ئابڕووی نەبەم. لەبن تەختەکە خۆی مەلاس کرد تا ئاڵای شەو کەوتە زەوی. کابرای بێگانە ڕۆیشت‌و دارتاش سەبرێک لە ژێرەوە هاتە دەر‌و لە سەر تەخت دانیشت. ژن خۆی دە خەو کرد. زۆر بە ئارامی وەخەبەری هێنا و گوتی: ئەگەر لەبەر دڵی تۆ نەبوایە ئەو کابرایەم دەتۆپاند‌و دەمکردە عیبرەتی ڕووداماڵاوان‌و حیزان. بەڵام چون من دەزانم زۆرت خۆش دەوێم‌و لێبڕاوی ژیانت بۆ ئاسوودەیی من بوێ‌و بینایی چاوانت بۆ دیتنی من پێویست بێ‌و ئەم جۆرە کارەشت لە ڕووی هەڵەو پەرێشانی بێ، نە لە ڕووی عەمد‌و قەست‌و ئاگاداری، جانیبی دۆستی تۆ و پاراستنی ئابڕووی تۆ ڕادەگرم. دڵت نەلەرزێ‌و نیگەرانی‌و نفرەت ڕێ مەدە بێنە ناو دەروونت. منیش حەڵاڵ بکە، کە پێم وابوو، تووشی هەرزەکاری بوویت‌و زۆر لێت بەدگومان بووم. ژنیش بە نەرمی هێندێک لەسەری ڕۆیشت‌و تووڕەیی هەر دووکیان با بردی! وە ئەم مەسەلەم هێناوە تا ئێوە وەک دارتاش فریو نەخۆن‌و تێبینی‌و بەرژەوەندی خۆتان بە درۆ و دەلەسەو فێڵ‌و فریوی قاڵاو فەرامۆش

نەکـــەن. وە هەر دوژمنێک کە لەبەر دووری نێـــوان خۆیو ئێمە نەتوانێ کارێک بکا، خۆی نزیک دەکاتەوەو دڵســـۆزی نیشـــان دەدا. وە بە جۆرێک میهرەبانیو ســـەگیەتی، خۆی دەکاتە مەحرەم. وە پاش ئـــەوەی نهێنییەکانی زانیو هەلی بۆ هەڵکەوتو بە زانایییەوە دەســـت بەکار دەبێو هەر زەبرێکی بیوەشـــێنێ وەک برووســـکە هیچ شـــتێک پێشـــی پێ ناگرێو وەک قەزا و قەدەر بێ خەتا دەڕوا. وە من قالاوەکانم تاقی کردبۆوەو بارســـتای دووربینیو عەقڵو تێگەیشـــتوویيو ئەنـــدازەی بیروڕای ئەوانـــم دەزانی. تا ئەم مەلعوونەم چـــاو پێکەوتو گوێم لە قسەکانی بوو. رووناکبیریو قووڵایی بیرکردنەوەیانم بۆ روون بۆوە.

پادشـــای کوندان قسەو رێنوێنی وەزیری خستە پشـــتگوێو فەرمووی، ئەو قـــالاوە بەڕێـــزو حورمەتەوە دەگەڵ ئەو بەرنو دەســـتووری دا رێزی لێ بگرنو شاهانە خزمەتی بکەن، هەر ئەو وەزیرە کە پێی خۆش بوو قالاو بکوژرێ گوتی: ئەگەر ناشـــیکوژن وەک دوژمن رەفتاری دەگەڵ بکەنو بۆ چاوترووکانێکیش لە فرووفێڵـــی ئەو ئەمین مەبن. چون هۆی هاتنەکەی بێجگـــە لەماڵوێرانی ئێمەو مەسڵەحەتی خۆیان، شتێکی دیکەی تێدا بەستە نییە.

پادشـــا ئەو نەسیحەتانەی نەبیســـتو قســـەکانی وەزیری راوێژکاری زانای بـــە هێند نەگرت. قالاو لە خزمەت پادشـــادا، بە رێـــزو حورمەتەوە دەژیا و لە رێورەســـمی ملکەچیو ئیتاعەی ئەمرو عەبدایەتیدا کەمو کورتی نەبوو. دەگەڵ دۆســـتانو خزمانی پادشادا خۆی رێکدەخســـتو بە پێی پلەوپایەو جێگەوپێگە رێزی لێ دەگرتن. وە رۆژ لە دوای رۆژ لە لای پادشا و هاورێیانی خۆشەویستتر دەبوو. وە پلەوپایەی دەرۆیشتە بانو پادشا و رەعیەت متمانەیان بە دڵسۆزیو رێنوێنییەکانی زۆر دەچووە سەر. لە هەموو کارێکو بوارێکو پرسیارێکدا پرسیان پێ دەکـــرد. رۆژێکیان دە کۆڕو کۆبوونەوەیەکـــی تایبەتو تەژی لە مێرخاسو باوەڕپێکراواندا گوتی: پادشای قالاوان بێ سووچو تاوان منی سزادا. جا چۆن تا تۆڵەی خۆمی لێ نەکەمەوە خەو و خۆراک لە خۆم حەرام نەکەم؟ کە گوتوویانە اَلْمُکافاةُ فِی الْطَبیعَةِو اجِبَةُ.[1] وە بۆ گەیشـــتن بەم ئامانجە زۆرم بیر کردەوەو بەو

١. پاداشو سزادان لە دنیادا واجیبە.

ئاکامە گەیشتم تا من لەسەر شکڵو دە جلوبەرگی قالاواندا بم هیچم بۆ ناچێتە سـەر. وە لە ئەهلی زانستم بیستووە، ئەگەر ستەملێکراوێک لە دەست دوژمنی خوێنخۆرو سـولتانی زاڵم ئامادەی مردن بێو خۆی ئاگر تێبەردا قوربانییەکەی قبوولـی درگای تەعالایە. وە هەر دوعایەکی لەو حاڵەدا بیکا قبووڵ دەبێ. وە ئەگەر پادشا رای لەسەر بێ، ئەمر بفەرموون با بمسووتێننو لەو ساتەوەختەدا کە گەرمای ئاگرم پێ دەگا، لە خودای مەزن عَزَّ اِسْمَهُ دەپاڕێمەوە بمکا بە کوند تا بەم شـێوە دەستم بەو ستەمکارە رابگا و ئەم دڵە بریانەو جەرگە سووتاوەم بەمجـۆرە فێنک کەمـەوەو لەم کۆڕەدا ئەو کوندە کە کوشـتنی ئەوی بە رەوا زانیبوو ئامادە بوو، گوتی:

سەد زبانت هەیە وەکوو سووسەن
ئەوی لێت دوورە شادو ئاسوودەن[1]

ئـەی زباندرێـژی درۆزن، وجوودت پـڕە لە مەکرو ئاژاوە، تـۆ بە رواڵەتی جوانو دەروونی پیسـتەوە وەک شەرابی خوسـرەوانی خۆشرەنگو بۆنخۆشی کـە ژەهریان تێکەڵ کردبـێ. وە ئەگەر وجوودی نەحسو ناپاکت سـەد جار بسووتێننو دەریاکانی بە سەردا رەوان کەن، گەوهەرو ماکەی ناپاکی تۆ لەوەی کە هەیە ناگۆڕدرێو پیسـی دەروونو خواروخێچـی بیروڕای تۆ نە بە ئاو پاک دەبێتەوە، نە بە ئاگر دەسووتێ. هەر چۆنێک بیتو بە هەر شکڵێک دەربێی، ئەو سیفاتە نگریسو کرێتە، دەگەڵت دەگەڕێ. وە ئەگەر زاتی چەپەڵت بتوانێ ببێتە تاوسو سیمورغ، مەیلو خۆشەویستیت لە قالاوان درێغ ناکەی. وە لە وێنەی ئەو مشـکەی کە هەورو با و مانگو رۆژیان پێ ناساند تا شوویان پێ بکا، دەستی رەدی لەسـەر سینگی هەمووان دانا و ئاوێکی پاکی بە دەستی هەمووان‌دا کرو مشکێکی کە لە جسناتی خۆی بوو دە ئامێز گرتو بە نازەوە زەماوەندی دەگەڵ کرد. پادشا گوتی: چۆن؟

گوتـی: زاهیدێک کە خوا دوعای قبووڵ دەکردو "مُسْـتجابُ الدّعوَە" بوو. لە قەراغ جۆگە ئاوێک دانیشتبوو. مشککرە، بێچووە مشکێکی لە لای ئەو بەرداوە.

---

١. گرچو نـرگس نیستی شـوخ و چو لالـه تیـره دل / پس دوروی و ده زبان همچون گل سوسن مباش.

شـــێخ دڵی پێ ســووتا، هەڵیگرتەوە. دە گەڵایەکییەوە پێچا تا بیباتەوە ماڵ، فکــری کردەوە کە لەوانەیە خاوخێزان پێ نارەحەت بن‌و زیانیان پێ بگا. لەبەر خـــودای تەعالا پـــاراوە. تا خودا کردی بە کچێکی لەبـــارو خۆش هەیکەل. بە جۆرێک کە ڕۆژی ڕوخساری ئاوری دە سێبەری چاڵاو بەردەدا و سایەی زولفی، دووکەڵی لە ڕوخســـاری مانگ هەڵدەســـتاند. پاش ئەوە بردی بۆ لای مریدێکو فەرمووی وەک منداڵانی خۆشەویســـتی خۆی پەروەردەی بکات. مرید بە ئەمری شـــێخ جووڵاوەو دە بارهێنانی کچەدا تێکۆشا. کاتێک گەورەبوو، دەوری منداڵی تێپەڕی، شـــێخ گوتی: کچی من گەورە بـــوویەو دەبێ مێرد بکەی. لە ئادەمی‌و پەری، هەر کەس دیاری بکەی دەتدەم بەو. کچ گوتی: مێردێکم دەوێ بە توانا و قودرەت کە هەموو کارێکی لە دەست بێ. گوتی: مەگەر بتدەم بە ڕۆژ. گوتی: زۆر باشە. شێخ ڕووی دە ڕۆژ کردو پێی گوت: ئەم کچە جوان‌و لەبارە حەزدەکەم ببێتە هاوسەری تۆ، چونکە مێردی بە توانای ویستووە. ڕۆژ گوتی: من کەسێکی لە خۆم بە تواناتر نیشـــانی تۆ دەدەم، کە نووری من دادەپۆشێ‌و هەموو عالەم لە نووری جەماڵی من بێ بەش دەکا. ئەویش هەورە. شـــێخ لە جێوە هاتە لای هەورو مەسەلەکەی دەگەڵ باس کرد. گوتی: با لە من بەهێزترە، بۆ هەر لایەک بیەوێ ڕەپێچەکم دەدا. دە دەستیدا وەک مۆرەی جادووگەرم. ڕۆیشتە لای با و مەسەلەی دەگەڵ باس کرد. گوتی: بڕۆ لای کێو، لە هەمووومان بەهێزترەو بە من دەڵێ، شێتۆکەی خاکەسار. هاتوچووی بێبڕانەوەم بە خراپ باس دەکا. وە بێ جموجووڵ لە ســـەر جێی خۆی پان بۆتەوەو زۆرو تاقەتی من کارتێکردنی لەودا وەک گۆرانی نەرمە، دە گوێی پیاوی کەڕدا. شـــێخ دەگەڵ کێو دانیشت‌و باسی غەم‌و شـــادی خۆی‌و ئەم قسانەی بۆ کرد. جوابی داوە مشک لە من بەهێزترە، جەستەم کون‌کون دەکا و هێلانە لە ناو جەرگمدا هەڵدەکۆڵێ‌و هیچیشم دەگەڵی پێ ناکرێ. کچەکە گوتی: قســـەی کێو دروستە. شووی من مشکە. شێخ کچی دا بە مشک. گوتی کە هاوسەری من دەبێ لە جسنی خۆم بێ. کچ گوتی: دوعا بکە ببمە مشـــک. شێخ دەستی بەرز کردەوە، لەبەر حەقتەعالا پاڕاوە. دوعای قبووڵ بوو. دەســـتی دە دەستی یەک نان‌و ڕۆیشت. تۆش هەر ئاوای. وە کاری

تۆ ئەی مەکربازی لە بنەوەبڕی حەرامزادە هەر ئەم تاموبۆنەی هەیە.

چەنیّ وەک مارو هەنیّ وەک ماسی

خۆت ساغ کەرەوە مار بە یا ماسی[1]

پادشای کوندان، وەک شێوەی بێدەوڵەتانە، نەیتوانی ئەم نەسیحەتانە دەگویّ بگـریّو ئاکامەکانی لێک داتـەوە. قالاویش هەر ڕۆژ حەکایەتی شـیرنو پەندو مەتەڵی عەجایبو غەرایبی بۆ دێنانەوەو بە شـێوەیەک خۆی دەکردە مەحرەم تا سەرەنجام ئاگاداری لە هەموو رازو نهێنییەک وەدەست هێنا و خەبەرو باسەکانی زانـی. لە نەکاو خۆی ون کردو عەرز قووتی دا و گەڕاوە لای پادشـای قالاوان. کاتێک پادشا چاوی پێکەوت پرسی: ماوَراءُک یا عِصامْ؟[2] جوابی داوە:

ئەوەی پێویسـت بوو، بۆ خزمەتکردن بە پادشـا ئەنجام درا. ئێستا دەبێ دەستبەکار بین. پادشا گوتی: لە ڕێنوێنی تۆ لا نادەین. ڕێنوێنی خۆتمان پێ بڵـێ تا فەرمان بدەم. گوتی: کونـدەکان هەموویان لە فلان کێونو بە ڕۆژ دە غارێکـدا کۆ دەبنەوە. لەو نزیکەش چرپوچیلکەو داروبار زۆرە. پادشـا فەرمان بدا هێندێک بۆ ئەو شـوێنە بەرنو لەبەر درگای ئەشکەوتی دابنێن. وە دە جلو پەلاسـی شـواناندا، کە لەویّ مەڕ دەلەوەڕێنن ئاگر هەیـە. من چزیلکێک لەو ئاگرە دێنمو دەبن دارەکانی دەنێم. پادشا فەرمان دەرکا قالاوەکان بە باڵو پەڕ باوەشێنی بکەن. کاتێک ئاورەکە هەلایسا، هەر کوندێک بێتەدەر دەسووتیّو هەر چی وەمێنیّ لەبەر دووکەڵ دەمریّ.

بەم جۆرە کە گوتی دەست بەکار بوونو پلانیان بەڕێوە بردو تەواوی کوندەکان سـووتانو قالاوەکان بەسەرکەوتنو شادمانی گەڕانەوە شوێنی خۆیان. پادشا و لەشکر زێدە لە ئەندازە قەدرو حورمەتی ئەو قالاوەیان گرتو بەپێویستیان زانی هەتا دەکریّ خزمەتی بکەن. ئەویش دوعای خێری بۆ پادشـا کردو لەو نێوەدا بەسـەر زبانیدا هات کە: هەر ڕووداوێکی لەم چەشـنە لە بەرەکەتو مبارەکی دەوڵەتی پادشـایە. وە من نیشانەی ئەم سـەرکەوتنەم ئەو ڕۆژە دیت کە ئەو

---

١. به مارماهی مانی نه این تمام و نه آن / منـافقی چـه کنـی مـار بـاش یـا مـاهـی.

٢. چت لە پشتەوەت قایم کردووە؟

چارەڕەشـــانە پەلاماریان داینو لەو بابەتە بە ڕەوایان زانی ئیقدامێک بکەن. وە ڕۆژێک لە کاتی وتووێژدا پادشـــا لێی پرســـی کە: ئەو ماوە دووروودرێژە چۆن توانیـــت هەڵکەی؟ ئەویش دەگـــەڵ کوند کە خێرخوازان لـــە هاودەمی دەگەڵ شـــەڕخوازاندا کەم تاب دێنو پیاوی کەریمو بەخشـــندە لە دەســـت لەچەری سەهەندە هەڵدێ. گوتی: هەر وایە، بەڵام عاقڵ بۆ ڕەزامەندی سەروەری خۆی، لـــە گرفتاری خۆ ناشـــارێتەوە، وە هەر کوێرەوەرییەک بێتـــە پێش وەک یاری دڵخوازو دلبەری روو وەک مانگی شەوی چاردە، بە مەیلو ئیشتیاوە دە باوەش دەگرێ. وە خاوەنی هیممەتو ورەیبەرز بە هەر نامرادییەک ورە لە دەست نادا و نارەحتیو بەزیوی تێدا دیاری ناکا و لە هەر جێگەیەک کاری گەورەو ڕووداوی هەســـتیار ڕوویدا و لەواندا عێلو خزمو کەسو موڵکو سەرزەمین لەدەستچوون، ئەگەر لەســـەرەتادا بۆ پاشەکشە پێکردنو شکســـتی دوژمن، هێندێک دانواندن هەبێو هێندێک زیللەت قبووڵ بکرێ، چون قەرار لەسەر ئەوەیە کە لە کۆتاییدا فەتحو ســـەرکەوتن دەست کەوێ، لە لای پیاوی زانا زۆر قورسو گران نییە. کە خاوەنی ڕێبازو شەریعەت دەڵێ "مِلاکُ الْعَمَلِ خَواتِیمُهُ".[١]

ئەم تـــۆزە کە ئەمڕۆکە دەچێتـــە دەمو لووتت

ســـبحەینێ دەنێتە دەمی تۆ قەندی فتووحات[٢]

پادشـــا گوتـــی: لە عەقڵو زانایی کوندان کەمێک بـــاس بکە. گوتی: لە نێو ئەواندا هیچ زیرەکێکم نەدی، بێجگە لەو یەکەیان کە بڕیاری کوشتنی منی دەدا و ئەوانیش بیروڕای ئەویان پێ سســـتو نابەجێ بوو. وە نەسیحەتەکانی ئەویان بەگوێ نەگرت. لانـــی کەم فکریان لەوە نەکردەوە کە من لە نێو قەومی خۆمدا پێگەو پایەم هەبووەو بە خاوەنی هێندێک زیرەکیو زانایی ناوبانگم ڕۆیشـــتووەو لـــە وانەیە پیلانێک بگێڕم، نە بۆ خۆیان عەقڵیان پێی گەیشـــتو نە گوێیان دا قسەی دڵســـۆزانو نە ڕازو نهێنییەکانیان لێ شاردمەوە. وە دەڵێن: "پادشایان لە شـــاردنەوەی گەنجو خەزێنەی ڕازو نهێنیدا دەبێ زۆر وریابن، بە تایبەتی لە

---

١. پێوەندگی کردار، ئاکامو کۆتایی کارە.

٢. گردی کە همی تلخ کند کام تو امروز / فردا نهـد انـدر دهـن تـو شکـر فتح.

دۆستانی هیوابڕاوو دوژمنی نیگەران" پادشا گوتی: من وای بۆ دەچم ستەمکاریو کــزیو بڕیاری وەزیران بوو بە مایـــەی تێداچوونی کوندان. گوتی: هەر وایە کە دەفەرمووی. کەم کەس هەیە ســـەرکەوتنێک وەدەست بێنێو ملهوڕی نەکا. وە هاودەمی ژنانی زۆر پێخۆش بێو ریســـوا نەبێ. وە لە خواردندا زێدەڕۆیی بکا و نەخۆش نەکەوێ. وە گوێ بداتە وەزیری ناحاڵیو ناوریاو تووشی شکست نەبێ. وە گوتوویانە لە بادی هەواو مەغروران نابێ چاوەڕوانی مەتحو ســـەنات هەبێ. نە دەروون چەپەڵ دۆســـتی زۆری دەبـــێ. وە نە بێئەدەب پلەوپایەی گەورەی دەبێ. وە نە بەخیل چاکەی پێدەکرێو نە تەماعکار بە بێگوناهی دەمێنێتەوە. نە مڵکو مەملەکەت بە پادشای زاڵمو ملهوڕ کە وەزیرانی چەپەڵ بیروڕای هەیە، بەڕێوە دەچێ.

پادشـــا گوتی: زەحمەتێکی سەختت بەســـەر خۆتدا بار کردو بە پێچەوانەی مەیلـــی خۆت بـــۆ دوژمنت دانەواند. گوتی: هەر کەس زەحمەتێک بکێشـــێ کە قازانجێکـــی تێدا چاوەڕوان دەکا، دە پێشـــدا دەبێ ئیفـــادەی بێجێو نەنگو عـــاری بێوەخت لە خۆی دوور بکاتەوە. چون پیاوی تەواو بەو کەســـە دەڵێن کاتێک لێ بڕا کارێک ئەنجام بدا، پێش هەموو شـــتێک دەســـت لە گیان بشـــوا و بە دڵ ئامادەی ســـەردانان بێ. ئەوجار قـــەدەم دە مەیدانی مەردان بنێ. وە بە گوێی پادشـــا گەیشتووە کە مارێک ئامادەی خزمەتکردنی بۆقێک بوو، چون ئاسوودەییو حەسانەوەی لەم کارەدا دەدیت.

پادشـــا پرســـی: چون؟ گوتی: دەگێڕنـــەوە پیـــری رووی دە مارێک کردو بێهێزییەکی تەواو هەموو لەشی داگرتو لە راو کەوت. سەرگەردان بوو. سەری لـــە کاری خۆیدا ســـووڕمابوو. کە بێ بژیو ژیانی بۆ ناچێتە ســـەرو بێقەوەتو حەرەکەتیـــش راوی بۆ ناکرێ. فکری کـــردەوە کە لاوەتی ناگەڕێتەوەو ئەیکاش لانی کەم پیری پایەدار بوایە. وە لە زەمانە، چاوەڕوانی وەفابوونو بەگەڕو دەوری فەلەک هیواداربوون، هەوەسێکە کە هیچ عاقڵێک فکری خۆی پێوە خەریک ناکا. چون دە ئاودا بەدوای تۆزو خۆڵەوەبوونو لە ئاور داوای سەرماکردن، سەودایەکە کە بەرهەمی سەفرای گڕ گرتووە.

رابــردوو بەکــەس ناگەڕێتەوە. وە را و تەدبیر بــۆ داهاتوو زۆر گرینگە. وە لەجێــی لاوەتی ئەزموونێکی کــەم هەیە کە دە باقی تەمەنــدا دەوامی ژیانو مەعیشــەت بەهۆی ئەو بەرهەم دێ. وە من دەبێ زێدەخوازی لەســەر دەرکەم. بناغەی کار، لەســەر رەوتی خۆ ئازارنەدان دابمەزرێنمو لە گرفتارییەک کە دێتە سەر رێم روو وەرنەگێرم. کە ئەحواڵی دنیا لە نێو ئارامیو دژواریدا هاوبەشە.

پاش ئەو قســانە، رۆیشتە قەراغ ســەرچاوەیەک، کە بۆقی زۆر تێدابوو. وە پادشــایەکی دەستڕۆیشــتوویان هەبوو. خۆی هێنا حاڵی جاویو لە سووچێک بەســەر زەویدا پان بۆوە. بۆقێک لێی پرسی: غەمناکت دەبینم، چییە؟ گوتی: جا کەس هەیە، لە من شــایانتر بێ بۆ غەم خواردن؟ چون بەرێچوونم بە راوی بۆقەوە بەســتراوەتەوە. ئەمڕۆ تووشی نەخۆشییەک بووم کە راوم لێ حەرامەو گەیوەــە ئەو جێگەی کە ئەگەر یەکیشــیان بگرم. ناتوانــم رایبگرم. ئەو بۆقە رۆیشــتە لای پادشا و ئەو خەبەرە خۆشــەی پێدا. پادشا لە ماری پرسی کە: بە چ هۆیەک ئەم بەڵایە بەســەر تۆدا نازڵ بوو؟ گوتی: پەلاماری بۆقێکم دا و بۆم نەگیرا و خۆی دە ماڵی شــێخێک هاویشــت. من بە دوایدا رۆیشتم. ماڵەکە تاریکو کوڕی شێخ لەوێ بوو. بە قامکی کوڕەکەمەوە دا، پێم وابوو بۆقەکەیە. هەر لەو گەرماگەرمەدا ددانم تێ رۆکردو لەجێی خۆی سارد بۆوە. شێخ لە تاوی مناڵەکــەی بە دوامدا هەڵدەهاتو نفرینی دەکــردمو دەیگوت: لە پەروەردگاری خــۆم دەخــوازم زەلیلو زەبوونت بکا و ببی بە بارەبەری پادشــای بۆقان. وە ئەڵبەتە نەتوانی بۆق بگری، مەگەر ئەوەی پادشــاکەیان بە خێرو سەدەقە پێت بدا. وە ئێســتا هاتووم تا پادشا، سواری پشــتم بێو من بە حوکمی ئەزەلیو قــەزا و قەدەرو چارەنووس رازی بم. پادشــای بۆقان ئــەم رووداوەی زۆر پێ خۆش بوو. هەستی بە گەورەییو شەرەفــو باڵادەستییەک دەکرد کە بە مۆجزە رووی تێکردووە. سواری دەبوو و شانازیو فەخری بەو کارەوە دەکرد. چەندێک بەمجۆرە تێپەڕیبوو، مار گوتی: تەمەنی پادشا درێژ بێ، من بژیویو توعمەیەکم دەبێ هەبێ تا بژیمو هێزێکم دەبەردا بێو ئەم ئەرکە راپەڕێنم. پادشــا گوتی: بەڵــێ، وایە، عیلاج نییە. وە بۆ هەر رۆژێــک دوو بۆقیان بۆ دانا، دەیخواردنو

بەمجۆرە گوزەرانی دەکرد. وە بە حوکمی ئەوەی کە ئەم کارە بە قازانجی بوو، ئەم ئیشەی پێ شەرم نەبوو. وە جلوبەرگی عەیبو عاری دەبەر نەکرد.

وە ئەگـەر من سـەبرێکم کردبێ هەر ئەم میزاجەی هەبـووە. چون بوو بە مایەی تێداچوونی دوژمنو نەجاتی هۆزو گەلی خۆم. هەر وەها دەتوانین دوژمن بە نەرمیو بە مودارا زووتر تێدابەرین تا بە شـەڕو پێکدادان، وە لێرەوەیە کە گوتوویانە "عەقڵ باشـترە لە ئازایەتی". چونکە یـەک کەس هەر چەند ئازا و نەبەزیـش بێو بە تەنیایی دە کەسـان بە زەویدا دا، زۆرزۆر دەتوانێ بیسـت کـەس ببەزێنێو لەوە پتر ناتوانێ. بەڵام پیاوی زانای قووڵ دەتوانێ بە فکرێک وڵاتێک بشـێوێنێو لەشکرێکی گەورەو گرانو هەرێمێکی ئاوەدان تێکوپێک بدا و ژێـرورووی بکا. وە ئاگر بەو هەموو گڕوتینەوە کە هەیەتی، ئەگەر دە دارێک بەر بێ هەر ئەوەندەی لێ دەسووتێنێ کە لە سەر عەرزە. کەچی ئاو بەو نەرمو نیانییەوە کە هەیەتی، گەورەترین دار لە رەگو ریشـەوە هەڵدەکەنێ. کە ئیدی سەرهەڵنەداتەوە.

چوار شت هەن کە بچووکەو کەمەکەیان دەبێ بە زۆر بزانێ؛ ئاگرو نەخۆشیو دوژمـنو قەرز. وە ئـەم کارە بە پتەویو دروسـتی را و بۆچوونی پادشـا و شـکۆمەندیو بەختەوەری دەوڵەتـی ئەو بە ئەنجام گەیشـت. وە گوتوویانە: "ئەگەر دوو کەس بیانەوێ کارێکی گرینگ راپەڕێنن. ئەوەیان سـەر دەکەوێ کە گەورەیـی پیاوەتیو جوامێری تێـدا هەیە. وە ئەگەر تا ئێرە بەرانبەر هاتنەوە، ئەوەی بەورەترە، دەیباتەوە؛ ئەگەر دیسان وەک یەک دەرچوون، سەرکەوتن بۆ ئەو کەسەیە کە دۆستو یارو یارمەتیدەری زۆر بێ. وە ئەگەر لەوەشدا یەکسان هاتنەوە، ئەوەیان دەیباتەوە کە بەختی بڵندو بە هێزی هەیە".

وە زانایـان گوتوویانـە: "هەر کەس دەگەڵ پادشـایەک کە سەرخۆشـی سـەرکەوتن، تووشـی هەڵەی نەکردبێو لە ترسو خۆفی هەڵاتن ئاسوودە بێ، دوژمنایەتی بکا، مەرگی بۆ خۆی کڕیوەو ژیانی دەگەڵ ترسو دڵەراوکێ بەڕێوە بردووە، بەتایبەت پادشـایەک کە وردەکارییەکانـی رووداوی گەورەو گرانی لێ شاراوە نییە. وە جێگەی نەرمیو تووڕەییو قینو رەزامەندیو پەلەو پشوودرێژی

لێ تێک نەچێ، وە مەسەڵەحەتی ئەمڕۆ و سبەی. وە لە سەرەتای کاراندا بیر لە ئاکامو بەرهەمەکان دەکاتەوەو کار ئاسانی پێویست ئەنجام دەدا و هیچ کات لایەنی سەبرو دڵدانەوە لە بیر ناکا و یاسای ترسو سیاسەت بە کەم ناگرێ. وە ئەمڕۆ هیچ پادشایەک دەگرتنو داگیرکردنی وڵاتانو پاراستنی مەسلەکو ڕێبازاندا ئەو دەسەڵاتەیان نییە کە ئیرادەو وریایی پادشا هەیەتی. وە دە بارهێنانی خزمەتکارانو ڕاکێشکردنی سەرنجو ڕەزامەندی خەڵکاندا، ئەو هەموو لوتفو سۆزەو چاکەکردنە ناکرێ کە پادشا بە تەدبیرو تەڵقینی دەولەتو ڕێنوێنی بەختەوەری ئەنجامی دەدا. وە بۆ نموونە نەفسی عەزیزی خۆی بۆ بەندەکانی فیدا دەکا.

پادشا گوتی: ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەو تێداچوونی دوژمنان لە سایەی تەدبیرو ڕای تۆو ڕێنوێنیو دڵسۆزی تۆوە هاتە دەست. وە دە هەر کارێکدا کە باوەڕم بە چالاکیو تێکۆشانی تۆ کردووە، بەرهەمو ئاسەوارەکەی بەم شێوەیە خۆی دەرخستووە. وە هەر کەس هەوساری کاران بە وەزیری دڵسۆز بسپێرێ. هەرگیز دەستی تێشکان ناگاتە داوێنی بەختو یەغباڵیو پێی کارەسات بە هەرێمی بەختەوەری ئەودا تێناپەڕێ. سەمەرەتر ئەوە بوو کە تۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە ماڵی دوژمن مایەوەو قسەیەکت نەکرد کە ئیرادت لێ بگرنو ببێتە هۆی نفرەتو شکو گومان. گوتی: لە هەموو کارێکدا ڕەوشتی جوانو عادەتی پادشا سەرمەشقم بووە. لە قەدەر تێگەیشتنی خۆم لە خەسڵەتە بەرزەکانی ئەو کەڵکم وەرگرتووە. وە کارە گرینگەکانی پادشام لە هەموو ڕەهەندێکدا ڕەچاو کردووە. وە گەیشتن بە ئامانجو سەرکەوتنی داخوازەکان لە سایەی پەیڕەویکردنی ئاکارو کاری پادشا وەدەست هاتووە. چون پادشا لە سایەی حەمدی خوداوە ڕەسەنایەتیو تەدبیری ئەنگێوەو هەیبەتو شانو شکۆی شاهانەی تێدا کۆ بۆتەوە.

پادشا گوتی: لە نێو خزمەتکارانی درگادا تۆم واهاتە بەرچاو کە لوتفی گوتارت دەگەڵ جوانی کردار بەرانبەرو ئاوێتە بوون. وە لە تواناتدا بوو، بە ئیرادەی بەهێزو لێهاتوویی خۆت ئەم کارە گرینگە ڕاپەڕێنی تا خودای مەزن بە

بەرەکەتی کارزانیو مبارەکی ئیرادەی تۆ ئەو سەرکەوتنەی بەنسیب کردین؛ کە بۆ من غەمێکی گەورە بوو، نە شیرینی تەعامو شەرابی تێدابوو، نە لەززەتی ئارامی خەو. چون هەر کەس دەگەڵ دوژمنی سەرکەوتووی قەهار تێکەوت تا زەمانێک کە لە دەستی رزگار نەبووە، شەو لە رۆژو سەر لە پاو، کەوش لە مەندیل، لێک ناکاتەوە! وە زانایان دەڵێن "نەخۆش تا لە نەخۆشی چاک نەبێتەوە، تام لە خواردن ناکا و بارەبەر تا باری گران دانەنێ ناحەسێتەوە. گەلیش، هەزار ساڵ تا لە لای دوژمنی دەستدرێژکەر ئەمین نەبێ ئاگری سینەی دانامرکێ". ئێستا بۆم بگێڕەوە، ئەخلاقو رەوشتی پادشای ئەوانت لە بەزمو رەزمدا چۆن هاتە بەر چاو.

گوتی: بناغەی کاری ئەوم لەسەر خۆبەزلزانیو بە خۆفشینو سەرمەستی بێجێ، هاتە بەر نەزەر، بەو حاڵەشەوە سستیو داماوی پێوە دیار بوو و لە بەهرەی را و بۆچوونی راست بێبەشو لە سەرەتی فکری باشو بەخێر بێنسیب. وە هەموو لایەنگرو پێرەوەکانی لەم دەستە بوون. تەنیا ئەوەیان نەبێ کە رای لەسەر کوشتنی من بوو. پادشا پرسی: کام خەسڵەتی ئەو یەکەیانت بە گرینگ هاتە بەرچاو کە نیشانەی عەقڵو زانینی ئەو بوو؟ گوتی: یەکەم، فتوای کوشتنی من. یەکی دیکەش ئەوە بوو کە هیچ نسحەتێکی لە پادشای خۆی درێغ نەدەکرد. هەر چەند دەیزانی کە پادشا پەسندی ناکا و کار دەکێشێتە رووگرژیو ناخۆشی نێوانیان. وە لەو باسەدا رێورەسمی فەرمانبەری رادەگرتو گەردنکەشیو دەمەقاڵەی نەدەکرد. وە قسەی بە نەرمو نیانیو حەکایەتی بەرێو جێ دەگوت. وە لایەنی رێزلێنانو کرنۆشی بە تەواوی دە بەرچاو دەگرت. وە ئەگەر دە کارەکانی پادشادا هەڵەو خەتایەکی دیتبایە بە زبانێک پێی دەگوت کە درگای توورەیی بە سەریدا نەکراباوە. چون هەمووی دە قالبی پەندو مەتەڵو نەزیلەدا دەگوت. وە عەیبەکانی دیترانی لە کاتی حەکایەتکردندا دەستنیشان دەکردو خۆی هەڵەکانی خۆی، وێڕای ئەوانی دیکە باس دەکردو بەهانەیەکی بەدەستەوە نەدەدا کە ئەوی پێ تەمێ بکەن. رۆژێک گوێم پێوە بوو کە بە پادشای گوت: دنیاداری پێگەیەکی بەرزو دەرەجەیەکی عالی هەیە. وە بە

تێکۆشانو ئارەزوو کەس پێی ناگا. وە بێجگە لە ڕووداوی باشو یارمەتی بەخت، بە دەست نایە. وە زەمانێک پێی گەیشتی دەبێ لە لات عەزیز بێو دە ڕاگرتنو پاراستنیدا زەحمەت بە خۆت بدەی. وە ئێستا وا باشترە کە دەکاراندا غەفڵەتو کەترەخەمـــی کەم بکرێتەوە. وە کارە گرینگەکان بە کەم بەراورد نەکرێن. چون لە سەر پێ مانەوەی موڵکو ڕاوەستاوی دەوڵەت بە بێ وریایی تەواوو دادگەری داگرو ڕای دروســـتو شمشێری تیژ مومکین نابێ، بەڵام گوێیان نەدا قسەکانیو دڵســـۆزیو ڕێنوێنییەکانی قبووڵ نەکرا. بەرهەمەکەشـــی ئەوە بوو کاروباریان بە چەپو ڕاســـتدا شـــێوا. نە لە عەقڵو تێبینییەکانی ئەو فایدەیەک بە کەس گەیشتو نە ئەویش بەو هەموو عەقڵو زانایی خۆیەوە لەو بەڵایە ڕزگاری هات.

ئەوەیە داستانی دوورەپەرێزبوون لە مەکرو فێڵو فەرەجی دوژمن، هەر چەند کە خۆ بە لێقەوماویو زەلیلی نیشان بدا. کە قالاوێکی ڕیوەڵەو تەنیا، بە هەموو کزیو لەجەری خۆیەوە، توانی دوژمنی بەهێزو بە توانا بەم شێوەیە تێکەوپێچێو لە ناویان بەرێ. ئەوە هەمووی دەگەڕێتەوە ســـەر نەفامیو کەم ئاوەزی ئەوان. ئەگینا هەرگیز بەو مەبەستو مرادە نەدەگەیشتو ئەو سەرکەوتنەی بە خەونیش نەدەبینی. پیـــاوی زانا دەبێ بە چاوی پەند وەرگرتـــنو بە خۆداچوونەوە لەم باسو خواســـانە وردبێتەوەو بە گوێی عەقڵ ببیســـێو حەقیقەت بناسێو بزانێ کە نابێ باوەڕ بە دوژمن بکا. وە دوژمن، با کزیش دیاری بکا، بەکەم نەگرێ.

وە بەدەســـت هێنانی دۆســـتی بژاردەو شایســـتە، دەبێ بە سوودمەندترین بازرگانیو پڕبەهاترین زەخیرە دابندرێ. وە ئەگەر بۆ کەســـێک ئەم دوو لایەنە دابین بکرێ کە هەم دۆستانو لایەنگران ڕازی ڕابگرێو هەم لە دوژمنانی غەددارو دڕبەرانی مـــەککار بتوانێ ئەمین بێ، دەگاتە ترۆپکی مرادو ئاخرین ســـنووری بەختەوەری لە هەر دوو دنیادا.

وَاللهُ وَلِیّ التَوْفیق لِما یُرْضیهِ



# مەیموونو رەقە ـ حەکایەتی سەرەکی

رای گوتی: داســتانی خۆ پاراستن لە پیلانو ئاژاوەگێری دوژمنی پڕفرۆفێڵم بیســت. ئێستا داستانی کەســێکمان بۆ بگێڕەوە کە بۆ وەدەستهێنانی شتێک زەحمەت دەکێشێو پاش گەیشتن بەو شتە، قەدری نازانێ تا ئەوەی لە دەستی دەردەچێ.

بەرەهمەن گوتی: وەدەســتهێنان ئاسانترە لە راگرتنو ئاگالێبوون. چون زۆر شــتی بەهادار بە یارمەتــی رووداوی باشو مــەدەدی رۆژگار، بێ ماندووبوون وەدەســت دەکەون. بەڵام راگرتنیان بێجگە لە را و تەدبیری ئەنگێوەر، بە هیچ شــتێکی دیکە مەیســەر نابێ. وە هەر کەس لە گۆڕەپانــی عەقڵدا پیادە بێو جلوبەرگی دووربینیو وریابوونی لەبەردا نەبێ، ئەوەی بە دەســتی هێناوە زۆر زوو بڵاو دەبێو لە دەســتیدا تەنیا نەدامەتو حەسرەت دەمێنێتەوە. وەک چۆن رەقە بێزەحمەتی زۆر مەیموونی دە داو خستو بە نەزانی بە بای فەنایدا دا.

رای پرسی چۆن؟ گوتی: لە دوورگەیەکدا مەیموون زۆربوون کە پادشایەکیان بە ناوی "کارداناە" هەبوو، خاوەنشکۆ، بەهەیبەت، وە سیاسەتی تەواوو فەرمانی رۆیشــتوو و دادگەری داگری هەموو وڵات، کاتێک دەورانی جەوانی کە بەهاری عومرەو فەسڵی خۆشــگوزەرانی، تێپەڕی سستیو داتەپیوی دەورانی پیری لە هەموو لایەکەوە ســەری هەڵدا و بوو بە هۆی نەمانی توانایی لەشو کەمحوکمی چاو...

خۆزگــە لاوی گەرابایــەوە ڕۆژێــک
بیزانیبــا چی دەگــەڵ کــردووی پیری
ئــەو دەروونەی وەک گڕکانــی ئاگر بوو
ئێســتە ســاردو ســڕە وەک زمهەریری
ئەو ماســوولکانەی وەک پۆڵا پتەوبوون
ئێســتە نەرمو شــلن هەر وەک هەویری
گوێ نابیسێ، چاو کەمحوکمە، پێ سستە
دە ژووریـــدا پـــان بوویـــە بـــە پیـــری

وە عادەتی زەمانە خۆی هەر ئەوەیە کە تەڕو پاراوی جەوانی بە هەڵپرووکاویو سیســی پیری دەگۆڕێتەوەو زەبوونی دەروێشــیو نەداری بە ســەر شــکۆی دەوڵەمەندیدا دەسەڵاتدار دەکا.

گێژەڵووکەی بە ســامو تونــدی خەزان
کــە پەلامــاری بــردە بــاغو ڕەزان
دەشــکێنێ نەمامــی شــلکو تــەڕ
گوڵــی بۆنخــۆشو گــەش دەکا پەڕپەڕ
ئــەو گوڵــەی باغــی پــێ دەرازاوە
داخەکــەم ئێســتە هەڵپــرووکاوە[1]

زەمانە خۆی دە خشــڵو زیوەری بووکاندا نیشــانی جیهانیان دەدا، جوانی ڕواڵەتــی کردۆتــە یارمەتیدەری غروورو خۆهەڵمســاندنی نەفامانو خســتنە بەرچاوی شتی بێقیمەتو ناعسڵ دەکاتە هۆی فریوخواردنو تەماعو خۆکوتانی بە تەماعان. تا هەموو دەکەونە داوی بەڵاو پەتای ئەو و دەبنەدیلی هەوا و مرادو مەنزووری ئەو. لە نگریســی دەروونو مەکری سروشتی ئەو غافڵو لە پەستیو نزمی میزاجو تەبعیو لەرزۆکیو رووخەکی پەیمانو بەڵێنی ئەو بێخەبەرن.

مەبەســتە دڵ بــە دنیــا بێوەفایــە
هەمــوو ئــاکارو کــــاری ناڕەوایــە

---

١. هێمن.

لە بێســتوونی بپرســن بەزمــی فەرهاد
هەتــا پێتــان بڵــێ ئــەو ماجەرایــە
کە هەر کەس عەشقی دنیای لە سەر بێ
لــە خــۆڕا مانــدووە رەنجــی بــە بایە

وە پیاوی تێگەیشتوو، روو دەو باسانە ناکا و دڵی نادا بە پلەوپایەیەک کە دەوامی نییەو زوو فەشەل دەبێ. وە روو دەکاتە کەسبی خێراتی دنیای باقی. چونکــە، پلەوپایەو عومری دنیا ناپایەدارە. وە ئەگەر ماڵێکیش کۆ بکرێتەوە، لەســەر لێوی گوڕ دەبێ بەجێێ بێلێ. تا سەگانی ددان تیژکردوو، تێی بەربن کە "میراتی حەڵاڵە".

بەڵێ وردەوردە، باســی پیریو کەنەفتی "کاردانا" بڵاو بۆوە. ترس لە پادشــا و هەیبەتی ئەو لە کەمی دا. لە خزمەکانی لاوێکی تازە پێگەیشتوو پەیدابــوو کە شــوێنەواری بەختەوەری لــە نێوچاوانیدا خــۆی دەنواندو نیشــانەی دەوڵەتو ئیقباڵ دە هەڵسوکەوتیدا دیار بوو. وە شایستەبوونی بۆ پادشــایەتیو دنیاداری ئاشکرا بوو. لە سەر پێی خۆ و سەربەخۆ بوو، کردنەوەی درگای سیاسەتو ئامادەکردنی پێڕاگەیشتنی وڵات بۆ ئەو دیاری کرابوو.

وە بە وردەکاری پیلانو حیلە دڵی لەشــکری وەدەســت هێنا و دڵدانەوەو میهرەبانی دەگەڵ رەعیەت دەست پێکرد، تا دۆستی ئەو لە دڵاندا جێی خۆی کردەوەو دڵی هەمووان بــۆ پێرەوی لە ئەمرو فەرمانی ئەو ئامادە بوو. پیری کەنەفتیان لەسەر کار لابردو هەوساری دەسەڵاتیان دا بە دەستی ئەو. بێچارە پادشای پێشوو، بە زۆرەملی دەبوایە دوور کەوێتەوەو بڕوا. جلو پەلاسی بردە قەراغ دەریا، کە دارســتانێکی چڕی، پڕ میوەی لێبوو. لەوێ دار هەنجیرێکی هەڵبژارد کە لقو پۆپی کێشابووە سەر ئاو. بە میوەی ئەم دارە خۆی بەڕێوە دەبردو قانیع بوو. بە تۆبەکاریو پەشــیمانیو دوعا و پاڕانەوە تۆشــەی ئەو دنیای کۆ دەکردەوەو ســەرمایەو سامانی رۆژی پەسلاێنی بە نوێژو عیبادەت ئامادە دەکرد.

بـــارو بارگەت تێک بنێ تۆشـــە دەگەڵ خۆت هەڵگرە
فکـــری دواڕۆژت ببـــێ، ئـــەم دەشـــتە دووڕو قاقڕە[1]

وە لە ژێر ئەم دارەدا رەقەیەک نیشـــتەجێ بوو و لەبەر سێبەری دەحەساوە. ڕۆژێـــک مەیموون خەریکی هەنجیـــر رنین بوو، دەنکێک دە ئاو کەوت. گوێی لە دەنگی تێکەوتنەکە بوو. کەیفی ســـاز بوو و خۆشحاڵییەک کەوتە دڵو گیانیو هەر ســـەعاتەی بە هەوەسی ئەم خۆشـــحاڵییە دەنکێکی دیکەشی بەردەداوەو حەزی لـــەو کارە دەکرد. رەقە دەیخواردو وای دەزانـــی ئەم هەنجیرانە بۆ ئەو داوێتە خوارو ئەو میهرەبانیو دڵجۆییە بۆ ئەو بەپێویست دەزانێ. فکری کردەوە، هەیاران بە بێ وەی ئاشنایيو ناسیاویمان پێکەوە هەبێ ئەو پیاوەتییەم دەگەڵ دەکا، ئەگـــەر ئەوجار پێکەوە ئاشـــنا بین، بێگومان زۆرتـــر رێزم لێ دەگرێو چاکەم دەگـــەڵ دەکا. وە وەها زەخیرەیەکی گرانبایـــیو نیعمەتێکی گەورە لە هاودەمی ئەو بەدەســـت دێ. بانگی مەیموونی کردو خۆی پێ ناســـاند. جوابی خۆشـــی بیستەوەو خۆشـــحاڵییەکی تەواوی دیتو هەر یەک لەوان، مەیلیان بۆ لای یەکتر چوو، بە جۆرێک کە وەک گیانێک بوون لە دوو جەستەدا و دڵێک لە دوو سینەدا. بەم دۆســـتایەتییە ترسو غەمی غەریبی لە دڵی مەیموون رەوییو رەقەش بە خۆشەویستی ئەو پشتی قایم بوو. هەمو ڕۆژێک دۆستایەتییان زۆرتر پەرەی دەگرتو لێک نزیکبوونەوەیان قایمتر دەبوو. وە زەمانێک بە سەر ئەوەدا تێپـــەڕی. چون دووریو لە ماڵ نەبوونی رەقە درێژەی کێشـــا، هاوســـەرەکەی تووشـــی پەرێشـــانی بوو. غەمو حیرەتو پەژارەو دڵتەنگی رووی تێکردو حاڵی دەگەڵ دۆستێک باس کرد. جوابی داوە: ئەگەر دوایە تۆمەتبارم نەکەی، خەبەری حاڵو ئەحواڵی ئەوت بۆ دێنمەوە. گوتی: ئەی ڕۆ بابانێکمە خوشکێ! لە قسەی تۆدا چ شـــکو بەدگومانییەک دەتوانێ هەبێو لە فەرمایشتی تۆدا چون دەکرێ تۆمەت لێ بدرێ؟ گوتی: ئەو دەگەڵ مەیموونێک دۆستایەتییەکی گەرمی دەست پێکردووەو دڵو گیانی داوە بە هاودەمی ئەو. دۆســـتایەتی ئەوی لە پێکەیشتنی تۆ بەلاوە خۆشـــترەو ئاگری دووری تۆ بە ئاوی نزیکاتی لەو دادەمرکێنێ. غەم

---

١. بار مایه گزین که برگذرد / این همه بارنامه روزی چند.

خواردن بێسوودە. تەدبیرێک بکە کە مایەی ئاسوودەیی بێ. دوایە هەر دووکیان بیرورایان خستە سەر یەک. هیچ پلانو تەدبیرێک باشتر لەوە نەبوو کە مەیموون بکوژرێ. وە هاوسەری رەقە بە ئیشارەی دەستەخوشکی، خۆی نەخۆش خستو لە مێردەکەی پاڕاوەو باسی نەخۆشییەکەی پێ راگەیاند.

رەقـــە ئیجازەی لە مەیموون وەرگرت ســـەرێک لە ماڵو منـــاڵ بداتەوە. کە گەیشـــتەوە ژن نەخۆش بوو. دەستی کرد بە دڵدانەوەو لاواندنەوەو زبانلووسیو چاپلووســـی گەیاندە ئەوپەڕی خۆی. ئەڵبەتە ژن، ئیلتیفاتێکی نەکردو بە هیچ جۆر لێوی هەڵنەپچڕی. لە دەستەخوشکی پرسی: هۆی نارەحتیو قسەنەکردن چییە؟ گوتی: نەخۆشێک کە لە دەرمان ناهومێدو لە چاکبوونە بێهیوا بێ. دڵی چۆن ئیزنی قســـەکردنی پێ دەدا؟ مێرد کە ئەوەی بیست، دادو هاواری دەست پێکردو بە ســـەرو ئەژنۆی خۆیدا دا کە: ئـــەوە چ دەرمانێکە کە لەم وڵاتە گیر ناکەوێو بە حەولو تەقەلا، دەستی پێ راناگا. زوو پێم بڵێن تا وەدوای کەومو دوورو نزیک بخولێمەوە ئەگەر گیانو لەشـــم بـــدەم درێغی ناکەم. جوابی داوە: ئەوە دەردی رەحەمەو دەرمانکردنی کاری ژنانە. وە هیچ دەرمانێکی نییە بێجگە لە دڵی مەیموون. رەقە کوتی: لە کوێ دەســـت دەکەوێ؟ جوابی داوە. راســـتە دەســـت ناکەوێو تۆمان بۆ ئەوە بانگ کردەوە تا دواجار چاوت بە هاوســـەرت بکـــەوێو دیدار بە قیامەت نەبی. دەنا ئەم بێچارەیـــە نە هیوای کەمبوونەوەی ئێـــشو ئازاری خۆی هەیەو نە چاوەڕوانی ئەوەی چاک بێتەوە. رەقە لە ئەندازە بـــەدەر نارەحەتو خەمگین بوو. وە هەر چەند فکری لە رێگە چارەیەک کردەوە هیچی دەست نەکەوت. تەماعی دە دۆستەکەی خۆی کردو بەخۆی گوت: ئەگەر خەیانەت بکەمو دۆســـتایەتیو رابردووی پڕ لە یەکدڵیو برایەتی نادیدە بگرم لە پیاوەتـــی بێبەش دەبم. وە ئەگەر لەســـەر عەهدو پەیمان پێ دابگرمو خۆم لە غەدرو خەیانەت بپارێزم، ژنەکەم کە کۆڵەکەی دینو ئاوەدانی ماڵو ســـڵامەتی جەستەیە، دە تەندووراوی مەترسیدا دەمێنێتەوە. لەم تەرزە فکرانەی دەکردەوەو سەعاتێک لە دڕدۆنگیو دوودڵیدا مایەوە، سەرەنجام خۆشەویستی ژن غاڵب بوو و بریاریدا دەرمان پەیدا بکا، کە شاهێنی تەرازووی وەفا بەردەکەی سووک بوو.

بـــەم بڕیارەوە گــەڕاوە لای مەیمـــوون. چاوەڕوانیو تامەزرۆیـــی مەیموون گەیشـــتبووە ئەوپەڕی خـــۆی، لەوانە بوو چاوی پێی بکـــەوێو لێی توورە بێ [کـــە بـــۆ هێندەی پێ چوو]، بەڵام کە چاوی لێ کـــرد هێندێک هێور بۆوەو بە گەرمی ئەحواڵی خۆیو باسی ماڵو منداڵەکەی لێ پرسی. ڕەقە جوابی داوە کە دەردی دووری لە تۆ وەهام بەســـەردا زاڵ ببوو، کە پێککەیشتنەوەم دەگەڵیان خۆشـــییەکی وای پێ نەدام. وە لە تەنیایی تۆ و لێک هەڵبڕانی نێوانمان، هەر کات بیرم لە خزمو قەومان دەکردەوە، عەیشـــم لێ دەشـــێوا و عومرم لێ تاڵ دەبوو. وە ئێســـتا چاوەڕوانـــم چاکەیەکم دەگەڵ بکەیو مـــاڵو منداڵی من بە دیداری خۆت شـــاد بکەی تا جێگەو پێگەی دۆستایەتی من دە خزمەت تۆدا بۆ هەموان روون بێتەوە. وە ئەقرەبا و دەســـتو پێوەندەکانم فەخرو شـــانازی بە خۆیـــان بکەن. وە بە تەعام میوانداریـــت بکەن، بەڵکوو هێندێک جوابی چاکەو پیاوەتی تۆ بدرێتەوە.

مەیمـــوون گوتی: ئامـــان نەکەی دڵی خۆت بەم شـــتانە نیگـــەران بکەیو دۆستایەتیو برایەتی من دەگەڵ خۆت بە گەورەیی من دابنێی، کە شانازی من بە پیاوەتی تۆ زۆرترەو نیازو حەوجەشم بە دۆستایەتی تۆ زیادترە. چونکە من لە عەشیرەتو وڵاتو دەستو پێوەندو ماڵو منداڵ هەڵبڕاوم. وە موڵکو دەسەڵاتم، نە بەویستی خۆم، بەجێهێشتووە. هەر چەند موڵکی بێدەردەسەری خۆشحاڵی لە ســـایەی حەمدی خوداوە، بەردەوامترەو دۆستایەتیو پێکەوە ژیانی بێقڕەو هەرا شـــیرینترە. وە ئەگەر پێشـــتر لەوە، شنەی ئەم ئاســـوودەییە گەیشتبایە لووتمو حەزو خۆشی بێخەیاڵیو قەناعەتم هەست پێ بکردایە، هەرگیزاوهەرگیز خۆم بەو دەســـەڵاتداریو مەملەکەتەوە کە بێجگە لە دەردەســـەری هیچی تێدا بەستە نییە، دەرگیر نەدەکردو تووشی ئەم حیرەتو سەرسامییەش نەدەبووم.

گۆشـــەگیریو قەناعـــەت دوو نیعمەتن خودایی
ســـامانو ماڵی دنیا، مایەی شـــەڕو جودایی[1]

وە بەم حاڵەشـــەوە، ئەگەر خودای تەعالا، بە دۆســـتایەتیو هاودەمی تۆ،

---

١. کسی که عزّتِ عزلت نیافت هیچ نیافت / کسی که روی قناعت ندید هیچ نـدید.

منەتی لەســەر دانەنابامو نیعمەتی دۆســتایەتی تۆی لەم تەنیاییەدا پێ کەرەم نەکردبایەم، کێ منی لە چەنگاڵی دەردی غەریبیو دوور وڵاتی دەردێنا؟ کە وابوو بەم هەموو کەرەمەی تۆ کە باسم کرد، هەقی تۆ زیاترەو لوتفی تۆ زۆرترەو ئەم تەعاروفـو رووەدربایســتییە پێویست نییە. کە دە نێو پیاواندا سەفای عەقیدە گرینگەو هەر چی لەوی تێپەڕێ وەزنێکی نییە. چونکە هەموو جۆرە گیاندارێک دەگەڵ هاونشــینی خۆیان لە خواردنو خواردنەوەدا رێک دەکەونو دەگەڵ یەک دادەنیشـــن. وە کاتێک لە خواردن تەواو بوون دەگەڵ یەک ئاسوودە دەژین وە دیسان دۆستان ئەگەرچی "بُعْدالْمَشرقین" لێک دوور بن، ئارامی دەروونیان، مەگەر بەیادی دۆستان، دەست ناکەوێو راحەتی ئەوان بێجگە لە خەیاڵی یەکتردا بوون مومکین نابێ، بە خەیاڵ پێک دەگەنەوەو بەو هومێدەوە خەو دەیانباتەوە.

وە هاتوچـووی دزان بـۆ ماڵان لەبەر دۆســتایەتیو نزیکایەتی نییە. بەڵام بۆ مەبەســتێک ئەو هەموو زەحمەتە وەبەر خۆیان دەنێنو کاتو ناکات خۆیان تووشــی گرفتاری دەکەن. وە ئەگەر دۆســتان چێوبازی بکەن، ئەگەر دۆستان پێــی رازی نەبوون نابێ بە دوژمنایەتی لە قەڵەم بدرێ. بەڵام چون قازانجێکی تێــدا نابینن خۆی لێ دەبوێــرن. ئەگەر بمەوێ بێمە زیارەتــی ئەهلو عەیالی تۆ و بۆ ئەم مەبەســتە دەســت بە کار بم، ئەوە بزانە کــە پەڕینەوەی من لە دەریا مومکین نییە. رەقە گوتی: ســواری پشتی خۆمت دەکەمو دەتپەڕێنمەوە ئەوبەری دوورگە. کە لەوێ هەم ئەمنو ئاسایش هەیەو هەم نیعمەتو بەرەکەت.

هەر وا تێی راخوڕی تا مەیموون رام بوو و هەوســاری خۆی دا دەســتی رەقە. کاتێک گەیشــتە ناوەراســتی ئاو، فکری کردەوەو ناجوامێریو ناحەزی ئەوەی لە مێشــکیدا مرووری کردەوەو بە خۆی گوت: غەدرو بێوەفایی تەنیا شــتێکە کــە زانایان خۆیان لێ پاراســتووە، بە تایبەتی دەرهەق بە دۆســتان، ئەویش لەبــەر ژنان کە نە عەهدو پەیمانیان دروســتەو نە مــروەتو وەفایان بۆ کەس هەیە. وە گوتوویانە "کە ناســینی عەیاری تەواو لە زێڕدا بە هۆی ئاگر دەســت دەدا، وە تــوانو تاقەتی بارەبــەر لە رووی ئەو بارەگرانــەی کە هەڵیدەگرێ، دەناسرێ، پیاوەتیو ئەمانەتداری پیاوانیش لە سەودا و موعاملەدا دەردەکەوێ،

بـــەڵام زانســـت، هەرگیزاوهەرگیز ناگاتە ئەو ئەندازەی کە بەســـەر کاری ژنانو کەمشەرتیو مەکرو فێڵیاندا زاڵ بێ".

راوەســـتا و لە دڵی خۆیدا لەم چەشـــنە فکرانەی دەکردەوەو دەگەڵ خۆی شـــەڕی دەکردو نیشانەی شکو دوودڵی تێدا دیاربوو. مەیموون شکی لێ پەیدا بوو، پرسی: دەفکری چی دای؟ مەگەر هەڵگرتنی من زۆرت بۆ گرانەو ماندووی کـــردووی؟ رەقە گوتی: لەبەر چـــی وا دەفەرمووییو بە چ دەلیل؟ گوتی: دیارە دەگەڵ خۆت شەڕت هەیە، لە رۆیشتنترا دیارە تووشی دڕدۆنگی هاتووی. رەقە گوتی: راست دەفەرمووی. من لەو فکرەدام، کە رۆژی یەکەمە تۆ ئەو زەحمەتە وەبەر خۆت دەنێی، وە من خێزانم نەخۆشـــەو رەنگە نەتوانێ باش هەڵسووڕێو ئەو جۆرەی پێویســـتە نەتوانین پەزیراییو میوانداری بەرێزت بکەین. مەیموون گوتـــی: چون بیرو بڕوای تۆ ناســـراوەو پێت خۆشـــە رەزامەندیو خۆشـــحاڵی مـــن ببینی، ئەگـــەر تەعاروفـو خۆ زەحمەتدان وەلا بنێی، زۆر باشـــتر دەبێ. بڕواپێکراوی لەم بەســـتێنانەدا لە رووی خوێندنەوەی دەروونو دەربڕینی بیروڕا ئاشکرا دەبێ. وە ئەوەی من لەمەڕ نیازپاکیو دۆستایەتیو باوەڕی تۆ دەیزانم، لەولای ئەو قســـانەیە کە خۆت تووشـــی زەحمەتی ئـــاگاداریو پەزیرایی لە من بکەی. دڵی خۆت بەوانەوە تەنگ مەکەو با بڕۆین.

رەقە هێندێکی دیکە رۆیشـــت. دووبارە راوەستا و ئەو فکرانەی تازەکردەوە. بەدگومانی مەیموون زیادی کردو بە خۆی گوت: ئەگەر پیاو شـــکی کەوتە سەر دۆستێک، وا باشە پەنا بۆ وریاییو ئاگاداری بەرێو دەوروبەری خۆی بخاتە ژێر چاوەدێرییو بە نەرمیو مودارا بجووڵێتەوە. ئەگەر شـــکو گومانەکەی راست بێ لە نامەردیو خەیانەتی دۆســـتەکەی رزگار دەبێو ئەگەر شکو دڕدۆنگییەکەی لەخۆڕایی بووە، دەبێتـــە دە بەرچاوگرتنی وریاییو ئیحتیات کە کارێکی عەیب نییـــەو زیانێکی تێدا بەدی ناکرێ. وە دڵ لەبەر ئەوە پێی دەڵێن "قەلب" چون جێگەی ئالوگۆڕی زۆرە "انقلاب" کەس تێی ناگا، لەوانەیە هەر ســـەعات مەیلی لە شەڕ بێ یا لە خێر.

ئەوجار لێی پرســـی: هۆی چییە کـــە وا زووزوو، دەکەویە غایلەو فکرانو لە

بەحری سەرلێشێواویدا قرِنەگۆمە دەکەی؟ گوتی: هەر وایە. نەخۆشیو ناساغی ژنەکەم پەرێشـانی کـردووم: مەیموون گوتی: لـە رووی یەکدڵییەوە منت لەم دڵنیگەرانییە ئاگادار کردەوە. ئێسـتا دەبێ بزانین نەخۆشـییەکەی چییەو بۆ مالیجەکردنی دەبێ چ بکەین، چارەکردنی بەو بیروهۆشـەوە کە تۆ هەتە، نابێ دژواربـێ. رەقە گوتی: تەبیبان دەرمانێکیان بـۆ دیاری کردووە کە پەیدانابێ. پرسی: ئەوە چ دەرمانێکە؟ گوتی: دڵی مەیموون!

لەو نێو ئاوەدا بەرچاوی تاریک بوو. دووکەڵێک لە مێشکی بڵند بوو. بەخۆی گوت: چڵێسیو نەوسنی منی خستە ئەم گێژاوەو غەڵەبەی شەهوەتو زاڵبوونی تەماع بەسـەرمدا تووشی ئەم تەندووراوەیان کردم. وە من یەکەم کەس نیم کە بەم شـێوەیە فریو دراوەو قسـەی دووڕوویانی لە دڵـی خۆیدا جێ کردۆتەوەو تیری بەڵای لە چلەی کەوانی جەهلو نەفامی وە دڵ کەوتووەو ئێستا بێجگە لە مەکرو حیلەت هیچم بۆ نەماوەتەوە. ئەگەر بکەومە ئەو دوورگەیەو ئەگەر دڵمیان تەسلیم نەکەم لە برسان دەمرمو لەوێ ئەسیر دەبم. وە ئەگەر بمەوێ دەرباز بمو خۆم دەو ئاوە باوێم بە هیلاک دەچمو خەساری دنیا و قیامەت تووشم دەبێ.

ئەوجار بە رەقەی گوت: رێگەی دەرمانی ئەو خانمە مەسـتوورەیەم دیتەوە. زۆر ئاسـانە. وە زانایـان دەڵێن: "کارێکی باش نییە کە یەکێک لە شـێخان، ئەوەی بـۆ کاری خێرو زەخیرەکردنی چاکە لێیان بـوێ، نەیدا و بیگێڕێتەوە. یا لە پادشـایانی رۆژگار شـتێک بۆ خێرو مەسـڵەحەتی خاسو عام بخوازنو درێغی بکەن. یا دەگەڵ دۆسـتان، ئەوەی دەبێتە هۆی ئاسوودەییو حەسانەوە نەیاندەیتـێ". وە مـن جێگەو قەدری ئەم ژنـە لە دڵی تـۆدا دەزانم. وە لە دۆستایەتیمان ناوەشێتەوە ئەم دەرمانەت پێ نەدەم. وە ئەگەر وا بیر بکەمەوە، تـا دەگا بە کـردەوە، لە لای ئەهلی پیاوەتی چۆن دەبەخشـرێم؟ وە من ئەم نەخۆشـییێیە دەناسم. ژنەکانی ئێمەش زۆر تووشـی دەبن، وە ئێمە دڵمانیان دەدەینێو زۆر تووشـی دەردو زەحمەت نابین، مەگەر هێندێک، کە لە ئاسـت ئاسـوودەیی ئێمەو چاکبوونەوەی ئەواندا هیچ مەترسییەکی نییە. وە ئەگەر لەو شـوێنە کە لێی بووین. خەبەرت دابا، دڵم دەگەڵ خۆم دێنا. ئەو کارە زۆر بۆ

من ئاســان بوو، کە لە چاکبوونــەوەی ژنی تۆدا راحەتی هەیەو لە دووری دڵدا بۆ من ئاســوودەیی. وە لــەو کۆتایی ژیانەدا حەوجەم بە دڵــم نییە. گەیومە جێگایــەک کە هیچ کارێــک بۆ من لە هاودەمی دڵ دژوارتر نییە. هێندەی غەمو پەژارە پێداباریوە، هەر دەم تۆفانێکی تێدا هەڵدەستێو ئارەزووم ئەوەیە چاوم پێی نەکەوێو لێی دوور بم. لە بیربردنەوەی غەمی دووری لە عێلو عەشیرەتو موڵکو تەختو تاج، بە دوورکەوتنەوە لە دڵ مەیسەر دەبێو کەم دەبێتەوە. وە ماوەیەک لەو غەمە جەرگبڕو بیرە گیانخۆرانە رزگار بم.

رەقە گوتی: دڵت بۆ بەرهەڵدا کردووە؟ گوتی: مەیموون عادەتیان ئەوەیە، کاتێک دەچنە زیارەتی دۆستان، بۆ ئەوەی رۆژیان بە خۆشی رابرێو دەستی غەم بــە داوێنی هاودەمی ئەوان رانەگا، دڵ دەگــەڵ خۆیان نابەن. چونکە عەمبــاری غەمو مەینــەتو پەژارەیە. وە بە مەیلی خاوەنی لەســەر غەم یا شادی هەلوێستە ناکەنو هەر سەعاتێک عەیشی زوڵاڵ، لێڵاو دەکەنو تەمەنی پڕ لە شادی داماو دەکەن. وە چون دەهاتمە ماڵی ئێوە، ویستم کە هاودەمی دیداری ئێوە بە خۆشــی تێپەڕ کەم، ئێستاش زۆرم پێ ناحەزە، کە هەواڵی نەخۆشــی ئەم خاتوونەم بیســتووە، دڵ دەگەڵ خۆم نەبەم. رەنگە تۆ لێم ببووری، بەڵام ئەو تایفە گومانی خراپ دەکەن کە بەو هەموو دۆستایەتییە کە لە قەدیمەوە هەیانە، ئەوەندە چاکەی نەکردووەو ئاســوودەیی تۆی، بەوشتە کــە زەرەری بۆ من نییە، پێک نەهێناوە. بگەڕێوە با بەدەســتی پڕو ئامادە بێینەوە.

رەقە لە جێوە گەڕاوە. متمانەی پەیدا کرد کە گەیوەتە مورادو مەیموونی لە قەراخ ئاو دانا و ئەویش بە هەڵاتن خۆی هاویشــتەوە سەردار. رەقە سەعاتێک چاوەڕوان بوو، پاشــان بانگی کــرد. مەیموون پێکەنیو گوتی: تۆ کە خۆت بە دۆســت نیشــان دەدا، هەموو کات دوژمنم بووی، کوا شــەرتو قەرارمان ئەوە بوو. من لە دەســەڵاتدا عومرم بە ئاخر گەیشــتووەو گەرمو ســاردی رۆژگارم چەشــتووەو لە خێرو شــەڕی رۆژگار ئاگادارم. وە ئەمڕۆ کــە زەمانە ئەوەی پێی دابووم ئەســتاندوویەتەوەو گەردوون ئەوی بەخشــیبووی وەریگرتەوە. لە

ریزی ژێر پێ کراوانەو لەم ئەزموونانەم زۆرە. وە مەسەلی مەشهوورە کە قَدْ النّاوَایِلَ عَلَیْنا.[1] وە بە پێی ئەو سەرەتایانە هەر چی روو بدا لە من شاراوە نییەو هەڵوێستی دۆستانەو دوژمنانە باش لێک دەکەمەوە. لەم قسانە بگەڕێو دە مەجلیسی پیاواندا رۆمەنیشەو لافی دۆستیو پەیمان لێمەدە. چون ئەگەر کەسێک بڵێ هەموو هونەرێک دەزانێو زۆر لافی پیاوەتیو جوامێری لێبدا، کاتێک دەوری ئەزموون بێتە گۆڕێ، بێگومان لەسەر بەردی تاقیکردنەوە روو زەرد دێتەدەر. وە چەند چەشنەدار لە لای یەک دەکرێ داندرێنو ئەگەر رەنگیان بکەنو لە رەنگکردنەکەشدا زێدەرۆیی بکەن، کەمتر دارێک بە رواڵەتو رەنگ لە عوود جوانتر دەردەچێ. [هەموو دارەکان وەک یەکن] بەڵام ئەگەر هاتە باری سووتاندن عوود وەلای سەروو دەخەنو چنارو بێ، دەکەنە ئاوردووی حەمام.

با ئەوەشت پێ بڵێم. من وەک ئەو کەرەم کە رێوی گوتبووی دڵو گوێی نەبوو. رەقە پرسی: ئەم حەکایەتە چۆنە؟ گوتی: دەگێڕنەوە شێرێک گرێ بوو، وەها کزو کەنەفت بوو کە هێزی دە بەردا نەما و لە راو کەوت. رێوییەک دە خزمەتیدا بوو کە بە بەرماوی ئەوبەرێ دەچوو. رۆژێک رێوی لە شێری پرسی: ئایا پادشا ئەم نەخۆشییە عیلاج ناکا؟ شێر گوتی: منیش لەم دەغدەغەیەداموو ئەگەر دەرمانێک دەست کەوێ، راناوەستم. وە دەڵێن تەنیا بە مێشکو گوێی کەر چاک دەبمەوە. دەستیش ناکەوێ. رێوی گوتی: ئەگەر پادشا ئەمر بکا زوو دەست بەکار دەبمو بە بەرەکەتی بەختی ئەو زۆر ناکێشێ وەک وشتری ساڵح کەرێک لە بەردی دێتە دەر. وە پەشمو کوڵکی پادشا داوەریوە، شکوێ جوانیو جەماڵی هێندێک کەسری هێناوەو لەبەر ئەوە ناتوانێ لە مێشە بڕواتە دەرەوە. چون بۆ هەیبەتو شکۆی پادشایی زیانی هەیە. وە لەم نزیکانە کانییەک هەیەو جل شۆرێک هەموو رۆژێ بۆ کووتالو شمەک شوشتن دێتە سەر ئەم ئاوە. کەرێک کە شمەکی لێ دەنێ لەو مێرگەدا دەلەوەڕێ. دەچم فریوی دەدەمو دەیهێنم، وە پادشا نەزر بکا دڵو گوێی بخوا و باقییەکەی بکاتە سەدەقەو بەڵا گەردان. شێر شەرتی نەزری بەجێ هێنا.

---

١. سیاسەتو ریاسەتمان کردو گەورەییو سیاسەتیان بەسەرداکردن

ڕێوی ڕۆیشتە لای کەرەکەو درگای قسانی کردەوە. لێی پرسی: هۆکار چییە وا کزو لەجەڕو داڵکۆشتی؟ گوتی: ئەم جل شۆرە کارم زۆر لێ دەکێشیو باشیش بەخێوم ناکا. دە غەمی تفاقی مندا نییەو ناهێڵی کەمو زۆر بحەسێمەوە. ڕێوی گوتی: ڕێگەی خەلاسو دەربازبوون ئامادەیە. ئەو زەحمەتو مەینەتە بۆ دەکێشی؟ گوتی: من نێوبانگم هەیەو بچمە هەر شوێنێک لەم زەحمەتە ڕزگاریم نایە، وە تەنیا من نیم، هەموو جسناتی کەر تووشی ئەم چارەڕەشییەن. ڕێوی گوتی: ئەگەر بە قسەم بکەی دەتبەمە مێرگێک کە وەک دووکانی گەوهەرفرۆش بە جەواهێراتی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاوەتەوە. هەواکەشی وەک تەبەقی عەتتار بە شنەی بۆنخۆشو بە مێشکو عەنبەر عەتراوی بووە.

وە چەندێک لەمەوبەر کەرێکم ڕێنوێنی کردووەو ئێستا بە ئاسوودەیی لەو شوێنە خۆشو زەنوێرە بە کەیفو شادی دەیگوزەرێنێ، کاتێک کەر ئەو قسانەی بیست، تەماع وە خۆی خست؛ کەڵەکی ڕێوی گرتیو نانی برژیو لە ئاوری برسیەتیدا نەسووتا. گوتی: لە قسەو ڕێنوێنی تۆ دەرناچم چون دەزانم لە ڕووی دۆستیو بەزەوە ئەم چاکەیەم دەگەڵ دەکەی.

ڕێوی وە پێش کەوتو کەری هێنا بەردەمی شێر. شێر پەلاماری دا و برینداری کرد، بەڵام بێفایدە بوو، کەر بۆی دەرباز بوو. ڕێوی لە بێهێزی شێر کەمێک سەری سووڕما و پاشان گوتی: بێ ئەوەی لازم بێو قازانجێکی تێدا بەستە بێ، ئازاردانی حەیوان لە پتەوی عەقڵو ئیرادە بەدوورە. وە ئەگەر کوشتن ئەنجام نەدرا، کام بەدبەختی لەوە زۆرترە کە پادشای من نەتوانێ کەرێکی لەڕو لاواز بکوژێ. شێر ئەم قسەیەی پێ ناخۆش بوو. فکری کردەوە ئەگەر بڵێم تەنبەلیم کردووە بە سستی بیروڕا و شکو دڕدۆنگی تاوانبار دەکریم. وە ئەگەر ددان بە بێهێزی خۆمدا بێنم، دەبێ قبووڵ کەم لە کارکەوتوومو عاجزم. ئاخری گوتی کە: هەر چی پادشایان دەیکەن، پێویست ناکا ڕەعیەت بیزانێو لێی ئاگادار بێتەوە. فکری هەر کەس ناگاتە ئەو پلەیە کە لە بۆچوونی پادشا تێبگا. لەم پرسیارە بگەڕێو فێڵێک بکە کەرەکە بێتەوەو پاکی بیروبۆچوونی تۆ بەو کارە ڕوون دەبێتەوەو لە نێو وەکانی خۆتدا خۆشەویستتر دەبیو لوتفی ئێمەت زۆرتر

دەبێ.

ڕێوی دووبارە ڕۆیشتەوە. کەر لێی توورە بوو کە: منت بۆ کوێ بردبوو؟ ڕێوی گوتی: فایدەی نییە. ئێستا دەورەی زەحمەتو کوێرەوەری تۆ کۆتایی نەهاتووە. وە دەگەڵ چارەنووسو تەقدیری ئاسمانی پێشدەستی دەست نادا. ئەگینا جێی ئەوە بوو کە ترست ڕێ نەنیشێو زوو بگەڕێیەوە. چون شێر لە رووی خۆشەویستیو ئارەزوومەندی دەستی بۆ تۆ درێژ کرد. ئەو بۆ ئەم هاودەمییە پەلەی کرد. ئەگەر هێندێک ڕاوەستابای هەموو چەشنە لوتفو کەرەمو چاکەیەکت دەبینی. وە من لەم ڕێنوێنییەی خۆمدا رووسوور دەبووم. بە زبانی لووسو دەمدەمەی شیرین دووبارە کەری فریو دا و هێنایەوە. کەر هەرگیز شێری نەدیتبوو، پێی وابوو ئەویش کەرەو لە جسناتی خۆیەتی.

شێر رووی خۆشی نیشان دا تا هێندێک نامۆیی بەسەر چوو. ئەوجا لە نەکاو دەرپەڕیو تێکی شکاند. پاش ئەوە بە ڕێوی گوت: من غوسڵ دەکەم، پاشان دڵو گوێ دەخۆم. کە چارەی دەردی من بەم شێوە دیاری کراوە. کاتێک شێر ڕۆیی، ڕێوی دڵو گوێی کەری خوارد. شێر کە هاتەوە گوتی: کوا دڵو گوێ؟ گوتی: پادشام پایەدار بێ، ئەگەر ئەو گوێو دڵی بوایە. کە یەکیان شوێنی بیستنو ئەوی دیکەش ناوەندی عەقڵو ئاوەزە، پاش ئەوەی هەیبەتی پادشای [جاری یەکەم] دیتبوو، گوێی بە درۆی من نەدەدا و بە مەکری من فریو نەدەدرا و بە پێی خۆی بەرەو گۆڕ غاری نەدەدا. وە ئەم مەسەلەم بۆ هێنایەوە تا بزانی کە من بێ دڵو گوێ نیم. وە تۆ لە وردەکارییەکانی مەکرو فرپوفێڵ هیچ کامیانت پشت گوێ نەخست وە من بە عەقڵو ئەندیشەی خۆم تێگەیشتمو زۆر تێکۆشام کە کوێرەڕێی تاریک، رووناک بکەمەوەو کاری دژوارم بۆ ئاسان بێتەوە. ئایا ئێستاش چاوەڕوانی منی بگەڕێمەوە لات؟ فکری مەحاڵ بە کارت نایە.

رەقە گوتی: ئەمڕۆ دان پێدا هێنانو حاشاکردن لە لای منەوە هەر یەک شتە. وە برینێک کەوتە سەر نێوانو پەیوەندی منو تۆ کە بە هیچ حەکیمو لوقمانێک یا بە مەیلی چەرخو گەڕانێکو یا هاوکاری گەردوونی گەردانێک، بۆی نادۆزرێتەوە چارەو دەرمانێک. وە داغی بەدئاکاریو پەستیو رەزالەت وەها لە نێوچاوانم

دراوە کە لەناوبردنو سڕینەوەی بە خەیاڵیش جێبەجێ ناکرێ. غەمو حەسرەتو پەشیمانیش هیچ سوودی نییە. دڵ لەسەر خواردنەوەی شەربەتی دووری دەبێ دابنێمو جەستە خەستەی لێک هەڵبڕان بم.

تەنیـا بـۆ یەکجـار خەتاباریـم کەرد
باری بـە سـەرما، سـەنگبارانی بەرد
ئازیـز ماچوو وێم پـەی قەرەبووی غەم
هەرگـی کام دەرگا وەبان سـەرم کەم[1]

ئەم رووداوە چارەنووس بوو، دەبا پەشیمانو ناهومێد بگەڕێمەوە.

ئەوەیە داستانی ئەو کەسەی دۆستێک یاماڵێک وەدەست دێنێو بە نەزانیو غەفڵەت لە دەسـتی دەدا تا بکەوێتە بەندی پەشیمانی، وە هەر چەند باڵ لێدا و سـەر دە قەفەس بکوتێ، سـوودی نییە. وە ئەهلی عەقڵو ئاوەز دەبێ ئەم بەشـە بە وردیو تێبینییەوە دووبار بخوێننـەوەو باش حاڵی بن کە ئەوەی لە ماڵو سامانو دۆستانو شتی دیکەش وە دەستیان هێناوە، ئاگاداری لی بکەنو لە شـەنە بە باکردنو دەست بڵاوی خۆ بپارێزنو هەر شتێک کە لە دەستچوو بە لاڵانەوەو پاڕانەوە دەست ناکەوێتەوەو غەمو پەژارەش سوودێکی نابێ.

خودای تەعالا هەموو ئیمانداران بۆ ڕێی بەختەوەری ڕێنوێنی بکا.

بِمنهِ وَ رَحْمتهِ

---

١. به همه عمریک خطا کردم / غمو تشویر صد خطا خوردم
به چه خدمت ز من شوی خشنود / تا من امروز گرد آن گردم.

## ٦

# شێخو فسۆس

رای گوتیه بەرەهمەنی: بیستم بەسەرهاتی ئەو کەسەی کە بە مرادی خۆی بکا و لە پاراستنیدا تەنەخی بکا، تا لە ئاگری پەشیمانیدا بسووتیو لە زیانو زەرەرو زەحمەت چی تری گیر نەکەوێ. ئێستا داستانی ئەو کەسەم بۆ بگێڕێتەوە کە لە بڕیارداندا پەلە بکا و لە سوودو قازانجی تەدبیرو ئاڵوگۆڕی بیروڕا غافڵ بێ، پێمان بڵێ عاقیبەتی کاری بە کوێ دەگا و چی بە سەر دێ.
بەرەهمەن گوتی:

اِیّاکَ والْأمرَ الذّیَ اَنْ تَوَسَّعَتْ
مَوارِدُهُ ضاقَتْ عَلَیْکَ المَصادِرُ

کە دەڵێ: خۆت بپارێزە لە کارێک کە رێگەی چوونە ناوی گوشادەو رێگەی دەرچوونی تەنگو باریکە.

هەر کەس بناغەی کاری خۆی لە سەر وریایی‌و قورسایی دانەنێ، تووشی نەدامەتو لۆمەی دوارۆژ دەبێو رازاوەترین خەسڵەتێک کە خودا ئادەمزادەکانی پێ رازاندۆتەوە، جوانی سەبرو خۆڕاگریو فەزیلەتی گرانو سەنگینییە، چونکە سوودی ئەم خەسڵەتانە بۆ هەمووکەس دەگەڕێتەوەو هەموو لایەک دەگرێتەوە. ئەگەر کەسێکیش لە هەموو جۆرە چاکەو چاکەکارییەکدا دەست بەکار بێو لەم بەستێنەدا دەستی کەسی پێ نەگا، ئەگەر زبان پیسیو دەمهەراشی تێکەڵاو بکا هەموو هونەرەکانی دادەپۆشێو بێگومان تەبیاتی دەگۆڕێ.

لایەنـــی ســـەبرو خۆڕاگری، بێجگە لە پتەویو ئیرادەی بەهێز، هیچ شـــتێک بۆی راناوەســـتێ. پەلەو هەڕەمە پەسندیدە نینو دەگەڵ خوو و خدەی خاوەن رایان یەک ناگرنەوە. لەم بارەوە حەکایەتی شـــێخەکەم کەوتەوە بیر، کە بە بێ تێڕوانین کەوتە رێ تا دەســـتی بە خوێنی ناحەق سوور بوو، فسۆسی بێچارەی لە خۆڕایی کوشت. رای پرسی: چۆن بوو؟

گوتی: دەگێرنەوە شـــێخێک ژنێکی بوو داوێـــن پاکو نەجیب کە لە جوانیدا عەکسی روخساری یارمەتی گزینگی بەیانانی دەدا و رەنگی ئەگریجەو پەرچەمی، بە دادی داهاتنی شـــەوەزەنگ دەگەیشـــت. شێخ زۆر بە ئاواتی منالێکەوە بوو، چون ماوەیەک تێپەڕیو بە مراد نەگەیشت، ناهومێد بوو. پاش ناهومێدی، خودا رەحمەتی نازڵ کردو ژن مندالی وە زگی کەوت. پیر زۆر خۆشحاڵ بوو، بە شەو و بە رۆژ باســـی دەکرد. رۆژێک بە ژنەکەی گوت: بـــەو زووانە کوڕێکت دەبێ. نێوی چاکی لێ دەنێم. ئەحکامی شـــەریعەتو رێورەسمی تەریقەتو خوداناسی زوو پـــێ فێردەکەمو لە بارهێنانو هیدایەتو پەروەردەکردنیدا تێدەکۆشـــم، بەو رادەیـــە کە لە ماوەیەکی کەمدا کاروبـــاری دینی بتوانێ راپەڕێنێو بەهرەمەندی کەرامەتی ئاسمانی پێ ببڕێو ناوی پیرۆزی بکەوێتە سەرزارانو لە تۆرەمەی ئەو منالڵ بکەونەوە کە ئێمە شـــانازی بـــە پلەوپایەیان بکەینو چاومان پێیان روون بێتەوە.

ژن گوتـــی: رازو رەمـــزی ئەم قســـانەت چییە؟ لە کـــوێ دەزانی من کوڕم دەبێ. وە تەنانەت لەوانەیە هەر ئەولادیشـــم نەبێ. یا ئەگەر بشبێ، کوڕ نەبێ. ئەودەمیش کە ئافەریدگار عَزَّ اِسْـمُهُ وَ عَلَتْ کَلِمَتُهُ ئەو نیعمەتەی پێداین، لەوانەیە کە تەمەن یاری نەکا. لەســـەر یەک ئـــەم کارە دوورو درێژخایەنە. وە تۆ وەک نەزانێک سواری ئەسپی تەمەنا و ئارەزوو بوویتو لە مەیدانی لافـو گەزافدا تەقڵە دادەکوتی. وە حاڵو ئەحواڵی تۆ راســـت چۆتەوە ســـەر حاڵی پیاوە فەقیرەکە کە شـــیرەو رۆنی بە سەرو کوڵکی خۆیدا رشت. زاهید گوتی: ئەوە چۆن بووە؟ گوتـــی: پیاوێکی فەقیرو نەدار هەبوو کە لـــە جیرانەتی ئەودا بازرگانێک رۆنو دۆشاوی دەفرۆشت. وە هەموو رۆژێ هێندێکی بۆ کابرای فەقیر دەنارد کە پێی

بژێو بیخـــوا. کابرا کەمێکی دەخواردو باقییەکەشـــی دە گۆزەیەک دەکردو لە لایەکی ماڵەوە هەڵیداوەســـی. کەمکەم گۆزە پڕ بوو، ڕۆژێک چاوی تێ بڕیبوو، فکری لێ دەکردەوە کە ئەگەر: "ئەم ڕۆنو دۆشـــاوە بە دە درەم بفرۆشمو پێنج ســـەر مەڕی پێ بکڕمو هەر مانگێک پێنج بەرخ بزێن. لە بەرو بوومەکەی چەند مێگەل وەڕێ دەخەمو پشـــتیان پێ دەبەستم. کەلوپەلی ماڵ دەکڕمو ماڵێکی جوان پێکەوە دەنێمو لە بنەماڵەیەک ژن دەخوازم. بێگومان کوڕێکیشـــم دەبێ، نێوی باشـــی لێ دەنێمو دەبەر خوێندنی دەنێم، کە گەورەبوو ئەگەر سەرکێشی بکا، بەم عەســـایە ئەدەبی دەکەم. ئەم بیرۆکەیە لە مێشکیدا توند بوو، هەموو گیانو لەشی داگرتو لە نەکاو عەسای هەڵسووڕاندو نەیزانی لە گۆزەی دا. گۆزە دەستبەجێ شکا و ڕۆنو دۆشاو بە سەریدا رژا خوارەوە".

وە ئەم نەقڵەم هێناوە تا بزانی کە کردنەوەی قسەو باس بە بێ یەقینی تەواو و رێککەوتن لەســـەری بێعەیب نابێو ســـەرەنجامەکەی پەشیمانییە. شێخ بەم بۆچوونە هێندێک وریا بۆوەو چیدی باسی نەکرد تا ژنەکە ماوەی سکپڕییەکەی بەســـەر چوو. ئەلحەق کوڕێکی جوانو لەبەردڵانیشـــی بوو. جێژنو شـــادییان کردو نەزریان بەشـــیەوە. کاتێک ماوەی نەخۆشـــی ژن بەســـەر چوو، ویستی بڕوا حەمامێک بکا. کوڕی بە بابی ئەســـپاردو ڕۆیشـــت. ســـەعاتێک تێپەڕی. پیاوی پادشـــا هاتە شـــوێن شێخ، نەیتوانی راوەســـتێ، رەگەڵی کەوت. وە لە ماڵەوە فسۆســـێکیان هەبوو کە پێکەوە لەیـــەک جێ بوون، بە چەند جۆر پێی دەحاوانەوە. ئەوی دەگەڵ کوڕەکەی بە تەنیا بەجێهێشتو ڕۆیشت، هەر دەگەڵ لە ماڵ دەرکەوت مارێک بەرەو لانکی کوڕەکە خوشـــی تا پێوەی بدا و بیکوژێ. فســـۆس ماری کوشتو منداڵی نەجات دا. کاتێک شێخ هاتەوە، فسۆس بەسەرو گوێلاکی خوێناوییەوە بە هەڵاتن بۆ لای چوو. شێخ وای بۆ چوو کە ئەوە خوێنی کوڕەکەیەتی، لە هۆش چوو، کە وەخۆ هاتەوە بە عەســـا کەوتە گیانی فسۆسو کوتای، کە هاتە ژوورەوە، کوڕی بە ســـڵامەتی چاو پێکەوتو ماریش لەوێ بە لەتوکوتکـــراوی کەوتبوو. هێندێک بە ســـینگیو بە چۆکـــی خۆیدا دا و، وەک بێهۆشان پاڵی بە دیوارەوە دا. سەرو سینەی خۆی دادەڕووشاندو دەیگوت:

سەد بریا ئەم منداڵە لە دایک نەبوایەو من هێندەم خۆش نەویستبا، تا لەبەر ئەو خوێنی بە ناحەق نەڕژابایەو ئەم کارە ناحەزە رووی نەدابایە. چ کارەساتێک لەوە ناخۆشتر کە هەواڵو هاومالّی خۆم کوشتو بە بێ دەلیل جلوبەرگی مەرگم دەبەر کرد.

شـــوکری نیعمەتی باریتەعالا کە لە پیریـــدا منداڵێکی بە من عەتا کرد، بەو شێوەی کە گێڕامەوە. وە هەر کەس لە شوکری نیعمەت غافڵ بێ، ناوی دەکەوێتە دەفتەری گوناهبارانو زیکری ئەو لە لاپەڕەی شـــوکرانەبژێران دەســـڕدرێتەوە. شـــێخ بەمجۆرە نارەحەتی خۆی دەردەبڕی کە خاتوون لە حەمام هاتەوەو ئەو کارەساتەی چاو پێکەوت، بوو بە بەشداری ئەم پەژارەیەو سەعاتێک باسی ئەو رووداوەیان کردو ژن بە شێخی گوت: هەر کەس دە کاراندا پەلە بکا، لە سوودو قازانجی سەبرو سەنگینیو گرانی بێبەش دەبێ.

بـــەم حەکایەتە دەبێ وریا بێتەوەو لـــەم ئەزموونە عیبرەتێک بگرێ. ئەوەیە داســـتانی کەسێک کە پێش ئەوەی بڕیار بدا، دەســـت بەکار بێ. پیاوی عاقڵ دەبـــێ ئەم ئەزموونانە بکاتە رێنوێنو ســـەرقافڵەو ئاوێتەی بۆچوونی خۆی بە رێنوێنی زانایان ســـەیقەل بکا و لە هەموو بوارێکدا بە تەدبیرو پشووی درێژەوە هەڵســـووڕێ، لە پەلەو هەلەهەل خۆی بپارێزێ. تا ئیقباڵو دەوڵەت بەســـەریدا بڕژێ. یارمەتی خێرو سەعادەت بۆ لای ئەو بچێ.

واللهُ وليّ التوفيق



## کتک‌و مشک

رای گوتی: باسی کەسێکم بیستووە کە بێ فکرو تێبینی خۆی دە دنیای سەرگەردانیو پەشیمانی هاویشتو کەوتە داوی زیانو زەرەرو ڕۆژەرەشی. ئێستا بۆم بگێڕەوە بەسەرهاتی ئەو کەسەی لە راستو چەپو پێشو پاشەوەی، دەستەدەستە دوژمن گەمارۆیٚ دەدەنو دەکەوێتە گێژاوی بە هیلاک چوونو سەردانان، پاش ئەوە نەجاتی خۆی لەوەدا دەبینێ، دۆستایەتیو هاودڵی نیشان بدا و جەماڵی حاڵی خۆی لەتیف بکا و بە سلامەتی دەرباز بێو پەیمان دەگەڵ دوژمن بەرێتە سەر. بەڵام ئەگەر ئەوە دەستی نەدا چۆن دەتوانێ بۆ لای نەرمی نواندن بچێو چۆن داوای ئاشتی بکا؟

بەرەهمەن لە جوابدا گوتی: زۆربەی دۆستایەتیو دوژمنایەتییەکان پتەو و قایم نین. وە بێگومان هێندێکیان دەگەڵ ڕووداوەکانی زەمەن سارێژ دەبنەوە. هەر وەک هەوری بەهاری کە گا دەبارێنێو جار تاو و ساوەو زۆر لە سەر حاڵەتێک ڕاناوەستێ.

وە دۆستایەتی ژنانو نزیکی لە سوڵتانو خۆشەویستی دێوانانو جوانی کوڕەجحێڵەی لەبەردلان، هەمووی ئەم حاڵەتەیان هەیەو دڵ بە بەقایان مەسپێرە. وە زۆر دۆستی هەن کە گەیوەتە ئەوپەڕی مەحکەمیو پتەویو پەرەگرتنی بە درێژی ڕۆژگار لە گەشەکردندا بووە کەچی لە نەکاو کەلێنێکی دەکەوێتێو دەکشێتە دوژمنایەتیو نێوان ناخۆشی. واش هەیە دوژمنایەتی

قەدیمو رقەبــەری میراتی بە تەعــاروفـو تەوقەیــەک کاڵ دەبێتەوەو بناغەی دۆستایەتیو خۆشەویســتی دادەڕێژرێتەوە. پیاوی زانا لە هەر دوو بواراندا، نە دۆستایەتی دەگەڵ دوژمن بە یەکجاری وەلا دەنێو نە متمانەی تەواو بە دۆستان دەکا و وەفاداری ئەوان دەکاتە پاڵپشت. نابێ لە مەکری دەهرو ژەهری دەور، لە پەرێشانکردنی دۆستایەتیدا ئەمین بێ. بەڵام ئەوەی بەرژەوەندی خۆی دەناسێ، دۆستایەتیو نزیکی لە دوژمن بە غەنیمەت دەزانێ چون بۆ ئەم بوارانەی باسمان کــرد زیانێک لە ناو دەبا و قازانجێــک وەدی دێنێ. وە هەر کەس لەم بابەتەدا رێگەچارەی لە بەرچاو بێو رێگەی مەسڵەحەتی لە کاتی خۆیدا دۆزیەوە، زووتر مەقســوودی حاسڵ دەبێو درگای سەرکەوتنو گەیشتن بە دەوڵەتو ئەنگوتنی بەیانەی بەختەوەری بە ســەردا دەکرێتەوە. وە نموونەی ئەم باســە حەکایەتی کتکو مشکە. رای پرسی چۆن؟

گوتی: دەگێڕنەوە لە فلان شار دارێک بوو، لەبن دارەکەش کونە مشکێکی لێ بوو. هەر لەو نزیکەش ماڵی کتک بوو. راوکەران زۆر بەوێدا دەهاتنو دەچوون. رۆژێــک راوکــەر داوی نایەوەو کتک دەگیر کەوت. وە مشــک بــۆ دۆزینەوەی توعمەیــەک لــە ماڵ هاتەدەر. چاوی بە هەموو لایەکــدا دەگێڕا و رێگەی تاقی دەکردەوە. لە نەکاو چاوی بە گوربە کەوت. کە دیتی دەســتو پێی بەستراوە خۆشحاڵ بوو. لەو حاڵەتەدا چاوی لە پشت سەری خۆی کردو چاوی بە فسۆس کــەوت کە خــۆی لێ مات داوە. رووی بۆ لای دارەکــە وەرگێڕا. دیتی کوندێک خەریکە پەلاماری بدا. ترسی رێ نیشتو بیری کردەوە: ئەگەر بگەڕێمەوە فسۆس تێمرۆدێ. وە ئەگەر لە جێی خۆم بمێنمەوە، قالاو دێتە خوارو ئەگەریش برۆمە پێش کتک سەر رێی لێ گرتووم. بەخۆی گوت: درگای بەلایان کراوەیەو ئەنواعی پەتا و ئافەت دەوریان تەنیوەو رێگا پڕ مەترســییە، بەو هەموو گرفتارییەوەش نابێ دڵم داخورپێو هیچ پەنایەک بۆ من لە سێبەرو سایەی عەقڵ ئەمینترو هیچ دەســتگرۆیەک یارمەتیدەرتر لە سالاری هۆشو وریایی نییە. وە ئەوەی دڵی بە هێزەو فکری بە توانایە، لە هیچ حاڵەتێکدا ترس بە خۆ رێ نادا و ورە بەرنادا و خۆفـو سەرسامی لە دڵدا جێ ناکا. چون مەینەتی پیاوی زانا ناگاتە ئەو رادەیە

که عەقڵ داپۆشــێ. وە ئاســوودەییش لە دەروونی ئەواندا ئەوەندەی بایەخ پێ نادرێ کە بێخەبەریو سەرمەســتی زاڵ بێو تەدبیر لە بیر بچێو ئەحواڵی دڵی ئەوان وەک قووڵایی بەحرانە کە نازانی چەندە قووڵەو دەســتت بە بنی راناگا. وە هەر چی تێی باوێژرێ، تازە چاوت پێ ناکەوێتەوە، ئەو شــتە قووت دەدا و شــلوێش نابێ. ئێستا بۆ من هیچ تەدبیرێک لەوە باشتر نییە کە دەگەڵ گورپە ئاشــتی بکەم. چون زەلیلەو لە نــاو داوی بەڵادایەو بێ یارمەتی من لەو بەڵایە رزگاری نایە. وە رەنگە کە بە عەقڵەوە گوێ بۆ من رابگرێو قســەی راســتو ناراست لێک بکاتەوەو لە راستی قسەکانم ئاگادار بێتەوە. وە بزانێ کە مەبەستم فێڵو غەدرو مەکر نییە. وە بە تەمای هاوکاری موســالەحەی من قبووڵ بکا و بەمجۆرە هەر دوو لایەنمان بە بەرەکەتی راستیو رێککەوتن رزگاریمان بێ.

پاشــان رۆیشــتە لای کتکو پرســی: چ رووی داوە؟ گوتی: تووشی بەڵا و زەحمەتم. مشــک گوتی: تا ئێســتا بێجگە لە راستی شــتێکی دیکەت لە من بیســتووە؟ من هەمیشە بە غەمی تۆ شــاد دەبوومو ناکامیو تێشکاوی تۆم بە سەرکەوتنی خۆم زانیوەو هەر چی لە دەستم هاتبێ بە زەرەرو زیانی تۆ ئەنجامم داوە بەڵام ئەمڕۆ لە بەڵادا دەگەڵت بەشــدارمو رزگاری خۆم لە کارێکدا دەبینم کــە تۆش بە هۆیەوە نەجاتت دەبێ. بەو دەلیلــە وا مێهرەبانم دەبینی. وە بۆ عەقڵو تێگەیشتوویی تۆ شاراوە نییە کە درۆت لەگەڵدا ناکەمو قەستی خیانەتو دژایەتیم نییە. هەر وەها فســۆس بە دوامەوەو کوند لەســەر دارەکە دەتوانی ببینیو هەر دووکیان خەریکن پەلامارم بدەن. ئەوانە دوژمنی تۆنو ئەگەر بێمە لای تۆ ئەوان لێم هیوابڕاو دەبن.

ئێستا وەرە من ئەمینو خاترجەم بکە تا بێمەلاتو مەقسوودی من حاسڵ بێو ئەو بەندو داوەش لە لەشت هەڵبڕم تا تۆش رەها بی. ئەم قسەیەی منت لە بیر بێو بەراســتیو نیاز پاکی من متمانەت هەبێ، کە هیچ کەس لە وەدەستهێنانی چاکەو تێگەیشــتنی سەعادەت لە دوو کەسان بێبەهرەتر نییە: یەکیان ئەوەیە متمانە بە وتەی کەس ناکا و بە فەرمایشــی زانایان متمانەی پتەو نابێ. ئەوی تریان کەسێکە، دیتران قسەی لێ قبووڵ ناکەن، لە قبووڵی شەهادەو ریوایەتی

ئەو مل با دەدەن و لەو شــتەدا کە دەیڵێن، زانایان جوابی نادەنەوەو من بە پێی عەهدو پەیمانی خۆم دێمو دەڵێم:

ئەگەر رەقیب دەگەڵم رێک کەوێ بە یەکڕەنگی
دڵم لە هەر چی کینەیە دەسڕمەوە بە بێدەنگی[1]

ئەم دۆســتایەتییە قبووڵ کەو کارەکە وە درەنگی مەخە، کە عاقڵ لە کاری گرینگدا درەنگی و لە مەترســیدا دڕدۆنگی بە رەوا نازانێ. وە دڵت بە بەقای من خۆش بکە، چون بە ژیانی تۆ شــادم، دەزانی مانەوەی هەر کاممان لە پێناوی مانەوەی ئەوی دیکە دایە. وەک کەشتی بە تەقالای کەشتیوان دەگاتە قەراخ وە کەشتیوان بە لێخوڕینی کەشتی خۆی رزگار دەبێ وە راستی من بە تاقیکردنەوە دەردەکــەوێ و وەک رۆژ ئاشــکرا دەبێ کە گوتەی من ناگاتە باســی عەمەلو کردەوەمو کردارم لە سەرووی گوتارمە.

کاتێک کتک قسەی مشــکی بیستو جەماڵی راستی لەسەر لاپەڕەکانی چاو پێکەوت، خۆشــحاڵ بوو، گوتی: قســەکانت وە هەق دەچنو من ئەم پێکهاتنە قبووڵ دەکــەم کە خودای مەزن فەرموویەتی: وَ اِنْ جَنَحوُ اللِسَّــلمِ فَاَجْنَحْ لَها.[2] وە هیوادارم هەر دوو لامان بەوکارە رزگاریمان بێت. وە من جەزای ئەم کارە لەسەر خۆم بە واجیب دەزانمو لە هەموو عومری خۆمدا پێی پابەندمو منەتبارم. مشک گوتــی: من چون دەگەڵ تۆ بوومە هاوپەیمان، دەبێ ئەوەی لە دەســتمان دێ بۆ خۆشەویستی و نێوانخۆشــی بیکەین. تا ئەوانەی لێم قاسیدن و بەدوامەوەن ئاگاداری ئەم لوتفــو دۆســتایەتییە ببن و دەســت لە گونــان درێژتر بە قوونی خۆیاندا دەن و بگەڕێنەوەو من بە ئاسوودەیی بەندو داوەکانی تۆ هەڵبڕم. گوتی: وادەکەم.

ئەوجار مشــک هاتە پێشتر. کتک بە گەرمی ئەحواڵی پرسی و فسۆس و کوند بە ناهومێدی رۆیشتن و مشک بە کاوەخۆ دەستی بە بڕینی داوەکان کرد. گوڕپە برێــک راما و گوتــی: زوو ماندوو و مەلوول بووی، وە بــڕوای من بە کەرەمی

---

١. اگر یگانه شوی با تو دل یگانه کنم / ز مهرو عشق دگر دلبران کرانه کنم.
٢. ئەگەر ئاشتییان دەگەڵ کردی تۆش بیکە.

عەهـــدی تۆ لەوە زیاتر بوو. ئێســـتا کە حاجەتت بەجێهاتـــووە مەگەر نییەتت گۆڕیوە کە دە ئەنجامی بەڵێنیدا بیر لە بێبەڵێنی دەکەیتەوە؟ ئەوەی بزانە کە پتەوی عەزمو مەحکەمی بڕوای هەر کەس لە کاتی نەگبەتیدا تاقی دەکرێتەوە، چـــون ڕووداوەکانی ڕۆژگار محەکی پیـــاوانو کوورەی وەفایە. ئەم خۆمێلکاندنە شـــایانی ڕەوشـــتی کەریمان نییەو دەگەڵ عادەتی مێرخاسان جۆر دەرنایە. وە قازانجی پیاوەتیو بەهرەی ئازادەگی منت لەجێ وە دەســـت کەوت. وە تەماعی دوژمنانی زۆردارت لە کۆڵ بۆوە. وە ئێســـتا پیاوەتی لەوەدایە کە پاداشـــی من بدەیتـــەوەو ئەوبەندو داوە زوو هەڵبـــڕیو ترسو لەرزی ڕابردوو تووڕ هەڵبدەی، کـــە ئەم ســـازانەی لە نێوانمانـــدا ڕووی دا، دوژمنایەتی کۆنی الحَمْـدلله والْمِنّه[1] لەناو برد. فەزیلەتی وەفاداریو گەورەییو شـــەرەفی ئەنجامدانی هەقو ڕاستی بە سەر عەقڵو زاناییدا مەشـــارەوە. عەیبو عاری غەدرو ناحەزی مەکرکارێکی کرێتو نەشـــیاوەو کەلەبەرێکی گەورەیە. پیـــاوی کەریمو جوامێر جوانی ئاکارو کردەوەکانی خۆی بەوانەوە پیسو چەپەڵ ناکا. هەر کەس ئازادەو ڕەسەن بێ، پـــاش عەهدو پەیمان، زاهیرو باتینو دەرو ژووری خۆی بە یەکســـانی دەردەخا و هـــەر وەها ئەگەر بتەوێ لەو کایەی نەردەدا فێڵ بکەی، لێت ئاشـــکرا دەبێو عەیبو ئیرادت ئاشکرا دەبێ، وە لە هەر جێگایەک کەرەمو پیاوەتی لە ئارادایە، سروشـــت لە ئەنجام نەدانی هەق بێزارەو هیممەتی لە ســـەر ئەوە داناوە هەق ئەنجـــام بدرێ. وە پیاوی دروســـتکردارو بەئەخلاق بە یەک خۆشەویســـتی لە مەیدانی ڕاستیو ئیخلاسدا هەنگاو هەڵدەگرێو ساختومانی دۆستیو ڕاستگۆیی دەگەیەنێتە ئەســـتێرەی کەیوانو نەمامی پیاوەتیو خۆشەویستی ڕازاوەو تێراو دەکا. وە ئەگەر لە دەروونیدا هەست بە ترسو توندوتیژی دەکا، زوو ئەم هەستە وەلا دەنێو ئەو هەلە وەک دەرفەتو غەنیمەتی گەورە دەقۆزێتەوەو بە سەودا و موعامەلەیەکی پڕسوودی دەزانێ، بەتایبەت کە متمانەیەک لە نێواندا هەبێو بە سوێندی قورسو گران پتەو کرابێ.

وە دەبێ بزانین کە سزای مەکربازان زوو نازڵ دەبێو سوێندی بە درۆ پایەو

---

١. سپاس بۆ خودا و منەتبارم.

بناغـــەی ژیان هەڵدەتەکێنیو ئەو کەســـەی کە بە پاڕانـــەوەو تەمەننا نەتوانێ دەست لە ئازارو عەزیەت هەڵبگرێو دە لێبوردنو چاوپۆشیدا پێشدەستی نەکا، لە جوانیو جەماڵی پیاوەتی بێبەشو لە لای جوامێری سەرشۆڕ دەبێ.

مشک گوتی: هەر کەسێک سوێندو پەیمان دەگەڵ تۆ بشکێنێ، پشتیو دڵی زامو برینی زەمانە بیپرووخێنێ. وە بزانە کە دۆستان دوو جۆرن: یەکەم ئەوانەن کـــە بە مەیلو ئارەزووی خۆیان دۆســـتایەتی دەکەنو دووهـــەم ئەوانەن کە لە رووی ناچاری دەبنە هاودەم. وە هەر دوو تاقم لە بەدواداچوونی سوودو قازانجو ئیحتیمالـــی زیانو زەرەر غافڵ نین. بەڵام ئەوەی بێترسو نیگەرانیو هان دانی بڕوای بێغەلو غەشـــی خۆی درگای دۆستایەتی دەکاتەوە، لە هەموو حاڵێکدا بـــڕوای پێ دەکـــرێو هەموو کات دەتوانی لێی ئەمین بـــی. وە هەر چاکەیەکی دەگـــەڵ بکـــەی لە چوارچێوەی عەقـــڵو ئاوەز دەرناچێ. وە ئەو کەســـەی کە لەبەر پێداویستییەک پەنا بۆ دۆستیی کەسێک دەبا، پێوەندی نێوانیان حاڵەتی جیاوازی هەیە. جاری وایە گەرمو گوڕیو تێکەڵاوی، جاروبارەش دوورەپەرێزیو لێکهەڵبڕاوی. وە هەمیشە پیاوی زیرەک، هێندێک لە پێداویستییەکانی کەسێکی لەم چەشنە دابین دەکا. لە سەرەخۆ و بە ئارامی ئەو کارە دەکا. وە لە هەمان کاتـــدا ئاگای لە خۆی دەبێ کە پاراســـتنی نەفس لە هەموو حاڵەتێکدا فەرزە. تـــا بەمجۆرە هەم بە ناویەدەرەویی لە ناو خەڵکدا بمێنێتەوەو هەم بە مرۆڤێکی خـــاوەن را و تێگەیشـــتوو بمێنێتەوە. وە تەواوی تێکـــەڵاوی خەڵکی دنیا، بۆ گەیشتن بە سوودو قازانجی فەورییو بە پەلەیە. وە من ئەوەی وەعۆدەم گرتووە ئەنجامی دەدەمو لە پاراســـتنی گیانمدا زێدە وریابـــوون بە رەوا دەزانم. چون ترسی من لە تۆ زۆرتر لەو ترسەیە کە لەو تایفەی بە هیممەتی تۆ لە دەستیان رزگار بووم، هەمبوو. وە قبووڵی ئاشتی تۆ بۆ بەرگری لە پەلاماری ئەوان لازم بوو. وە دۆســـتایەتی کە لە لایەن تۆوە هاتە نێوان، هەم بۆ مەسڵەحەتی کاتیو لەناوبردنـــی زەرەرو زیـــان بوو، کە هەر کارەی فێڵی خۆی هەیە. وە هەر کەس مەسڵەحەتی کاتی لە بەرچاو نەبێ، چۆن دەتوانین بێژین بیر لە عاقیبەتی کاران دەکاتەوە؟ من تەواوی بەندەکانی تۆ هەڵدەپســـێنمو زەمانی دەرفەت رادەگرمو

تەنیا گرێیەک بۆ گرێوی گیانی خۆم رادەگرمو کاتێک هەڵیدەبڕم کە تۆ ئەرکێکی گرینگترت لە پەلاماردانی من بۆ بێتە پێشو نەتوانی گرفتاریم بۆ دروست بکەی.

وە بەم شێوەیە مشک بەندو داوەکانی بڕیو گرێیەکی گەورەی هێشتەوە. ئەو شەوە لەوێ مانەوە. ئەو کاتەی سیمورغی بەیانی باڵی کردەوەو بە سەر ئاسۆی رۆژهەڵاتدا دەستی کرد بە سووڕانەوە، راوکەر، لە دوورەوە پەیدا بوو. مشک گوتی وەختی ئەوەیە باقی ئەو کارەی بەرعۆدە بووم راپەڕێنم. ئاخرین گرێی بڕیو پشیلە وەها ترسی رێنشتبوو کە مشکی لە بیر چۆوە بە پەلە بەدارێکدا هەڵچوو، مشکیش خزیە نێو کونێکو راوەکەر لەسەر داوی هەڵپساو کەمێک راما و بە نارەحەتیو ناهومێدی گەڕاوە.

رۆژی دوایی مشک لە کون هاتە دەرەوە. لە دوور چاوی بە کتک کەوت. پێی خۆش نەبوو لێی وە نزیک کەوێ، کتک بانگی کرد کە: بۆخۆم لێ دەبوێری؟ قَدْ اَسْتَکْرَمْتَ فَارْتَبِطْ.[1] لەم دەرفەتە بەقیمەتەدا زەخیرەیەک بە دەست بێنەو بۆ دۆستانو منداڵانت دۆستێکی باشو لێهاتوو هەڵبژێرە. وەرە پێشتر با پاداشی بەزەییو پیاوەتی خۆت بە باشترین شێوە ببینی. مشک، خۆی دەبواردو گورپە گوتی: لە چاو پێکەوتن درێغی مەکەو دۆستیو برایەتی زایە مەکە. چون هەر کەس بە زەحمەتی زۆر دۆستایەتی بکێشێتە ناو بازنەی خۆشەویستیو بە خۆڕایی دەری باوێژێ لە بەهرەی پێوەندیو دۆستایەتی بێبەش دەبێو دۆستانی دیکەش لێی ناهومێد دەبن.

ئەو کەسەم پێ خراپە، دۆستی نەوێ
لەو خراپتر کە بیگرێو نەیەوێ
یار ئەگەر سەت کەڕەت هەڵتبچڕێ
وەک فەنەر خڕ بەوە وەکوو هەوەڵێ[2]

وە من منەتباری تۆم کە ژیانو مانم تۆ نەجاتت دا. وە بەو شێوەی لەو کارەدا، سەرکەوتن یارت بوو، بە خەونیش بۆ کەس نایەتە دی. وە

---

١. هەلێکی باشت بۆ رەخساوە، پێوەندی بگرە.
٢. بد کسی دان که دوست کم دارد / زو بتر چون گرفت بگذارد.
گرچه صدبار باز کردت یار / سوی او بازگرد چون طومار.

تـــا ئەو ڕۆژەی دە ژیاندا مـــاوم هەقی تۆ فەرامۆش ناکەمو لە تەڵەبی دەرفەتی قەرەبووکردنەوەو دۆزینەوەی کاتی پاداش راناوەســـتمەوە هەر چی لە دەستم بێ پێشکەشی دەکەم. زۆر ســـوێندی خواردو زۆر تێکۆشا تا پەردەی دردۆنگی لە نێوان هەڵبگرێو ڕێگای پێکگەیشتن هەموار بکا، ئەڵبەتە بێ سوود بوو.

مشک جوابی داوە: لە جێگایەک کە زاهیری حاڵ لە سەر بنەمای دوژمنایەتی دێتە بەرچاو، چۆن بە پێی چەند ڕووداوی ســـەرەتایی گومانی دۆستایەتی دێتە پێش، ئەگەر دۆســـتایەتییەکو تێکەڵاوییەک ڕوو بدا لـــە عەیبو عار بەدوورەو شـــکی لێ ناکرێ. وە دیسان لە جێگایەک کە لە دەروونداشکو گومانێک سەر هەڵبـــدا، ئەگەرچی بە ڕواڵـــەت رقو کینە لە ئارادا نەبێ، نابێ ســـەرنجی پێ بـــدرێو دەبێ لە خۆپارێزیو ئاگا لە خۆبووندا هیچ کۆتایی نەکرێ، چون زیانی زۆرەو عاقیبەتەکەی کارەســـاتە. ڕاست وەک ئەوە وایە: کەسێک لە سەر ددانی فیل دانیشێو خەیاڵی حەســـانەوەو خەوتنی لە سەردا بێ. بێگومان سەرەوبن دەکەوێتە ژێر پێی فیلو پانو فلچ دەبێتەوە.

وە خەڵکانی دنیا بۆ قازانجی خۆیان دۆست دەگرنو دووری لە دوژمنانیش بۆ زەرەر نەکردنە. بەڵام بوونەوەری عاقڵ تووشی زەحمەتێک بێ کە بۆ ڕزگاربوون لەو زەحمەتە چاوی لە دوژمن بێ، وە دەرچوون لە چەنگاڵی بەڵا بێ یارمەتی ئەو بەلایەوە ناموکین بێ، ڕوو لە دۆستایەتی دەکا و خۆشەویستی دەردەبڕێ. هەر وەها ئەگەر لە دۆستێک خیلافـو کەمشەرتی ببینێ دووری لێ دەکا و دوژمنایەتی دەســـت پێدەکا. وە بێچووی گیانداران بۆ شیرخواردن بە دوای دایکاندا هەڵدێن. وە کاتێک لەو خواردنە بوونەوە، بە بێترسو دڕدۆنگی، ئاشـــنایيو ناســـیاویش فەرامۆش دەکەنو هیچ زانایەکێش ئەو کارە بە دوژمنایەتی لێک ناداتەوە. بەڵام کاتێک سوودو قازانج بڕایەوە، کشانەوەش لە عەقڵ نزیکتر دەبێتەوە.

وە ئـــەوەش بزانە پیاوی عاقڵ لە کاراندا بە پێی سروشـــتی ڕۆژگار دەچێتە پێشو لە باراندا پۆستینو کەوڵ وەردەگێرێو بۆ هەر ڕووداوێک بە پێی بارودۆخو کاتو سات تەدبیرێک دەکا و دەگەڵ دۆستانو دوژمنان دە گێرو گرفتو ئاشتیو ڕەزامەندیو توندوتیژیدا بە شێوەیەک کە مەسڵەحەتی تێدابێ ژیان دەباتە سەرو

له هەموو بوارێکدا لایەنی سازشو مودارا دەبەر چاو دەگرێ.

وه بزانــه کــه بنەمای خولقانــی ئێمه لەســەر دژایەتی داڕێــژراوه. [ئەم دوژمنایەتییــه] له مرووری زەمــەن مایەی وەرگرتووەو ده سروشــتی ئێمەدا ریشــەی داکوتاوه. نابێ لەسەر دۆستایەتییەک که لەبەر حاجەتێک پێکهاتووه، پــاڵ بدەینەوه، ئەوه تەنیــا هەڵکەوتێکی بەدەگمەنەو هیچــی تر. که کاتێک هۆکارەکه لەناو چوو هەموو شــت دەگەڕێتەوه سەر دۆخی خۆی. هەر وەک ئاو که تا زەمانێک ئاوری له بن بایســێنی گەرمەو که ئاورت لێ ئەستاندەوه سارد دەبێتەوه. وه هیچ دوژمنێک بۆ مشک له گورپه خراپتر نییه، وه هەر دووکمان لەبــەر ناچاریو نیازێک که هاته پێش پێکەوه یەکمــان گرت. ئەمڕۆ که هۆی دۆستایەتی نەماوه، بێگومان دوژمنایەتی دێتەوه ئاراوه.

وه پێکەوەبوونی دوژمنی کزو بێرێز دەگەڵ دوژمنی تەیارو بەهێزو جیرانەتی دوژمنی بەقــودرەتو توانا دەگەڵ دوژمنی زەبــوونو بێنەوا هیچ خێری تێدا نییــه. وه من هیچ مەیلێک بەرانبەر به خۆم دەتــۆدا نابینم، مەگەر ئەوەی به خوێنو [گۆشــتی] من نەهار بکەیو به هیچ شــێوه نابێ فریوی تۆ بخۆم. وه کەی مشــک، له درێژایی زەماندا، متمانەی به گورپه کردووه؟ که وا بوو باشتر وایه بۆ پاراستنی ســلامەتی، بێهێز له هاونشینی بەهێز خۆی بپارێزێو عاجز له راوەســتان ده بەرانبەر ملهۆڕدا رانەوەستێ. که ئەگەر پێچەوانەی ئەوه روو بدا لایەنی بێهێز تووشــی برینو بەڵای گەوره دەبێو هەر کەســیش تووشــی لەخۆباییبوونو غەفڵەتی بێجێ بێ، رزگاری نایه.

پیاوی عاقڵ کاتێک هەوساری کاری خۆی کەوتەوه دەست، وه باری ناچاری لەناو چوو، دەبێ له دوورکەوتنەوه له دوژمن پەله بکا. وه مەسەلەن نابێ تاقه ســاتێکو کورته ماوەیەک مانەوەو راوەستانو ساوەساوه رەچاو بکا. هەر چەند متمانــەی به وەفا و پتەوی دۆســتایەتی له لایەن خۆیــەوه هەبێ، نابێ لەمەڕ دوژمن ئاوا بیر بکاتەوه. وه هەر چۆنێک بێ دەبێ رووگەردان بێ. وه هیچ شتێک لەباری وریاییو قایمەکارییو ســلامەتییەوه لــەوه عاقڵانەتر نییه که تۆ توخنی راوکەر نەکەوییو منیش له تۆ دوورەپەرێز بم. وه له نێوان دۆستاندا که رێگەی

هاودەمیو پێدانی دیاریو ســەوقات بەسترا و دڵدانەوەو مێهرەبانی وەستێندرا، وا باشە ســەفای بیروبڕوایان پتەو رابگرنو بناغەی یەکدڵیو یەکڕەنگی لەسەر یادو بیــرەوەری دەروون دابمەزرێنن. پاش ئەو کورتەیە دەبێ روون بێتەوە کە پێکەوەبوون مەجالی نییەو لە عەقڵو بیروبڕوای راست بەدوورە.

گوریە، پەرێشان حاڵی خۆی نیشاندا و دادو هاوارێکی کردو گوتی:

لــە دڵمــا ختۆکــەی جودایــی لــە تــۆ بوو
بەجێــم دێڵــی ئەممــا لەبەرچی وەهــا زوو؟
نەگونجــا کــە تێــرت ببینــم بــە چــاوان
قــەراری مــنو تــۆ ســەهۆڵو هەتــاو بوو؟[١]

بەو قسانە کۆتاییان بە دیدار هێنا و ماڵاواییان کردو لێک هەڵبڕان.

ئەوەیە داســتانی زانای رووناکبیر کە دەرفەتی ئاشــتیو رێککەوتنی دەگەڵ دوژمن لە کاتی پێداویســتیدا لە دەســت نادا و پاش گەیشتن بە ئامانج لایەنی قایمەکاریو هوشیاری فەرامۆش ناکا. سُبْحانَ الله، مشکێک بە هەموو وردیو کزی خۆیەوە کاتێک بەڵا دەوریان گرت، ورەی بەر نەدا و بە فێڵو مەکربازی یەکیانی کردە لایەنگری خۆی، تا بەم فێڵە مەترسیو بەڵای لەسەر لاچوو. وە لە عۆدەی پەیمانــی خۆی بەرانبەر بە دوژمن هاتە دەر. وە پاش تێگەیشــتنی مەترســی بۆ پاراســتنی خۆی لایەنــی قایمەکاری دە بەرچاو گــرت، ئەگەر خاوەنڕایانو هۆشیاران ئەم ئەزموونانە بکەنە سەرمەشقی ژیانو رێبازی خۆیانو لە دەسپێکی کاراندا ئەم ئاماژەو ئیماژانە بکەنە رێنوێن، دەبێتە هۆی کامرانیو ســەعادەتو بەختەوەری دنیا و قیامەت.

وَاللهُ وَلِیّ التَّوْفِیق

---

١. همی داد گویی دل من گوایی/ که باشد مرا از تو روزی جدایی
چنین من گمان بردەبودم ولیکن/ نه چونان که یک سو نهی آشنایی



# پادشا و پۆڕ

رای گۆتیه بەرەهمەنی: داســتانی ئەو کەســەم بیســت کە دوژمنانی زاڵو نەیارانی ملهوڕ دەوریان داوەو ڕێگەی دەربازبوونو شــوێنی خۆحەشاردانی لێ گیراوەو لە رووی ناچارییەوە پەنا بۆ یەکیان دەبا و ئاشتی دەگەڵ دەکا، تا لە دەست ئەوانی دیکە نەجاتی بێو پەیمانی خۆی دەگەڵ دوژمن بەرێتە سەر. وە پاش گەیشتن بە ئامانج، ئەوجار بۆ پاراستنی خۆی حەول بدا. وە بە بەرەکەتی تێبینیو وریایی لە دوژمن رزگاری بێ. ئێســتا باسی ئەوەمان بۆ بکە: هێندێک کەس هەن حەســوودو قین لە زگو تەژی لە دژایەتین. گەلۆ! دووریکردنو خۆ لێ لادان لەوانە باشــترە یا ئەوەی لێیان نزیک بێتەوەو دۆســتایەتییان بکەی. وە ئەگەر یەکێک لەوان خوازیاری دۆســتایەتی بــوو، دەکرێ رووی تێبکەیتو وەریبگری، یا رووی لێ وەرگێڕیو بەری بگری؟

بەرەهمــەن گوتی: هەر کەس بە دەروونمایەی رۆحی پاک ئاراســتەو تەیار بێو بە یارمەتی عەقڵی تــەواو رازاوە بێ، لە کاراندا وریاییو قایمەکاری زۆرتر بە واجیب دەزانێو خاڵەکانی خێرو شەڕو قازانجو زەرەر لەواندا زۆر چاک لێک دەکاتــەوە. وە دەبێ ئــەوەی لێ حاڵی بێ کە لە دۆســتی رەنجیدەو بەگلەیی دووریکردن باشترەو لە مەکرو غەدری ئەو خۆپاراستن پێویستە. بە تایبەت کە تووڕەیی دەروونو جیاوازی بیروڕای ئەو بە چاوی عەقڵ دەبینێو ئەو شتانە بە نیســبەتی خۆی بە تەنەخییەکی رەمزاوی یا شەڕفرۆشــییەکی ئاشکرا دادەنێ.

چون ئەگەر بە زبانچەوریو جامەلووسکێی ئەو هەڵفریویو لایەنی خۆپارێزی دە بەرچاو نەگرێ، بێگومان گیانی خۆی دەکاتە نیشانەی تیری بەڵا و تیغی پەتا بە مێقناتیزی نەفامی بۆ لای خۆی رادەکێشێ. وە نموونەی ئەم جۆرە برایەتییە، داســـتانی باڵندەکەیە. پادشا پرسی: ئەم داستانە چۆنە؟ گوتی: دەگێڕنەوە کە پادشــــایەک بوو، ناوی "کوڕی مەدین" بوو. باڵندەیەکی بوو بە ناوی "پۆڕ"؛ زۆر هەستیارو دەنگخۆش بوو. لە کۆشکی پادشادا هێلکەی کردو جووجکەی هەڵێنا. پادشــــا فەرمووی بیبەنە ئەندەروونو حەرەم. وە دەستووری دا زۆری ئاگاداری بکەن. پاش ماوەیەک، خودا کوڕێکی دا بەو پادشایە کە رووناکی گەشەو عەقڵو نەجابەت لە نێو چاوانیدا خۆی دەنواند. وە تیرێژی ئیقبالو بەختەوەری لە سەر رووپەری ئەحواڵی ئەودا دەدرەوشا.

وردەوردە شـــازادە بوو بە هۆگری بێچووە پۆڕ. هەموو رۆژێ کایەی دەگەڵ دەکرد. پۆڕەکەش هەموو رۆژان دەرۆیشتە چیا و دوو دەنکی میوە دێنا، کە هیچ کەس ناوی ئەو میوەیەی نەدەزانی. دەنکێکی دەدا بە کوڕی پادشا و یەکی دەدا بە بێچووەکەی خۆی. کوڕی شـــا و بێچووی پۆر بە ئیشــــتیا دەیانخواردو لەبەر شـــیرینیو تامخۆشی حەزیان لێ دەکرد. کارتێکردنی باشی ئەو لە گەشەکردنی جەســـتەو گەورەبوونیاندا دیار بوو. تا ئەو رادەیە کە زوو گەورەبوونو نیشانەی بەقازانجبوونـــی ئەو میوەیە بۆ هەموان دەرکـــەوت. وە هەر ئەوە بوو بە هۆی قەدرو قیمەتی "پۆڕ"و رۆژ بە رۆژ پلەوپایەی پتر بەرز دەبۆوە.

ماوەیـــەک بەســـــەردا تێپەڕ بوو. رۆژێک پۆڕ غایب بـــوو. بێچووەکەی خۆی بە کوڕی پادشا دا و بە نەوعێک ئازاری پێ گەیاند. ئاگری تووڕەیی، شازادەی خستە گەرداوی نەفامی. تا خۆڵی دە چاوی پیاوەتی خۆی کردو هاودەمی کۆنو تازەی لە بیر بردەوە، قاچی بێچووی گرت، بەدەوری سەری خۆیدا هەڵیسووڕاندو بە زەویدا دا. وەها بە توندی کە دەســـتبەجێ مرد. کاتێک پـــۆڕ گەڕاوە؛ بێچووی خۆی بە مردوویی چاوپێکەوت. تووشی غەمو پەژارە هاتو هاوارو فیغانی دەست پێکرد. بە بانگو سەڵا دەگریا و دەیگوت: قوڕ بە سەر ئەو کەسەی دەبێتە هاودەمی ملهۆڕانو زۆرداران کـــە گرێی پەیمانیان زوو دەکرێتەوەو روخســـاری وەفایان بە چنگوڕکی

جەفــا بریندار دەبێ، نە یەکدڵیو نەســیحەت لە لایان پێگــەو نە حزمەتکردنو یەکرەنگــی لە دڵی ئەوانــدا وەزنێکی هەیە. دۆســتایەتیو دوژمنایەتی ئەوان بە نیازو حاجەتیان بەستراوەتەوە. لێبوردن دە مەزهەبی تۆڵە سەندنەوەدا بە حەرام دەزانن. پامالکردنی ماف، دە شــەرعی غروورو ملبادانی ئەواندا مەباحە. بەرهەمی خزمەتــی دیتران بە کەم دادەنێن. وە ســزای هەڵخلیســکانی پیاوکوژان درەنگ فەراموش دەکەن. ئەگەر خۆیان کارەســاتی گــەورە بقەومێنن، بەلایانەوە گرینگ نییــەو هەڵەی چکۆلــەی خەڵکی دیکە زۆر بە گەورە دەزانــن. هەر چی بێ، من دەرفەتی سزادان لە دەست نادەمو تۆڵەی بێچوولەکەی خۆم لەم زۆرداره بێبەزەیە دەســتێنمەوە کە هاونشینو هاوتەمەنی خۆی کوشت. وە هاومالو هاوخەوی خۆی بە هیلاک برد. ئەوەی گوتو خۆی بە شــازادەدا دا و چاوی دنیابینی لە کاســە دەرهێنا و لە شەقەی بالانی دا و لە شوێنێکی بڵندو مەحکەم نیشتەوە.

هەواڵی ئەم رووداوە بە پادشــا گەیشت، بۆ چاککردنەوەی چاوی کوڕەکەی خەرجی زۆری کردو ویستی "پۆڕ" بگەڕێتەوە. وە بە داوی مەکرو حیلە بیخاتە ناو رکەی مەینەتیو بەلا. جا، ئەو دەم ئەوەی سزای کەسێکی بێدوارۆژو بێتێبینی وەک ئەوە، لە بارەیدا بەڕێوە بچێ. سواری ئەسپێکی تۆسنو سەرکێش بوو کە چوار پەلی لە عاســمان دەدا. رۆیشتە نزیک ئەو شوێنە کە پۆڕ لێی نیشتبوو. بانگی کردو گوتی: "وەرە خوار تۆ ئەمینی". پۆڕ ملی با دا و گوتی: "فەرمانی پادشــا لەسەر من فەرزەو بیابانی دووری ئەو بێگومان درێژو بێپایانە، چونکە لە هەمــوو تەمەنمدا کەعبەی ئارەزووی من درگای ئەو بووەو بەختەوەری خۆم دە رێزو حورمەتی ئەودا دیوە. وە ئەگەر گیانی شیرینی من بایەخێکی هەبووایە پێشکەشــم دەکرد. وە قەرار لەسەر ئەوە بوو منِ لە سایەی پادشادا بە ئارامی بژیم. ئێســتا کە خوێنی کوڕم دە حەریمی ئەودا رژاوە، ئایا دەتوانم ئارەزووی گەڕانەوەم ببێ؟! باشترین رێگە بۆ من دژایەتی دەگەڵ ئەم فەرمانەیە. وە چون پادشــا رەحمو بەزەیی زۆرە هیوادارم لێم ببوورێ. وە پادشــا باش دەزانێ کە پیاوی خەتابار ناتوانێ ئەمین بژی. ئەگەرچی لە ئێستادا هیچی دەگەڵ نەکەن، لە داهاتوودا عەزابو ســزادان بێگومان چاوەڕوانیەتــی. وە هەر چەند رۆژگار

زۆرتر تێپەڕێ ئەو رقە توندتر دەبێ. وە ئەگەر بە یارمەتی چارەنووسو بەختو نێوچاوان رزگاریشـــی بێ، ئەوەو نەتیجە تاڵی ئەو سزایە دەچێژنو رۆژەرەشیو بەدبەختییەکەی دەبینن. وە کوڕی پادشـــا، ئەو بەڵایەی بەسەر جووجەڵەی من هێنا و منیش لە غەمو سۆزی منداڵدا ئەو جوابەم داوە. وە من نابێ بڕوا بە تۆ بکەمو بە گوریسی مەکرو فێڵی تۆ نابێ بچمە ناو چاڵاو".

پادشا گوتی: "لە هەر دوو لامان سەرەتا و لاوەتی رۆیشت. ئێستا نە تۆ ئێمە دەبوغزێنیو نە تۆش ئازارێکت لە لای ئێمەوە پێ دەگا. بەقسەی من باوەڕ بکەو بێهوودە خۆت تووشـــی دەردی بێدەرمانی دووریو لێک هەڵبڕان مەکە. ئەوەش بزانـــە من تۆڵەکردنەوەو خۆئاســـوودەکردن بە عەیبو عارو شـــوورەیی زەمانە دەزانمو هەرگیز دەژیانمدا زێدەڕۆیی دەو کارەدا بە باش نازانم".

گنج لە نێو چاوانـــی من بێگانەیە
رق لـــە نێو دڵما مەلـــی بێلانەیە[1]

پـــۆڕ گوتی: گەڕانەوە هەرگیـــز مومکین نابێ، کە زانایـــان گوتوویانە: "وە دۆســـتی ترســـاو مەکەون". وە دەڵێن، هەر چەندی زۆرتر لوتفو چاکە دەگەڵ پیاوی رەنجاوی دڵشـــکاو بکەیو حورمـــەتو رێزی زۆرتر لێبگری، بەدگومانیو نەفرەت زۆرتر دەبێو خۆ پاراستنو ئاگاداری لە خۆ پێویستتر. وە زانایان دایکو باوک وەک دۆســـتان دێننە ئەژمارو بـــرا وەک هاوڕێو ژن وەک هاودەم چاو لێ دەکەن. وە خزمو ئەقرەبا وەک تاوانگرانو کچ لە تەرازووی دوژمناندا حیســـاب دەکەن. کوڕیان بۆ مانەوەی ناو و ناوبانگ دەوێ. وە لە نەفسو زاتدا خۆیان بە هەڵکەوتەی یەکدانە دەزاننو کەس ناکەن بە شـــەریکی ئەم عیزەتو ئیحترامە. چون هەر کات مەترسییەک بێتەپێش، هەر کەسە پەنا دەباتە قوژبنێکو بە هیچ کلۆجێک خۆی دە پێناو کەس نانێ.

دەگێڕنـــەوە لە دوور زەمـــان، پیرێژنێکی بابانوێران، لـــە گوندێک بە ناوی "چەکاو"، کیژێکی بوو وێنەی هەتاو، نۆبووکێک، بەژن وەک چنار، گەردن کێلو مەمکهەنار. ناوی کچە مەهەستی بوو، لە حوریانی بەهەشتی بوو لەبەر جوانی

---

١. خشم نبوده است بر اعدام هیچ / چشم ندیده‌ست در ابروم چین.

بەچاوە بوو. پیرێژن دنیای لێ تێکچوو، جەرگ سووتاو، دڵ وەک پۆلوو. ئەو پیرێژنە چارەرەشە سەربەهەشە، لەماڵی دنیا، دوو مانگای بوو. ڕۆژێک لەو دوو مانگایە، یەک، بۆ خواردنی هێندێک کەپەک، سەری خۆی دە کووپەڕا کرد. سەر دەکووپەدا گیری کرد. بە کووپەوە لە مدبەقرا، بۆ لای پیرێژن وەرگەڕا پیرێژن وای دانا کە چێڵ، دیوەزمەیە یا ئیزراییل، ئیزراییلەو بۆ گیانکێشان، هاتۆتە شوێنی نەخۆشان هاواری کرد ئەی مەلکەمووت، قاچو قول زلی کەللەپووت. مەهەستییە نەخۆشەکە، تەما دەگیانی من مەکە، بەڵێ وایە، دنیا وایە، هەر کەس دە فکری خۆی دایە، لە نێو خەڵکی ئەم سنوورە، ئەم مەسەلە زۆر مەشهوورە، ئاگرە سوورە، لەمن دوور بێ! جەهەننەم، دنیا خاپوور بێ.

وە من ئەمڕۆ لە هەموو شتێکو لە هەموو کەسێک رووگەردانمو لە خزمەت تۆدا، ئەوەندەم باری غەم هەڵگرتووە کە وەختە پشتی وشترم بشکێنێ. وە کام جانەوەر تابشتی بردنی ئەم بارەی هەیە؟ کە دەبینم، میوەی دڵو گیانو جگەرگۆشەی خۆمو نووری چاوەکانمو رەحەتی گیانم لە هاودەمی تۆدا لە دەست چووە.

به من دوژمن کەنیو دۆستیش لە تاوانم قورپی پێوا

کە بێگیانو دڵو دیدە چلۆن توانی بژی تاوێ[1]

وە بەو حاڵەوە لە خۆم ئەمین نیمو بەم لاواندنەوەیە هەڵفریوان لە عەقڵو تێگەیشتن بە دوورە. من چارەم هەڵبڕانەو ددان بە جەرگدا گرتن.

پادشا گوتی: "ئەگەر ئەم کارە سەرەتا لە تۆوە دەستی پێکردبا، هەقت بوو دووری بکەیو ئاگاداری لە خۆت بکەی، بەڵام چون، بۆ قەساسو سزادان ئەو کارەت کردووە، عەداڵەتیش هەر لەوەدایە، کەوابوو نەفرەتو دووریکردنت لە چییە؟ پۆر گوتی: "شوێنی توورەیی لە دەروونداە بە ئێشو ئازارەو جێگەی حەسوودی لە دڵاندا بە ژانو برکە، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە شتێک بڵێن، جێگەی متمانە نییە، کە زبان لەم بوارانەدا ناوەرۆکی بڕوا نادرکێنێو بەیان لەم بارەوە راستگۆ نییە. بەڵام دڵەکان بۆ یەکتر شاهیدی عادڵنو شایەدی یەکیان لە سەر ئەوی دیکە دەتوانین بە راست بزانین. وە دڵی تۆ لەو فەرمایشتانەتدا

---

١. دشمن خندید بر من و دوست گریست / کو بی دل و جان و دیده، چون خواهد زیست.

دەگـــەڵ زبانت یەک نیـــن، وە من بێڕەزایی هەیبەتی تۆ دەناســـمو هیچ کاتو ساتێک لە توورەیی تۆ دە ئەماندا نیم".

پادشا گوتی: "لە نێوان دۆســـتانو ئاشنایاندا رقو کینە زۆر سەر هەڵدەدا. چونکە دانیشســـتووانی ئـــەم جیهانە ناتوانـــن هەموو رێگەیەک بەســـەر ئازارو دوژمنایەتیدا ببەســـتنو هەر کەس بە نووری عەقـــڵ رازابێتەوەو زانایی دەکار بێنی تێدەکۆشی ئەم دژایەتیو دوژمنایەتییانە بمرێنێو بە دوای بووژاندنەوەیاندا نەچـــێ". پۆڕ گوتی: "اَلعَوانُ لاتُعَلَّمُ الخِمرةُ"،[١] یا وەک دەڵێن: قامکم دەزاری بنێ بزانە گەزەگەزەی دەزانم! من ســـاردو گەرمـــی رۆژگارم زۆر دیتووەو عومرم دە تەماشاکردنی تەختەنەردی گەردووندا بەسەر بردووە. زۆر شتی گرانو بەقیمەتم لە ژێر رەشماڵی ئەم دنیا سەیرو سەمەرەیەدا بە با داوە. وە ئەزموونو تەجرەبەی زۆرم وەدەســـت هێناوە کە پشتیان پێ دەبەســـتم. وە بەراستی تێگەیشتووم، کە هەر کەس لە ســـەر گۆی زەوی دەســـتی خۆی رەها ببینێ، دڵی ئەو وەک ســـەری گۆچان بۆ هەمووان خوار دەبێتەوەو بە تەواوی تەوقی سەری پیاوەتی خۆی دەخاتە ژێر پێی جەماوەرو روخساری شەرمو حەیا دەڕنێو بریندار دەکا. مـــن ئەم راســـتییانەم لێ تێک ناچێو بە هەڵە ناچـــم، وە فریودانی پیاوی پیر خۆماندووکردنو کات بەفیڕۆ دانە، وە ئەوەی پادشا دەیفەرموێ، عەینی راستیو حەقیقەتی مەحزە؛ بەڵام لە ئایینی عەقڵدا، قبووڵی بیانووی کەســـانی خاوەن رقو کینە دروست نییەو داواکردنی ئاشتی لەوانەی دوژمنن، حەرامە. چون ئەو کارە مەترسیو هەڕەشەی گەورەی تێدایەو گیانبازی نەردێکی گرانە. تا حەریف زەریفـو تاســـەکان دروســـت، ئەوەی کایەی دەگەڵ دەکەی ئەمینو دەستپاک نەبێ، دەستپێکردنی نەردێن رەوا نییە. هەر وەها مومکین نییە کە دوژمن ترس نەخولقێنێو دەفکری تۆڵەو ســـزاداندا نەبـــێ. وە زۆر دوژمن هەن کە بە هێزو دەســـەڵات دەرەقەتیان نایەیو بە فێڵو پیلان دەتوانی دە داویان بخەی. وەک چۆن فیلی وەحشی بە هاودەمی دەگەڵ فیلیماڵیو دەستەمۆ دە داو دەکەوێ. وە من بە هیچ شێوەو لە هیچ حاڵێکدا لە تۆڵەسەندنەوەی پادشا ناتوانم ئەمین

---

١. ژنی بەئەزموونو شووکردوو فێری چارشێوو مەقنەعە ناکەن.

بم. ڕۆژێک لە خزمەت ئەودا بۆ من بە ساڵێک تێپەڕ دەبێ، چونکە سەرگەردانیو کلۆڵی منو لەو لاشەوە هەیبەتو شکۆی ئەو ئاشکرایە".

پادشــا گوتی: "پیاوی ســەخیو بەخشندە، دۆســتی خۆی بەجێ ناهێڵێو بە هەر بەدگومانییەک برایەتیو دۆســتایەتی هەڵنابڕێ. وە ئاشــنایەتی کۆنو هاودەمی ڕاستەوخۆ بە گومانی ڕووت زایە ناکا. هەر چەند لەو کارەدا مەترسی کوژرانو لەدەستدانی گیان لە ئارادا هەبێ. وە ئەم خەسڵەتە لە گیاندارانی کەم قەدرو بێقیمەتیشدا دەبیندرێ. اَلْمَعْرِفَةُ تَنفَعُو لَو مَعَ الكَلْبِ الْعَقورْ.[1]

پۆڕ گوتی: "حەسەدو ئازار لە بنەڕەتدا ترسناکن. بەتایبەتی ئەگەر لە دەروونی پادشایاندا هێلانە بکەن. چون پادشا بۆ ئەوەی ئاسوودە خاتر بێ، سەختی دەگرێ، یانی لە مەزهەبی شــفای دەروونیدا مەحکەمو پێداگرەو لە ئایینی تۆڵەسەندنەوەدا زێدەڕۆییــە. کاتێک غەزەب دەگرنو تــووڕەن، گەڕاندنــەوەو ئازادکردن ڕەچاو ناکەنو دەرفەتی ســزادان بە واجیبی سەرشان دەزانن. وە وەگەڕخستنی عەزمو ئیرادەی خۆیــان لە زەبوونکردنی پیاوکوژانو ســزادانی هەڵەی ئاژاوەگێڕاندا بە شانازی گەورەو زەخیرەکردنی سوودو بەهرە لە قەڵەم دەدەن. وە ئەگەر کەسێک چاوەڕوانی پێچەوانەی ئەمە دەکا ڕووزەرد دەبێ، کە فەلەک لەم هەوەسەدا چاوی پێ سپی بوو و لەم تەلاشەدا پشتی چەما و بە مرادی خۆی نەگەیشت".

وە مەســەلەی کینە لە ســینەدا، تا کاتێک ماندەرێک لــە ئارادا نەبێ وەک سەلکەبزووتی هەڵایساوە؛ ئەگەرچی ئێستا کارێک ناکا، دەگەڵ هەلی بۆ هەڵکەوتو هۆکارێک پەیدا بوو، هەر بەوجۆرە کە ئاگر دەگەشــێتەوە، گڕە مەشــقەڵ بەرز دەبێتەوەو دنیایەک دەســووتێنێو چرەدووکــەڵ، دڵو دەماغ هەڵدەچێنێ. وە هەرگیز ســووتمانێکی لەم چەشنە بە ماڵو قســەو پاڕانەوەی پیاوکوژو لوتفی خەتابارو کلکەســووتەو شــینو ڕۆی گوناهکارو یەکدڵیو دڵسۆزی خزمەتکار، دانامرکێو هێور نابێتەوە، وە تا نەفســی ئــەو تاوانبارە مابێ، هەڵچوونی ڕقو تووڕەیی کەم نابێتەوە. وەک چۆن تا دارو دەســتەچیلە هەبێ ئاور ناکوژێتەوە. لەسەر ئەو کشــتە باسانەشدا ئەگەر کەســێک لە خەتاکاران دەرفەتی ئەوەی

---

[1] ئاشناییو دۆستایەتی قازانجی هەیە، تەنانەت دەگەڵ سەگی دڕندەش بێ.

ببێ کــە دەرهەق بە دەوروبــەر چاکەیەک بەجێ بێنێو بــە دوای ڕەزامەندی دۆستانەوە تەلاشێکو حەولێک بدا و لە وەدەستهێنانی قازانجو بەرگری لە زیان پشــتیوانییەک بە پێویســت بزانێ، ڕەنگە ئەو ترسو نیگەرانییە لە ناو بچێو هــەر وەها دڵــی پیاوی ڕەنجاو کەمێک هێور بێتەوە، هەر وەها دڵی ترســاوی خەتاباریش بە شــنەی دڵنیاییو هەست بە ئاسایشکردن فێنک بێتەوە. وە من لەوە زەعیفترو عاجزترم کە لەم بابەتانە شــتێک بخەمە سەر بیرو یادی دۆستی خــۆم، یا بتوانم بیــر بکەمەوە کە خزمەتی من هۆکاری ڕەنجاویو دڵشــکاوی لەناو بەرێو هۆکاری هاودەمی بە باری ئیجابیدا بچەرخێنێ. ئەگەر بگەڕێمەوە، بێوچان لە ترسو دڵەراوکێدا دەبمو هەر ڕۆژ، بەڵکوو هەر سەعات مەرگی خۆم بە چاوان دەبینم. لەم گەڕانەوەیەدا بۆ من، سوودێک نەماوەو خۆم بۆ خوێنبایی دان ئامادە نابینمو ناتوانم گەردنم بخەمە بەر تیغی تیژ".

پادشا گوتی: "هیچ کەس بە بێ ویستی خودای باری ناتوانێ زەرەر یا قازانج بــە کــەس بگەیەنێ. وە زۆرو کەمو گەورەو بچووکی ئــەم بابەتانە بە تەقدیرو حوکمی ئەزەلییەوە بەســتراوەتەوە. هەر وەک چۆن دەســتی ئافەریدەی خودا لە بەدیهێنانو زیندووکردنەوەدا کورتە، مراندنو لەناوبردنیش لە دەســتی ئەودا نییە. وە پەلاماری کوڕی من لە سەرەتادا و سزادانەکەی بە دەستی تۆ بە قەزای ئاسمانیو مەشیەتی یەزدانی هاتنە ئەنجام دان. وە ئەو زاتە پاکە هۆکاری ئەم مەبەســتەو شەرتی ئەو حوکمە بوو. ئێمە بە مقەدەری ئاسمانی سزا مەدە، کە ئەگەر ئەم هیجرانە ڕوو بدا دەبێتە هۆی پەرێشــانی دەروونو پەشــێوی فکرو بیر. وە شــادمانیو خۆشحاڵی لە کامەرانی کاتێک دەست دەدا کە خزمو قەومو دەستو پێوەندیش تێیدا بەشدار بن".

پۆڕ گوتی: بێدەسەڵاتی مەخلووق لە دوورکردنەوەی قەزا و قەدەری خالەق عَزَّاسْــمُهُ ئاشکرا و ڕوونە، وە قەرار دراوە کە هەموو چەشنە خێروشەڕو زەرەرو قازانج لەسەر تەوەری ویستی خودای مەزن بگەڕێو بە خۆزەحمەتدانو تەقالای خەڵکان پاشو پێش نابێو درەنگو زووی تێ ناکەوێ. بەڵام لەسەر ئەم قسانەشڕا بیروڕای گشتی لەسەر ئەوە کۆکەو هاودەنگە کە نابێ لایەنی وریاییو قایمەکاری

فەرامۆش بکرێو دەبێ خوت لە مەکرو پیلان بپارێزی. وشترت ببستەوەو تَوَکَّل عَلَـیالله. وە لە نێوان فەرمایشـــاتو کردەوەی تـــۆدا مەودایەکی زۆر هەیە. وە رێگەی بێپەروایی ترســـناکەو منیش نەخـــۆشو دەردەدار. وە خۆدوورکردنەوە لە مەترســـی پێویســـتەو تۆ دەتەوێ دەردی دڵی خۆت بە کوشـــتنی من شیفا بدەیو بە فێڵو کەڵەک دە داوم بخەیت. نەفســـی من لە مردن بێزارەو ئەلحەق هیچ گیانلەبەرێک بە مەیلو ئیختیاری خۆی ئەم شـــەربەتە هەڵناقورێنێ وە تا زەمانێک هەوساری مراد بە دەست ئەوە لە مردن خۆی دەپارێزێ. وە گوتوویانە کـــە: غەم بەڵایەو فەقیری بەڵایەو نزیکبوون لـــە دوژمن بەڵا و دووری لە یاران بەڵا و کەنەفتیو بێتاقەتی بەڵا و ترس بەڵا و سەردێری هەموو بەڵاکان مەرگەو سۆفیانی خواناس ناوی "ئافەتی گەورەیان" پیداوە.

وە کەســـێک دەتوانێ بزانێ دەروونی مرۆڤی کۆســـتکەوتوو چی تێدایە، کە خۆی چەنای چەن جار، تووشی سۆزی زریانی کۆستکەوتن هاتبێو لەو شەربەتە تاڵانـــەی هەڵقوڕاندبێ. وە من ئەمڕۆ لە دڵی خۆمەوە دەتوانم ئاگاداری بیروڕای پادشـــا ببمەوەو دڵتەنگـــیو پەژارەی ئەو بە چاوی عەقـــڵ دەتوانم ببینمەوەو زۆری ئەسەفـو دادو فیغانی من نیشاندەری ئەحواڵی ئەوە. وە متمانەی تەواوم هەیە کە هەر کات پادشـــا وەبیر کوێربوونی کـــوڕی بکەوێتەوەو منیش بیر لە بێچوولەکەی خـــۆم بکەمەوە، ئاڵوگۆڕێک دەروونمان دەهەژێنێ کە نازانین چی لێ هەڵدەستێ. لەم باسەدا لەسەر ڕۆیشتن سوودێکی نییەو دەست لێک بەردان لە هەموو کارێک باشترە. هەتا مردن بترسە لەو کەسەی ئازاری تۆی کێشا[1].

پادشـــا گوتی: "ئەو کەســـەی نەتوانێ لە هەڵەی دۆستان چاوپۆشی بکا چ خێرێکی هەیە. ئەو کەسەی نەتوانێ ئێشو ئازارو ڕقو کینە وەها توور هەڵبدا کە هەرگیز نەگەڕێتەوە سەریان و بە هیچ کلۆجێکو لە هیچ حاڵێکدا لەسەر لاپەڕەی دڵی کەمو زۆر لەوانە شتێک نەمێنێو تۆبەو پەشیمانیو داوای لێبوردنی دۆستان بە رووگەشی وەرنەگرێ، ئەوە پیاو نییە. وە پێت بڵێم من دەروونی خۆم سافـو بێخـــوش دەبینمو لەو بابەتانەی کە باس کران هیچی تێدا نابینمو هەمیشـــە

---

١. با هرکه بدی کردی تا مرگ براندیش.

رەهەندی لێبوردنو لێخۆشبوونی من بۆ ئەو کەسانەی ژێردەستی منن، ئاشکرا و بەرچاو بووە. وە ئیحسانو چاکەی من دەگەڵ خزمەتکاران پسانەوەی نەبووە".

پۆڕ گوتی:

گژەبـــای تۆڵـــەت بدا لـــە دەریا
دەیکا بـــە تۆزو دەریا بـــا دەیبا[1]

وە من دەزانم کە خەتابارم. وە هەر چەند دەستپێشخەر نەبووم، بەڵام سەرەڕۆ بووم. وە هەر کەس قاچی زامدار بێ، هەر چەند بێباکو بەگوڕو تینیش بێ، بە نێو بەردەڵانـــدا هەڵاتن بە ناچاری بە رەوا بزانێ، بێگومان برینی دەکولێتەوەو پای لە کار دەکەوێو تەنانەت ناتوانێ بە سەر خاکی نەرمیشدا بڕوا. وە کەسێک بە چاوی نەخۆشـــەوە پێشوازی لە بای شـــەماڵ بکا، دیارە دەیەوێ کوێر بێ. وە نزیکی من لە تۆ هەر لەم مایەدایەو دووریکردن لەو حاڵەتە هەم لەباری شـــەرعو یاسای دابو نەریتـــەوە فەرزە. قـــالَ اللهُ تعالی وَ لا تُلقوا بِاَیْدیکُمُ الـی الْتَّهلُکَهِ[2]، وە توانایی خەڵکان لەوە ناتوانێ هەوراز بچێ کە دە پاراستنی زاتی خۆیاندا ئەوەندە زێدەڕۆیی بکەن، کـــە لە لای خۆیان مەغروور بن. چون هەر کەس بـــە توانایی خۆیو هێزی خۆی، زۆر متمانەی هەبێ، بێگومان تووشـــی گرفتارییو تەنگـــەژە دەبێو خۆتێوەردانو هەڵســـووڕانی ئەو دەبێتـــە مایەی هیلاکەتو تێداچوون. وە هـــەر کەس ئەندازەی تەعامو شـــەراب نەزانێو ئەوەندە بخوا و تێ باخنێ، کە گەدە نەتوانێ هەزمی بکا، یـــا پارووی لە قـــەدەر زاری نەبێو بە گەروویدا رۆ نەچێ، وەها کەســـێک دوژمنی خۆیەتی.

وە هەر کەس، فریوی فڕوفیشاڵی دوژمن بخوا، بە کەرەپیاو حیساب دەکرێ. وە هیچ کەس نازانێ چارەنووســـی لە دوای چی وێڵـــەو پیاو دەبێ چاوەڕوانی بەختەوەری رۆژگار بێ یا ژیانێکی پڕ مەینەتیو داماوی. بەڵام لەســـەر هەمووان واجیبە کە کاروباری خۆیان لەســـەر بیروڕای دروســـتو مەحکەم بەڕێوە بەرنو لایەنی وریاییو قایمەکاری دە بەرچاو بگرنو لە هەڵسەنگاندنی نەفسی خۆیاندا،

---

۱. گر باد انتقام تو بر بحر بگذرد / از آب هر بخار که خیزد شود غبار.
۲. خودای مەزن فەرموویەتی: بە دەستی خۆتان، خۆتان بە هیلاکەت مەدەن.

پشت بە دەلیلو بەراوردکاری ببەستنو لە مەیدانی تاسەو هەوادا لەغاوی خۆیان توند بگرنو لە کاری خێردا دەگەڵ دۆستو دوژمن کێبەرکێ بکەن، تا هەمیشە ئامادەی قبووڵو پێشوازی لە دەوڵەت بن. وە ئەگەر ڕووداوی باش ڕوو بدا لە بەرەکەتو جەماڵی ئەو بێبەش نەبن.

وە کاروباری دنیا لەسەر ڕەوتی حوکمی ئاسمانی دەڕوا و لەم ڕەوتەدا کەمو زۆرو درەنگو زوو نییە. وە بەگشتی، دەتوانین ئەو کەسە بە عاقڵ بناسین کە لە زوڵمکردنو ئازاردانی گیانداران دووری بکا، وە تا ئەو دەمەی ڕێگەی دەربازبوون لە بەردەمی ئاواڵە بێ، لە شەڕگەی خۆفو خەتەردا ڕانەوەستێ. وە من لە شوێنی خۆحەشاردان نزیکمو ڕێگەی دەربازبوونیشم زۆرن. وە حەرامە بۆ من کە لەم سەرگەردانیو دڵەڕاوکێیەدا بوەستم. چونکە توورەیی پادشا، خوێنی من حەڵاڵ دەکا و ئەو بەڵایانەی لە ڕوانگەی ئایینو جوامێرییەوە مەباحە بەسەر منی دێنێ. هیوادارم دەچمە هەر شوێنێک، بژیویو بەرێچوونی منی تێدا بێ. چون هەر کەس پێنج خەسڵەت بکاتە دەسمایەو سامانی خۆی، ڕوو دە هەر لایەک بکا، مەبەستەکانی تووشی کەندو کۆسپ نایەنو لە چاوەدێری دۆستان بێبەهرە نابێ. وە ترس لە غوربەت وەردەگەڕێتە سەرباری ڕەحمەتو هاودەمی. [ئەم پێنج خەسڵەتە ئەوانەن]. دووربوون لە بەدکرداری، وە لەشکو گومانو مەترسی خۆخاڵیکردن، وە جوانی ئەخلاق بە پێویست زانین، وە زاهیرو باتینی خۆ بە کەمئازاری بەستنەوە؛ خۆشڕەفتاری لە هەموو کاتو ساتاندا. وە بوونەوەری عاقڵ کە لە زێدو شوێنی لەدایکبوونو لە نێو خزمو عەشیرەتدا لە گیانی خۆی ئەمین نەبوو، دەبێ دڵی لە دۆستو کەسو کاروماڵو منداڵ هەڵکەنێ، چون ئەو شتانە وەگیر هێنانەوەیان دەست دەدا، بەڵام نەفسو زاتی خود وەدەست ناکەوێتەوە. ناڕوێتەوە ئەم بەندەیە، خۆ قامیش نیم[١].

وە دەبێ بزانین کە بێفایدەترین ماڵو سامان ئەوەیە کە سوودو بەهرەی لێ نەکەوێتەوەو بەخشینو بڵاوکردنەوەی لەسەر نەکرێ. وە ناجسنترینو بەدعەمەلترینی ژنان ئەوەیە کە دەگەڵ مێرد پێ ڕانەکێشێو نەسازێ، وە

١. این بنده دگر باره نروید، نی نیست.

خراپترین ئەولاد ئەوەیە کە لە فەرمانی دایکو باوک مل با دا و لەسەر نافەرمانی خۆی مکوڕ بێو دەستقووچاوترین دۆست ئەوەیە کە لە کاتی نەداریو نەهاتیدا دۆستیو راستگۆیی وەلا بنێ. وە غافڵترین پادشایان ئەو کەسەیە کە بێگوناهان لێی بترسنو دەپاراستنی وڵاتو ئاگاداریکردن لە رەعیەتدا هەڵسووڕاو نەبێ. وە کاولترین شار ئەو شارەیە کە ئاسایشی تێدا نییە.

وە هەر چەند پادشـــا، مەرحەمەتو لوتفی خـــۆی دەنوێنێو متمانەو ورەی دڵم پێ دەبەخشـــێو بە عەهدو پەیمان پشت ئەستوورم دەکا، بەڵام لێی ئەمین نیـــمو لە خزمەتو جیرانەتـــی ئەودا ناتوانم بە ئەرخەیانـــی بژیم. چون رۆژگار لێکترازانێکی خستە نێوانمان کە بە هیچ شتێک ناگەینەوە یەک. وە لە داهاتوودا هەر کات تاسەی دیداری بکەم، حەکایەتی جەماڵی لە سەر مانگ چاو لێدەکەمو هەواڵی ساغو سڵامەتی ئەو لە شنەبای بەیانان دەپرسم. وە پادشاش هەر بەم شێوەیە لە حاڵو رۆژی من ئاگادار دەبێتەوە.

هەستە ئەی ســـروە برۆ بێنە هەواڵێک لە گوڵم
پێی بڵێ من لە غەمی چەندە بەســـۆزو بەکوڵم[1]

بەو گوتە بەسۆزەوە قسەکانی کۆتایی پێهێنا و ماڵاوایی لە پادشا کرد.

ئەوەیە چیرۆکی خۆپارێزی لە دوژمنی زاڵو بەدەســـەڵاتو خۆرزگارکردن لە درۆ و دەلەسەی دوژمنی بەهێز. وە بۆ پیاوی عاقڵ شاراوە نییە کە مەبەست لە باســـکردنی ئەم بابەتانە ئەوە بووە کە زانایان لە رووداواندا ئەو پەندانە بکەنە رێ نیشاندەرو چاوساغو بناغەی کاری خۆیانی لە سەر دابڕێژن.

خودای تەعالا هەموو ئیمانداران بکاتە ناســـەرو شناســـای مەسڵەحەتەکانی ئێستا و داهاتوو و بەرچاویان بۆ نیزامو بارودۆخی دنیا و دوارۆژ روون کاتەوە.

بِمَنِّهِ وَ رَحْمَتِهِ

---

١. ای باد صبحدم گذری کن به کوی من / پیغام من ببر به بَر ماهروی من.

## ٩
# شێرو چەقەڵ

رای گوتی: بیستم داستانی دوژمنی رەنجاو کە نابێ دڵ بە لاواندنەوەیان بسپێری، هەر چەند لە رووخۆشی نیشاندانو لوتفو مەرحەمەتدا زێدە حەول بدەنو هیچی تێدا نەهێڵنەوە. ئێستا باسی پادشایانو ئەوەی لە نێوان ئەوانو دەستو پێوەندانو نزیکاندا روو دەدا، بۆ من بگێڕەوە. گەلۆ! پاش روودانی خەتا و خەیانەتو ئاشکرابوونی پیلان، گەڕانەوە بۆ لای پادشایانو تازەکردنەوەی بەڵێنو پەیمان لە متمانەو قایمەکاری نزیکە؟ بەرەهمەن جوابی داوە: ئەگەر پادشاکان درگای بەخشینو لێبوردن قەپات بکەنو لە هەر کەس بڕوسکە خێچو خواریو خەیانەتێک ببینن، یا خۆشیان لە چارەی کەسێک نەهات، ئیدی چیدی بڕوا بەو کەسانە نەکەن، کاروبار پەکیان دەکەوێو لە حەزو خۆشیبەخشینو عەفووکردن بێنەسیب دەبن.

وە بۆ جەماڵی کەسایەتیو کەماڵی کاری پیاو، نە هیچ جلوبەرگێک لە بەخشینو لێبوردن جوانترو نە هیچ بەڵگەیەک لە چاوپۆشیو لێخۆشبوون روناکتر. وە پەسندترین ئەخلاق بۆ پادشایان ئەوەیە کە عەقڵی تەواوی خۆیان دەکاراندا بکەنە داوەر، وە هیچ کات ئەخلاقی خۆیان لە بەزەییو لوتفی بێعەیبو تووڕەیی بێزوڵم، بێبەش نەکەن، تا کاروبار لە نێوان ترسو هومێددا بە رەوانی بڕواتە پێش، نە موخلیسان ناهومێد بنو نە یاغیو لادەران رووداماڵاو بن.

وە هەر کات ئەم روانگەو بوارانە بە وردی کەوتنە بەر تێڕوانینو وردبوونەوەو

فەزیلــەتو بەرەکەتی بەخشــینو ئیحســان روون بۆوە، دەبــێ ئەم ئەخلاقەو رەوشــتە رەچاو بکرێو رێگەی باشو لایەنی مەســڵەحەت لــەو رەوتەدا نابێ تێکەڵ بکرێ، وە شــاراوە نییە کە ئادەمزاد لە هەڵەو خەتا و خلیسکان بەدوور نییە، وە ئەگەر دە بەربەرەکانێو بەرەنگاری لەگەڵ ئەم بابەتانەدا ســەرەڕۆییو توندوتیــژی رەوا ببیندرێ، زیانو زەرەری بۆ کارو مەســەلە گرینگەکان دەبێ. بەگشــتی دەبێ ئەندازەی وەفادارێو نیازپاکیو دڵسۆزیو هونەرو کارامەیی ئەو کەســەی دەکەوێتە بەر بەدگومانیو تۆمەتبار دەکرێ، بە وردی بناسرێ، ئەگەر بە مەسڵەحەت بتوانێ یارمەتییەکی بدا و لە بیرورِا و ئەمانەتی ئەو بۆ لابردنی کێشــەیەک کەڵک وەربگرێ، دەبێ متمانەو بــڕوای دەگەڵ تازە کاتەوە. وە لە شــکو دردۆنگی دەربێنێو ورەی ئەو کەســە لە رێگەی دڵدانەوەو لاواندنەوەوە بگەیەنێتــەوە رادەی جارانو ئەم فەرمایشــتە بکاتە رێبەری خــۆی أقیلُوا ذَوِی الهَیئَاتِ عَثرَاتِهِمْ.[1] چون بەڕێوەبردنی وڵات بێ وەزیرو یارمەتیدەران دەســت نادا. وە کەلک وەرگرتن لە بەندەگان زەمانێک مەیســەر دەبێ کە سروشتی ئەوان بە عەقڵو پــاک داوێنیو هونەرو چاکەخوازی رازابێتــەوە. وە دەروونیان بە هەق گوتنو نەسیحەتو لایەنگریو خۆشەویستی رووناک بوو‌بێتەوە.

وە دەزانین کە کاروباری وڵات ســنووری نییەو پێداویســتی پادشــایان بە پیاوانی لێهاتووی دڵسۆز، کە بۆ مەحرەمی نهێنییەکان شیاو بنو لە بەڕێوەبردنی کاراندا ســەربەخۆییو خۆڕاگرییان هەبێ، هەمووی ئاشــکرا و دیارە. وە ژماری کەســانێک کە بە ئەمانەتو دروســتیو تەقوا و دیانەت رێزیان لێ بگیرێ زۆر کەمە. وە رێگەی راســت لەم رەهەندەدا ناسینی باشــیو خراپی ژێردەستانەو ئاگاداری لەوەی هەر کام چی لە دەســت دێو بۆ چ کارێک باشــە. وە کاتێک پادشــا بە یەقینو تێبینی لە سەر یەکێک ساغ بۆوە، دەبێ بە پێی لێهاتوویيو ئازایەتیو بارســتای عەقڵ، کاری پێ بســپێرێ. وە ئەگــەر دە ئەنجامی کارو هونەری هەر کامیاندا نوقســانو ئیرادێک هەبوو، لــەوەش غافڵ نەبێ. چونکە هیــچ ئافەریدەیــەک ناتوانێ بێعەیب بێ. وە لەم مەســەلە وردەدا قایمەکاری

---

[1] . لە خەتا و خلیسکانی پیاوی جوامێرو رێکوپێک ببوورن.

تا ئەو جێگەیە پێویســـتە کە ئەگەر لێهاتوویی کەسـێک سەدەمە بە کارەکەی دەگەیەنێ، ئەو کەسە لەسەر کار وەلابنرێ، وە نەهێڵن کارەکان زیانیان پێ بگا. چون مەبەســـت لە بانگهێشتکردنی پیاوانی لێهاتوو، ئەنجامدانی کارەو ئەگەر لە جێگایەک کیفایەت دەبێتە کۆسپو تەنگەژە، دەبێ دووری لێ بکرێ وەک چۆن لـــە نەزانیو جەهل دووری دەکەن. وە ئەوە هەرگیز روو نادا کە کیفایەت ببێتە هۆی تێکوەپێچراویو گرفتی کار. بەلام ئەم جەختکردنەم بۆ ئەوە کرد تا روون بێتەوە کە چون دەبێ، بۆ گەیشـــتن بە مەنزوورو مەبەســـت لە ئەربابی هونەرو لێهاتوویی دەستبەردار بێ، پەنابردن بۆ ساویلکەیی ئەربابی جەهلو نەفامی، بە مەسڵەحەت نزیکترە.

وە پاش تێگەیشـــتنی ئەم بابەتانەو ناســـینی ئەم وردەکاریانە، لەسەر پادشا فەرزە کە لەســـەر کاروبارو ئەرکی کاربەدەســـتان لێکۆڵینـــەوەو چاوەدێری بکا. وە هیچ وردو درشـــتێک بۆ ئەو شـــاراوە نەبێ. تا ئەگەر موخلیسانو وەفاداران، تەوفیـــق یارمەتیان بدا و خزمەتێـــک بکەن، وە یا خائینان هەلیان بۆ هەڵکەوێو غەفڵەتێک بکەن، هەر دوو لایەن بزانێو پاداشـــی پێویســـت بـــدا بە وەفادارانو غەیانان بە بارستای پێویست تەمێ بکا. چون ئەگەر ئاوڕ لە یەکێک لەم دوو لایەنە نەدرێتەوە، دڵســـۆزان دەستیان بۆ کار ناچێو خەیانەتکاران بێباکو رووهەڵمالاو دەبن. کارەکان زەحمەتو بەرپرسایەتی فەشەل دێنێ. وە قەرەبووکردنەوەش بە دژواری دەست دەدا. وە داستانی شێرو چەقەڵ خۆی نموونەی ئەم حاڵەتەیە.

رای پرســـی چۆن؟ گوتی: دەگێڕنەوە لە وڵاتی هێند، چەقەڵێک دەژیا کە لە دنیا رووگەردانو لە نێو هاورەگەزانی خۆیدا حاوابۆوە. بەڵام لە خواردنی گۆشتو رژاندنی خوێنو ئازاری گیانداران خۆی دەپاراســـت. یـــاران دژایەتیان لەگەڵیدا دەســـت پێکردو گوتیان: لەم رەوشـــتەی تۆ رازی نین. وە بیرورای تۆ بە خەتا دەزانین. چون پێکەوە دەژینو هاودەمین، لە هەســـتانو دانیشتنو رەوشتیشدا دەبێ وەک ئێمە بی، هەر وەها ژیان تێکەڵکردن دەگەڵ زەجرو ئەشـــکەنجە بە باش نازانین. چونکە رۆژێک ئەو عومرە دەگاتە کۆتاییو دەبێ نسیبی خۆت لە

حەزو خۆشییەکانی دنیا بپچکڕی. وَلا تَنس نَصیبَکَ مِن الدّنیا.[١] وە بەراستی دەبێ بزانی کە دوێنێ ناگەڕێتەوەو فەرامۆشکردنی ئەمڕۆ و لە نیعمەتو خۆشییەکان غافڵبوون چ مانایەک دەبەخشێ؟

چەقەڵ وەڵامی داوە: ئەی گەلی دۆستانو برادەران، لەم تڕەهاتە دەست هەڵگرن! باشە ئەگەر دەزانن دوێنێ ڕۆیشتو سبەینێش نازانن چ دەبێ، ئەمڕۆ شتێک کۆ بکەنەوە کە تۆشەی ڕێگاتان بێ. چونکە ئەم دنیا هەڵفریوێنەرە سەرتاپای عەیبە، تەنیا ئەو لایەنە باشەی هەیە کە مەزرای دواڕۆژە، دەکرێ تۆوی تێدا بچێنی کە بەرهەمەکەی ڕۆژبازاری قیامەت بە کارتان دێ. حەولودەولی خۆتان بخەنە سەر کاری خێرو ئیجابی، هاوکاریو یارمەتی دنیای غەدداری بەدکار مەکەنە پاڵپشت. وە پێتان وا نەبێ هەتاهەتا دەمێنن. وە لە بەرهەمی لەشی ساغو ژیانی دەورانی جەوانی خۆتان بێنسیب مەکەن. چونکە حەزو خۆشی دنیا وەک برووسکەی برووسکەو تاریکی شەو، بێدەوامو خۆڕانەگرە. بەگشتی، دڵ بە کۆختەی بەڵا خۆشکردنو جەستە لە سەرای فەنادا بەجێهێشتن لە بەرزی ورەو هیممەتو کەماڵی عەقڵو تێگەیشتوویی بەدوورە. وە عاقڵ لە نیعمەتەکانی دنیا بێجگە لە خۆشناویو زیکری باقی، هیچی دیکەی ناوێ، چونکە خۆشیو ئاسوودەییو دەست ڕۆیشتوویيو نیعمەتەکانی، ڕوویان دە نەمانو دەستبەدەستبووندایە.

ئەگەر سەعادەتی دنیاتان دەوێ، ئەم قسە دە گوێ بگرنو بۆ توعمەی خۆتان، کە خۆشیو شیرینییەکەی تا گەروو پتر نییە، کوشتنی گیاندارێک ڕەوا مەزاننو بەوەی کە بێئازار دەست دەکەوێ ڕازی بن، چون ئەوەندەی بۆ مانو بەقای جەستەو دەوامی نەفس پێویستە، هەرگیز بۆی دانامێنن. ئەم مەوعیزەو ڕێنوێنییانەی من بە گوێی عەقڵ ببیسنو لە من داوا مەکەن لەسەر ئەو شتەی لای عەقڵ ڕەت کراوەتەوە، دەگەڵتان ڕێک کەوم. چونکە هاودەمیو هاوکەلامی من دەگەڵ ئێوە وەباڵو تۆقی مل نییە، بەڵام ڕێککەوتن لەسەر کاری ناپەسند دەبێتە هۆی عەزاب، چونکە دڵو دەست، ئامرازی گوناهن. یەکیان مەکۆی فکرو

---

١. بەشی تووشی خۆت لە دنیا فەرامۆش مەکە.

بیری ناشایستو ئەوی دیکەش سەرچاوەی کرداری کرێتو ناحەز. وە ئەگەر شوێنێک کار بکاتە سەر چاکو خراپەی کار، هەر کەس لە مزگتو هورمزگاندا کەسێک بکوژێ، گوناهبار نییەو ئەوەی دە مەیدانی شەڕو پێکداداندا کەسێک بە زیندوویی جێ بێڵێ گوناهکار دەبێ. وە منیش هاودەمی ئێوەمو بە دڵ لە دەستتان گورێزانو بێزارم. دۆستان عوزری ئەویان قبووڵ کرد. وە ئەویش هەنگاوی دە ڕێگەی تاعەتو سەلاحدا کرژتر کردو باسی ئەو لە دنیادا بڵاو بۆوەو بە تێکۆشانو درێژەدان دە تەقوا و دیانەتدا گەیشتە پلەوپایەیەک کە هیچ بەرزەفڕێک نەیدەتوانی پێی بگا.

وە لەو دەڤەرە مێرگو مێرغوزارێگ بوو، کە مانگی وێنەگەرو ڕەنگساز لە جوانی ئەو مێرغوزارە وێنەگەری فێر دەبوو، وە ئەستێرەی گەلاوێژی عەتربێژ لە شنەی ئەو شوێنە یارمەتی داوا دەکرد.

سەحەر لە تەرفی بوستان لە سەحنی لالەزارەوە
نەسیمی جانفەزا وەزی بە موژدەیی بەهارەوە[1]

لەو مێرغوزارەدا، جانەوەرانی وەحشی زۆر هەبوون، پادشاکەیان شێرێک بوو کە هەموو دە ژێر فەرمانی ئەودا بوون، کاتێک ناوبانگی ئەو چەقەڵەی بیست، بانگی کرد بۆ لای خۆیو بە چەندین جۆر ئەزموونو تاقی کردەوە، پاشان چەند ڕۆژ تەنیا پێکەوە دانیشتنو شێر گوتی: وڵاتی ئێمە پانو بەرینەو کارو زەحمەتی گەلێکن، پێویستمان بە یارمەتیدەرانو ڕێنوێنانی دڵسۆز هەیە، بیستوومانە تۆ دە خوداناسیو تەقوادا پێگەیشتووی، هەر کە چاوم پێت کەوت دیتنو نەزەر بە سەر خەبەردا زاڵو گوێ لە بیستن عاجز بوو. وە ئێستا دەمانەوێ متمانەت پێ بفەرموویو بکەوێتە ناو بازنەی باوەڕپێکراوانی من. چەقەڵ جوابی داوە: پادشایان مافی خۆیانە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان، پیاوی لێهاتوو هەڵبژێرن. لەسەر ئەوانەشڕا لەسەریان واجیبە کە هیچ کەس بە زۆرو نابەدڵی مەجبوور بە وەرگرتنی کارێک نەکەن. چونکە هەر کارێک بە زۆر

---

١. لە دیوانی حەقیقی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
نموده تیره و منسوخ با هوا و فضاش / صفای چرخ اثیر و صفات باغ ارم.

بە مل کەسێکدا ببڕێ، ئەو کەسە ناتوانێ کارەکە راپەڕێنێو لە عۆدەی رێنوێنی دڵسۆزانە نایەتە دەر. تەمەنی پادشا درێژ بێ، من کاری پادشا وەرناگرمو هیچ ئاگاداریو ئەزموونێکم لەسەری نییە. وە تۆ پادشا و دەسەڵاتداریو جانەوەری زۆرو جۆراوجۆر دە خزمەتتدا هەن، کە هەم توانا و لێهاتوونو هەم تەماعی ماڵی دنیایان زۆرە. ئەگەر لەسەر ئەوان لێکۆلینەوەیەک بفەرمووی دڵت ئاسوودە دەبێ. وە بە مووچەو بەراتێک کە لە شوغڵو کار دەستیان دەکەوێ، خۆشحاڵ دەبن.

شێر گوتی: ئەم نەویستنە سوودی چییە؟ ئەڵبەتە کە تۆ مەعاف ناکەم!

چەقەڵ گوتی: کاری پادشا بۆ دوو کەسان باشە: یەکیان مەکربازێکی نەترس کە بە نەترسیو خۆ پێدادان مەبەستی خۆی دەپێکێو بە فێڵو کەڵەک لە سەر پێی خۆی رادەوەستێ. وە یەکیش غافڵی زەعیف کە عادەتی بە ژێردەستیو پەستی گرتووە، وە بە هیچ لێکدانەوەیەک نابێتە گەورەو کەس بە کڵاوی ناپێوێ. وە سەرنجی کەس راناکێشێ تا بکەوێتە ژێر ئێرەیی پێبردنو دوژمنایەتییەوە. دەبێ بزانین کە پیاوی عاقڵ هەمیشە بێبەشەو ئێرەیی پێ دەبەن. وە من لەم دوو چینە نیم. نە تەماع بەسەرمدا زاڵە کە خەیانەت بکەمو نە نزمسروشتم کە زەبوونیو زەلیلی بکێشم.

وە هەر کەس بناغەی خزمەتی سوڵتان بە نەسیحەتو دیانەتو ئەمانەتو پاکی پتەو بکا و دەوروبەری لە ریا و درۆ و دەلەسەو خەیانەت خاوێن بکاتەوە، کارەکەی زۆر دەوام ناهێنێو درێژەی نابێ، [چونکە] هەم دۆستان مەتاڵی دوژمنایەتیو دژایەتی لە بەرانبەردا رادەگرنو هەم دوژمنان دەیکەنە نیشانەی تیری بەڵا. دۆستان لە بەر ئێرەیی بردن دەچنە پێگەی دوژمنایەتیو دوژمنان لەبەر ئەوەی ئەم کەسە یەکدڵو بە دڵو گیان دڵسۆزی دەکا، کارشکێنی دەکەن. وە هەر کات دۆستو دوژمن پێکەوە بە گژیدا هاتنو بۆ دوژمنایەتی هاودەست بوون، ئەڵبەتە بە ئەمینیو خاترجەمی ناتوانێ بژیو ئەگەر عەرشی عەزیمی دە ژێر پێ نابێ، گیانی بە سڵامەت دەرباز ناکا و پیاوی غەیان خەیاڵی لە لانی دوژمنانی پادشاوە ئاسوودەیە هەر چەند، لە دۆستان بترسێ.

شـــێر فەرمووی: ئەوانەی لە من نزیکن لە دژی تـــۆ نابن، چونن ئێمە لە تۆ رازین؛ خۆت بە وەهمو خەیاڵ نەخۆش مەکە، چونن نیازپاکی ئێمە لەسەر تۆ، بۆ رەتکردنەوەی دژایەتیو بەدنییەتیو چەپەڵی دوژمنان تەواوە. بە گوێکێشانێک رێگەی پیلانو مەکری ئەوان دەبەســـتینو ئەوپەڕی ئەمنو ئاسایش بۆ تۆ دابین دەکەین. چەقەڵ گوتی: ئەگەر مەبەســـتی پادشـــا لەم بەرزکردنەوەو پلەوپایە پێدانەدا ئەوەیە کە چاکەیەک دەگەڵ من بکا، لە روانگەی رەحمەتو دادپەروەریو عاتیفەوە، ئەوە باشـــترە کە ئیزن بفەرموون تا لەم سەحرایەدا ئەمینو بێغەم بخولێمەوەو لە نیعمەتەکانی دنیا بە گیا و بە ئاو قانیع بم، وە لە دوژمنایەتیو ئێرەیی هەموو ئەهلی عالەم ئاســـوودە بم. وە ئاشـــکرا و روونە کە عومری کەم لە ئەمنو ئاســـوودەییو بێغەمیدا زۆر باشـــترە کە تەمەن درێژ بێو لە خۆفو خەتەرو دڵەڕاوکێدا بژی:

تێپەڕێ هێندە بە ناخۆشـــی ئەگەر عومری درێژ
خۆزگە سەدخۆزگە بەوانەی کەمو ئاسوودە دەژین[1]

شێر گوتی: ئەم باسە روون بۆوە، تۆ دەبێ ترس لە دەروونو هەراس لە دڵت دەرباوێی، کە بە هەر حاڵ لە ئێمە نزیک دەبیتەوە.

چەقەڵ گوتـــی: ئەگەر هەر دەبێ وابێ، دەبـــێ ئەمانێکم بدەیتێ کە ئەگەر دۆستان قەستی منیان کرد، ژێردەستان بە هیوای گرتنەوەی شوێنو جێگەی منو باڵادەستان لە ترسی جێگەو پێگەی خۆیان، بە دنەو هانەی ئەوان لە من توورە نەبیو بە وردی پیلانەکەیان بخەیتە بەر ســـەرنجو شەرتی وریاییو قایمەکاری، زۆرتر بەجێ بێنی. شێر پەیمانو بەڵێنی پتەوی دەگەڵ دارشتو ماڵو خەزێنەی خۆی پێ ئەســـپاردو لە هەموو ژێردەستانی خۆی، لەباری پلەوپایەو کەرامەتی تایبەت، زۆرتری وەسەر خست. وە بۆ هەموو جۆرە راوێژکارییو را و بۆچوونێک لەســـەر کاروباری وڵات، رووی دەو دەکرد. وە خۆشەویســـتیو سەرسووڕماویو پەسندی شێر لەمەڕ چەقەڵ زۆرتر دەبوو.

نزیکانی دەوروبەری شـــێر، ئەم نزیکـــیو رێزلێنانەیان بەلاوە ناخۆش بوو و

---

١. هێمن.

پێوەی تەنگاوبوون. لەســەر دوژمنایەتی چەقەڵ هەموو رێککەوتنو چەند رۆژان تەدبیریــان لەو کارە کردەوە، تا وردەوردە بنکۆڵی بکەنو جێگەی پێ لەق بێ. یەکیان فێر کرد هێندێک گۆشت، کە شێر بۆ خواردنی خۆی وەلا نابوو، بدزێو دە حوجرەی چەقەڵدا بیشــارێتەوە. رۆژی دواتر، کاتی فراوێنی بەیانی شــێر داوای گۆشــتی کرد، گوتیان: نایدۆزینەوە، وە چەقەڵ دیار نەبوو، دوژمنانیش هەموو حازربوون، کە دیتیان ئاگری تووڕەییو برسیەتی شێر پێکەوە تەندووری گەرمــی ســوور کردۆتەوە، نانی خۆیان پێوە دا و یەکێــک لەوان گوتی: چارە نییە دەبێ پادشــا لە زیانو زەرەرو قازانجەکانــی ئاگادار بکەینەوە، ئەگەرچی هێنــدێ کەس زەرەری تێدا بکەن. وەک بە من گوتراوە چەقەڵ ئەم گۆشــتەی بردۆتە ژووری خۆی. ئەوی دیکە گوتی: ئەگەر باوەڕ بەو قســەی نەکەی، دەبێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەی، چونکە ناسینی خەڵکان دژوارە.

یەکێکــی تر هەڵیدایە: هەر وایە کە دەفەرمــووی، ئاگاداری لە نهێنییەکانو خوێندنەوەی دەروون هەر وا ئاســان نییە. بەڵام ئەگەر ئەم گۆشتە لە مەنزڵی ئەودا بدۆزرێتەوە، دیارە ئەوەی لەمەڕ خەیانەتی ئەو لەســەر زارانە، وە راست دەگەڕێ.

یەکی تر گوتی: نابێ بە زانیاری خۆت بادیهەوا بی، کە پیاوی غەددار هەرگیز رزگار نابێ. چونکە خەیانەت بە هیچ لەونێک ناشاردرێتەوە.

یەکێکی دیکە دەســتی پێکرد: کەســێکی ئەمینو بڕوا پێکراو، هەمووشتی چەقەڵی بە من رادەگەیاندو من بڕوام نەدەکرد. پەندێکی جوان دەڵێ: اُخبُرْ تقلِه.[1] دیســان یەکی دیکە گوتی: مەکرو فێڵبازی ئەو هەرگیز لە من شــاراوە نەبووە، وە ناپاکیو حیلەگەری ئەو بنەی نایە. من ئاگام لە کاری ئەو هەیەو فلانکەسم بە شاهید گرتووە کە کاری ئەم شێخ یا زاهیدە ریاکارە دەبێتە هۆی ریسواییو خەتا و گوناهی گەورەی لێ دەردەکەوێ.

ئەوی دیکە گوتی: ئەگەر ئەم شێخە بەتەقوایە کە وە عۆدەگرتنی پادشا بە بەڵا و موسیبەت دەزانێ، ئەم خەیانەتەی کردبێ، بەلامەوە سەیرە.

---

١. تاقی بکەوە دوژمنایەتی بکە.

یەکی دیکە گوتی: ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێ، کاتی [دزینی ئەم گۆشتە] کوفرانی نیعمەتو جەسارەتی سووکایەتیپێکردنو تەوهین بە پادشاشی لە بەرچاو بووە. وە هیچ زانایەک ئەم کارە بە خەیانەتی تەنیا لە قەڵەم نادا.

یەکێکی تر دەنگی بەرز کردەوە: ئێوە هەموو ئەهلی ئەمانەتنو بەدرۆخستنەوەتان لە نەریتی عەقڵ دوورە. ئەگەر پادشا ئەمر بکا هەر ئێستا ماڵی بگەڕێنو گۆشت بدۆزنەوە، دەلیلی ئەم کارە ئاشکرا دەبێو شکو گومانی خاسو عام وەراست دەگەڕێ.

یەکی دیکەش گوتی: ئەگەر قایمەکاریو ورياییەک دەکاردا بێ، دەبێ پەلە بکەن، چون جاسووسانی ئەو لە هەر لاوە گەمارۆیان داوینو هەموو سووچو قوژبنێکیان گرتووە.

یەکێکی تر گوتی: ئەم تەفتیشو بەدواداچوونە هیچ سوودی نییە، چون ئەگەر گوناهیشی ئاشکرا بێ بە فێڵو کاری سەیروسەمەرە لە پادشای دەشارێتەوە.

لەم بابەتانە زۆریان گوتو هەڵڕشت، تا دڵی پادشا کرمێ بوو، ئەمری کرد چەقەڵ بانگهێشت بکەن بێتە خزمەت پادشا. کە هات پرسیاری لێ کرد: چت لە گۆشت کرد؟ جوابی داوە: بە ئاشپەزم ئەسپارد تا کاتی فراوێن بۆ پادشای بێنێ. ئاشپەزیش لەوانە بوو کە پێکەوە ببوونە یەک قسە، گوتی: ئەڵبەتە بێخەبەرمو ئاگادار نیم. شێر چەند کەسێکی لە باوەڕپێکراوان ناردو گۆشتەکەیان لە ژووری چەقەڵدا دۆزیەوە. دەگەڵ دۆزیانەوە هێنایانە لای شێر. پاشان گورگێک کە تا ئەو ساتە بێدەنگ بوو، وە وای دەنواند کە من ئەهلی دادو ئینسافمو بێ لێکۆڵینەوە، خۆم دەکاران وەرنادەمو هەر وەها دەگەڵ چەقەڵ دۆستمو دەرفەتی عینایەتم دەوێ، هاتە پێشو گوتی: چون پادشا خەیانەتی ئەو ناپیاوەی بۆ روون بۆوە، هەر چی زووتر بە سزای خۆی بگەیەنن، چون ئەگەر هەر وا لێی بگەڕێنو سزای نەدەن ئیدی چیدی خەتاباران لە فەریخەت ناترسن.

شێر فەرمووی تا چەقەڵ بگرنو زیندانی بکەن. ئینجا یەکێک لە حازران گوتی: من لە رای رووناکی پادشا، کە رۆژ دە درەوشاوەترین حاڵەتدا وەک سێبەر بە دوایو بە بەردەمیدا هەڵات هەڵاتیەتی، وە هەر وەک زەڕڕە لە پەنا

ئەودا پەرواز دەکا، ســـەرم سووڕ ماوە، کە ئاکاری ئەم غەددارە فێڵبازە، چۆن بە لای بەڕێزیانەوە، نەناســـراوەو داپۆشراوەو لە چەپەڵی‌و پیسی دەروونی ئەو غافڵ بووە.

یەکی دیکە گوتی: سەیرتر ئەوەیە کە تەدارەکی ئەم کارە وە درەنگی بکەوێ.

شـــێر وەڵامی بۆ نارد ئەگەر بۆ ئەم کارە دەلیلو بەهانەیەکی هەیە، بیخاتە روو. جوابێکی درشـــتو زبریان، بێ ئاگاداری چەقەڵ، بۆ پادشا هێناوە. ئاگری تووڕەیی‌و غەزەبی شـــێر بڵێسەی ســـەندو گڕی ئەم ئاگرە عەقڵی شێری دمبێن لێدا و عەهدو پەیمانو بەڵێنی لە بیر بردەوەو دەســـتی دوژمنانی لە کوشـــتنی چەقەڵدا ئاواڵە کرد. خەبەر بە دایکی شـــێر گەیشـــت. زانی کە بە پەلە بڕیاری داوەو لایەنی ســـەبرو حەوســـەلەو خۆڕاگری لەدەســـت داوە. بە خۆی گوت: وا باشە زوو بڕۆمو ئەم هەتیوە [کەللەکەرە]م لە وەسوەسەی دێوی مەلعوون رزگار بکەم. چونکە جاروبار کە پادشـــا تووڕە دەبێ، شـــەیتانی نەفامو ئاژاوەگێڕیش زاڵ دەبێ.

دە پێشـــدا وەڵامی بۆ ئەو جەماعەتە، کە دەستووری کوشتنیان پێ درابوو، نارد کە دەســـت رابگرن. پاشـــان هاتە لای شـــێرو گوتی: گوناهی چەقەڵ چ بووە؟ شێر باسی رووداوەکەی بۆ کرد، دایکی گوتی: کوڕی من، خۆت بە فکرو خەیاڵانەوە خەریک مەکەو لە گەورەیی ئیحســـانو بەخشین بێنسیب مەبە. وە هیچ کەس بە قەدەر پادشـــایان پێویســـتی بە سەبرو خۆڕاگری نییە. وە دەبێ بزانین کە حورمەتی ژن هی مێردەو سەربڵندی ئەولاد هی باوکەو زانیاری قوتابی هی مامۆســـتایەو هێزو قەوەتی سپا هی ســـەردارانی نەترسو ئازا و کەرامەتی زاهیدان بە دینو ئاسایشـــی رەعیەت هی پادشـــا و نیزامی کاری وڵات بە تەقوا و عەدڵو مەندی‌و عەقڵو وریایی‌و قایمەکاری، بەگشـــتی ئەوەیە کە ژێردەستان باش بناســـی‌و هەر یەکەی لە سەر پێگەو جێگەی پێویست دابمەزرێنی. وە بە ئەنـــدازەی هونەرو لێهاتوویی باریان بێنی‌و تۆمەتبارکردنیان لەســـەر یەکتر بە وردی بخەیتە بەر سەرنج، چون ئەگەر تێچاندی ئەم دەرهەق ئەوەو هی ئەوەیان دەرهەق بەم، گوێی پێ بدرێ، ئەو دەم هەر کات بیانەوێ دەتوانن دڵســـۆزێک

بخەنــە ژێرباری تۆمەتو خائێنو دوژمنێک بە جلوبەرگی ئەمانەتو ســەداقەت برازێننــەوەو جوانییەکانــی وڵات دە ریختو قیافەی کرێتو قێزەوندا نیشــانی خەڵک بدەن. وە بەمجۆرە، نێوان بە نێوان دەبینی حەسوودێک زانایەکی بێبەش دەکا و غەیانێک، ئەمینێک تۆمەتبار. وە هەر ســاتێک بێگوناهێک دەخاتە نێو گێژاوی هیلاک، وە شــک دەوەدا نییە، بە درێژە پەیداکردنی ئەم رەسمو دابە، هەموو لە دەســەڵات دەکەون، حازران دەســت لە کار دەکێشنەوەو بەرپرسی ناگرنە ئەستۆ و غاییبان خۆیان خانەنشین دەکەنو بەڕێوەبردنی کاران یەکجاری رادەوەســتێ. ئەوە رەوا نییە کە پادشایان، هەر کە میزاجو تەبیاتیان گۆڕا، بێ یەقینی راســتگۆیانە، باوەڕپێکراوانو ئەمانەتداران سزا بدەن. بەڵکوو دەبێ لە مەودای لەسەرەخۆییو پانتایی زانستی ئەودا، هەموو شتێک بگونجێو رابردووی خزمەتکاران بە دروســتی دە بەرچاو بگرێو تەلاشو تێکۆشــانی ئەوان لەسەر رووکاری دڵ حــەک بکا و زایەو بێبەرهەم وەلای نەنیت. وە دە بەرچاونەگرتنی جامیــنو بە نزم زانینی پلەوپایەی ئەوان بە رەوا نەزانێ. وە هەر خەتایەک کە ئەنقەســتو عەمدی تێدا نەبێ، زاتی هەوا و یەکدڵی زامدار ناکا؛ وە زێدەرۆیی دە ســزای ئەودا بەجێ نییە. وە نابێ گوێ بداتە قسەو قسەڵۆکی بێهونەرانی تاقی نەکراوە، وە تێچاندنی ئەوان لە سەر هونەرمەندانی کارامە بە هێند بگرێ. وە عەقڵو بۆچوونی خۆی لە هەموو بابەتێکدا بە حاکمێکی عادڵو کارناســێکی لەسەر حەق بزانێ.

وە چەقەڵ لە دەوڵەتی تۆدا گەیشتبووە پلەوپایەی بەرزو بڵند. زۆرت پەسن دەدا و لە خەڵوەتدا شــانازی وتووێژت پێ دەدا. وە ئێستا ئەرکی تۆ ئەوەیە، ئەمــر بکەی نەیکوژنو خۆتو ئەویش لە لۆمەو بەدگۆیی ناحەزان رزگار بکەی. تا ئەو جۆرەی شــایانی خۆڕاگریو مەندیو ماقووڵــی تۆ بێ، دە لێکۆڵینەوەو کەشفی ئەحواڵی ئەودا، بە وردیو وریایی پرسوجۆ بکەیو لەلای عەقڵی خۆتو هەموو لەشکرو سپا و رەعیەت، مەعزوور بیت، چونکە ئەم تۆمەتە لەوە سووکو چرووکتــرە لەوەی، وەها بەندەیەک، پێکەو ئەمانەتی خۆی پێ عەیبدار بکا. یا تەماعو چڵێسی بۆ ئەو شتە عەقڵی ئەو ژێر پێ بکا.

خــۆ، تۆ دەزانی کە لەو ماوەیەدا کە خزمەتـــی تۆی کردووەو پێش ئەویش گۆشتی نەخواردووە، دەست لە پەلەپەل هەڵگرە، نادروستی ئەم رووداوە روون بێتـــەوە. چونکە چاو و گوێ بە تەخمینو بەراورد، زۆر حوکمی نادروســـت دەر دەکەن، وەک ئەوەی کەســـێک لە تاریکی شەودا گوڵنەستێرەیەک ببینێو پێی وابـــێ کە ئاگـــرەو بە هەڵە بچی، کاتێک هەڵیگرتەوەو لە دەســـتی گرت، روون بێتەوە کە بای پێواوەو پێش ئەوەی یەقین پەیدا بکا، پەلەی کردووە. ئەوجار، ئێرەیـــی نەزان بەرانبەر بـــە زانا و بەدکردار لە پیاوچاکو ترســـەنۆک لە ئازا، مەشـــهوورە. وە گومانی دروست ئەوەیە کە دوژمنان ئەو گۆشتەیان لە مەنزڵی چەقەڵ دانابێ. وە ئەم کارە لە لای حەســـوودانو دوژمنانەوە، هێندە زەحمەت نییە. وە حەســـوودیو بەرچاوتەنگی زاڵمان لە کەس شاراوە نییە، بە تایبەتی ئەگەر غەرەزی گەورەیان هەبێ. وە باڵندە لە تەشقی ئاسمانو ماسی دە تەختی گۆمدا و دڕندە لە ســـەحرادا لە دوژمنایەتـــی دەروون چەپەڵان دە ئاماندا نین. وە باشوو ئەگەر نێچیرێک بگرێ، هەم ئەو باڵندانەی کە بڵندتر لەو هەڵدەفڕنو هـــەم ئەوانەی لەوی بەرەژێرترن، بۆ ئەو نێچیرە پەلاماری دەدەنو دەیانەوێ لە دەستی دەربێنن، وە ســـەگەکانیش ئەگەر لەسەر رێگا کوتە ئێسکێک وەبینن، هەر ئەو رەفتارە دەگەڵ یەک دەکەن. وە خزمەتکارانی تۆش کە پلەوپایەکانیان لە چەقەڵ نزمترە، ئێرەیی پێ دەبەن. ئەگەر لەو پلەوپایە بەرچاوەدا کێشـــەو دەمەقاڵەش رووبدا ســـەیر نییە. لەم کارەدا سەبرو تێبینی پێویستەو جۆرێکی بە ئەنجام بگەیەنە کە لایقی گەورەیی تۆ بێ. چونکە کاتێک راســـتیو دروستی ئەم کارە ئاشکرا بوو، کوشتنی ئەو دشوار نییە.

شـــێر زۆر بە سەرنجەوە، قســـەی دایکی گوێ پێدا و خســـتیە بەر عەقڵو تێگەیشـــتنی خۆی. وە چەقەڵی بانگ کردە لای خۆیو گوتی: خۆشەویســـتی ئێمە، بە حوکمی تاقیکردنەوەکانی پێشـــوو، بۆ قبووڵکردنی عوزری تۆ، زۆرترە لەوەی کە دوشمنان لەمەڕ تۆ باسی دەکەن.

چەقەڵ گوتی: من لە عەزابی ئەو تۆمەتە رزگاریم نایە، تا پادشـــا حیلەیەک دەکار نەهێنێ کە دروستی ئەم حاڵو ئەحواڵە، بەو فێڵە روون بێتەوە. با وەکوو

ئیمانم بە بێگوناهــیو تۆکمەیی ئیمانو دیانەتی خۆم هەیەو یەقینم هەیە هەر چەندی وریاییو تاقیکردنەوەم لەســەر بکرێ، ئاســتی وەفاداریو دڵسۆزیم بۆ هەموو خەڵکو خزمەتکارانو دەستو پێوەندان، زۆرتر دەردەکەوێ.

شــێر گوتی: ئەم لێکۆڵینەوە چون دەکرێ؟ گوتی: ئەوانەی ئەم بوختانەیان کــردووە، ئامادەیــان بفەرموو بــە پێداگــریو توندییەوە لێیان بپرســە، کە تاوانبارکردنی من بەم تاوانەو وەلانانی جەماعەتێک کە گۆشــتخۆرنو لەســەر گوشــت پێک هەڵدەپرژێن، چ مانایەکی هەبوو. چۆن روونبوونەوەی ئەم بابەتە بێجگە لەوە بە هیچ شــێوەیەک دەســت نادا. وە هیوادارم پادشا ئەم کارە بکا و ئەگەر ویســتیان حاشا بکەن، نەعرەتەیەک لێ بدا و بفەرموون کە هەر کەس راســتی بڵێ، دەبەخشــرێ. لەم رووەوە، چارشــێوی گومانی درۆزنانە لەسەر روخساری یەقینی راستەقینە لادەچێو بێگوناهی من زۆرتر دەردەکەوێ.

شــێر گوتی: بەخشــینو لێبوردن چۆن دەســت دەدا، کاتێک یەکێک ددان بەوەدا بێنێ کە دەرهەق بە منو خەڵکی وڵاتی من، خەیانەتی کردووە؟ گوتی: پادشــا پایەدار بێ، هەر بەخشینو عەفوێک لە قودرەتو دەسەڵاتو هەیبەتەوە بدرێ، سەرتاســەر هەمووی هونەرە؛ وە لەو دەقیقەیەدا کە بە زبانی پادشــادا تێپەڕێ، جیاوازییەک روو نــادا، بە تایبەتی کە خەتابار ئەو بابەتەی بە تۆبەو پەشــیمانی وەرگرتو بە بەندەییو فەرمانبەری جاران دەستی بە کار کردەوە، ئەڵبەتە ئیدی، چیــدی مەجالی تۆڵەکردنەوە نامێنێو بێگومان مســتەحەقی لێبوردن دەبێ. وە زانایان دەڵێن: تەڵەبی چوونە دەر لە بەدکرداری رەهەندێکی گەورەیە لە چاکەو ئیحساندا.

شێر کە قســەکانی چەقەڵی بیستو شوێنەواری راســتیو دروستی لەسەر لاپەڕەکانی ئەم باســە دیــت، ئەو تایفەی کە ئەم پیلانەیــان گێڕابوو، لەوانی دیکەی جوێکردنەوە دە کەشــفو دۆزینی نادیارەکانو شــیکردنەوەی دەروونی ئەواندا، وردبوونــەوەو زێدەڕۆیی بە واجیب زانیو ئەمانــی پتەوی پێدان، بەو مەرجەی راســتی بڵێنو هیچ نەشــارنەوە. بەمجۆرە هێندێک ددانیان بە خەتای خۆیاندا هێنــا و هەموو قەرارو مەدارو پیلانەکەیان باس کرد، ئەوانی تریش بە

ناچار هەر وایان کردو بێتاوانی چەقەڵ ئاشکرا بوو.

دایکی شــێر کە زانی دروســتکاری چەقەڵ لە تۆزوگەردی گومان هاتەدەرو چارشــێوی دردۆنگــی لە روخســاری یەکدڵی هەڵگیرا، بە شــێری گوت: ئەم جەماعەتــە ئەمانیان پێ درا و تازە پاشــگەز بوونەوە مومکین نییە. بەڵام لەم رووداوەدا ئەزموونێکی گەورەی بۆ هاتووەتە پێش، تا لەمەو دوا عیبرەت بگرێو بەدگومانی خۆی بە نیســبەت ئەو تایفەی پاشــملە بۆ دڵســۆزان تێدەچێننو لەبەرچاوانیان دەخەن، دووکات زیاد بکا و لە هیچ غەیانێکی تێچین قسە قبووڵ نەکا، مەگەر دەلیلی وای بە دەســتەوە بێ کە نەتوانی چاوپۆشــی لێ بکەی. وە ترپەهــاتو فلّتەفلّتی، ئەوانەی ئەهلی غەرەزن، لەمــەر نزیکانو مەحرەمان دەیرپێسن بە هێند نەگرێ. هەر چەند کورتیش بێ، ئەم جۆرە باسانە وردەوردە مایە دەگرنو دەگاتە جێگایەک کە پێش لێگرتنیان زەحمەت دەبێ.

نیلو فــوراتو دەجلە پێک دێن لە جۆگە ئاوان
فیلان دەدەن رەپێچەک، دەیانبەن سووکو ئاسان[١]

وە گیای تەڕ کە کەوتە ســەر یەک، بای دەدەنو تەنافی لێ دروست دەکەن کە فیل بۆی ناپسێ. کورتی ببڕینەوە، وردو درشت کە گەیشتە یەک، دەبێ بە دوای لێکدانەوەو رێگە چارەوە بێو بەدوای بەرگریو دەربازبووندا بگەرێ.

وە لە نزیکبوونەوەی هەشــت کەســان، واجبە خۆ بپارێزی. **یەکەم:** ئەوەی نیعمەتی پیاوی دەوڵەمەندو ســەخی بە کــەم دەزانێو کوفرانی نیعمەت دەکا، **دووهەم:** ئەوەی لە خۆوە تووڕە دەبێ. **سێهەم:** کەسێکە بە تەمەنی درێژ دەنازێو مافی ئەمو ئەو پامال دەکا. **چوارەم:** ئەوەی رێگای پساندنی دۆستایەتیو فێڵو تەڵەکەی لەبەردەمی ئاواڵەیەو بە سانایی پێیدا دەڕوا. **پێنجەم:** ئەوانەی بناغەی کاری خۆیان لەسەر دوژمنایەتی دادەنێن، نە راستیو دیانەت. **شەشەم:** ئەوەی لە کاری هەڵەو ســەرەرۆییدا هەوســاری خۆی بەرەڵڵا بکا و بە هەوا و هەوەس بژی. **حەوتەم:** ئەو کەســەیە کە لە خۆڕا و بێســەبەب لە خەڵکان بەدگومان دەبێو بە بێ دەلیلی مەحکەم، تۆمەت لە باوڕپێکراوان دەدا، **هەشتەم:** ئەوەیە

١. از نیل و فراتو دجله جویی زاید / پس موج زند کـه پیـل را بربایـد.

کە حەیا و شـــەرمی کەمەو زۆر شـــۆخیو گاڵتە جاڕی بکا و لەم بەســـتێنەدا نێوبانگی کردبێ.

وە دۆســـتایەتیو رووتێکردن دە هەشـــت کەســـان فـــەرزە: **یەکەم**: ئەوەی شوکرانەی چاکە بە پێویست دەزانێ، **دووهەم**: ئەو کەسەیە کە گرێی گرێبەستی ئەو بە رووداوی رۆژگار شل نابێتەوە. **سێهەم**: ئەوەی کە رێز لە پیاوی کەریمو سەخیو بەئەدەب بە واجیب دەزانێ. **چوارەم**: ئەوەی لە غەدرو فرۆفێڵ بەدوورە، **پێنجـــەم**: ئەوەی لە کاتی توورەییو دەرهەڵبووندا خۆڕاگر بێ، **شەشـــەم**: ئەو کەســـەی کە لە کاتی تەماعکردنیشدا سەخی بێ. **حەوتەم**: ئەوەی حەیا بەخۆ بێ. **هەشتەم**: ئەوەی لە دانیشتن دەگەڵ ئەهلی فەسادو خراپە خۆی بپارێزێ.

وە کاتێک شێر هەڵوێستی دروستو خۆشەویستی دایکی لە بەڕێوەبردنی کاری ئەم رووداوەدا چاوپێکەوت، زۆری شـــوکرانە کردو گوتی: بە بەرەکەتی رێنوێنی تۆ، رێگەی تاریک روناکو کاری پڕ لە گرێوگۆڵ ئاسان بۆوە. وە لە بێگوناهی ئەمینێکی راستگۆ و کارناسێکی لێهاتوو، ئاگادار بووینەوەو بێگوناهێکی سادق لە تۆمەتو تاوان رزگاری هات.

پاش ئەوە متمانەی شـــێر بەرانبەر بە چەقـــەڵ زیادی کردو زۆرتر لە جاران لوتفو مەرحەمەتی خۆی بە ســـەردا باراندو چەقەڵـــی بانگ کردو گوتی: ئەم تۆمەتـــە دەبێ بە مایەی متمانەو بڕوای زۆرتـــر بزانین. وە راپەڕاندنی کارەکان کە بە تۆم ئەســـپاردبوو هەر وەک جاران بە عۆدەی تۆیە. چەقەڵ گوتی: ئاوا جێبەجێ نابێ. پادشـــا عەهدو پەیمانی لەوە پێشتری وەلا نا و قسەی مەحاڵی دوژمنانی، مەجالی جێکردنەوە لە دڵی خۆیدا پێدا.

پادشا گوتی: لەم بابەتانە هیچ دە زەینو بیرەوەری خۆتدا مەهێڵەوە. چونکە نە لە دڵســـۆزیو فەرمانبەری تـــۆدا کەمو کورتییەک هەیـــەو نە دە ئیرادەتو دۆســـتی مندا. ورەت بەرز بـــێو کاروباران بەڕێوەبـــەرە. چەقەڵ جوابی داوەو گوتـــی: هەموو جارێـــک وەک ئەوجار نابێ. ئەمجارە نەجاتـــم بوو، بەڵام دنیا لە حەســـوودانو بەغیلان پاک نەبۆتەوە، تا ئەو رۆژەی پادشـــا لوتفی دەگەڵ من هەبێ، حەســـوودی یارانیش درێژەی دەبێ. وە ئەو جۆرەی پادشـــا گوێی

بۆ قســەکانیان شــل کرد، پادشای بە گوێڕایەڵ حیســاب دەکەن‌و هەر ڕۆژەو تێچاندنێکی تازەم بۆ تێدەچێنن‌و هەر ســەعاتەو گومانێکی دیکە دێننە ئاراوە، وە هەر پادشــایەک گوێڕایەڵی قسەی حەسوودان بوو، وا باشە لە خزمەتکردنی ئەو خۆت بپارێزی، وە مەسەلی مەشهوورە کە دەڵێ: خَلِّ سَبیلَ مَنْ وَ هَیَ سِقاؤُهُ.[1]

قســەیەکم هەیە، ئەگەر پادشــا ئیزن بفەرموون، بە عەرزی دەگەیەنم. کە پادشــایان‌و گەورەپیــاوان بۆ گــوێ دان بە دەلیل‌و بابەت لــە هەموو کەس شــایانترن. وە پادشا ئەگەر لەم ڕووداوەدا ڕەحمەتی خۆی بە سەر مندا باراندو متمانــەو بڕوای تازەکردەوە لــە ڕووی مێهرەبانی بوو کە دەتوانین بە نیعمەتو پیاوەتــی ناوی بەرین، بەڵام ئەو پەلەو هەڕەمەی کە دە کارەکەدا دیتمان، منی بە نیســبەت کەرەم‌و لوتفی پادشا دردۆنگ‌و بەدگومان کردو لە سۆزو دڵسۆزی ئەو ناهومێد بووم، چونکە ڕابردووی خۆشەویســتی‌و خزمەتەکانی منی بێهوودە زایەو باتڵ کرد. ئەویش بە تۆمەتێکی چووک، کە ئەگەر وە ڕاستیش گەڕابا هیچ مەترسی لێ نەدەکەوتەوە. پادشا دەبێ، پانتایی دڵی وەک دەریایەکی بێ سەرو بن بێ‌و بارستای خۆڕاگری‌و قایمەکاری وەک چیا ئەستوورو بڵندو سەنگین بێ، نە تێچاندنی ئەم‌و ئەو، ئەم یەکەیان دەخاتە شەپۆلان‌و نە هەڵچوونی تووڕەیی ئەوی دیکەیان دەجووڵێنێ.

شــێر گوتی: قســەکانت زۆر جوانن، بەڵام زۆر درشــتو زبرن. جوابی داوە کە: دڵی پادشــا لە وازۆکردنی حوکمی ناڕەوادا لە قســەی من درشــتترن، وە چون بوختان‌و ریاکاری بە ئاســانی گوێی پێدرا، واجیبە کە بیســتنی قســەی راســتو دروســت بە لای ئێوەوە گران نەبێ. ئامان، تکایە ئەم قسانەی من بە بێ‌ئەدەبی لە قەڵەم مەدەن. چون دوو مەســەلەحەتیان تێدا هەیە: یەک ئەوەی کە مەزلوومان بە قەســاس‌و سزادان خۆشحاڵ دەبن‌و دڵیان لە کینەو ڕەنجاوی پاک دەبێتەوە. باشتر ئەوەیە هەر چی لە دڵمدایە هەڵبرێژم، تا بوون‌و نەبوونی من بۆ پادشــا یەکسان بێ‌و شتێک نەمێنێ کە ببێتە هۆی دوژمنایەتی‌و پەژارە. وە ئەوەکەی تر ئەمەیە کە دەســەڵاتداری ئەم ڕووداوە، عەقڵی ڕێنوێن‌و عەدڵی

---

١. دەگەڵ ئەو کەسە مەبە کە سستپەیمانە.

دنیاڕازێنەوەی پادشـــا بێ. وە ڕەوازانینی حوکم، پاش بیستنی قسەی تۆمەتبار باشـــترو بەجێترە. شـــێر گوتی: هەر وایە: منیش دە کاری تۆدا بە حەوســـەلە بووم‌و لە ڕزگارکردنی تۆلەم، گێژەنەی ڕەحم‌و بەزەییم دەکار هێنا. جوابی داوە: ئەگەر ڕزگار بوونم لە سایەی بەزەیی پادشاوە بوو، فەرمانی کوشتنی بەپەلەش فەرمانی ئەو بوو. شێر گوتی: تۆ نازانی کە تەڵەبی ڕزگاری لە تۆفانی هیلاک، هەر چەند پەلامارێکیش درابێ، ئیحســـانێکی گـــەورەو منەتبارییەکی بەرچاوە؟ چەقەڵ گوتی: بەڵی ڕاستە. وە من لە تەمەنی درێژو ساڵانێکی زۆریشدا ناتوانم سپاسی پادشا بکەم‌و چاکەی بدەمەوە. ئەم لێبوردنە، پاش ڕەتکردنەوەی سزا و تەمێکـــردن، لە هەموو نیعمەتێک گەورەترە. وە لەمەوبەر دڵســـۆزو وەفاداری پادشـــا بووم‌و گیان‌و دڵو بینایی خۆم بە قوربانـــی ڕەزامەندی ئەو دەکرد. وە ئـــەوەی دەیڵێم بۆ ئەوە نییە لەم ڕووداوەی خۆمدا خەتایەک یا عەیب‌و ئیرادێک بدەمە پاڵ ئەو. بەڵام ئێرەیی حەسوودان دەرهەق بە خاوەن هونەران‌و لێهاتووان ڕەســـمێکی کۆن‌و باوەو عادەتێکی بەردەوامـــەو پێش‌پێگرتنی بە کەس ناکرێ. بـــەڵام ئەم کارانە ســـوودی چییە؟ ئەم بێ ئەنوایانە، دۆســـتان دەگرن‌و هەزار فڕوفێڵ دەکەن‌و خۆیان زەحمەت دەدەن‌و جامەلووســـکی‌و کلکەسووتەی پادشا دەکەن‌و تێدەکۆشن کارو باری وڵات لە گرێژەنە بەرن. بە زبانی چەورو ڕەفتاری جوانی درۆزنانە دنیایەک دەکەنە پشـــتیوان‌و هەموو لایەنەکان بە وەعدەی درۆ هەڵدەخەڵەتێنن‌و حاسڵی ئەو کارانەش بێجگە لە حەسرەت‌و پەشیمانی هیچی تر نییە. چون هەمیشە هەق سەرکەوتووەو ناهەق تێک شکاوە. وە بەو حاڵەشەوە دەترسم کە عَیاذاً بِاللهِ[1] لە نێوان من‌و پادشادا مەجالی خۆ تێهەڵقوتاندنێکی دیکە وەدەست بێنن، ئەگینا، ئێمە هەر بەندەی بارەگای خۆتین.

شێر پرســـی: کام کەلێنە کە ئەوانە دەتوانن پیلانگێڕی تێدا بکەن؟ گوتی: "دەڵێن، لە دڵی بەندەی تۆدا ترسێک چەکەرەی کردووە، بەو کارەی کە دەرهەق بـــەو ئەنجامت دا و ئەمڕۆ دڵشـــکاوەو ڕەنجاوە". وە ئەوە بۆ پادشـــا جێگەی بەدگومانییە، بە تایبەت لەمەڕ کەســـانێک کە ســـزا درابن‌و جەفایان دیتبێ. یا

١. پەنا بۆ خودا.

لــە پلەوپایە کەوتبن‌و عەزڵ کرابن، یا لە جێگەی ئــەو دوژمنێکیان دانابێ کە روتبــەو پایەی لەو نزمتــر بووبێت، هەر چەند ئەمە هەرگیز نابێ. وە لە پیاوی زانا شاراوە نییە کە پاش ئەم رووداوانە، دڵو دەروون‌و بیروڕای هەر دوو لایەن پاک دەبێتەوە. چون ئەگەر دڵی پادشا، بەهۆی کۆتاییکردن‌و گوناهێک، کە بە گوێی ئەویان گەیاندبێ لە کەسێک کرمێ بووبێ، کاتێک تووڕەیی خۆی دەربڕی‌و ســزایەکی بە ئەندازەی لەســەر کابرا دە کار هێنا، بێگومان ئەو دڵکرمێبوونە لادەچــێ‌و کەم‌و زۆر هیچی لێ بەجێ نامێنێ. وە تێچاندنی حەسوودانیشــی بۆ ئاشــکرا دەبی‌و چیتر گــوێ ناداتە تڕەهاتو قۆڕیاتی ئەوانــەی غەرەزدارو رق لــە زگن. وە زۆری یەکدڵی‌و دڵســۆزی‌و کەماڵی هونەرو کیفایەتی ئەم کەســە روونتر دەبێتەوە. چونکە تا بەندەیەک دڵســۆزێکی لێهاتوو نەبێ، ناکەوێتە بەر حەســوودی‌و دوژمنایەتی‌و هاوکاران بۆی تێناچێنن. وە راســتیان گوتووە کە دەڵێن: دارا کە نەبی، هەمیشە ئاسوودە دەژی.[1]

وە ئەگەر، لە دڵی خزمەتکاردا خۆفـو هەراســێک هەبێ، وەختێک ســزا درا ئەویش ئەمین دەبێ‌و لە چاوەڕوانی بەڵادا نامێنێتەوە. وە رەنجانی خزمەتکار لە سێ حاڵەتان بەدەر نییە. جێگەو پێگەیەکی کە هەیەتی لە سۆنگەی بێ لوتفی پادشا، دابەزێ‌و کەم بێتەوە. یا دوژمنان لێی وەخۆ کەون، یا ماڵ‌و سامانێکی کە وە سەریەکی ناوە لە دەستی بچێ. وە هەر کات رەزامەندی پادشای وە دەست هێناوە، بڕواپێکردنی پادشا لەسەر ئەو تازە دەبێتەوەو دوژمن تێدادەچێ‌و ماڵ‌و ســامان کۆ دەکاتەوە، چونکە بێجگە لە گیان هەمووشــت قەرەبوو دەکرێتەوە؛ بە تایبەتی لە خزمەت پادشــایان‌و ئەعیان‌و جوامێرانی رۆژگاردا. وە چون ئەم بابەتانە جێبەجێ دەکرێن، ئازارو ئەزیەت بە چ دەلیل دەبێ بمێنێ؟ وە قەدری ئەم نیعمەتانە ســەرەتا و لە دواییدا کە وێک دەکەونەوە کەسانێک دەیزانن کە وەک رابردووان باش‌و دڵسۆزو پاکداوێن‌و خاوێن بن.

وە پاش ئەم هەموو قســەو باسە، هیوادارم کە پادشا لێم ببوورێ‌و جارێکی دیکە نەمخاتەوە داوی بەڵا و ئیزنم بدا لەم بیابانەدا ئەمین‌و ئاســوودە بۆ خۆم

---

١. دارنده مباش وز بلاها رستی.

بسووڕێمەوە. شێر گوتی: ئەم باسە روون بۆوە. خوا هەڵناگرێ قسەکانت ماقووڵو رازاوە بوو. ورەت بەرزو دڵت پتەو بێو لەسەر کاروباری خۆت بمێنەوە، چون تۆ لەو بەندەگانە نیت کە ئەم تۆمەتانە دەرهەق بە تۆ مەجالی قبووڵکردنیان بێ. ئەگەر شتێکم پێ بگەیەنن، گوێی پێ نادەمو بە هێندی ناگرم. ئێمە تۆمان ناسیوەو بە دروستی تێگەیشتووین کە دە جەفادا خۆڕاگرو لە نیعمەتدا شوکرانەبژێری. وە ئەم هەر دوو خەسڵەتە، دە ئەحکامی عەقڵو رێبازی یەکدڵیدا بە واجیبی سەرشان دەزانی. وە ملبادان لەم دوو ئایینی بەندەیی‌و دینی‌و مردانەگی‌و پیاوەتییە بە حەرامی رەها دەزانی. وە هەر چی بە پێچەوانەی دینداری‌و خۆڕاگری‌و ئەمانەت بێ، بە مەحاڵو حەرامو ناڕەوا و سەرسووڕهێنەری دادەنێی. لەخۆڕایی خۆت نیگەران مەکە، فکر لەم شتانە مەکەوە. متمانەت بە عینایەتو چاوەدێری ئێمە زۆرتر هەبێت. کە بڕوای ئێمە بە راستی‌و ئەمانەتی تۆ ئەمڕۆ وەراست گەڕا و گومانم لەمەڕ عەقڵو زانایی تۆ ئەمڕۆ پاش ئەم رووداوە بوو بە یەقین، وە بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان، چیدی قسەی دوژمنانم بە گوێدا ناچێ‌و هەر رەنگێک تێکەڵ بکەن، بە دوژمنایەتی لە قەڵەم دەدەین.

کورتی ببڕینەوە، دڵی چەقەڵی گەرم کردو ناردیەوە سەر کار. رۆژ لە رۆژ زۆرتر رێزو حورمەتی لێ دەگرتو پلەوپایەی بەرزتر دەکردەوەو متمانەی زۆرتری پێ دەکرد.

ئەوەیە چیرۆکی پادشایان‌و ئەوەی لە نێوان ئەوان‌و ژێردەستانیاندا پاش توندوتیژی‌و تووڕەیی رادەبرێ. وە عاقڵان لێیان تێک نەچێ کە مەبەست لە گێڕانەوەی ئەم حەکایەتانە چی بووە. وە هەر کەس ئاسمان ئاوڕی خێری لێ دابێتەوەو سەعادەتی ئەم جیهانەی بە نسیب بووبێ، بە وردی تەلاش بکا لەم ئیشاراتە حاڵی بێ. وە هیمەت بکا و رەمزو رازی زانایان کەشف بکا.

وَاللهُ اَعْلَمُ وَ هُوَ الْهادی اِلی سَوَاءِ السَّبیل

## ١٠
# تیرهاوێژو شێری مێ

ڕای گوتی: بیســـتم داستانی پادشایانو ئەوەی لە نێوان ئەوانو دەستو پێوەندناندا ڕادەبرێ؛ وەک، خەیانەتو خیلافـو جەفا و سزادانو گەڕانەوە بۆ تازەکردنەوەی متمانەو بڕواپێکردن، کە لەسەر پادشایان فەرزە بۆ ڕێکوپێکی وڵاتەکانیانو دە بەرچاوگرتنی مەسڵەحەتەکانیان لەسەر بنەمای ئەم پەندە کە دەڵێ: اَلرّجوعُ اِلی الحَقّ أولیٰ مِنَ التّمادِی فِی الْباطِلِ.[1]

ئێستا باسی ئەو کەسەم بۆ بکە کە بۆ پاراستنی خۆیو دە بەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی، لە ئازاردانی دیترانو زیانگەیاندن بە گیانداران دووری بکا و قسەی زانایان دە گوێ بگرێ تا تووشی تەنگەژەو گرفتاری نەبێ.

بەرەهمـــەن جوابـــی داوە: کەس ئازاردانـــی گیانداران بـــە ڕەوا نازانێ مەگەر جاهیلانو نەزانان کە ناتوانن جیاوازی نێوان خێرو شـــەڕو قازانجو زەرەر بناســـنو بە حوکمی کەریەتی خۆیان فکر لە عاقیبەتی کاری خۆیان ناکەنەوەو هێزی دیتنو بەراوردیـــان ئەوەندە نییە بەرهەمی هەڵسوکەوتی خۆیان ببینن، چونکە زانیاری ئەوانەی ڕێگەیان ون کردووە، لە تێگەیشتنی مەســـڵەحەتەکان، بە گشـــتی، کوڵو کلۆڵە. وە پەردەی نەزانیو نەفامی بەرەڵێخێکی ئاشـــکرایە. وە بوونەوەری عاقڵ هەر شتێکی بۆ خۆی نەیەوێ بۆ دیترانیشی ناوێ.

---

١. گەڕانەوە بۆ سەر ڕێبازی دروست باشترە لە درێژەدانی ڕێگەی ناهەق.

کارو ئاکارت دزێو و چاوەڕوانی چاکەشی؟
بەرهەمی باغی ژیانت باوڕێنەو ئاوەشـــی[1]

وە دەبێ بزانین کە هەر کردارێک پاداشـــی خۆی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدەرەکەی. وە ئەگەر بە درەنگیشەوە بگەڕێتەوە نابێ دڵخۆش بین، کە ئەوەی دەبێ بێت هەر دێت با بە درەنگیشـــەوە بێت. ئەگەر کەسێک بیەوێ بەدکرداری خۆی بە درۆ و دەلەســـەو فێڵو تەڵەکە، داپۆشـــێو بە فریودان خۆی دە لیباســـی چاکەکاریدا نیشـــان بدا، بە جۆرێک کە خەڵک تەعریفی بکـــەنو لە دوورو نزیک نێوبانگی بڕوا، دیســـانیش بەم فرۆفێڵانە، بەرهەمی کارە خراپەکانـــی یەخەی بەرنـــادەنو بەرو بوومـــی دەروونی پیسو پۆخڵ وەک ژەهراو بـــە گەروویدا دەکرێ، ئەو دەم نەســـیحەتو پەند وەردەگرێو رەوشـــتی چاک رەچاو دەکا. وە نموونەی وەها حاڵەتێک داســـتانی شـــێرو پیاوی تیرهاوێژە.

رای پرسی، چۆن بوو ئەم چیرۆکە؟ گوتی: دەگێڕنەوە شێرێکی مێ بە دوو توولەوە لە مێشەیەکدا دەژیا. رۆژێک بە دوای نێچیردا لە مێشە وەدەر کەوت. تیرهاوێژێک هاتو هەر دوو توولەی کوشـــتو کەوڵی کردن. شێر کە گەڕاوەو کەلاکـــی بێچووەکانی بەم جۆرە چاو پێکەوت، هاوارو دادو بێدادی گەیشـــتە ئاســـمان. لە جیرانەتی ئەودا چەقەڵێکی پیر هەبوو، کە گوێی لەم شـــیوەنو رۆرۆیە بوو. رۆیشتە لای شێرو پرسی: هۆی ئەم غەمو فیغانە چییە؟

شـــێر حاڵو حەکایەتی بۆ باس کردو کەلاکی بێچووەکانی پێ نیشـــان دا. چەقەڵ گوتی: ئەوەی بزانە کە هەر دەســـتپێکێک پایانێکی هەیەو هەر کات مەودای تەمەن تێپەڕێو ئەجەل هات، ساتێک مۆڵەت نادا، هەر وەها بناغەی کاری ئەم جیهانە فانییە لە سەر ئەوە داندراوە، لە پاش هەر شادییەک دەبێ چاوەڕوانی غەمێکو لەپاش هەر غەمێکیش بە هیوای شادییەک بی. وە لە هەر حاڵەتێکدا دەبێ بە قەزای ئاسمانی رازی بی کە سەبرو خۆڕاگری لە رووداواندا جلوبەرگی جوامێرانە.

---

١. بد می‌کنی و نیک طمع می‌داری / هم بد باشد سزای بد کرداری.

**کاری گەردوون هەمیشە هەر ئەوەیە**
**شادی گەر هات غەمی لە پشتەوەیە**[1]

لەم شیوەنو گریانە دەست هەڵبگرەو بەزەییت بە خۆدا بێو پەندی لەمێژینە دەڵێ: یَداکَ أوکَتا و فُوکَ نَفَخ.[2] (مەبەست ئەوەیە، خۆت لۆمە بکە نە کەسی دیکە.) ئەوەی تیرهاوێژ دەگەڵ تۆی کردووە، تۆ سەت خراپترت دەگەڵ خەڵکانی تر کردووەو ئەوانیش دادو فیغانی بێهوودەیان کردووەو پاشان ناچار هێور بوونەتەوە. ئەگەر دیتران ئازاریان دای خۆڕاگر بە، وەک چۆن ئەوان خۆڕاگرن کاتێک تۆ ئازاریان دەدەی. مەگەر نەتبیستووە کَما تَدِینُ تُدانُ.[3] پیاو هەر چی بیکا، دەبێ بەو ئەندازەش چاوەڕوانی پاداش یا موکافات بێ. هەر کەس هەر تۆمێک بچێنێ حاسڵەکەی دەدروێتەوە. ئەگەر هەر لەسەر ئەم ڕەوشە بڕۆی زۆر بەڵای دیکەی لەم چەشنە دەبینی. ڕەوشتی خۆت بە مودارا و کەمئازاری برازێنەوەو خەڵکان مەترسێنە تا ژیانێکی ئەمینو ئاسوودە تێپەڕ بکەی.

شێر گوتی: بێپەردەتر قسەم دەگەڵ بکەو مەترسە، ئەوەی دەیڵێی بە دەلیلو بەڵگە بیانسەلمێنە.

چەقەڵ گوتی: تەمەنت چەندە؟ گوتی: سەد ساڵ. گوتی: باشە لەم ماوەیەدا بە چی ژیاویو هێزو توانات لە چی گرتووە؟ گوتی: لە گۆشتی گیانداران، ئادەمزادو گیاندارانی وەحشی کە ڕاوم کردوون.

گوتی: ئەو گیاندارانەی چەندین ساڵ بە گۆشتی ئەوان ژیاوی، دایکو باوکیان نەبوو، ئایا عەزیزانی ئەوان، سۆزی دووریو لەناوچوونیان جەرگی هەڵنەقرچاندوون؟ ئەگەر ئەودەم ئەوەت زانیبا و خوێنی ئەو بەستەزمانانەت نەرشتبایە، ئەمڕۆ تووشی ئەم حاڵەتە نەدەبووی.

شێر کە ئەم قسانەی بیستو لە ڕاستی بابەتەکە تێگەیشتو یەقینی پەیدا کرد کە ئەم ئازارە بەرهەمی ئەو ئازاردانە بووە کە ئەنجامی داوەو کاری ناڕەوای وەلا نا و دەستی لە گۆشت خواردن هەڵگرتو بە میوە خواردن قەناعەتی کرد.

---
۱. تا بود چنین بُدست کار عالم / شادی پس اندُهست و راحت پسِ غم.
۲. دەستەکانت بەستراونو زارت فوو دەکا
۳. چۆن پاداش بدەی ئاواش پاداشت دەدەنەوە.

کاتێک چەقەڵ دیتی شێر رووی دە میوەجات کردووە کە قووتی ئەو [چەقەڵ] بوو، نارەحەت بوو و گوتی: زۆر ئاســـان رۆزی خۆت وەدەست هێناوەو دەستت کـــردووە بە خواردنی رۆزیو قووتی ئەوانی دیکە کە هیچ بەشـــدارییەکت تێیدا نییە. ئەو دارانە تۆیان بۆ تێر نابیو زۆر ناکێشێ ئەم دارودرەختو میوەو هەموو ئەو کەسانەی پێی دەژین هیلاک دەبنو تێدا دەچن. چونکە رسقو رۆزی ئەوان بەشـــی شەریکێکی زەبەلاحو دوژمنێکی گەورەی تێکەوت. ئەودەم کە زاڵم بووی ســـەرت دەبڕینو هەڵتدەدڕین، ئێســـتە کە زاهیدو لەخواترســـی نانیان دەبڕیو لە برســـانیان دەکوژی! لە هەر دوو حاڵەتدا عالەم لە دەســـتت رزگاریان نایە. دەتەوێ خەریکی دەسدرێژیو فەساد بە، یـا بـە جلوبـەرگی تـەقوا و پـاکی پۆشتە بە.

کاتێک شێر ئەو قسانەی بیست ئەو جار لە خواردنی میوەجاتیش دەستبەردار بوو. وە رۆژگاری خۆی نغرۆی بەحری عیبادەت کردو بە خۆی گوت:

مەبەســـتە دڵ بـــە دنیـــا، بێبەقایـــە
هەچـــی تێیدایـــە بێعەهـــدو وەفایـــە
ســـەعادەتمەند ئەوەی نێوی بەجێهێشت
ئـــەوەی لایەنگـــری مافـــی رەوایـــە[1]

ئەمەیە داستانی بەدکرداری دڕندەو خوێنخۆر، کە دنیا لە دەستی بە ئەمانەو هەمـــوو لایەنێک دە ژێر چـــۆک دەنێو بیر لە عاقیبـــەتو دواهاتی کاری خۆی ناکاتەوە تا تووشی وەها حاڵەتێک دەبێ کە خۆی خولقاندوویەتی. هەنگێ وەخۆ دێتەوەو رێگەی باشو رێبازی راست دەدۆزێتەوە.

هەر وەک شـــێر دەســـتی لە خۆینرشـــتنو خوێنخواردن هەڵنەگرت، تا دوو جگەرگۆشـــەی خۆی بە کەوڵکراوی لە سەر عەرز چاو پێ کەوت. کاتێک ئەوی چـــاو پێکەوت رووی لە دنیای ســـتەمکار وەرگێڕا و چیدیکـــە بە کایەو ئاکارە رەنگاوڕەنگەکانی جیهانی بێوەفا هەڵنەفریوا و گوتی:

---

١. چند از این آب و باد و آتش و خاک / وز دی و تیر وز تموز و بهار
برگذر زین سرای غرچه فریب / درگذر زین رباط مردم‌خوار.

ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیدایە هەلهەلەی مەخلووق
لە دەوری نەعشیدا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلووق
بـــە پەلپەلکردنی ســـبحەی ئەگەر ببوایـــە باوەڕیان
دەبوو قەت بەو حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق
بـــە ناوی تێگەیشـــتین ئێمە دنیا، هەر ســـەرابێ بوو
هەموو دەشچن بە خنکانو لە وشکیشە مەلەی مەخلووق[1]

وە عاقڵان پێویســـتە ئەم ئامازەگەلە بە وردی تێبگـــەنو ئەم ئەزموونگەلە بکەنە ڕێنوێنی عەقڵو سروشتی خۆیان. وە کاری دینو دنیا لەسەر ئەم تەوەرە بەرێوە بەرن. وە هەر چی بۆ خۆیانو ئەولادی خۆیان پەسندی ناکەن بۆ خەڵکی دیکەشی پەســـند نەکەن، تا سەرەتا و بنەتای کاری ئەوان بە ناوبەدەرەوەیی‌و یادی بەخێـــر برازێتەوە. وە لە دنیاو قیامەتدا لـــە دواهاتەکانی بەدکرداری دە ئەماندا بن.

وَاللهُ یَهدی مَنْ یَشاءُ اِلی صِراطٍ مُستَقیمٍ لِلَّذینَ اَحسَنوُالحُسنیٰ وَ زیادَةُ

---

١. لە دیوانی مەحوی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
هرانک او در تو دل بندد همی برخویشتن خندد / که جز همچون تو نااهلی چو تو دلدار نپسندد
اگر نوکیسه عشقی را بدست آری تو از شوخی / قباها کز تو بردوزد کمرها کز تو بر بندد
اگر تو خود نه ای، جانی، چنان بستانم از تو دل / که یک چشمت همی گرید، دگر چشمت همی خندد.

# ١١
# میوان‌و شێخ

رای گۆتیه بەرەهمەنی: داستانی بەدکرداری خوێنخۆرم بیست کە دە ئازاردانی خەڵکدا زێدە سەرەڕۆیە، وە کاتێک خۆی تووشی بەڵا دەبێ، پەنا دەباتە بەر تۆبەو پەشیمانی. ئێستا باسی ئەو کەسەم بۆ بکە کە کارو پیشەی خۆی وەلا دەنێ‌و کارێکی دیکە رەچاو دەکا. وە چون تێیدا شارەزا نابێ‌و گەڕانەوەش بۆ سەر پیشەی پێشوو دەست نادا، سەرگەردان‌و غەمبار تووشی داماوی‌و کلۆڵی دەبێ.

بەرەهمەن جوابی داوە: لِـكُلِّ عَمَلٍ رِجالٌ،[1] هەر کەس لە شوغڵی میراتی‌و کارێکی کە فێری بووە رووگەردان بێ‌و خۆی بە کارێکەوە خەریک بکا کە لایقی ئەو نەبێ‌و دەگەڵ ئەسڵو بناغەی ئەو رێک نەکەوێ، بێشک دەکەوێتە باری سەرلێشێواوی‌و گومانەوەو حەسرەت‌و دڵەراوکەی دەبێ، کە هیچ سوودیشی نییەو گەڕانەوەش بۆ سەر شوغڵی جاران مەیسەر نابێ. هەر چەند گوتوویانە: اَلحِرفَةُ لاتُنْسىٰ وَ لٰكِنْ دقائِقها تُنْسىٰ.[2] پیاو دەبێ لە سەر کاری خۆی پێداگرو خۆڕاگر بێ‌و بە هەر هەوەسێک دەست بۆ لقێکی دیکە نەبا، وە بە جوانی شکۆفەو گەڵای ئەو لقە فریو نەخوا، چون ناتوانێ متمانەی بە شیرینی میوەکەی هەبێت. وە نموونەی ئەم سەرەتایە بەسەرهاتی شێخەکەیە. رای پرسی: ئەم حەکایەتە

---

١. هەر کارەی پیاوی خۆی دەوێ.

٢. کارو شوغڵ فەرامۆش ناکرێ، بەڵام وردەکارییەکانی لە بیر نامێنن.

چییە؟ گوتی: دەگێڕنەوە لە وڵاتی "کەتنووج" پیاوێکی داوێنپاکو دڵسۆز هەبوو کە لە دینداریدا گەیشـــتبووە پلەی ئیجتیهـــادو زۆر بە وردی تاعەتو عیبادەتی دەکردو لەســـەر ڕێبازی زانایان دەڕۆیشتو ڕۆژگاری دەگەڵ خێراتو چاکەکاری ڕادەبوارد. لە دۆســـتایەتی دنیا و کەســـبی حەرام بە دوور، لە ریا و غەیبەتو پاشملە باسکردن مەهجوور. شێخێکی بەناوبانگو مەشهوور.

ڕۆژێک ڕێبوارێک وەک میوانێک لێی وەژوور کەوت. شـــێخ بەرووی خۆشەوە، بەجۆشو خرۆشەوە ڕۆیشتە لای. کە میوان پێڵاوی لە پێ کرد، لێی پرسی کە: لە کوێوە دێیو بەرەو کوێ دەچێ؟ میوان جوابی داوە کە: بە بیســـتن، حاڵی عاشـــقی سادق، بە بێ دیتنی دەروون، تێناگەی. وە هەر کەس کە سەراسیمەو بێدڵ، هەنگاوی خستە ڕێگەی ئەوینو مەبەستی ڕەزامەندی دۆست بێ. بێگومان ئاوارەی دەشـــتی دوورییەو شوێنو پێگەی جیاواز لە پشت سەری خۆی بەجێ دێڵـــێ، تا بڕوانێتە ڕووگەی دڵ. وە کاتێک ئەم بەختەوەرییەی دەســـت کەوت، گیانی خۆی بۆ قوربانیکردن دەخاتە ســـەر بەری دەســـت. وە ئەگەر لە گیان عەزیزتریش دڵبەرێکی هەبێ، ئەویش قوربانی دەکا. بە گشـــتی، سەربهوردەی من دوورو درێژەو سەفەری من سەرەتا و بنەتای نییە.

کە ئەم قســـانە کۆتایی پێ هات. شـــێخ فەرمووی کەمێک خورمایان هێنا و هـــەر دووکیان دەیانخوارد. میوان گوتی: میوەیەکی بەلەزەتو خۆشـــە. ئەگەر لە وڵاتی ئێمەش دەســـت کەوتبایە زۆر باش دەبوو. هەر چەند قورسەو دەگەڵ میزاج ســـازگار نییە. وە لەو هەرێمە هەموو چەشـــنە میوەیەکی ڕەنگاوڕەنگ، بەتامو بۆنی خۆشەوە، لە سایەی خوداوە، دەست دەکەوێو بە ئاشکرا لە خورما باشترن.

شـــێخ گوتی: بەو حاڵەشـــەوە، هەر چەند هەر چـــی تەبیاتی مرۆڤ بیەوێ بوونەکەی لە نەبوون باشترە، بەڵام ئەو کەسەی ئارەزووی شتێک دەکا کە پێی ناگا، بە بەختەوەر ناناسرێ، چون نەگەیشتن بە مرادو هەست بە سەعادەتکردن دوو شتی دژ بە یەکن. وە ئەگەر واش نیشان بدەن کە قەناعەت لە پێشەوەیە، عەقڵ قبووڵی نییە، چونکە قەناعەت لەسەر شتێکی کە هەیە پەسندەو قانعبوون

لەسەر شتێک کە بوونی نییە، دەلیلە بۆ نزمی ورەو نەبوونی ئیرادەو هیممەت.

وە ئەو شـێخە زبانی عیبری باش دەزانیو راوێژو گفتولفتی زۆر خۆش بوو. میوان خۆشـی لە قسەکردنەکەی هاتو ویستی فێری ئەو زبانە بێت. دە پێشدا مەتحو سـەنای شـێخی کردو گوتی: لە چاوی پیس بە دوور بی، نە رەوانبێژی لەمە تەواوترو نە فەسـاحەتێ لەوە جوانترم بیسـتووە، ئەگەر ئەم تکایەم لێ قبووڵ بفەرمووی لە خۆت دەوەشێتەوە. چونکە بە بێ ئاشنایەتی بەرایی، زۆرت حورمەتی قەدەمی من گرتو خۆشەویستیت بە واجیب زانیو لە پەزێراییدا زۆرت زەحمەت کێشـا. ئەمرۆ کە هۆکاری دۆستایەتیو هاونشینی لە ئارادایە، ئەگەر لوتفت هەبێو بە مەیلەوە ئەم ویسـتەی من قبووڵ بفەرمووی، دۆستایەتیمانی پێ دەڕازێتەوەو جێگەی شوکرو سپاسی تێدا پتەوتر دەبێ.

شێخ گوتی: فەرمانی تۆ لە سەر چاوەو بەو کارە شانازی دەکەم. وە ئەگەر بە راستی مەیلت لە فێربوونەو دە جێبەجێکردنیدا لێبڕاوی، ئەوەی لە دەستم بێ دڵسـۆزانە ئەنجامی دەدەمو دە فێرکردنو حاڵیکردنتدا لازمە ئەوەندەی دەتوانم حـەول بدەم. میوان دەسـتی پێکردو ماوەیەک خۆی ماندوو کرد. سـەرەنجام رۆژێک شێخ پێی گوت کارێکی دژوارەو زەحمەتێکی گەورەت وە ئەستۆ گرتووە.

دەتـەوێ ببیـە مـنو نابیتـێ
بگەیـە ئاسـتی مـنو ناگەیتێ[1]

وە هـەر کەس زبانی خـۆی وەلا بنێو لە باری زبانو شـوغڵو کارەوە بە پێچەوانەی رابردووان بجوولێتەوە، کارەکەی بە ئاکام ناگا و نابێتە شتێک.

میوان جوابی داوە: چاولێکەری بابو باپیران دە نەزانیو نەفامیدا، نیشانەی بێعەقڵیو کەریەتییەو کەسبی هونەرو دەستخستنی گەورەیی نیشانەی عەقڵو تێگەیشتنو زانیارییە.

شـێخ گوتی: من شەرتی نسحەتو رێنوێنیو دڵسۆزیم بەجێ هێنا و دەترسم عاقیبەتی ئەم تەلاشە نەدامەتو پەشیمانی بێ، وەک ئەو قالاوەی کە دەیویست لاسـای رۆیشـتنی بە لەنجەولاری کەو بکاتەوە. میوان پرسـی: ئەو حەکایەتە

---

١. خواهی که چون من باشی و نباشی ا خواهی که چو مـن دانی و ندانی.

چۆنە؟ گوتی:

دەگێڕنەوە کە قاڵاوێک چاوی بە کەوێک کەوت کە دەڕۆیشت. لەنجەولارەکەی زۆر پێ جوان بوو. جووڵانەوەی بە ئاهەنگو ڕێکوپێکیو چوستوچالاکی هەموو ئەندامی، سەرنجڕاکیش بوو. قەڵ ئارەزووی کرد ڕەوتی کەوی بێ. چونکە سروشتی هەموو کەس مەیلی بە هەموو چەشنە جوانییەک هەیەو هەموو دەیانەوێ پێی بگەن. کورتی ببڕمەوە، لێ برا فێری ئەم شێوە ڕۆیشتنە بێ. ماوەیەک خۆی زەحمەت دا و بە دوای کەودا ڕۆیشت، فێری نەبوو، ڕۆیشتنەکەی خۆشی لە بیر بردەوە، بە شێوەیەک کە بە هیچ شێوە وەبیری نەهاتەوە.

وە ئەم نەقڵەم بۆیە بۆ کردی تا بزانی کە تەلاشی بێهودە دەکەیتو لە خۆوە خۆت زەحمەت دەدەی. زبانی بابو باپیران فەرامۆش دەکەیتو عیبریش فێر نابی. وە گوتوویانە، نەفامترین کەس ئەوەیە کە خۆی بە کارێکەوە خەریک بکا کە دەگەڵ پیشەو نەسەبی ئەو نەیخوێنێتەوە.

وە ئەم بەشە دەگەڕێتەوە بۆ وریاییو قایمەکاری پادشایان. هەر والی یا حاکمێک کە بیەوێ وڵات بەڕێوەبەرێو ڕەعیەت بحەسێنێتەوەو دوژمنان تێک بشکێنێ، دەبێ بە وردیو بە وریایی هەڵبژێردرێو [پادشا] نەهێڵێ کە بۆرەپیاوی نائەهڵی بێ عەسڵو نەسەب خۆی بگەیەنێتە ئاستی پیاوماقووڵانی نەجیبو ڕەسەنو خۆی بکاتە هاوشانو هاوڕکێفو هاوتەرازی ئەوان. چون هەڵبژاردنی بەندەگانو دە بەرچاوگرتنی پلەوپایە، دە کاروباری دەسەڵاتداریو سیاسەتدا روکنێکی موعتەبەرە، بە ئاوڕدانەوە لە قانوون لە نێوان پلەی پادشایەتیو وەرزێریدا، جیاوازی هەیە. وە ئەگەر جیاوازی پلەوپایە دە بەرچاو نەگیرێ. پلەنزمەکان جێگەی پلە ناونجییەکان دەگرنەوەو ناونجییەکان دەچنە جێگەی گەورەکانو گەورەیی ملکو دەسەڵاتو هەیبەتی جیهانداری تووڕ هەڵدەدرێ، زیانو پشێوی زۆر ڕوو دەدا. وە پادشایانو گەورەکانی ڕۆژگار هەمیشە تێکۆشاون پێش بەم کارەساتە بگرن. چونکە ئەگەر ئەم ڕەسمە درێژە پەیدا بکا، خەڵکانی دنیا سەرساموو سەرگەردان دەبن، کارەکەرو کاسەبە جێگەی سەنعەتگەرو هونەرمەند دەگرنەوەو ئەهلی هونەرو سەنعەت ناتوانن کاری کارگەران ئەنجام

بــدەنو ناچار زیانی ئەم بارودۆخە بڵاو دەبێتەوەو هەموو لایەک دەگرێتەوە، وە پێداویستییەکانی ژیانو بژیوی جەماوەر بە خاسو عامەوە تووشی کەمو کەسری دەبێ. روودانی ئەم بارە نالەبارەش دەدرێتە پاڵ دەســەڵاتدارو حاکمی رۆژگارو شوێنەوارەکەی پاش ماوەیەک خۆی نیشان دەدا.

ئەوەیە داســتانی کەسێک کە کاری خۆی وەلادەنێو کارێک رەچاو دەکا کە میراتی نییەو بە شــێوەی فێربوون دەســت نادا. پیاوی زانا دەبێ ئەم باسە بۆ تێگەیشتن بخوێنێتەوە نەک بۆ پێکەنینو سەرگەرمبوون، تا بتوانێ لە فایدەکانی بابەت ســوود وەربگرێو ئەخلاقو عادەتەکانی خۆی لە عەیبو غەفڵەتو ئیرادو کەمایەسی بپارێزێ.

وَاللهُ وَلِيُّ التَّوفيق

## ١٢
# پادشا و بەرەهمەنەکان

رای گوتی: داستانی ئەو کەسەم بیست کە لە پیشەی بابو باپیران رووگەردان دەبێو بە شتێک بادیەوا  دەبێ کە ئامرازی جێبەجێکردنی ئامادە نییەو ناگاتە ئەو شتەی ویستوویەتیو گەڕانەوەش بۆ لای کارو شوغڵی پێشوو مومکین نییە.

ئێستا پێمان بڵێ کە لە خەسڵەتەکانی پادشایان کامیان پەسندترەو مەسڵەحەتی مولکو پایەداری دەوڵەتو نزیکی ویستو ئارەزووی دڵی گەلو خەڵکانی تێدایە؛ سەبرو خۆڕاگری، سەخاوەت یا ئازایەتی؟

بەرەهمەن هاتە جوابو گوتی: باشترین رەوشتو پەسندترین رێگە بۆ پادشایان، کە هەم خۆیان ببنە خاوەنی هەیبەتو رێزو دەسەڵاتو هەم لەشکرو دەستو پێوەندو خەڵک شاد بن، وە هەم وڵاتو دەسەڵات پایەدار بن، سەبرو خۆڕاگرییە. چونکە لە سۆنگەی سەخاوەتەوە تەنیا تایفەیەکی تایبەت قازانج دەکەن. وە ئازایەتیش لە عومرێکدا جارێک بەکار دێ کە گرفتارییەک بێتە پێش. ئەمما سەبرو خۆڕاگری هەموو رۆژو سەعاتان بوونی پێویستەو قازانجی بۆ خەڵکو لەشکرو خاسو عام هەیەو پیاوێکی زانا گوتوویەتی: ئەگەر دە نێوان منو خەڵکدا تەنیا تاڵەموویەک هەبێ لە کاتی خۆشەویستیو نزیکیدا هەرگیز ناپسێنم، چون ئەگەر ئەوان شلی کەن دەیکێشم، وە ئەگەر توندی بکێشن شلی دەکەم، یانی سینگفراوانیو کەماڵی سەبرو حەوسەلەی من تا ئەم ئاستەیە، کە دەگەڵ هەموو خەڵکی دنیا دەتوانم بژیمو بەرێبچمو هیچ کەس پێوەندی منی

بۆ ناپسێ. وە هەر کەس ئەم ورەیەی هەبێ دەبێ ئەم بابەتانە بکاتە رووگەی دڵو کەعبەی گیان. چون خۆڕاگریو زیپکو زاکوون بۆ پادشایان جوانترین خشڵو درەوشاوەترین زێروزەنبەرە. چونکە فەرمانی پادشایان لە رشتنی خوێنو گرفتاریو مڵکو ماڵی خەڵکی دنیادا رەوایە، وە ئیزنو حوکمو ئەنجامدانی ئەمرو فەرمانەکانیان بە تەواوی بێ پەردەیە، ئەگەر رەوشتی خۆیان بە سەبرو حەوسەلە نەڕازێننەوە، بە یەک توندوتیژی دنیایەک وێران دەبێو خەڵکانێک دەرەنجێنو گیانو ماڵی زۆران دە مەترسی نەمانو هیلاکەت دەکەوێ.

وە سەبرو حەوسەلە خۆی بریتییە لە راوێژکاریو مەشوەرەت دەگەڵ عاقڵانو دە کارکردنی عەقڵو هۆشو ئەزموونو هاونشینی زانایەکی دڵسۆزو عاقڵو مێهرەبان. وە دووریکردن لە پیاوی غەیانو جاهیلو غافڵو ئازاردەر، چونکە هیچ شتێک ئەو کارتێکردنەی نییە کە هاودەمو هاونشین هەیەتی.

مەتەڵی عەهدو وەفا وەک مەتەڵی عەنقایە
پیاوەتی، باسی لە کن کەس مەکە، ئادەم بووە قات
لە هەموو جێ لە چ کەس بۆنی مرووەت نایە
کەرەمو سیدقو وەفا، ئێستە لە عالەم بووە قات[1]

وە ئەگەر پادشایەک بە سەخاوەت دنیا زێڕەوشان بکا، یا بە ئازایەتی دە جار دوژمن تەرتو تونا بکا، ئەگەر سەبرو خۆڕاگری نەبێ، بە نەعرەتەیەک هەمووی بە بای فەنا دەدا، وە هەموو رەعیەتو سپا و لەشکر لە خۆی بێزار دەکا. وە ئەگەر لەو دووانەدا [سەخاوەتو ئازایەتی] کەموکوورییەکیشی هەبێت، بە مودارا و دۆستایەتی دەتوانێ هەموو دنیا بکاتە دۆستو سپاسگوزاری خۆیو بە را و تەدبیر دوژمنان سەرکوت بکا، ئەڵبەتە سەبرو حەوسەلەی لە رادەبەدەریش بێ، عەیب نییە. چونکە ئەگەر رەنجو زەحمەتی زۆر بکێشرێو دە خۆڕاگریدا زێدەڕۆیی بکرێ، ئاخرییەکەی دەبێتە شەرمەزاریو زەحمەت بە خەساری.

---

١. لە دیوانی مەحوی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
تا نباشی حریف بی خردان / که نکوکار بد شود ز بدان
باد کز اوست لطف جان بر کار / زهر گردد همی ز صحبت مار.

وە هەر پادشایەک کە هەموو ئامرازو ئاسانکارییەکی دەسەڵاتی لە بەردەستدا بێ، ئەگەر، نە لە کاتی سـەبرو خۆڕاگریدا بە دوای هەوا و بادیهەوابووندا بێو نە لە کاتی تووڕەیی‌و سـزاداندا پێڕەوی لە شـەیتان بـکا و بناغەی کاری لە سـەر فکرو راوێژکاری راوەستابێ، وڵاتی ئەو ناکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دوژمنان‌و کـەس زەفەری پێ نابا. چون ئەگـەر لە هەڵگرتنی ئەم رەوشـتەدا غەفڵەت بکرێ؛ خۆشییەکی کە لە سـایەی یارمەتی رۆژگارەوە دەست کەوتبێ‌و رۆژگار لە بەرێوەبردنی کاروبارو سەروسـامان دان بە دەسەڵاتو موڵک، یارمەتی دابێ، هەمووی ئەوانە بە کەمترین تووڕەیی‌و زیانپیسییەک لە بەر یەک بڵاو دەبێتەوەو دواهاتەکانی بەڵا و پەشیمانی دەگەڵ خۆی دێنێ.

وە ئاشـکرایە کە سـەرچاوەی هەموو بەختەوەرییـەک، تەقدیری ئەو لایە. بەڵام مانەوەو خۆنواندنی ئەو، بەسـتراوەتەوە بە تێگەیشـتن‌و عەقڵی پادشا و دڵسۆزی‌و رێنوێنی وەزیر. کە ئەگەر پادشا خۆڕاگرو زانا بێ‌و راوێژکاری حەکیم‌و ئاوەزمەندیشـی هەبێ کە بە ئازایەتی‌و بێنیازی‌و قسەڕوێشـتوویی‌و لێهاتوویی ناوبانگـی دەرکردبێ‌و خاوەن‌ئەزموون‌و نیازپاکـی‌و مێهرەبانی بێت، دە هەموو کارێکدا سەرکەوتوو دەبێ. وە روو دە هەر شوێنێک بکا، فەتح‌و زەفەرو ئیقباڵ بە دوایدا دەچن‌و هەمیشـە گوێ‌قوڵاغی ئەمرو فەرمانی ئەو دەبن‌و دوژمنان بە تێکشکاوی‌و سەرشۆڕی دەدەنە دەست ئەو. وە ئەگەر بە پێی هەوا و غرووڕەوە لە سـەر کارێک فەرمـان دەر بکا و مەسـڵەحەتی کار دە بەرچاو نەگرێ، بە تەدبیرو مەشـوەرەتی یاریدەدەران‌و راوێژکاران‌و لوتـفـو هاوکاری ئەوان، ئەو کارەیش بە خێرو خۆشـی بە ئەنجام دەگا و راپەڕاندنی لە دەسـت دەر ناچێ، هەر وەک لە دوژمنایەتی پادشـای هێندو قەومەکەیدا قەوما. رای پرسـی: ئەو رووداوە چۆن بوو؟

گوتی: دەگێڕنەوە لە وڵاتی هێند، پادشـایەک بە ناوی "هبلار" دەسەڵاتداری دەکرد. شـەوێک حەوت جار خەونی ترسـناکی دیتو دەگەڵ هەر خەونەش لە خەو رادەپەڕی؛ کاتێک خەونی ئاخری دیت، ترس‌و هەراس تەنگی پێ هەڵچنی‌و تەواوی ئەو شـەوە دەیناڵاندو لە چەشنی ماری کلکپەڕیو، یا کەسێک دووپشک

پێوەی دابێ، ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو. کاتێک، پەردەی تاریکی لە سەر روخساری جوانی بەیانەی دنیاڕازێنەوە لادرا و شاژنی ئەستێرەکان بە لەنجەولاری بووکانەوە لە رۆژهەڵاتەوە خۆی دەرخست، هەستا و بەرەهمەنەکانی بانگ کردو ئەوەی بە خەون دیتبووی هەمووی بۆ گێڕانەوە. کاتێک بە وردی گوێیان دا بە قسەکانی پادشا و شوێنەواری ترسو خۆفو نیگەرانییان دە نێو چاوانیدا بەدی کرد، گوتیان: خەونێکی بەسامەو تا ئێستا کەس لەوە ترسناکتری نەدیتووە. ئەگەر ئیزن بفەرمووی سەعاتێک خەڵوەت دەکەینو چاو لە کتێب دەکەینو بە وردی فکری لێ دەکەینەوەو تەعبیری دەکەین، ئەودەم تەعبیرەکەتان بە جوانیو بە بەسیرەتەوە عەرز دەکەینو بۆ دەفعی بەڵا چارەیەک دەدۆزینەوە.

پادشا گوتی: زۆر بەجێیە.

پادشایان بەجێهێشتو لە لایەکی دیکە، پێکەوە دانیشتنو بە یەکتریان گوت: لەم ماوەیەدا دوازدە هەزار کەسی لە ئێمە کوشتووە. ئەمڕۆ لە رازو نهێنی ئەو ئاگادار بووینەوەو سەرەبەنێکمان هاتە دەست کە بتوانین تۆڵەی خۆمانی لێ بکەینەوە. ئەوەش بزانن کە ئەو لەبەر ئیحتیاجو نیاز ئێمەی لەم رازەدا کردە مەحرەمی خۆی، وە ئەگەر لە هەموو وڵاتاندا لێکدەرەوەیەکی خەونی شک بردبا هەرگیز ئەو متمانەیەی بە ئێمە نەدەفەرموو. بەو پەرێشانییەشەوە ئاسەواری دوژمنایەتی، بە تەواوی لە نێوچاوانیدا دەبیندرێ، دەبێ پەلە بکەینو دەست ببزێوین تا دەرفەت لە دەست نەچووە. فَاِنَّ الْفُرَصَ تَمُرُّ مَرَّ السَحابِ[1].

رێگەش ئەوەیە لەم بارەوە قسەی زبرو درشتو هەر چی دەکرێ بێپەرواتر دە کار بێنینو ئەوەندی بترسێنین کە هەر ئیشارەیەک بکەین نەتوانێ لێی لابدا. پاشان پێی دەڵێین، ئەو خوێنەی کە شەخسی خۆت تێی گەوزای، نەحسیو شەرارەتەکەی بەوە لادەچێ کە بفەرمووی جەماوەرێک لە نزیکانی خۆت، لە بەر چاوی ئێمە بەو شمشیرە تایبەتییە بکوژن وە ئەگەر ریزی ناوەکانی ویست دەڵێین: "جۆبەر"ی کوڕتو "ئێراندوخت" دایکی کوڕو "بەلار"ی وەزیرو "کاک"ی دەبیر، فیلی سپی کە خۆی سواری دەبێو ئەو دوو فیلەکەی تر کە زۆری خۆش

١. دەرفەتەکان وەک هەورەکان زوو تێدەپەڕن.

دەوێنو ئەو وشـــترە بوختییە کە لە شـــەوێکدا لە وڵاتێکـــەوە دەڕواتە وڵاتێکی دیکە. ئەوانە هەموو بە شمشـــێر مل بپەڕێنیو شمشێرەکەش بشکێنیو دەگەڵ ئەوان دە ژێر خاکدا بیشـــارێتەوە. وە خوێنی کوژراوەکان دە تەشـــتێک بکەن، پادشا سەعاتێک دە نێویدا دابنیشێ، کاتێک هاتە دەر، چوار کەس لە ئێمە لە چوار لاوە دەوری بدەینو ئەفســـوونێک بخوێنینو فووی پێدا بکەینو لەو خوێنە هێندێکی دە شـــانی چەپی هەڵسووین، پاش ئەو کارانە پاک پاک بیشۆینەوەو جەســـتەی چەور بکەینو ئەمینو ئاســـوودە بیبەینەوە مەجلیسی پادشایەتیو دەســـەڵاتداری. ئەگەر پادشا، سەبری هەبێو دڵ لەم جەماعەتە بەر بدا شەڕیو نەحســـی ئەم خەونـــە لەناو دەچـــێ. وە ئەگەر ئەم کارەی بـــۆ ناکرێ، دەبێ چاوەڕوانی بەڵای گەورە بێ، وەک برانەوەی پادشایەتیو تێپەڕبوونی ژیان.

ئەگەر بەقســـەمان بکات، بە کوژرانی ئەم جەماعەتە، تۆڵەیەکی باشمان لێ کردۆتەوە. کاتێک بە تەنیا مایەوەو کەســـی بە دەستەوە نەما، لێی رادەپەڕینو کاری ئەویش جێبەجێ دەکەین.

لەســـەر ئەم غـــەدرو کوفرانی نیعمەتـــە رێک کەوتنو چوونە لای پادشـــا. خەڵوەتی کردو قســـەی ئەوانی بیست. لە جێگەی خۆی هەستا و گوتی: مردن لەم رێگەچارەی ئێوە دەیڵێن زۆر باشـــترە. ئەگەر ئـــەم جەماعەتە کە دەگەڵ نەفســـی خۆم بەرانبەرن، بکوژم من لە ژیاندا چ ئاســـوودەییو چ فایدەیەکم بۆ دەمێنێتـــەوە؟ خۆ من هەر چـــی بیکەم تا هەتاهەتا لە دنیـــادا نامێنمەوە؛ بە هەر حاڵ ئاخری کاری ئادەمزاد هەر مەرگەو موڵکو دەســـەڵاتیش، بێ زەواڵو تێداچوونو دەستبەدەستبوون، نابێ. رێگەچارەیەکی باشتر بدۆزنەوە، چون لە نێوان مەرگی منو مەرگی خۆشەویســـتاندا[١] جیاوازی نییە. بە تایبەتی تاقمێک کە فایدەی عومرو سوودی مانەوەیان بۆ هەموو کەسو لایەنێکە.

بەرەمەنان گوتیان: پادشا بەرقەرار بێ أخوکَ مَنْ صَدَقَکَ قسەی حەق تاڵەو نەســـیحەتی بێڕیا و دوور لە خەیانەت، درشتو زبرە. پیاو چۆن دیتران دەگەڵ نەفســـی خۆی بەرانبەر دەزانێو گیانو وڵات فیدای ئەوان دەکا؟ نەســـیحەتی

---

١. برای تۆ ئەو کەسەیە کە راستت پێ دەڵێ.

دۆستان دەبێ دە گوێ بگیرێو بە موعتەبەری بزانێ. وە مەسەلێکی مەشهوورە أمَرَ مُبکیاتِک لا أمَرَ مُضحکاتِکَ[١]. پادشا دەبێ نەفسی خۆیو وڵات بە هەر قیمەتێک بپارێزێو لەم کارەدا هیوایەکی گەورەو فەرەجێکی تەواو هەیە، بێ درِدۆنگیو دوودڵی دەست بەکار بێ وە بزانێ کە ئادەمزاد هەموو کەسی بۆ خۆی دەوێ. وە مرۆڤ پاش رەنجو تێکۆشانی زۆر دەگاتە دەرەجەی سەربەخۆییو مەملەکەت بە تێکۆشانی زۆر دەستدەکەوێو تووڕەهەڵدانی ئەم دوو لایەنە لە عەقڵو زانایی بە دوورە. وە کاتێک پەشیمانی بە دوای خۆیدا دێنێ کە پەشیمانیو غەمخواردن دە فریا نایەن. وە تا زاتی پادشا هەبێ، ژنو منداڵ کەم ناهێنێو تا مولکو دەسەڵات باقی بێ، خزمەتکارو زریقەوبریقەش هەر دەبێ.

کاتێک پادشا ئەم قسانەی بیستو جەسارەتو رووداماڵاوی ئەوانی لەو باسەدا دیت، زۆر ناڕەحەت بوو، شێوا و پەشۆکا و هەستا و رووی دە کۆختەی خەمان کرد، سەری خستە سەر ئەرزو جەیحوونو سەیحوونی بە چاواندا رەوان بوو، هەر وەک ماسی لەسەر وشکانی هەڵبەزهەڵبەزی دەکردو بە خۆی دەگوت: ئەگەر ئاسایشی عەزیزان دە بەرچاو بگرم لە فایدەی مڵکو دەسەڵاتو ئاسوودەیی عەمر بێنسیب دەبم. وە ئاشکرایە کە خۆم چەندە دەژیمو سەرەنجامی کاری ئادەمی فەنایەو دەسەڵاتیش پایەدار نییە. ئەو جار من بێ کوڕەکەم کە میوەی دڵو سۆمایی چاوانمەو لە حاڵی حەیاتو پاش مردنیش پشتو پەنای منە، پادشایەتیم بۆ چییە؟ وە چون دەکەوێتە دەست دوژمنان لە درەنگو زووی بەجێهێشتنیدا چ تەفاوەتێک هەیە. ئەویش بۆ کوڕێکی کە تێگەیشتوویی‌و نەجابەتی درەوشاوەو نیشانەی ئیقباڵو بەختی بەرچاوەو پێڕەویکردنی لە بابو باپیران کە پادشای نێوبەدەرەوەی دنیا بوون، لە کەسبی شەرەفو تەدارەکی جیهانداریدا، ئاشکرایە.

وە بێ "ئێراندوخت" کە سەرچاوەی زوڵاڵی رۆژ لە قووڵکەی چەناگەی ئەو هەڵدەستێو سەرچاوەی رووناکی مانگی شەوی چاردە لە بناگوێی ئەودایە، روخساری هەر دەڵێی بەختی دەوڵەتی دڵخوازو زولفی دەڵێی تاریکی شەوگاری

---

١. گوێ بدە ئەوەی دەتگریەنێ، نە ئەوەی دەتخاتە پێکەنین.

نەگبەتە، کە وا ئالۆزو پەرێشـانە. دە لوتـفـو میهرەبانیدا بۆ عوزرو بەهانەو دە هەستانو دانیشتن دەگەڵ جەماوەردا، بۆ خۆگرتنو خۆشاردنەوە. اذا خَلَعَتْ رَداهـا، خَلَتْ حَیاها[1]، پاکداوێنو بەحەیا، دانیشـتنی دڵ دەفڕێنی، قسـەکردنی شـادی دەبزوێنێ، بە لارولەنجە کەو دەبەزێنـێ، ئەخلاقخاوێن، پاکیزەداوێن، ئەندام نەرموشڵ، هەیکەل شلومل.

بـە باڵا سـنەوبەر، بـە قەد شـووشو باریک
جەماڵـی رووناکـی شـەوی هـەورو تاریک[2]

پاش ئەم پەریڕوخسارە ژیان بۆ من چ تامێکی هەیە؟ وە "بەلار"ی وەزیر کە باشترین پیاوی لێهاتووی عالەمو کارزانترین ئەولادی ئادەمە، وەهەو خەیاڵی ئەو [ئەوەندە تیژە] کە لـە رازی زەمانەی غەددار ئاگات دەکاتەوەو عەقڵی ئەو لە نهێنییەکانی گەردوونی گەڕۆک خەبەری هەیە، بۆ بوونی ئەو کەسایەتییە، نەزمو نیزامـی وڵاتو وەرگرتنی خەراجو کۆکردنەوەی مـاڵو داراییو ڕێکوپێککردنی خەرجو مەخاریجو تەژیبوونی خەزێنەکان، چۆن دەست دەدا؟

وە بـۆ "کاک"ی دەبیر کە نەخشـێنەری فەلەک، قوتابی قامکەکانیەتی، وە دەبیری ئاسـمان نۆکەری بەیانو شـێوەی قسـەکانیەتی، وە هەر واژەیەک لە قسـەکانی گەوهەری گرانقیمەتەو ئەفسوونی ئاشـکرایە، نامەیەکی کاری سەد هەزار سـوارو قەڵەمێکی کاری سـەدهەزار نێزە دەکا، مەسڵەحەتی دەورووبەرو رووداوەکانی هەرێمەکان چۆن مەعلووم دەبێو چۆن لە ئەحواڵی دوژمنانو نییەتو قەستی نەیاران ئاگادار دەبین؟ وە هەر کات ئەم دوو بەندە لێهاتووەو ئەم دوو دڵسۆزە زانایە کە هەر یەکەی لە جێی خۆیدا چاوی بینا و دەستی یارمەتین لەناو بچنو سـوودو قازانجی دڵسۆزیو ڕێنوێنیو لێهاتوویی ئەوان لە مەملەکەتی من ببڕێتەوە، بەڕێوەبردنی کارانو ڕێکوپێکی نەزمی وڵات چۆن جێبەجێ دەبێ؟ وە فیلی سپی، کە خۆی دەڵێی خەرمانەی مانگە دەدرەوشێتەوەو دەڵێی هەیکەلی گەردوونی گەردانە، دەخولێتەوە. شـوێنی بەڕێچوونیشـی کاخێکی دڵگوشایەو

---

[1] ١. کە رووبەندی لادا، پەردەی شەرمو حەیاش لادەدا.
[2] ٢. میسباح.

دیمەنێکــی دڵبزوێنەو هەر وەها قەڵایەکی مەحکەمو پەنایەکی بەرزو بڵندە. بێ ئەو فیلە چــۆن دەتوانم پەلاماری دوژمن بدەم؟ ئەوجــار دوو فیلەکەی تر کە وەک برووسکەی دەستکردی هەورو بای سەرپەڕ هێرش دەبەن، دوو خورتوومی ئــەوان وەک دوو ئەژدەها کە لە تەپڵی ســەری چیاوە هەڵاوەســرابن، وە هەر وەک نەهەنگ کە لە دەریا دەرکەوتبن، هەر وەک گێژەڵووکەی رەشــەبا خەڵک رەپێچەک دەدەنو لە گۆڕەپانی شــەڕو پێکداداندا لافاوی خرۆشــانی دوژمنان تێکــەوە دەپێچن، چۆن بەرەنگاری دوژمنان ببمەوەو تێکیان بشــکێنم؟ وە بێ وشــتری جەممازەی بوختی کە لە هەڵاتندا دەســتی بای سەبا ناگاتە خرخاڵی قاچیو شەماڵی توندو بەحەرەکەتیش تۆزی پێی ناشکێنێ. وەک شاعیران پێی هەڵدەڵێن: "دڕووخۆرێکی کەمخۆرە، شــانو پیلی پانوپۆڕە، بە شــەو و رۆژو مانگو ســاڵ، لەم مەحاڵە بۆ ئەو مەحاڵ، باری گرانی لە پشتەوە ماندوو نابێ هەر وا گشتە، برووسکەو با دەبەزێنێ، نایگاتێ مامزی گەرمێنێ، کە توورە بوو دەلرفێنێ، بەبری بەیان دەتۆقێنێ".

من بێ ئەم وشــترە چۆن لە رووداوەکانی وڵات ئــاگادار دەبمو چون نامەی مزگێنــیو هەواڵی خۆشو باسو خەبەری دیکــە بۆ ئێرەو ئەوێ بنێرم؟ وە بێ شمشــیری بوڕڕان کە گەوهەر لە ســەر رووکاری ئەو وەک ئەستێرەیە لە سەر رێگەی کاکەشــانو وەک مێروولەیە لە ســەر جۆگەلە ئاوی رەوانی نێو چیمەنو سەبزەزار، ئاودیمەنێک کە ئاگری ئاژاوە لە هەیبەتی کوژاوەتەوە، ئاگربرینێک کە ئابڕووی دەسەڵات دەپارێزێ. پەنا بۆ خودا لە ئاوڕەنگی ئاگرینکردار.[1]

دە شەڕو بەرەنگاریدا چۆن سەرکەوم؟ وە ئەو دەم کە لەم کەرەسەو ئامرازانە بێبەهرە بوومو خۆشەویســتانو یارمەتیدەرانم بەتڵاند، لە ژیانو لە دەسەڵات چ خۆشییەکەم دەست دەکەوێ؟ دووری لە ئازیزان کارێکی دژوارو تاڵو ناخۆشە، وە جێبەجێکردنــی کاروبارو راپەڕاندنی ئەرکەکان بــە بێ یارو خزمەتکار، خۆ ماندووکردنێکی بێهوودەو تەلاشێکی بێفایدەیە.

سەرتان نەهێشــێنم. وردەوردە باســی دە فکرەوەچوونی پادشا بڵاوبۆوە.

---

١. نَعوذُ باللهِ از آن آب رنگ آتش فعل.

بەلاری وەزیر فکری کردەوە ئەگەر دە کەشــفی هۆکاری ئەم حاڵەتەدا هەنگاوی یەکەم هەڵبگرێ لــە دابو نەریتی بەندەگی دوور دەکەوێتەوە، ئەگەریش خۆی تێ نەگەیەنم، دەگەڵ دڵسۆزی، یەک ناگرێتەوە. پاشان رۆیشتە لای ئێراندوختو گوتــی: بارودۆخێکی ئــاوا هاتووەتە پێش، وە لــەو رۆژەوە کە من هاتوومەتە خزمەت پادشا، هیچ شتێکی لێ نەشاردوومەوە. لە هیچ کارێکی چکۆلەو گەورەدا بێ راوێژکاری دەگەڵ من، فکرکردنەوەی بە رەوا نەزانیوە. وە یەک، دوو کەرەت بەرەهمەنەکانی ویســـتووەو دەگەڵیان قسەی کردووەو ئێستا خەڵوەتی کردووەو دە فکرەوە رۆچووەو نەخۆشو لێوبەبار بۆی دانیشتووە، ئەوجا، ئیمرۆ تۆ شاژنی رۆژگاریو پەنای لەشــکرو رەعیەت تۆی. وە پاش رەحمەتو بەزەیی پادشــا، تۆی. لەوە دەترســم ئەو چاوبەســتانە، کارێکی پێ بکەن کە سەرەنجامەکەی سەرســامیو پەشۆکاویو پەشیمانی بێت. تۆ دەبێ بچیتە لایو بزانی چ باسەو بە من بڵێوە تا تەدبیرێکی لێ بکەم.

ئێراندوخت گوتی: منو پادشــا نێوان ناخۆشــیمان لــە نێواندا هەیە. بەلار گوتی: کاتێک پادشــا خەمگینو ئاڵۆزە، خزمەتکاران نابێ رووداماڵاوی بکەنو بچنە خزمەتی. کار، کاری خۆتە. وە من زۆر جار لە پادشــام بیســـتووە، "هەر کات ئێراندوخـــت دێتە لام غەمم لە دڵدا نامێنێ". برۆ ئەو کارە بکەو منەتێکی گەورە لەسەر تەواوی خزمەتکارانو دەوروبەری پادشا دابنێو نیعمەتی گەورەمان بە سەردا ببارێنە.

ئێراندوخت رۆیشتە لای پادشا و شەرتی خزمەتی بەجێ هێنا و گوتی: "هۆی ئەم خەمو خەفەتــە چییە؟ فکر لە چی دەکەیتەوە؟ وە ئەوەی لەو بەرەهمەنە مەلعوونانــەت بیســـتووە، بە ئێمەی بفەرموو، تا فکرێکــی لێ بکەینەوە. چون یەکێک لە مەرجەکانی بەندەگی ئەوەیە لە هەموو باسێکدا بەشداری بکەین، وە لە نێوان غەمو شادیو جوانو ناحەزدا جیاوازی دامەنێ". [هەر چی هەیە پێمان بڵێ].

پادشا گوتی: نابێ لە شتێک بپرسی کە ئەگەر پێتی بڵێن نارەحەت بی.

ئێراندوخـــت گوتی: خوا نەکا، پادشــا لــە رووی ناچارییەک غەم دایبگرێ.

وە ئەگەر اَلعَیاذُ باللهِ، غەمێک روو بدا، ورەی پیاوانە هاوڕێ دەگەڵ سیفەتی خۆڕاگریو پاراستنی نەریتی دەروون دە کار بێنێ. چونکە بیروڕای روونی ئەو، ئاگادارە کە خۆڕنینەوەو کڕووزانەوە مەینەتیو پەژارە زێدە دەکا، چونکە المُصیبَةُ لِلصّابِرِ واحِدَةٌ وَ لِلْجازِعِ اَثنان.[1] هەر وەها لە ئەسبابو ئامرازو کەلوپەلی دەسەڵاتو قودرەت شتێک کەم نییە کە ئاوا بۆی غەمگین بێ. هەر بەڵایەک نازڵ بێ یا هەر گرفتێک بێتە پێشەوە، بەرگریکردنی سەهلو ئاسانە.

قوربان وەرە دەر، لەم غەمو دەردو کەسەرە
ئەمری تۆ رەوا، هەمووی لە سەرچاوو سەرە
زێڕت هەیە، زێوت هەیە، خەروار خەروار
ئازووقە هەمووجۆر هەیە، عەمبار عەمبار
ئەستێرە بماڵەوە لە ئاسمانی سەروو
خوێن بمژە هەڵامسێ هەتا دەبیە زەروو![2]

وە پادشای سەرکەوتوو ئەو کەسەیە، کە ئەگەر کارێکی گرینگ روویدا، شێوەی تەدارەکو ئامادەبوون بۆ روویەڕووبوونەوە، بە عەقڵو زانایی خۆی دابین بکا. وە رێگەی قەرەبووکردنەوە لە بەر نووری فکرو تەدبیری ئەو هەڵەی تێناکەوێ، وە رزگاربوونو دەرچوون لەم جۆرە رووداوانە تەنیا بە عەقڵو خۆڕاگریو نەپەشۆکان مومکین دەبێ.

پادشا گوتی: ئەگەر ئەوەی بەرەهمەنان دەیڵێن، بە کێو بگوترێو ئەم خەبەرە بدەن بە رۆژگار، کێو لە بەر یەک دەچێو رۆژ رەش هەڵدەگەڕێ. تۆش لەم پرسیارە بگەڕێ، چون ئەگەر بیبیسی نەخۆش دەکەوی. ئەو مەلعوونانە دەڵێن دەبێ تۆ و کوڕەکەمو هەموو بەندە دڵسۆزەکانمو فیلی سپیو فیلەکانی دیکەشو لۆکی بوختی، هەمووان بکوژم تا پێش بەو خەونە ناخۆشانەی دیتوومن، بگیرێ.

ئێراندوخت کە کچێکی زیرەک بوو، خۆی نەدۆڕاندو گوتی: باکت نەبێ قوربان،

---

١. موسیبەت بۆ پیاوی خۆڕاگر یەکەو بۆ ئەوەی دادو هاوار دەکا دوانە.

٢. هم گنج داری هم خدم، بیرون جَه ازکتم عدم / بر فرق فرقد نه قدم، بر بام عالم زن علم
انجم فرو روب از فلک، عصمت فرو شوی از ملک / برزن سما را بر سمک، انداز درکتم عدم.

پادشـــا نابێ بەو شـــتانە دەرهەڵبێ، گیانی بەندەگان بە قوربانی مەسڵەحەتی پادشا بێ. تا زاتی گەورەتان پایەدار بێ، ژنو منداڵ کەم ناهێنێو تا مەملەکەتو دەسەڵات مابێ، خزمەتکارو کەلوپەلی جوان هەر دەبێ.

بەڵام کاتێک شەڕڕو نەحسی ئەم خەونانە لاچوو و خەیاڵی پادشا لەم فکرە ئاســـوودە بوو، ئیدی چیـــدی بەو جەماعەتە متمانە مەفەرمـــوون، بە تایبەتی لـــەم روانگەوە کە لەم کارەدا گیاندار تێدا دەچێ، چونکە خوێنڕشـــتن کارێکی ئەستەمە، وە بێ فکرو قووڵبوونەوە، فتوادان بۆ ئەم کارە دواڕۆژێکی پڕمەترسی دەبێ. وە پەشـــیمانیو عەزرەت ســـوودێکی نابێ، چون ئەوەی رابرد بە کەس ناگەڕێتەوەو کوژراویش زیندوو نابێتەوە.

وە پادشا دەبێ ئەوەی لە بیر بێ کە بەرەهمەنان خۆشیان ناوێ، وە ئەگەرچی لە زانســـتدا لێکۆڵینەوەیان کردووە، بـــەڵام هەرگیز بەم دەلیلە لایقی ئەمانەتو متمانەپێکردن نابنو نابنە شایانی مەشوەرەتو تەدبیرپێکردن. چون ئادەمزادی ناجســـنو بەدگەوهەری نزمو پەست، بە هیچ جلوبەرگێک جوان نابێو زانستو ســـامانی دنیاش نابنە هۆی ویقارو کەرەمی ئەوان، ئەگەر بۆ پەروەردەکردنیان کۆشش بکەی، وەک ئەوە وایە تۆقی زێڕ دە گەردنی سەگ بکەیو دەنکە خورما دە زێڕ بگری.

هەر عەســـایەک نـــە ئەژدەهایـــە گوڵم
هـــەر گیایـــەک نـــە کیمیایـــە گوڵـــم[1]

وە مەبەســـتو غەرەزی ئەم نفرەتییانە لەم تەعبیرو لێکدانەوەدا ئەوەیە کە دەرفەتیـــان لە دەســـت نەچێو بـــەم فتوایە دەردی خۆیان کە لە سیاســـەتی پادشـــاوە دە دڵیاندا کۆبۆتەوە، ئارام بکەنەوە. وە یەکەم کەس کوڕیان دیاری کردووە کە خۆی بەشـــێکە لە زاتی پادشـــا و لە جێگەی ئەوە ـ خودا نەکا هەر بە جێنشین لێی رازی بین ـ دەیانەوێ ئەو بکوژن، ئەویش ئەو کوڕە بەو هەموو نەجابەتو عەقڵو تێگەیشـــتنەوە. پاش ئەویش بەندە دڵســـۆزەکان لەناو بەرن کە گرێژەنەی وڵاتو راوەســـتاوی دەسەڵات بەوانەوە بەســـتراوەتەوە، وە باقی

۱. هر عصایی نه اژدها باشد / هر گیاهی نه کیمیا باشد.

ئامــرازی جیهانداری، وەک فیلو چەکو چۆڵو وشــتر راماڵن. وە من، بەندەی پادشــا خۆم بوونەوەرێکی بێقابیلەتمو وەکانی من لە خزمەتدا زۆرن. وە چون پادشــا بە تەنیا مایەوەو دەســەڵاتی ئەوان بە ســەر مەملەکەتو ئەهلی وڵاتدا ســەقامگیر بوو، بە کەیفی خۆیان دەجووڵێنەوە. خۆپارێزی ئەوان تا ئێستا لە رووی ناچاریو نەتوانین بووە. وە چون، ئەسبابی گەورەییو قودرەتی پادشایان دەبینیو یەکدڵیو پشتیوانی بەندەگانی ئەویان بە ئاشکرا لە بەرچاو بوو، ورەی دەســتبەکاربوونیان نەبووە. وە ئەگەر لەودا، کەمو زۆر، کەموکورتییەکیان شک بردبایــەو لە دەروونو بیروبڕوای خزمەتــکارانو بەندەگاندا رەنجانو ئازارێکیان بەدی کردبایە، لەمێژ بوو وڵاتیان، وەک چۆن رەسم بووە، لە نێو خۆیاندا بەش دەکرد، چونکە هیــچ هۆکارێک بۆ جەریبوونو رووداماڵاوی دوژمن وەک نفرەتی دڵسۆزانو جیاوازی قسەی لەشکرو رەعیەت نییە. وە ریوایەتو نەقڵو نەزیلەی قەدیمییەکان لەســەر ئەم بابەتە زۆر ئاشکرایە. وە مێژووی پێشینیان بە وردی لەسەری رۆیشتووە.

لە سەر یەک، ئەگەر ئەوەی گوتوویانە سوودێکی هەیە، ئەڵبەتە نابێ وەدوا بکەوێو لازمە زووتر کارەکە ئەنجام بدرێ. وە ئەگەر مەجالێک بۆ دەســتڕاگرتن هەیە، قایمەکارییەک ماوە. دەکرێ فەرمانی لەســەر بدرێ. پادشا ئیزنی دا کە دەبێ بگوترێ. گوێی پێ دەدەمو قبووڵی دەکەمو شکو گومانو دڕدۆنگی دەبێ دوور بکەنەوە. گوتی: "کارایدوون"ی حەکیم ماوە. هەر چەند عەسڵو نەسەبی لە بەرەهمەنان نزیکە، بەڵام دە دینداریو راستگۆییدا لەوان سەرترە. وە رووداوەکانی جیهانــی زۆرتر لە بەرچاوە. وە لە بەرهەمو ئاکامــی کاراندا بۆچوونی کاراتری هەیە. وە زانســتو قایمەکاری تێدا کۆ بۆتــەوە. کام فەزیلەت لەم دوو هونەرو سیفەتانە لە سەرترە؟ ئەگەر رای پادشا کەرامەتی مەحرەمبوونی پێ ببەخشێو ئــەو تەعبیرەی بەرەهمەنەکان کردوویانەو خودی خەونەکان بۆ ئەو بگێڕێتەوە، راســتیو دروستییەکان عەرزی پادشــا دەکا. ئەگەر تەعبیری ئەویش وەک هی ئەوان بوو، شــکو گومان نامێنێو ئەنجام دانی ئەوەی گوتوویانە پێویستە، وە ئەگەر بە پێچەوانە شــتێک بڵێ، را و دەســتووری ئەنگێوەی پادشــا لە هەقو

باتڵدا داوەری دەکا، وە پادشا باش دەزانێ جیاوازی دڵسۆزیو خەیانەت چییە. وە بەڕێوەبردنی فەرمانی ئەو کەندوکۆسپی لە بەر نییە. وە هەر کاتێک ئەم دەستوورە بدا زەمانەو چەرخی گەردوون پێشی پێ ناگرن.

پادشا ئەم قسانەی وە دڵ کەوتو فەرمانی دا ئەسپی بۆ زین بکەنو بە نەناسراوییو دوور لە چاوان رۆیشتە لای کارایدوونی حەکیم. وە کاتێک گەیشتە لای، پادشا لە خۆبەکەمزانیدا زێدە ئیفراتی کرد. حەکیم زۆری حورمەت گرتو گوتی: هۆی خۆ تووشی زەحمەت کردنی خاوەنشکۆ چییە؟ وە ئەگەر فەرمان بەمن گەیشتبا، خۆم دەهاتمە بارەگای پادشا. وا باشترە خزمەتکاران بگەنە خزمەت خاوەنشکۆ، وە هەر وەها نیشانەی تووڕەیی لەسەر روخساری مبارەک دەبیندرێو سایەی غەمێک لە سەر نێوچاوانی خاوەنشکۆ دەتوانم ببینم.

پادشا گوتی: رۆژێک خەریکی حەسانەوە بووم، لە کاتی خەودا حەوت دەنگی ترسێنەرم گوێ لێ بوو. بە هەر دەنگێک لە خەو رادەپەڕیم، بە دوای ئەوەدا خەوتم، حەوت خەونی سامناکو زراوتۆقێنم دیت. دوای هەر خەونێکیش دیسان بەخەبەر دەهاتم، دیسان خەوم بە سەرمدا زاڵ دەبۆوەو دیسان خەونێکی دیکە. جەماعەتی بەرەهمەنانم بانگهێشت کردو بۆم گێڕانەوە. تەعبیرێکی ترسێنەرو سامناکیان لێداوە کە بووەتە هۆی نارەحەتیو سەرسامی ئێستام کە دەیبینی. حەکیم لە چلۆنایەتی خەونەکان پرسیاری کرد. کە بە وردی گوێبیستی هەمووی بوو، گوتی: پادشا تووشی هەڵە بووە. نەدەبوایە ئەم رازە لای ئەو تایفەیە بدرکێنێ کە گوتوویانە:

لە جیهاندا دیارە بۆ زانا
کاری هەر مەردو مەردی هەر کارێک[1]

وە بۆ پادشا دەبێ ئەوە ئاشکرا بێ کە ئەو مەلعوونانە بە دەردی ئەم کارە ناخۆن، کە نە عەقڵی رێنوێنیان هەیەو نە ئایینی تەواو. وە پادشا بەم خەونە دەبێ دڵخۆش بێو شادی بکا و سەدەقە بدا و دیارییو سەوقات ببەشێتەوە کە لە هەموویاندا دەلیلی بەختەوەرییو نیشانەی دەسەڵاتو دەوڵەت دەبیندرێ. وە

---

١. کە پدید است در جهان باری / کار هر مرد و مرد هر کاری.

من هەر ئێستا تەعبیری خەونەکان بە تەواوی بەیان دەکەمو لە بەرانبەر مەکرو حیلـــەی ئەو بەدبەختانە مەتاڵێکی مەحکـــەم رادەگرم. وە بێگومان هەواخوای دڵســـۆزو خزمەتکارانی یەکدڵ بۆ ئەم کارە هەن تا پێش بە قەســـتی پەلاماری دوژمن بگرنو بۆ بەرگری لە غەدرو فێڵی دوژمنان تێبکۆشن.

تەعبیری خەونەکان ئەوەیە کە، ئەو دوو ماســـییە ســـوورە کە دە خەونیدا راست لە سەر کلک راوەستابوون، قاسیدی "هومایون پادشا"ن کە دێنە خزمەت پادشا و دوو فیلانیش دێنن کە باری چوارسەد رەتڵ یاقووتیان لە سەر پشتەو لە خزمەت پادشـــا رایاندەوەســـتێنن وە ئەو دوو مراوییەی کە لە پشت سەری پادشـــاوە دەرپەڕینو هاتن لە بەر پێی نیشـــتنەوە، دوو ئەسپی رەسەنن کە لە لایەن پادشـــای "بەلەنجەر"ەوە بە دیاری دەیهێنن، وە ئەو مارەی کە لە قاچی پادشا دەهاڵا شمشێرێکە کە پادشای "هەمجین" بۆی دەنێرێ. وە ئەو خوێنەی کە پادشـــا دە خۆی هەڵسوو، دەســـتێک جلوبەرگە کە پێی دەڵێن "ئەرجوان" جەواهێرنیشان کراوەو لە وڵاتی "کاسروون" بە دیاری بۆ خزمەت بە جامەخانەی پادشـــا دەینێرن. وە ئەو وشترە سپییەی کە پادشا سواری ببوو، فیلێکی سپی رەنگە کە قاســـیدی شـــای "کەندیوون" دەینێرێو ئەو شتەی وەک ئاگر لە سەر سەری پادشـــا هەڵایسابوو، تاجێکە کە پادشای "جاد" بە پێشکەش دەینێرێتە خزمـــەت ئێوە. وە ئەو باڵندەی دندووکی دە ســـەری پادشـــا دەکوتا، غایلەو فکرێکـــی ناحەزە، بەڵام زەرەرو زیانێکی لێ ناکەوێتەوە، ئیللا ئەوەندە نەبێ کە پادشا لە ئازیزێکی خۆی رووگەردانو دڵگیر دەبێ.

ئەوەیە تەعبیری خەونەکانی پادشـــا و ئەوەی کە حەوت جار ئەو خەونانەی دیتووە ئەوەیە، کە قاســـیدەکان لە حەوت کەڕەتدا بە دیارىو پێشکەشـــانەوە، دەگەنە خزمەت پادشا، وە پادشا بە وەرگرتنی ئەم نیعمەتانەو بەردەوامی وڵاتو دەسەڵات رۆژگارێکی پڕ لە بەختەوەرىو شادی دەباتە سەر. مەبادا کە زینەتی عەدڵو دڵســـۆزی ئەو لەم رۆژگارە بڕفێننو شیرینىو جوانی دەسەڵاتی ئەو لەم عەسرو زەمانە بسڕنەوە.

وە لە داهاتوودا، دەبێ پادشـــا، نائەهلان نەکاتە مەحرەمو تا نەزانن یەکێک

عاقــڵو زانایە لــە کاروباراندا راوێژکاری دەگەڵ نەکەنو لە هاونشــینی دەگەڵ پیاوی بێباکو چەنەوەری بەدگەوهەری زۆروەڕ، بە گشتی خۆی بپارێزێ.

گوێ لە ئاو بگــرە چۆن دەناڵێنێ
کــە دەگاتــە خورپێنــی ناهەموار[1]

پادشــا کە ئەم تەعبیرەی گوێ لێ بوو، کەیفی ســاز بوو، شوکری خودای بەجێ هێنا و زۆری سپاسی حەکیم کردو زۆری قەدر گرتو چاکەی زۆری دەگەڵ کردو بە شادی گەڕاوەو حەوت رۆژان چاوەڕوانی هاتنی پەیامهێنەران بوو، رۆژی حەوتەم هەر وەک حەکیم گوتبووی دیارییەکان گەیشتن. پادشا خۆشحاڵ بوو، گوتی: لەوەدا خەتابارم کە خەونی خۆم بۆ ئەوان [بەرەهمەنان] گێڕاوە؛ ئەگەر رەحمەتی ئاسمانیو میهرەبانی ئێراندوخت نەبووایە، سەرەنجامی لێکدانەوەکانی ئەوان مەلعوونان بە هیلاکی منو ئازیزانو دەستو پێوەندان کۆتایی پێ دەهات. وە هــەر کەس بەختی ئەبەدی یاری بێ، نەســیحەتی دڵســۆزانو مەوعیزەی دۆســتان، بە گرینگ دەزانێو لە کاراندا پێش تەدبیرو لێکدانەوە دەســت بەکار نابێو پێگەی وریاییو قایمەکاری بە کەم نازانێ.

پاش ئەوە، رووی دە وەزیرو کوڕو دەبیرو ئێراندوخت کردو گوتی: پێم باش نییە ئەم دیارییو سەوقاتانە بنێرمە نێو خەزێنەکەنمو باشترە لە ئێوەی دابەش بکەم، کە هەمووتان کەوتبوونە بەر مەترســی گــەورە. بە تایبەتی ئێراندوخت کــە دە رزگاربوونماندا لەم کارەســاتە، دەوری بەرچاوی گێــڕا. بەلار گوتی: بەندەگان بۆ ئەوەن کە لە کارەســاتاندا ببن بە مەتاڵو بەڵاگەردانو ئەم ئەرکە بە میوەو بەرهەمی عومرو دەوڵەت بزانن. هەر چەند راپەڕاندنی هەموو ئەرکێک بە ئیقباڵو بەختی پادشایانەوە بەستراوەتەوەو بەندەگان ئەو پلەوپایەیان نییە کە بێ ئامرازی ورەو هیممەتی گەورەی خۆیان کارێک راپەڕێننو شەرت ئەوەیە، ئەگەر لە کاتی پاراســتندا خۆ فیداکردن پێویست بێ، خۆی بکاتە قوربانی، وە ئەگەر کەســێک بەختی یار بێو بەختیار بێو ئەم رەوشــتەی دەگەڵ بێ، نابێ چاوەڕوانــی خــەڵاتو پێهەڵاگوتنو چاکە بێ، بەڵام شــازنی زەمانە لەم کارەدا

[1] ١. آب را بین کە چون همی‌نالد / یکدم از هم‌نشین ناهموار.

دەوری ســـەرەکی گێڕا، تاجو جلوبەرگ بابەتی ئەوەو ئەڵبەتە بۆ کەسی دیکە نابێ. پادشـــا فەرمووی هەر دووکیان [تاجو جلوبەرگ] بێننو خۆی هەڵســـتا. بێوەســـتان ئێراندوختو چەند کەســـی دیکە لە خزمەتیدا کە هاوشـــانی خۆی بوون، ئامادە بوون. پادشا فەرمووی تا هەر دووکیان لەبەر دەستی ئێراندوخت دابنێن تا یەکیان هەڵبژێرێ. تاجەکەی پێ باشـــتر بوو. چاوی لە بەلار کرد تا بە مەســـڵەتخوازی ئەو، یەکیان هەڵبگرێ، ئەو ئیشارەی بە جلوبەرگەکە کرد. لەم حاڵەتەدا پادشا رووی تێکردن. خاتوون کە زانی پادشا ئاگای لە راوێژکاری ئەمو بەلار بووە، تاجەکەی هەڵگرت تا پادشـــا نەزانـــێ راوێژکارییان کردووە. بەلاریـــش چاوی خۆی هەر لەو حاڵەتەدا کە بوو راگرت تا شـــا نەزانێ بە چاو ئیشـــارەی کردووە. وە لە پاش ئەو رۆژە چل ساڵی دیکەش ژیا و هەر کات بە خزمەت پادشـــا گەیشـــتبا، هەر ئەو حاڵەتەی دەدا بە چاوی تا ئەو گومانە وە راســـت نەگەڕێ، وە ئەگەر عەقڵیەتی وەزیـــرو زیرەکی ژن نەبایە هەر دووکیان گیانیان لە دەست دەدا.

وە پادشـــا شەوێک دەرۆیشتە لای ئێراندوختو شەوێک لای خێزانێکی دیکە. شـــەوێک کە نۆرەی ژووری ئێراندوخت بوو، بە حوکمی قەرار رۆیشـــتە ئەوێ، خاتوون تاجی لەسەر نا و هاتە پێشوازیو تەبەقی زێڕینی پڕ لە پڵاوی لە سەر دەست، لە خزمەت پادشا راوەستا. پادشا لەو برینجەی دەخواردو بە قسەکانی خاتوون ســـەرگەرمو سەرمەستو بە جوانیو جەماڵی ئەو چاوی روون دەبۆوە. لـــەو حاڵەتەدا هەوێیەکی ئێراندوخت کـــە ئەو جلوبەرگەی دەبەردا بوو، بەوێدا تێپەڕی. پادشا ئەوی دیت، سەری سووڕما و دەستی لە خواردن کێشاوە، قووەتی شەهوەتو هەستانی ئێشتیا، هەوساری خۆڕاگری لە دەست راپسکاندو دەستی کرد بە پێهەڵاگوتنی. ئەو جـــار بە ئێراندوختی گوت: تۆ دە هەڵبژاردنی تاجدا نەتزانی، زەرەرت کرد. خاتوون کە سەرســـامی پادشـــای بەرانبەر بە هەوێکەی دیت، حەسوودیو تووڕەیی هەڵیانتەزاندو وای لێ کرد، تەبەقی برینجی بە سەر شـــادا کردو دەنکە برنج چوون دە نێو ریشو سەرو کاکۆڵیو پێیدا هاتە خوارو ئەو تەعبیرەی کە حەکیم باسی کردبوو لێرە وەدیهات.

پادشا فەرمووی، بەلاری بۆ بانگ بکەن‌و پێی گوت: چاوت لەو ئەتکە بێ ئەم نەفامە بە پادشای سەردەم‌و شوانی رۆژگاری کرد. لە بەر چاومی لابەرەو بیبەن لە سووچێک ســـەری بپەڕێنن، با بزانێ کە ئەو یا، وەکانی ئەو ئەم قیمەتەیان نییە کە ئەوتۆ هەڵشـــاخێن‌و جەسارەتی ئاوا بکەن‌و ئێمەش چاوپۆشی بکەین‌و لە گوناهیان خۆش بین.

بـــەلار خاتوونی هێنا دەرو لای خۆی فکری کـــردەوە، لەم کارەدا پەلەکردن شەرت نییە. چون ئەو ژنێکی بێوێنەیەو پادشا بێ ئەوە هەڵناکا، وە بەرەکەتی زیرەکی‌و تەدبیری ئەو، چەندین کەســـی لە گێژاوی مردن رزگار کرد. وە ئەمین نیم لەوەی کە پادشا بەو پەلەیە لە فەرمانی خۆی پاشگەز بێتەوە، دەبێ سەبر بکەم‌و دەست راگرم تا بارودۆخەکە ئارام بێتەوە. ئەگەر پەشیمان بۆوە، ئەوەتا ژن هەر ماوەو من سەربەرز دەبم‌و دەکەومە بەر پەسندی پادشا. وە ئەگەر پێی چەقاندو ویســـتی ئەم ستەمە بکا، چار نییەو پێش بە کوشتن ناگیرێ. وە لەو دوواخستنەدا سێ قازانجم دەست دەکەوێ: **یەکەم**: خێرو حەسەناتی نەکوشتنی روح‌دەبەرێک، **دووهەم**: وەدەســـت هێنانی خۆشحاڵی پادشا لەوەی کە خاتوون زیندووە. **ســـێهەم**: منەتبارکردنی جەماوەری وڵات کە شاژنێکی بەو گەورەییەم بۆ راگرتوون کە خێراتی باڵی بە سەر هەمواندا کێشاوە.

پاش ئەوە خاتوونی دەگەڵ چەند کەســـێک لە مەحرەمان کە خزمەتی ماڵی پادشـــایان دەکرد، بردە ماڵی خـــۆی‌و فەرمووی وریابن‌و بـــە نهێنی راییگرن‌و ئەوەندی لە توانادایە رێزو حورمەتی لێ بنێن. وە شمشـــیرێکی خوێناوی کردو بـــە حاڵەتێکی غەمگین هاتەوە لای پادشـــا و گوتی: فەرمانی پادشـــام بەجێ هێنا. هەر کە ئەو قسە بە گوێی ئەو گەیشت ـ تووڕەییەکەی دامرکابوو ـ وەبیر عەقڵ‌و دڵســـۆزی‌و جوانی‌و جەماڵی ئەو کەوتەوە، نارەحەت بوو. پێی شـــەرم بوو کە شـــوێنەواری دڕدۆنگییەک لە خۆی نیشان بدا و حوکم بدا و بیشکێنێ‌و دژوازییەک لە خۆی بنوێنێ. وە بە لەســـەرەخۆیی وەزیریشی دەزانی. متمانەی هەبوو کە رەنگە دەستی راگرتبێ‌و بێ گەڕانەوەو لێکۆڵینەوە کارێکی نەکردبێ، چونکە هەستیاری ئەم رووداوە لە هیچ زانا و نەزانێک شاراوە نییە. کاتێک وەزیر

عەلامەتی نەدامەتی بە نێوچاوانی پادشـــاوە دیت، گوتی: پادشا نابێ غەمناک بێ کە رابردوو بۆ کەس ناگەڕێتەوەو ئەوەی لە دەست چوو، دەست ناکەوێتەوە. غەمو ئەندێش جەستە کزو لاواز دەکا و کەموکووڕی دەخاتە سەر رای دروست. وە بەرهەمی غەم وەرهەمەو دۆســـتان تووشی پەژارەو دوشمنان شاد دەکا. وە هەر کەس ئەم بابەتە ببیسێ لە هەمبەر خۆڕاگریو هەیبەتی پادشادا بەدگومان دەبێ، کە ئاوا بە پەلە فەرمانێک دەر بکا و هەر کە جێبەجێ کرا پەشـــیمانی خۆی نیشـــان بدا، بەتایبەت کارێک کە دەســـتی تەدارەکو ئەنجامدانی کورت بێ. وە ئەگەر ئیزنم بدەیەی ئەفســـانەیەک دەگێرمەوە کە شایانو زبانحاڵی ئەم بارودۆخەیە. فەرمووی: بڵێ.

وەزیر گوتی: دەگێڕنەوە جووتێک کۆتر دەستیان کرد بە دانە کۆکردنەوە تا هێلانەکەیان پڕ بکەن. نێرە گوتی: هاوینەو دەشتو سەحرا پڕە لە گیا و گوڵ، ئەم دانەیە رادەگرین تا لە زستاندا کە لە سەحرا هیچ دەست ناکەوێ، رۆژگاری پێ بەرینە سەر. مێیەکەش بەو کارە رازی بوو، هەر کامە بۆ لایەک دەرپەڕین. ئـــەو دانەیە، ئـــەودەم کە کۆیان کردبۆوە نمی هەبوو. هێلانە پڕ بوو، کە هاوین داهاتو گەرما کاری تێکرد، دانەکان وشـــک بوونەوەو هێلانە وەک بەتاڵ دەهاتە بەرچـــاو. نێرە دیار نەبوو، کە هاتەوە، دانەکەی بە کەمتر هاتە بەرچاو، گوتی: ئەوەمان بۆ بەرێچوونی زستان دانابوو، بۆ خواردت؟

مێیە هەر چەندی گوتـــی: "نەمخواردووە" فایدەی نەبوو. ئەوەندەی لێدا کە گیانی دەرچوو. لە وەرزی زســـتاندا کە باران زۆر باری، دەنکەکان نمیان کێشا و هێلانە هاتەوە ســـەر دۆخی جاران، نێرە تێگەیشـــت کە هۆی کەمبوونەوەی دانەکان چ بووە. دەستی کرد بە گریانو شیوەن. بەخۆیدا دەدا و دەیگوت: بەوە زۆرتر نارەحەتم کە پەشیمانی هیچ سوودی نییە.

وە پیاوی عاقڵ دەبێ دە کوشـــتنو لەناوبردندا پەلە نەکا، تا وەک کۆترەکە تووشـــی ســـۆزو غەمی دووری لە یار نەبێ. وە فایدەی وریاییو زانایی ئەوەیە، کە عاقیبەتی کار دە بەرچاو بگیرێو مەسڵەحەتی حاڵو دواڕۆژ نەکەوێتە پشت گوێ. چون ئەگەر کەسێک هەموو ئامرازو ئەسبابی گەورەیی کۆ بکاتەوە، ئەگەر

بە وەخت دە کاریان نەهێنێ لە قازانجەکانی بێبەش دەبێو پادشای سەرکەوتوو ئەو کەسەیە، کە فکرو لێکدانەوەی ئەو لە ئاست کۆتایی کاران کورتی نەهێنێو تێڕوانینی بینیشی ئەو بە سەر کۆتایی کاراندا بکشێ. تەلاش بکا کەمئازار بێو قسەی بەندەگانی دڵسۆز گوێ بداتێ.

کاری چـاک زۆر بکـەو خراپـەش کەم
ئـەوی دەیچێنـی دێتـەوە بەرهـەم[1]

وە ئاشـکرایە کە پادشـا بە را و تەدبیری دروستو فکری ئەنگێوەی خۆی سـەربەخۆیەو لـەو تڕەهاتەی من بێنیازە. وە هـەر فەرمانێکی بیدا بێگومان سـەعادەتو دەوڵەت تەڵقینو ئیلهامی دەکەنو ئەوەی بە دەسـت بەندەکانە، هـەر ئەوەیە کە لە بەیانی ڕێنوێنیو نەسـیحەت ڕانەوەسـتن، بەڵکە هێندێک لە مافی خاوەننیعمەتان ئەدا بکرێ. وە بەندە هەر ئەوەندە دەڵێم کە پادشـا ئەگەر ڕای لەسەر ئەوەیە کە خاسو عام تەعریفو مەدحو سەنای بکەنو دڵیان خۆشەویستی ئەویان بوێ.

هـەر کـوێ هـاوارە، بـە فریـاد بگە
سـایەت بـۆ مەزلـووم بکـە پەناگە[2]

وە پادشـا پێویستی بە مەوعیزەی من نییە، وە ئەو لە سەر ڕۆیشتنەی من، بۆ ئەوە بوو تا بەخاتری ژنێک ئەو هەموو فکرو خەیاڵە ڕێ نەدەنە دڵو دەروونی خۆتان. کە لە کەیفکردنو حەزبردن لە دوازدە هەزار ژن کە لە خزمەت سەرا و کۆشکی تۆدان، بێبەهرە دەبیو بەوەش هیچ کارێک جێبەجێ نابێ.

کاتێک پادشا ئەو قسانەی بیست، لە کوژرانی ژن ترسا، گوتی: بە یەک وشە کە بەسـەر زارمدا تێپەڕی دەست بەکاربوویو زاتێکی بێوێنەت لەناو بردو لەم کارەدا ئەو جۆرەی شایانی حاڵی دڵسۆزانە، عاقڵانەو خۆڕاگرانە نەجووڵایتەوە؟ وە ئەو ساتە وەختە کە ئەم قسەم بە سەر زاردا هات، زۆر سەخت لە کوژرانی ئێراندوخـت نارەحەت بـووم. وەزیر گوتی: دوو کەس هەمیشـە دە ژێر باری

---

١. بـە کاستـن و نیک فزودن باید / زیرا کە همی کشت درودن باید.
٢. هر کجا فریاد خیزد مقصد فریاد باش / سایە بر مظلوم گستر آفتاب داد باش.

غەمــدان: یەکیان ئەوەیە کە تێدەکۆشــی کاری خراپ بــکا، وە یەکی دیکەش ئەوەیە لە حاڵی دەست ڕۆیشتوییدا چاکەکردن بە فەرز نەزانێ. ماوەی خۆشیو دە نازو نیعمەتدا ژیان لە دنیادا بۆ ئەوان کورتەو غەمو حەســرەتی دواڕۆژیش زۆرە.

پادشــا گوتی: لە تۆ دووری دروســتە. گوتی: لە دوو کەسان دەبێ دووری بکــەی. یەکیان ئەوەیە کە چاکو خراپ یەکســان دەبینــێو بڕوای بە جەزای قیامەت نەبێ، ئەوی دیکەش کەســێکە کــە چاوی لە نەزەری حەرامو گوێی لە بیســتنی جنێــو و غەیبەتو داوێنی لە ئالوودەبوونو دڵی لە فکری حەســەدو تەماعو ئازار، نەگێڕێتەوە.

پادشا گوتی: پیاوێکی حازرجوابی، ئەی بەلار!

گوتی: سێ کەس ئەم خەسڵەتەیان هەیە: پادشایەک کە لەشکرو ڕەعیەت لە خەزێنەو زەخیرەدا بەشــدار بکا. وە ژن کە بۆ هاوسەری خۆی سازو ئامادەیە، وە زانایەک کە کاروباری بە سەرکەوتن ڕازابێتەوە.

پادشا گوتی: نزیکی لە تۆ نارەختی کردم ئەی بەلار.

گوتی: ســیفەتی نارەحەتی بۆ دوو کەسان دروستە: سواری ئەسپی جوانو بۆشــناخ کە خراپ دەڕوا. وە مێــردی ژنی جوانو لەبار کە دەســتی کەڕەمو سەخاوەتی بەستراوەو باش بەخێوی ناکا و هەمیشە جنێو و قسەی سووکی لێ گوێ دەبێ.

پادشــا گوتی: شاژنت کوشــت، بە تەلاشی بێهوودە، بێ مافی ڕەوا. گوتی: تەلاشی سێ کەسان بێهوودەیە: ئەوەی جلوبەرگی سپی دەپۆشێو شیشەگەری دەکا، جل شۆرێک کە خۆی هەڵدەماڵێو سەرانسەری ڕۆژ دە ئاودا ڕادەوەستێ. وە بازرگانێک کە ژنی منداڵکار دێنێو عومری لە سەفەردا تێپەڕ دەبێ.

پادشا گوتی: شایانی ئەوەی سزایەکی توند بدرێی: گوتی: دوو کەس دەتوانن شایانی ئەم سزادانە بن. یەک ئەوەی بێگوناهێک سزا بدا، ئەوی تر ئەوەی کە دە سواڵکردندا زۆر چەقەسرۆ بێو ئەگەر عوزرێکیش بێننەوە گوێی پێنەدا.

پادشا گوتی: ســیفەتی "نەممامی" بۆ تۆ دروستەو لیباسی "بێشەرمی" پڕ

بە بەرتە. گوتی سێ کەس ئەم بابەتە دەگرنەوە: دارتاشێک کە دارتاشی دەکا و تۆڵاشو بڕادەکەی لە ماڵدا کۆ دەکاتەوەو جێ لە خۆی تەنگەبەر دەکا. وە سەرتاشێک کە لە کاری خۆیدا شارەزا نییەو سەری خەڵکی بریندار دەکا و هەقی کارەکەی نادەنێ. وە دەوڵەمەندێک کە ماڵی لە غوربەتەو سەروەتو سامانی دەکەوێتە دەست دوژمنانو هیچی بە منداڵو ئەهلو عەیالی خۆی ناگا.

پادشا گوتی: ئارەزووی دیداری ئێراندوختم هەیە. گوتی: سێ کەس ئارەزووی شتێک دەکەنو پێی ناگەن. فەسادکارێک کە خێرو سەوابی چاکەکارێک چاوەڕوانی دەکا و بەخیلێک کە چاوەڕوانە وەک ئەهلی چاکەو پیاوەتی مەتحو سەنای بکەن. وە نەزانێک کە لە حەسەدو تەماعو شەهوەت چاوپۆشی نەکا و ئارەزووی ئەوە بێ کە جێگەو پێگەی وەک هی پیاوچاکان بێ.

پادشا گوتی: من خۆم دەو عەزابە هاویشتووە. گوتی: سێ کەس خۆیان تووشی زەحمەتو عەزاب دەکەن. ئەوەی لە شەڕکردندا دەست ناکاتەوە تا بە قورسی بریندار بێ، وە بازرگانێکی بەتەماعی وەجاغکوێر کە ماڵی دنیا لە رێگەی حەرام کۆدەکاتەوە، لە نەکاو بە پەلاماری حەسوودێک تێدادەچێو وەباڵی وەئەستۆدا دەمێنێتەوە. وە پیرێک کە ژنی بێشەرم بێنێ، هەموو رۆژێ قسەی ساردو تاڵی پێ دەڵێو لە حەیفان ئاواتی مەرگ دەخوازێو ئاخریش هەر بەو دەردەوە دەمرێ.

پادشا گوتی: تۆ بە سووکایەتییەوە چاومان لێ دەکەی، کە ئەو قسەمان بەلاوە دەکەی. گوتی: خزمەتپێکراو (پادشا) لە بەر چاوی سێ تایفە سووکە. بەندەیەکی چەنەوەرو زۆروەڕ کە ئەدەبی قسەکردن دەگەڵ باڵادەستان نەزانێو جاروبار لە مەجلیسو کۆڕو کۆبوونەواندا، یا لە شامو نەهارخواردندا بەرانبەر گەورەکان بێو گەورەکانیش، ئەهلی جەفەنگو جنێوفرۆش بێو لە هەیبەتی پلەوپایەو غروری سیاسەت بێخەبەربێ، وە بەندەی غەیانی بەرپرس کە. ماڵی پادشای لە ژێر دەستیدایە، بە شێوەیەک کە پاش چەند سالێک سەروەتو سامانی لە پادشا وەسەر کەوێو خۆی بە گەورەتر بزانێ. وە بەندەیەک کە دە حەرەمی پادشادا بێ ئەوەی لێی بوەشێتەوە، متمانەی پێ بکرێو بە تێکەڵاوی

دەگەڵیان پەی بە ڕازو نهێنییەکان بباتو لەخۆبایی بێ.

پادشا گوتی: تۆم وەک دەست بڵاوێکی سەرسەرییو عەقڵسووک هاتە بەرچاو ئەی بەلارا گوتی: ئەو لاتاوانە بۆ ســێ کەسان دەبن، یەک ئەوەی کە جاهیلی نەفامو سەفی، بۆ ڕێی ڕاست بانگهێشت بکا و هانی بدا بڕوا و کەسبی عیلم بکا، کاتێک جاهیل پشتی قایم بوو قسەی سووکو چرووک بە کابرا دەڵێو پەشیمانی فایدەی نییە. وە ئەوەی کە مرۆڤی ئەحمەقو نەفام، بە دۆستایەتی بێجێ، بە ســەر خۆیدا زاڵ بکا و بیکاتە مەحرەمی ڕازو ئەســراری خۆی، هەر سەعاتەی، بە زبان ئەوەوە درۆیەک دەگێڕێتەوەو کارێکی ناڕەوا دەخاتە سەر ئەستۆی. وە قامکگەســتنو لێوکرۆژتن ســوودی نابێ، وە ئەوەی کە ڕازو نهێنی بە کەسێک بڵێ کە دە ڕاگرتنو شاردنەوەی ڕازەکانی خۆیدا وریا و ئاگادار نەبێ.

پادشــا گوتی: ئەو کارەی تۆ، بە دەلیلــی بێباکیو ڕووداماڵاوی تۆ دەزانم. گوتی: کەریەتیو نزمی لە ســێ کەسدا بە دانیشتنو هەستانیاندا دەردەکەوێ. ئەوەی ماڵو سامانی خۆی بە ئەمانەت لای بێگانە دابنێو نەناسێک بکاتە داوەر لە نێوان خۆیو دوژمندا. وە ئەو کەسەی ئیدیعای ئازایەتیو سەبرو کەسبی ماڵو دڵۆڤانی دەگەڵ دۆســتانو ئەنجامی کاران بکا، نەتوانێ لە ڕۆژی شەڕدا و کاتی ڕۆژەڕەشــیو لە نێو دەوڵەمەندانو کاتی هێرشو قەهری دوژمنان، بۆ دەسەڵات پەیداکردن بە سەر پادشــایاندا، ئازایەتی بنوێنێ. وە ئەو کەسەی دەڵێ: "من ئارەزووە جەســتەییەکانم وەلا ناوەو ڕووم کردۆتە حەزو خۆشــی ڕۆحانی"و لە هەموو حاڵێکیشــدا ئەســیری هەوا و هەوەس بێو ڕووگەی دەستووراتی، ڕقو قینو شەهوەت بێ.

پادشــا گوتی: دەتــەوێ ئێمە بکەیە زەوی تەڵقینەکانــی خۆتو لێهاتوویی زێرکفتو درۆزنانەی خۆت بخەیە بەرچاوی خەڵک؟ گوتی: سێ کەس، بەخۆیان دەنازنو لایان وایە ماهیرو شارەزان، بەڵام هەر لە دنیای جەهلدا دەژین؛ موتریبی تــازەکار کە هەر چەند خۆی زەحمەت دەدا، لێدانی خۆی دەگەڵ هاواڵەکانی بۆ کۆک ناکرێو نازانی زێروبەمی دەنگ لە بلندو نەویدا تێکەڵاو بکا. وە وێنەگەری بــێ ئەزموون کە لافی وێنەگەری لێدەدا بــەڵام ڕەنگامێزی نازانێ. وە پیاوێکی

رووداروو بێمایە کە لە مەجلیساندا لافی کارزانی لێدەدا و کاتێک ویستی کارێک ئەنجام بدا لە ژێردەستانی خۆی دەپرسی چ بکا و چۆن بکا.

پادشا گوتی: ئێراندوختت بە ناهەق کوشت، ئەی بەلار. گوتی: سێ کەس بە ناحەق دەست بۆ کار دەبەن: ئەوەی زۆر درۆ دەکا و گوتەوکردەی تا سەر جێبەجێ ناکا. وە تەمبەڵێکی بێکارە کە بەسەر توورەییدا زاڵ نییەو پادشایەک کە هەموو کەس لە کارو بڕیاری گەورە ئاگادار دەکاتەوە.

پادشا گوتی: ئێمە لە تۆ دەترسین، ئەی بەلار! گوتی: چوار کەس لە خۆڕا دەترسێنو نیگەرانن. ئەو مەلە گچکەیەی لە سەر لقێکی باریک دەنیشێو دەترسێ ئاسمانی بە سەردا بکەوێو بۆ بەرگری لەو کەوتنە لاقی دە حەوا دەکا، وە قورینگ کە هەر دوو قاچی لەبەر قورسایی جەستەی خۆی لە عەرز دانانێو کرمێک کە خۆراکی خاکەو دەترسی خاک تەواوبێ. وە چەکچەکی کە بە رۆژ نایەتە دەر تا خەڵک شەیدای جەماڵی نەبنو وەک باقی باڵندان ئەسیری داو و زیندانی قەفەس نەبێ.

پادشا گوتی: ئاسوودەیی دڵو خۆشیو عەیشو نۆش، دەبێ لە نەبوونی ئێراندوختدا، ماڵاواییان لێ بکەین، گوتی: دوو کەس هەمیشە لە شادی بێبەشن. عاقڵێک کە دەبێتە هاونشینی جاهیلان وە بەدخوویەک کە بە هیچ شێوە لە رەوشتی خراپی رزگاری نایە.

پادشا گوتی: ئەجرو پاداش لە گوناەو چاک لە خراپ جودا ناکەیتەوە، ئەی بەلار! گوتی: چوار کەس ئەو سیفەتانەیان تێدا بەدی ناکرێ: ئەوەی تووشی دەردێکی کوشندە بووەو فکر لە شتێکی دیکە ناکاتەوە. وە بەندەی غەیانی خەتابار کە رووبەڕووی پادشای بە دەسەڵات بووبێتەوە، وە ئەو کەسەی کە دەگەڵ دوژمنی ئازا تێکەوتووەو زەینی ئەو لە هەموو کارێک دابڕاوە. وە ستەمکارێکی بێباک کە کەوتۆتە ژێر دەستی زاڵمێکی لە خۆی ملهوڕترو چاوەڕوانی بەڵای گەورەتر بێ.

پادشا گوتی: هەموو چاکەیەکت ون کردووە! گوتی: ئەم خەسڵەتە لە چوار کەسان جوانە. ئەوەی زوڵمو ستەم بە فەزیلەت دەزانێ. وە ئەوەی زۆر

سەرسامە بە بڕیارو رای خۆی. وە ئەوەی کە دەبێتە هەواڵی دزانو ئەو کەسەی کە زوو تووڕە دەبیو درەنگ دێتەوە سەرخۆ.

پادشـــا گوتی: متمانەم بە تـــۆ نەماوە، ئەی بەلارا گوتـــی: زانایان متمانە بە چوارکەس ناکەن. ماری قەڵسو ســـەر لێشـــێواو، دڕندەی برسی، پادشای بێڕەحمو بەزەییو حاکمی بێدین.

پادشـــا گوتی: دڵســـۆزیو یەکبوونی تۆ بۆ ئێمە حەرامە. گوتی: یەکبوونو دەمســـازی چوار شتان پێکەوە دەست نادا. پیاوچاکو پیاوخراپ، خێرو شەڕ، رووناکیو تاریکیو رۆژو شەو.

پادشا گوتی: بڕوامان پێت نەما. گوتی: چوارکەس بۆ ئەوە نابن بڕوایان پێ بکەی. دزی زەبەردەســـتو لێهاتوو، ماڵاتی جەستەگەورەو بەکەیف، بێحەیای رەنجاو، کەم عەقڵی نەفام.

پادشـــا گوتـــی: [مەینەتی من بـــەو دەلیلە بێپایانە، کـــە دەرمانی هەموو دەردێکم ئێراندوخت بوو] وە دەردی بێ دەرمانی لە دەســـتچوونی ئێراندوخت هیچ چارەیەکی نییە. گوتی: غەمخواردن بۆ پێنج تایفە لە ژنان رەوایە: ئەوەی عەسلو نەســـەبی گەورەیەو زاتی خۆی شـــەریفە، جوانی کەموێنەو پاکداوێنی هەمە لایەنەی هەیە، وە ئەوەی زانا و بە سەبرو یەکدڵ بێ. وە ئەوەی لە هەموو رەهەندێکدا نسحەتو رێنوێنی بکا و حزوورو غایببوونی مێرد دە بەرچاو بگرێو ئـــەوەی دە چاکو خراپو خێرو شـــەڕدا، هاودەنگو هاورێ بێ. وە ئەوەی دە هاودەنگی ئەودا قازانجی زۆر هەبێ.

پادشـــا گوتی: ئەگەر [کەســـێک] ئێراندوخت بداتەوە دەســـت ئێمە، زۆرتر لەوەی ئارەزووی بێ، ماڵی دنیای دەدەمێ. گوتی: ماڵ لە لای چوارکەســـان لە گیان خۆشەویســـتترە. ئەوەی بۆ پووڵ شەڕ دەکا، وە ئەوەی بۆ بڕووکەماڵێک دیواری مەحکەمو ئەســـتوور کون بکا، وە ئەوەی بازرگانی دەریا دەکا، وە ئەو کەسەی لە مەعدەندا وەک بەکرێگیراو رادەوەستێ.

پادشـــا گوتی: تۆ برینێکی وەها گەورەت خســـتە دڵی ئێمـــە کە بە هاوکاری چەرخی گەردوونو لوتفی زەمانەش چارە ناکرێ. گوتی: دوژمنایەتی لە نێوان چوار

کەساندا بەم شێوەیە هەیە: گورگو مەڕ، کتکو مشک، بازو دوراج، کوندو قاڵاو.

پادشا گوتی: بەو کارەی کردت، خزمەتەکانی هەموو عومری خۆت زایە کرد. گوتـــی: حەوت کەس ئەم عەیبەیان هەیە: ئەوەی ئیحســـانو پیاوەتی خۆی بە منەتو ئازاردان لەناو دەبا، وە پادشایەک کە بەندەی بێکارەو درۆزن پەروەردە دەکا و گەورەیەکی تووڕەو تۆســـن کە ســـزا و جەفای لە چاکەو پیاوەتی زۆرتر بـــێ. وە دایکی میهرەبان کە زۆر ئاگاداری لــە ئەولادی خراپ دەکا. وە پیاوی ئازادەو سەخی کە مەکربازێکی بەدعەهد دەکاتە باوەڕپێکراوی خۆی، وە ئەوەی کە بە غەیبەتکردنی دۆستان شانازی دەکا، وە ئەو کەسەی کە لەرووی عەقیدەو ئیمانەوە رێز لە خواترسو خواناسان نەگرێو زاهیرو باتینی دەگەڵ ئەوان یەک نەبێ.

پادشـــا گوتی: ئێراندوختو ئەو هەموو جەماڵو جوانییەت کوشـــت، گوتی: پێنج شـــت هەموو خەسڵەتە باشەکان لە ناو دەبەن. تووڕەیی، سەبووری پیاو وەک جنێوفرۆشی دەنوێنێو زانستیشی بە شکڵی نەزانی دەخاتە بەرچاو. غەم، عەقڵ دەشـــارێتەوەو جەستەش کز دەکا. شـــەڕو پێکدادانی بێبڕانەوە، دەبێتە هۆی نەمانی نەفس، وە برسییەتیو تووننیەتی گیانداران کەنەفت دەکا.

پادشـــا گوتی: ئێمە لەمـــەودوا کارێکمان بە تۆ نەمـــاوە، ئەی بەلار! گوتی زانایان دەگەڵ شـــەش کەس ناتوانن ببنە ئاشنا: یەکێک ئەوەی مەشوەرەت بە کەسێک بکا کە لە زانست بێبەهرەیە. وە کەمچیکڵدانێک کە حەوسەلەی کاری گەورەی نییە، وە درۆزنێک کە زۆری شـــایی بـــە خۆیەتی، وە تەماعکارێک کە ماڵی دنیای لە نەفسی خۆی خۆشتر دەوێ، وە کزو لاوازێک کە سەفەری دوورە دەســـت دەکا. وە خۆبەزلزانێک کە مامۆستا و گەورەپیاو رەوشتی ئەو پەسند ناکەن.

پادشا گوتی: تۆ کە تاقی نەکرابوویەوە، باشتر بووی، ئەی بەلار. گوتی: دە کەسان دەکرێ تاقی بکەینەوە. یەکیان پیاوی ئازا لە شەڕدا، یەکێک وەرزێر لە کشتو کاڵدا، پادشا لە کاتی دڵتەنگیدا، بازرگان دە حیسابدا، دۆست لە کاتی نیازو حاجەتدا، خاوخێزان لە نەگبەتیدا، پیاوی زاهید لە دەستخســـتنی ئەجرو

پاداشدا، ئەوەی تووشی دەســـتەنگی هاتووە لە دەروێشیدا کە بە مەسڵەحەت بێ. وە کەسێک کە ژنو ماڵی تەرک کرد، لە خۆڕاگریدا لە روانگەی قودرەتەوە، چون قســـە گەیشتە ئێرەو نیشـــانەی توورەیی دە نێو چاوانی پادشادا سەری هەڵدا، بەلار بێدەنگ بوو، دە باڵ خۆیدا فکری کردەوە: کاتی وەی هاتووە غەم بەربا دەین.[1]

کاتی ئەوەیە پادشـــا بە دیداری ئێراندوخت شادو شوکر بکەمەوە، کە مەیلی دیدار گەیوەتە ئەوپەڕی خۆی. وە هەر وەها بە نیسبەت ئەو هاتەران پاتەرانەی گوتم عەجایب چاوپۆشـــییەکی فەرموو! ئینجا گوتی: تەمەنی پادشام درێژ بێ! لەسەر رووی زەوی وێنەی ئەومان نییە، وە ئەوەی بە ئێمە گەیشتووە دە مێژوودا نەبیندراوەو تا کۆتایی عومری عالەمیش نابیندرێ. من بە پلەوپایەو قەدەرکەمەوە، بەو دەرەجە نزمەوە کە هەمە، بەو جۆرە بە کەیفی خۆم قسەم دەکردو قاچم لە بەرەی خۆم پتر رادەکێشا، هیچ کات توورەییم بە پادشاوە نەدیت. زاتی مبارەک وەها بە جەماڵی ســـەبرو ئارامی رازاوەتەوەو بە زینەتی ویقارو خۆڕاگری جیلوە دەکا و جەماڵی حەوســـەلەو پانتایی زانستی ئەو بێسنوورەو لایەنی چاوپۆشیو لێبوردنـــی هەراو و بەربڵاوەو خێراتی ئەو دەگاتە هەموو خەڵک، وە ئاســـەواری کەمنازاریو رەحمو دڵۆڤانی ئەو شایعو بڵاوە، وە ئەگەر لە سووڕانەوەی چەرخی گەردوون، بەڵایەک نازڵ بێ و لە داگیرکەری زەمانە رووداوێک روو بدا کە هێندێک لە نیعمەتەکانی ئاســـمان لەناو بەرێ، دەو [حاڵەتانەدا] هیچ کەس پادشای بە گرژیو خەمناکی نابینێو جەنابی ئەوان بە دوورە لە عەیبی دادو هاوارو بەخۆدا دان و، نەفســـی کەریمی خۆی دە هەموو گرژیو تاڵو ترشـــییەکدا رادەگرێ. وە رازیبوون بە قەزا و قەدەر بە فەرز دەزانێ، با وەکوو کەماڵی دەسەڵاتو پایەبەرزی هەیەو دەســـتی دەڕوا، لێبوردنو چاوپۆشیکردنی شاهانە دەرهەق بە بەندەکانی موخلیس لە سەر شوێنی خۆیەتی، هەر وەها جەماعەتێک کە خۆیان بە هاوشانی ئەو دادەنێن، ئەگەر هێندێک سەرکێشـــیو ملبادان بکەنو بە ئاشکرا یا بە نهێنی کارێک بکـــەن کە بە دژایەتـــیو رووبەڕووبوون لێک بدرێتـــەوە. لە تەمێکردنو

---

١. وقت است اگر نوبت غم درگذرد.

ســـزادانیاندا ئەوەندی لە شانو شکۆی پادشایەتی بوەشێتەوە کاردانەوە نیشان دەدا، وە خاسو عامو رەعیەتو لەشـــکر چاویان بەو تێکشـــکانو مل کەچکردنە دەکەوێ، وە چون ئەم قودرەتەیان دیتو ســـەریان دانەواند، ئەوجار [پادشـــا] لە رێزگرتنو خەڵاتکردندا بەو ئەندازە کە هیممەتی بڵندو ئاغایەتیو ســـەخاوەتی خـــۆی رێ دەدا، زێدەرۆیـــی دەفەرموێ کە تاریخی گەورەپیـــاوانو فەرزانەکانی جیهانو ناوی پادشـــایانی گەورە، پێی دەرازێتەوەو باســـی ئەو لە سەر لاپەڕەی رۆژگار دەمێنێتەوە.

بەو قودرەتو دەست رۆیشتووییە کە باس کرا، گوێی دا بە قسەکانی من کە بێ پەروایانەو توندوتیژ بوو، کام بەندە دەتوانێ شـــوکرانەی ئەم سۆزە ببژێرێ؟ شمشیری سەرپەڕێن ئامادەیەو منی بەندەش بێئەدەبانە دواوم. راگرتنی نەریتی سزادان، مەگەر بە لێبوردنو خۆڕاگری پادشا، بەکێ دەکرێ؟ وە منی بەندە ددان بە گوناهی خۆمدا دێنمو ئەگەر ســـزا بدرێم، بە دروســـتی دەزانم، چونکە خەتام کردووەو دە راپەڕاندنی فەرماندا درەنگم کردووە، وە لە ترســـی ئەم وەزعەو ئەم قسانە بیرم لە حاڵی خۆم کردۆتەوەو رادەگەیەنم کە شاژنی دنیا زیندووە.

پادشـــا بە بیســـتنی ئەم قسەیە شاگەشـــکە بوو. نیشـــانەی خۆشحاڵیو گەشـــانەوەی بەختەوەری لە روخساریدا دەرکەوتو پاش ئەو حاڵەتە فەرمووی کە: لەمپەری توندوتیژیو کۆســـپی کوشتنو سزادانت ئەوە بوو کە راستگۆییو دڵپاکیو دڵسۆزی تۆم دەناسیو دەمزانی کە دە راپەڕاندنی ئەو حوکمەدا دەست رادەگریو پاش گەڕانەوەو کەســـبی زانیاریو ئـــاگاداری بەو حوکمە رادەگەی. چونکـــە هەڵەی ئێراندوخت ئەگەرچی قورس بوو، سزاکەشـــی تا ئەم ئەندازەیە نەبوو، وە لەم قســـانەدا، ئەی بەلار، تۆ تاوانێکت نییە. چونکە بەو قســـانەت دەتویست کە قەراری بڕیاری ئێمە لە پێشخستن یا پاشخستنی ئەم حوکمە بزانیو بە خاترجەمی تەواو دەست بەکار بی. بەو ئیحتیاتو وردبینییە عەقڵو زانایی تۆ زۆرتر دەرکەوتو تاقیکراوەو متمانەی ئێمە بە تاعەتو بەندەگی دڵسۆزانەی تۆ زیاتر بوو، وە خزمەتی تۆ لەم کارەدا پێگەیەکی بەرزی وەدەست هێنا و پاداشی ئەو خزمەتە، ئەوەندی دە تواناادا بێ، بە خێرو خۆشـــی بە تۆ دەدەینەوە، وە

خزمەتکار دەبێ بە زیوەری ویقارو خۆڕاگریو پشوودرێژی برازێتەوە تا راگرتنی ئەو فایدەی لێ بکەوێتەوە. ئێستا هەستە برۆ، ئەحواڵپرسیو تاسەباری ئێمەو داوای لێبوردنی ئێمە بگەیەنە ئێراندوختو پێی بڵێ:

بێ خەرمانەی مانگی رووت، تاریکە شەوگاری ژین

بێ زیارەتی جەماڵت، نەماوە تاقەتو تین[1]

وە پەلە دەبێ بکەن تا زووتر بێو شادمانیو عوزری ئێمە کە بە ژیانی ئەو تازە بۆتەوە، بگەیەنێتە ئەوپەڕی خۆی. وە ئێمەش لە حوجرەی دووریو ئارەزوومەندییەوە بگوێزینەوە بۆ حیجلەی زاوابەندیو دەستوور بدەین کۆڕی بەزمو شادی بەرپا کەنو بۆ من تێکەنو بڵێین.

دەمەوێ ساقی ئەمن ئەوشۆ غەمی دڵ کەم کەم

لووزەوەم بەردە سەرێ نامەوێ جورعەی کەم کەم[2]

بەلار گوتی: مەسەڵەحەت هەر ئەوەیەو بێ دوودڵی ئەو فەرمانە ئەنجام دەدرێ. ئەوجار بە پەلە رۆیشتە لای ئێراندوختو گوتی:

دنیا کە گوڵگوڵی بووە قوربان ئەتۆش وەرە

مایل بە گوڵ بە، عەیبی چییە گوڵگوڵی بوێ[3]

وە مزگێنی پێدا کە هەموو شت بە خێرو خۆشی گوزەراوەو کاتی ئەوەیە بچێتە خزمەت پادشا. خاتوون زۆر زوو خۆی رێکوپێک کردو هەر دووکیان پێکەوە هاتنە خزمەت پادشا، ئێراندوخت عەرزی ماچ کردو گوتی: شوکرانەی ئەو لێبوردنەی پادشا چون دەتوانم بکەم؟ وە ئەگەر بەلار متمانەی پتەوی بە کەماڵی سەبرو خۆڕاگریو دڵۆڤانیو کەرەمی بێپایانو رەحمەتی شاهانە نەبووایە، هەرگیز نەیدەتوانی سەبر بکا و دەست رابگرێ.

پادشا بە بەلاری گوت: "منەتێکی گەورەت لەسەر داناوین"وە من هەمیشە متمانەم بە دڵسۆزیو رێنوێنی تۆ بووە، بەڵام ئەمڕۆ متمانەم زۆرتر بوو.

---

١. بی طلعت تو مجلس. بی ماه بود گردوون / بی قامت تو میدان، بی سرو بود بستان.
٢. لە دیوانی هێمن وەرگیراوە بەرانبەر بە:
زان می کە چو آه عاشقان از تف / انگشت کند بر آب زورق را.
٣. نالی.

ورەت بەرز بێ کە دەستی تۆ لە مەملەکەتی ئێمەدا ئاواڵەیەو فەرمانی تۆ بەسەر فەرمانبەرانی ئێمەدا دەڕوا و ڕێنوێنیی‌و دڵسۆزی تۆ دە خەرجکردن‌و جێبەجێکردن‌و پەیمانبەستن‌و باسکردندا ڕەوایەو کەس ڕەخنەی لێ ناگرێ.

بەلار گوتی: دەوڵەتی پادشا هەر لە پەرەگرتن‌و بەردەوامی قودرەتدا بەرقەرار بێ! لەسەر بەندەگان فەرزە فەرمانبەرو ملکەچی فەرمانی پادشا بن‌و ئەگەر تەوفیقی خزمەتیان دەست کەوت، چاوەڕوانی پاداش‌و ستایش نەبن. چونکە کەرەم‌و لوتف‌و سۆز‌و عاتیفەی پادشایان، زۆر لە خزمەتکردن‌و نۆکەری بەندەگان گەورەترە. وە ئەگەر تەمەن هەزار ساڵ بێ‌و هەمووی بۆ تەڵەبی ڕەزامەندی‌و ئاسوودەیی خاتری پادشا تێپەڕ بکەن، هەزار یەکی ئەو ناتوانن شوکرانەبژێر بن. بەڵام نیاز بە بەندەنەوازی پادشا ئەوەیە کە لەمەوپاش دە کاراندا پەلە نەفەرموون تا عاقیبەتەکەی لە حەسرەت‌و پەشیمانی بە دوور بێ.

پادشا گوتی: "ئەم نەسیحەتەمان بە دڵ‌و بە گیان قبووڵ فەرموو، لە داهاتوودا بێ ڕاوێژکاری‌و قووڵبوونەوەو هەڵسەنگاندن‌و ئیستیخارە، حوکمێ نادەین". وە پاش ئەو قسانە خەلاتێکی شاهانەی بە ئێراندوخت‌و بەلار عەتا فەرموو.

هەر دووکیان شەرتی خزمەتیان بەجێ هێنا و لەمەڕ ئەو تایفەی بەرەممەنان کە خەونەکانی پادشایان بەو جۆرەی رابرد تەعبیر کردبۆوە، لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە کە پادشا فەرمانیدا لەناویان بەرن‌و هێندێکیان بە سێدارەوە هەڵاوەسی. وە "کارایدوون"ی حەکیمی بانگ کردو بەخشش‌و خەلاتی زۆری پێدا و دەستووری دەرکرد کە بەرەممەنان بێنە خزمەتی. گوتی: جەزای غەیانان‌و سزای مەکربازان ئەوەیە. رووی دە پادشا کرد، زۆری ئافەرین پێ گوت‌و بەجێی‌هێشت.

پادشا بە بەلاری گوت کە با بگەڕێنەوەو بحەسێینەوەو کۆڕێکی دۆستانە پێک بێنین کە هەلی وا هەڵناکەوێتەوە.

نیازم بەو پیاڵەی چاوی مەستە
بە یەک پرشنگی عالەم سەربەسەر مەست
لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هۆشیار
هەتا چاوی بکا بڕ، مەستە، هەر مەست

به دوویا شـێخو سـۆفیو مەسـتی عیشـقی
لە ڕێیدا کەوتوون مەسـتە لە سـەر مەسـت[١]

ئەوە بوو داسـتانی فەزیلەتی سەبرو خۆڕاگریو بە گرینگتر زانینی لە باقی ڕەوشتی پادشایان. لە زانایان شاراوە نەبێ کە فایدەی گێڕانەوەی ئەم حەکایەتانە عیبرەتوەرگرتنی خوێندەوارانو هۆشـیاربوونەوەی بیسـەرانە. وە هەر کەس عینایەتو لوتفی ئەزەلی پێدرابێ، سەرمەشـقو ڕێنیشـاندەری ئەو، ئەزموونی ڕابردووانو ڕێنوێنی حەکیمانە. وە بناغەی کارەکانی ئێسـتا و مەسڵەحەتەکانی ئەمڕۆ و سبەێنێ لەسەر پایەی حیکمەتو عەقڵانییەت دادەمەزرێنێ.

وَاللهُ اَلْمَوَفِّقُ لِما يَنْفَعُ فی الْعاجِلِ وَ الأْجِلِ

---

١. لە دیوانی مەحوی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
در جهان شاهدی و ما فارغ / در قدح جرعه‌ای و ما هشیار
خیز تا زاب روی بنشانیم/ باد این خاک توده غدّار
ترک تازی کنیم و برشکنیم/ نفس زنگی مزاج را بازار.

# ١٣
# زێڕینگەرو گەڕیدە

ڕای گوتی: باشە، داستانی سەبرو خۆڕاگریو باشتربوونی ئەوم بە سەر باقی ڕەوشتەکانی پادشـــایاندا گوێ لێ بوو. ئێستا داستانی پادشایان دە بەستێنی چاکەکردن دەگەڵ خزمەتکارانو بە گرینگ زانینی لایەنی باش دە ڕاگرتنی ئەواندا بۆ ئێمە بگێڕەوە. تا دەرکەوێ کام تایفە قەدری پەروەردەکردن باشتر دەزانن‌و لەوەدا شـــوکرانەبژێرترن. بەرهمەن لە وەڵامدا گوتی: گرینگترین ڕەهەند لەوەدا ناسێنی جێگەو شوێنی ڕاگرتن‌و پەروەردەکردن‌و شوێنی هەڵبژاردنە. چون پادشا دەبێ هەموو دەســـتکردەکانی خۆی بۆ هەموو چەشنە تاقیکردنەوەیەک بە دارو بەرددا بدا و پێوەرو پێوانەی بیروڕا و یەکدڵیو ڕێنوێنی هەر کامیان دیاری بکا و کۆڵەکەی ئەم کارەش، خۆڕاگری، داوێن‌پاکی، بەپارێزو تەقوابوون‌و مەسڵەحەت ناســـین دە بەرچاو بگرێ. کە مایەی خزمەت بە پادشایان ڕاستیو دروستییەو بەشـــی گەورەی ئەم دروستییەش خوداترســـیو دینداریی‌و هیچ گەورەییەک بۆ مرۆڤ لەوە لە بانتر نییە.

وە سیفەتی پارێزو تەقوا کاتێک جوانە، کە ڕابردووەکان بە پاکیو پاکداوێنی بەناوبانـــگ بـــن‌و بەخۆپارێزیو خاکیبوون‌و ڕیازەتکێشـــان ناویان ڕۆیشـــتبێ، وە هەر کات ئەم شـــەرەفە بۆ ڕابردووەکان مســـۆگەر بـــوو، ئەوجار پێوەندیو بەســـراوەیی ئەولاد بە بابو باپیران لەم ڕوانگەوە دەرکەوتو هونەرەکانی خۆیو جوانی سیفەتەکان ئەم شـــانازییانەی ڕازاندەوە، شایانی بەختەوەریو ئامادەیی

بـۆ پەروەردەبوونو ڕاگرتن ڕوون دەبێتەوە. وە ئەگەر لەم شـەرتو مەرجانەدا گومـانو دڕدۆنگییەک بدۆزێتەوە، ئەڵبەتە نابێ ئەو کەسـە، بڕوای پێ بکرێو ببێتە مەحرەمو لە نهێنییەکانی پادشـادا دەخاڵەت بکا. چونکە ئەم کارە زیانی زۆری لێ دەکەوێتەوەو ئاکامە خراپەکانی دەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان خۆی وەدەر دەخا و زەرەرو زیانی زۆری بە دوادا دێو بە هیچ شێوەیەک قازانجی لێ دەست ناکەوێ.

وە پـاش ئەوەی لەم ڕێگەیەدا کـە زۆر گرینگە، وریاییو ئیحتیاتی زۆر دە بەرچاو گیرا، ڕاسـتگۆیی خزمەتکارو خۆپارێـزی ئەو لە لاڕێبوونو دووڕوویی‌و جیاوازی‌و دژوازی لە کەلامو گێڕانەوەدا دەبێ تاقی بکرێتەوەو ڕاستی‌و ئەمانەت دە گوتارو کرداری ئەودا مسـۆگەرو ڕاسـت بێ. چون عەیبو عاری درۆکردن زۆر گەورەیەو دووری‌و خۆپاراسـتنی خزمەتکارانو نزیکانی پادشا لەم عەیبو عارە، فەرزە. وە ئەگەر کەسـێک ئەو فەزیلەتەی [خزمەتی پادشایان] دەست کـەوت، تا لەباری وەفاداری‌و هـەق دە بەرچاوگرتن ناویانگـی نەڕوا و تاقی نەکرێتەوە، پادشـای وریا و تێبین هەرگیـز متمانەی پێ ناکەن. چونکە ڕیش نەرمی پەسـتو نزم، قەدری حورمەتگرتنو خەڵاتو ئەنعام بە واجیب نازانی‌و لە هەر لایەک باران ببینی، کەوڵو پۆسـت هەڵدەگێڕێتەوە [بە دوای قازانجی خۆیدا دەگەڕێ]و مرۆڤی لێهاتووی زانا و هونەرمەندی وریا، مردن لەم ڕەوشتە خراپە بە باشتر دەزانن. پادشایان دەبێ سەرنج بدەنە، سیفەتە باشەکانی زاتی نۆکەرانو خزمەتکارانو کاریان بە ڕازاوەیی ڕواڵەتی ماڵو سامانی زۆریان نەبێ. چونکە خزمەتکار لە لای پادشا عەقڵو زانینەو سەروەتو سامانەکەشی زانستو کارامەیی. وە دیاردەی بە ڕواڵەت، لە بەر چاو ئەهلی بینینو تێگەیشتنو دڵی خاوەن ڕایان بایەخێکی نییە. ژن نابێ بە پیاو، بە ئاغەبانوو.[1]

وە هێندێک سـەلیقە لایان وایە کە ئەوانەی لـە تەخت نزیکن، دەبێ قەدرو ڕێزی تایبەتیان لێ بگیرێو گەورە بکرێنو پیاوان لە بنەماڵە کۆنەکان هەڵبژێرنو زەحمەت بۆ ئەوە بکێشـن کە ئەشـرافو گەورەکان بکەنە خزمەتکاری پادشا.

---

١. زن مرد نگردد به نکو بستنِ دستار.

زۆریان لــەم بارەوە گوتووە. بەڵام عاقڵان دەزانن کــە خانەدانی پیاو، عەقڵو زانینەو شەرەفیشــی دەســت کورتیو تەقوا و پارێزە. وە شەریفـو بژاردە ئەو کەسە دەتوانێ ببێ کە پادشای وەختو خوسرەوی زەمانە هەڵیبژێرێو شەرەفی راگرتنی پێ بدا. وە لە عادەتەکانی رۆژگار ئەوەیە کە پیاوماقووڵان دەفەوتێنێو دەچەوسێنێو سرپوسواڵکەران دەپەروەرێنێ. وە هیچ زیرەکێک ئەم راستییە وە درۆ ناخاتــەوە. ئەوەش بزانین هەر کات، بۆرەپیاوێکی خەســیس بە پلەوپایەو خۆشەویستی ناو خەڵک بگا، پیاوماقووڵێکی بەخشندەو سەخی تووشی نەگبەت دەبێ.

وە پادشایانیش دەبێ هیممەت بکەنو دەستپەروەردەکانی خۆیان دە کار بێننو متمانەیان بە کاربەدەســتانی دەوڵەتی خۆیان چڕ بکەنەوە، وە ئەوەش بێسوود نابێ. چونکە کاتێک خزمەتکار بیر لە چکۆلەیی زاتی خۆی دەکاتەوە، شوکرانەی بەخشــندەییو ئیختیار لازمتر دەزانێ، چونکە لەو پلەوپایەو پەروەردەبوونەدا، مافێکی مســۆگەر بۆ خۆی نابینێ. بەڵام ئەم بابەتە زەمانێک مومکین دەبێ کە پاکداوێنی میراتیو کەسبی، پێکەوە جەم بووبنەوە. وە شیرینیو جوانی زانستو پێگەیشــتوویی وەدەست کەوتبێ، چونکە بێ ئەم ســەرەتایانە، نە ناوی باشی بەندەگی دروست دەردێو نە جلوبەرگی شوکرانەبژێری چوستو پڕ بە بەر دەبێ.

وە کاتێک کەســێک بەم خەســڵەتانە رازاوەو لە کوورەی تاقیکردنەوە، بەم شــێوە کە باس کــرا، بە ســەرکەوتوویی هاتەدەر، وە شایســتەگیو لیاقەتی پلەوپایەی لە هەموو بارێکەوە، بە تەواوی وەراســت گەڕا، دە پەروەردەکردنو گەورەکردنــدا دەبێ تەرتیبو نۆبە دە بەرچاو بگیرێو لە ســەرەخۆ، بێ پەلەو عەجەلــە، دەرجەو پایــەی بەرنە بانو گەورەی بکەن، تــا بکەوێتە بەرچاوانو دەگــەڵ تێپەڕبوونــی زەمان لە دڵاندا جێ بکاتەوەو بە یــەک قەڵەمباز نەگاتە ئاخرین پلەی نەردیوان! ئەگەر وا بکا دەپســێو سەرەوبن دەبێو رەخنەگرانو نەیاران مەجالی لۆمەو لەقەمیان بۆ دەرەخسێ.

ئــەوەش بزانین ئەگەر تەبیــب لە یەکەم چاوپێکەوتندا نەخۆشــێک عیلاج بکا، زوو ئەو نەخۆشــە تێدا دەچێو حەوجەی بە شــەربەتو دەرمانی دووهەم

نابێ. بەڵام تەبیبی زانا و ئاگا ئەوەیە، کە لە حاڵو وەزعی نەخۆشو ماوەی نەخۆشیو چۆنەتیو هۆی نەخۆشی بکۆڵێتەوەو چاو لە میزی نەخۆش بکا و پاش ئاگا بوونەوە لە کەمو زۆرو هۆکارە وردو درشتەکانی نەخۆشی، دەست بە دەرمانکردن بکا و لەو کارەشدا بە تەرتیب بڕواتە پێش. وە لە جیاوازی حاڵی نەخۆش بە پێی زیادو کەمبوونی نەخۆشییەکە غافڵ نەبێ تا نەفەسی دروست بێتەوەو نیشانەی شفا و سلامەتی دەرکەوێ.

وە هەر بەمجۆرە ئاگاداری پادشا لە بارستای لێهاتوویی خزمەتکاران فەرزە. تا لە خۆوەو بە هەڕەمە متمانە بە کەس نەکا. کە پەشیمانیو حەسرەتی بە دواوە بێ. وە نموونەی ئەم سەرەتایە حەکایەتی کابرای زێڕینگەرە.

ڕای گوتی: ئەم حەکایەتە چۆنە؟ گوتی: دەگێڕنەوە تاقمێک ڕاوکەر، بۆ دەداوخستنی دڕندەیەک، لە بیابانێکدا چاڵێکیان هەڵکەند. بەبرێکو مەیموونێکو مارێک تێکەوتنو بە دوای ئەواندا زێڕینگەرێکیش دەو چاڵە کەوت. ئەوانی دیکە لەبەر ئێشو ئازاری خۆیان نەپەرژانە ئازارو ئەزیەتی ئەو. چەند ڕۆژێک بەو قەرارە تێپەڕی تا ڕۆژێک گەڕیدەیەک بەلایاندا ڕۆیشتو ئەو حاڵەتەی چاو پێکەوتو بە خۆی گوت. ئەو پیاوەی لەو مەینەتییە ڕزگار دەکەمو خێرەکەی دەکەمە تۆشەی ڕۆژی قیامەت. تەنافی ڕۆهێشت. مەیموون خۆی پێوە هەڵاوەسی، جاری دووهەم مار پێشدەستی کرد، جاری سێهەم بەبر. کاتێک هەر سێک هاتنە سەر دەشتایی گوتیان: تۆ لەسەر هەر یەک لە ئێمە نێعمەتێکی تەواوت هەیە کە لەم ساتە وەختەدا ناتوانین پێشکەشتی بکەین. مەیموون گوتی: زێدی من لە کێوێکە لە تەنیشت شاری "بووراخۆر"و بەبر گوتی: لەو شوێنە مێشەیەک هەیە. من لە دیواری قەڵای ئەو شارەداماڵی خۆم چێ کردووە. ئەگەر ڕێت دەوێ کەوتو خودا تەوفیقی داین، ئەوەندەی لە دەستمان بێ قەرەبووی زەحمەتەکانت دەکەینەوە. ئێستا نسحەتێک دەکەین. ئەو پیاوە دەرمەهێنەوە. چونکە ئادەمزاد بێشەرتو پەیمانشکێنەو پاداشی چاکە بە خراپە دەداتەوە، نابێ فریوی جوانی ڕواڵەتی بخۆی، چون کرێتیو پیسی دەروونی زۆرترە.

جوانــی ئــاکار ناحەزو ســەقەتن
دەشــگرینو لــە لاوە پێدەکەنن[1]

بــە تایبەتی ئەم پیــاوە کە چەند رۆژان هاورێ بووین. لە رەوشــتی حاڵی بووینو تێگەیشتین کە پیاوی وەفا و پیاوەتی نییەو سەرەنجام رۆژێک پەشیمان دەبێتەوە. قســەی ئەوانی قبووڵ نەکردو نەسیحەتی ئەوانی خستە پشتگوێ، تەنافی رۆهێشتو زێڕینگەر هاتە بان چاڵاو. زۆر سپاسی کابرای گەڕیدەی کردو پێی گوت کە وەختێک بچێتە لایو ئەوی بوێ، تا خزمەتێک بکا و پاداشــێکی پێشــکەش بکا، بەمجۆرە گەیشــتنە ماڵاواییو هەر یەکە بە لایەکدا رۆیشــت. ماوەیەک تێپەڕی، گەڕیدە رێگەی کەوتە ئەو شارە. مەیموون لە رێگادا تووشی بوو، بەخێرهاتنو خۆشو بێشی دەگەڵ کردو گوتی: مەیموونەکان بێ‌ماڵو حاڵنو خزمەتێکم لە دەست نایە، بەڵام کەمێک راوەستە با کەمێک میوە بێنم، زۆر زوو رۆیشــتو گەڕاوەو میوەیەکی زۆری هێنا. گەڕیدە ئەوەندی بۆی خورا خواردیو کەوتەوە رێ. لە دوور چاوی بە بەبر کەوت، ترسی رێ نیشت، ویستی خۆی لێ لادا. گوتی: مەترســە، ئەمین بە. ئەگەر تۆ ئێمەت لە بیر نەمابێ، ئێمە هەقی چاکەی تۆمان هەر لە بیرە. هاتە نزیکترو زۆر سپاسو پێزانینی خۆی دەربڕیو گوتی: هێندێکم لە ســەر راوەستە، هەر ئێستا دێمەوە. گەڕیدە راوەستا و بەبر خۆی دە باغێکڕا کرد، کچی پادشــای کوشتو لیباسو زێڕو زیوەری بۆ گەڕیدە هێنــا. گەڕیدە زێروزەمبەری پێچاوەو سپاســی بەبری کردو بەرەو شــار وەرێ کــەوت. لەو میانەدا وەبیر زێڕینگەر کەوتەوەو گوتی: لە حەیواناتدا ئەم هەموو خــۆش قەولییە هەبێ، دیارە ئەو زۆر لەوە پتری لە دەســت دێ. ئەگەر بزانێ من لێرەم، لوتفو کەرەمی خۆی نیشــان دەدا و بە هاتنی من شــاد دەبێو بە یارمەتیو پشتیوانیو رێنوێنی ئەو ئەم زێڕوزیوەرە بە نرخێکی باش دەفرۆشم.

بە کورتی، کاتێک گەیشــتە ناو شــار، بەدوایدا گەڕا، کاتێک گەیشتە لای، زێڕینگەر خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو بە رێزو پێشوازییەوە بردیە ماڵی خۆیان، بۆ سەعاتێک، غەمو شادییان هەڵڕشتو حاڵی یەکتریان پرسی، لەم قسەو باسانەدا

۱. خوب رویان زشت پیوندند / همه گریان‌کنان خوش خندند.

گەڕیدە باسی زێڕو زیوەری کردو هەمووشی پێ نیشان دا. زێڕینگەر خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو گوتی: جا ئەوە کاری خۆمە! بە چاو تروکانێک فکری خۆم لەو بابەتە ئاسوودە دەکەم.

وە ئەو ناپیاوە، دە خزمەت کچی ئەمیردا بوو، زێڕو خشڵی ناسیەوە. بە خۆی گوت: هەلێکی باشم بۆ رەخسا، ئەگەر لە دەستی بدەم لە عەقڵو فامو تێگەیشتنو سوودو قازانج بێ بەهرەم. پاشان "با" بە چەنگ دەبمو بە هیچ ناگەم. لێ بڕا ئەو کارە بکا، رۆیشتە بەر درگای ئەمیرو خەبەری دا کە قاتڵی کچی ئەمیرم بە زێڕو زەمبەرەوە گرتووە. حازریان کرد. بێچارە کە حاڵی بوو چ رووی داوە بە زێڕینگەری گوت:

ئەوی کردی لەمە دۆستی سەگباب

قەت نەماندی لە دوژمنی ناباب[1]

پادشا پێی وابوو کە ئەو خەتابارە، چونکە جەواهێراتەکە لای ئەو بوو، فەرمووی تا بە دەوری شاریدا بیگێڕنو پاشان لە سێدارەی بدەن. لەو حاڵەدا ئەو مارەی لە سەرەتای حەکایەتدا باسمان کرد، ئەوی دیت. ناسیەوەو لە شوێنی زیندان خۆی گەیاندێ. وە چون چۆنیەتی رووداوەکەی بیست نارەحەت بوو و گوتی: ئاخر پێمان نەگوتی: [ئەو پیاوە] وەفای نییەو چاکە بە خراپە جواب دەداتەوەو پیاوێکی بەدزاتە. پاداشی ئیحسان بە خەیانەت دەداتەوە. هەر کەس لە خەسیسی پەستو ورەنزمو خۆپڕیو بێعەقڵ چاوەڕوانی پیاوەتی هەبێو لە کاتی تەنگەژەی رووداواندا یارمەتی بدا، وای بەسەر دێ کە عەرەب گوتی: مُثْقَلٌ اَسْتُعانَ بِذَقنِهِ[2] یانی عاجزو بێهێزێک لە کەسێکی بێهێزتر لە خۆی یارمەتی بخوازێ! وە من بۆ ئەم مەینەتیو چارەڕەشییە دەرمانێکم دۆزیوەتەوە. بە کوڕی پادشامەوە داوەو بریندارم کردووە، تەواوی شار بۆیان عیلاج نەکراوە. ئەم گیایە لای خۆت رابگرە، ئەگەر مەشوەرەتیان پێ کردی، پاش ئەوەی نەقڵو سەربردەی خۆت گێڕاوە. بیدەیە بیخوا، چاک دەبێتەوە. مەگەر بەمجۆرە

---

[1] ١. کشتی مرا بە دوستی و کس نکشتە بود / زین زارتر کسی را هرگز بە دشمنی.

[2] ٢. بارگرانێک کە لە چەناگەی خۆی یارمەتی بوێ!

ڕزگاریـــت بێ، دەنا کارت تەواوەو هیچ ڕێگەی دیکەم پێ شـــک نایە. گەڕیدە، زۆری عوزر خواستو گوتی: هەڵەم کرد نامەحرەمێکم لە ڕازی خۆم ئاگا کردەوە.

مار گوتی: لە عوزر هێنانەوە بگەڕێ، پیاوەتی تۆ لای ئێمە ناسراوەو رابردووت روونە. ئەوەی گوتو ڕۆیشـــتە ســـەر بەرزاییەک بە جۆرێک کە دانیشـــتووانی کۆشـــک دەنگی ببیسنو کەس نەیدیتو هاواری کرد: "دەرمانی مارانگەز لە لای گەڕیدەیـــە". زوو هێنایانو بردیانە لای پادشـــا. ســـەرەتا نەقڵی خۆی گێڕاوەو پاشـــان کوڕەکەی عیلاج کردو وردەوردە نیشـــانەی چاکبوونەوە دە کوڕەکەدا ئاشکرا بوو. وە بێگوناهیو پاکی ئەو لەو تۆمەتەی کە دابوویانە پاڵی بۆ پادشا روون بـــۆوە. خەڵاتی گەورەی دایەو ئەمری فەرموو لە جێگەی ئەو زێڕینگەر لە سێدارە بدەن.

وە ســـزا و حەددی درۆکردن لەو عەســـرەدا ئەوە بوو. کە ئەگەر نەممامێکی درۆزن کەســـێکی تووشـــی بەڵایەک کردبا، ئەگەر بوختانی ئەو درۆزنە ئاشکرا ببایە، هەمان ســـزا کە قەرار بوو بۆ تۆمەتلێدراو دە بەرچاو بگیرێ دەرهەق بە درۆزنی پەستو خەسیس بەڕێوە دەچوو.

وە کارپاکیو کارچاکی هەرگیز زایە نابێو ســـزای بەدکرداران قەت ڕاناگیرێ. وە پیاوی عاقڵ دەبێ بزانێ کە لە ئازاردانو جەفاکردن خۆی بپارێزێ، وە پلەو پێگەی دنیا و تۆشەی قیامەت بە سەلاحو کەمئازاری دابین بکا.

ئەوەیە ئیشارەو فەرمانی پادشایان لە هەڵبژاردنی دەستو پێوەندو ناسینی ئەحواڵی پەیڕەوانو خۆپاراستن لە هەڵبژاردنی بێوردبوونەوەو سەرنج دان، کە وەک دیتمان زیانو زەرەری زۆری لێ دەکەوێتەوە.

## ١٤
# شازادەو هاوڕێکانی

ڕای گوتی: بەڵێ، بیستم داستانی وریابوونی پادشایان لە هەڵبژاردنی خزمەتکاراندا و ئەو قایمەکاریو ئیحتیاتەی لەسەریان واجبە تا نەزانی بەدزات دەسەڵات پەیدا نەکا، چونکە قەدری پەروەردەبوون نازانیو شوکرانەی ئەوەی هەڵبژێراوە نازانێ. ئێستا باسی ئەوەمان بۆ بکە کە چۆن عاقڵی بەخشندەو کەریمو زیرەکی ئاگادار لە هەموو شت، دەکەونە بەندو داوی بەڵا و بریندارو ڕۆژەڕەش دەبنو مرۆڤی خەسیسی نەفامو تێنەگەیشتووش، لە سایەی نیعمەتو دە ژێر باڵی شادکامیدا ڕۆژگار دەباتە سەر، نە ئەمەیان عەقڵو زانایی دەستی دەگرێو نە ئەویان نەزانیو نەفامی زەفەری پێ دەبەنو سەرەنگرێی دەکەن. کە وابوو ڕێگاچارە بۆ وەدەستهێنانی سوودو قازانجو پێشگیری لە زەرەرو زیان چییە؟

بەرەهمەن هاتە جوابو گوتی: عەقڵ بەشی هەرەگەورەی سەعادەتەو هاچەری سەرکەوتنەو هەر کەس ئەم گەورەییەی پێ ببڕێو جوانی سەبرو خۆڕاگریشی ڕەگەڵ کەوت، شایانی دەوڵەتەو گەورەییو حورمەتی لێ دەوەشێتەوە. بەڵام بەرهەمەکانی بەسراوەتەوە بە تەقدیری ئاسمانی. وە پادشازادەیەک لە سەر دەرگای شاری "مەنزوور" نووسیبووی کە "ئەسڵی بەختەوەری قەزای ئاسمانییەو سەبەبو ئەسبابو هۆکار، هەمووی زیادییەو زایەیە". وە ئەو قسەیە داستانێکی لەپشتە. ڕای پرسی: چۆنە ئەم داستانە؟

گوتـــی: دەگێڕنەوە چـــوار کەس پێکەوە کەوتنە ســـەر ڕێگایـــەک. یەکەم شازادەیەک بوو کە نیشانەی پاکیو شەرەفـو گەورەیی لە هەستانو دانیشتنیدا ئاشـــکرا بوو، وە عەلامەتی پاشـــایەتیو دەوڵەتو دەسەڵات دە ئاکارو ڕەوشتی ئـــەودا خۆی دەنواند. دیاربوو کە شـــایانی گەورەییو دەرجەی پادشـــایەتییە. عالەمێک بوو دە جەستەیەکدا و لەشکرێک دە کەوایەکدا.

دووهەم کوڕە دەوڵەمەندێک کە تازە خەتی سمێلانی دەدا و حۆری بەهەشتی لە بەرانبەر جەماڵیدا سەجدەی دەبردو شێرسواری فەلەک لە ئاستی ڕوخساری پیادە دەبوو، تەڕو بڕو تورتو ناسک، لێهاتوویی و لیاقەتیشی لە ئەندازە بەدەر.

ســـێهەم کوڕە بازرگانێکی زیتو وریا و زانـــا و کارزانو تێبینو عەقڵتەواو، تێگەیشتوو، چاو و گوێ کراوە کە شەیتان باشاری نەدەکرد.

وە چوارەم کوڕە وەرزێرێکی بەهێزو بەتاقەت کە دە کاروباری کشتوکاڵدا زۆر ئاگا بوو، دە ئاوەدانکردنەوەدا دەستیکی وەک هەوری مانگی نیسان مبارەکو لە کاسبیدا قەدەمێکی وەک چیای "سەهلان" سەختو سەنگینی هەبوو.

هەموویان کەوتبوونە غەریبیو نـــەداریو نەگبەت ڕووی تێکردبوون. ڕۆژێک شـــازادە گوتی کە کارو چارەنووسی ئەم ســـەرە، بەسراوەتەوە بە قەزاوقەدەرو چارەنووسی ئەوسەر. وە تەلاشو خۆ دە زەحمەت خستنی ئادەمزاد ئاڵوگۆڕێکی زۆری تێدا پێکناهێنێ. وا باشـــترە پیاوی عاقڵ بە تەڵەبی ماڵی دنیا زۆر خۆی ماندوو نەکا و نەفســـی گەورەو عومری عەزیزی خۆی قوربانی مندارێکی دوژمن زۆر، نەکا. چونکە تەماعو خۆکوتانی خەڵک دە زیادو کەمبوونی ڕســـقو ڕۆزیدا کارتێکردنێکی ئەوتۆی نییە.

کـــوڕە دەوڵەمەند گوتی: بۆ ناســـینو دەرکی بەختەوەرییو وەدەســـتهێنانی گەورەییو نیعمەت، جەماڵو جوانی شـــەرتی موعتەبەرو هۆکاری سەرەکییە. وە هیچ ئارەزوویەک بێ ئەو هۆکارە مەیسەر نابێ.

کوڕە بازرگان گوتی: قازانجی بیروڕای دروســـتو تەدبیری ڕاســـت لە هەموو هۆکارەکان باشـــترەو هەر کەس دە بەردی مەینەتـــی هەڵەنگووتو بە عەرزیدا کەوت، هەستانەوەی تەنیا بە عەقڵو زانین دەست دەدا.

کوڕە وەرزێر گوتی: بەرەکەتی کەسبو کارو تێکۆشان دەبێتە هۆی خۆشیو کامەرانی خەڵکو ژیانیان بە شـــادیو دڵخۆشـــی دەرازێنیتەوە. وە هەر کەس بیەوێ بە شتێک بگا و لێبڕاوانە حەول بدا، پێی دەگا.

کاتێک گەیشـــتنە نزیک شاری "مەنزوور"، لە گۆشـــەیەک دانیشتن، کەمێک بحەســـێنەوەو بە کوڕە وەرزێریان گوت: اُطری فَانَک ناعِلَتهُ.[1] ئێمە هەموو لە پێ کەوتووینو چاومان لە دەستی تۆیە شتێکمان بۆ پەیدا بکەی. فکرێک بۆ بژێوی ئەمڕۆمان بکەوە، تا ســـبەی کە حەسانیەوە، ئێمەش روو دە کەسبێک دەکەینو شتێک پەیدا دەکەین. رووی دە شار کردو پرسی لێرە چ شتێک رەواجە؟ گوتیان: ســـووتەمەنیو دار زۆر بەقیمەتە. لەجێـــوە رووی دە کێو کردو کۆڵەدارێکی کۆ کردەوەو بردیە شارو فرۆشتیو خواردەمەنی کڕیو لەسەر دەرکی شاری نووسی "دەسکەوتی تێکۆشانی رۆژێک، رسقی چوار کەسە".

رۆژی دوایـــی. بـــە نەجیبزادەیان گوت: ئەمڕۆ بە جوانی خۆت کاســـبییەک بکەو بەخێومان بکە. فکری کردەوە. ئەگەر شـــتێک نەهێنمەوە دۆســـتەکانم لە دەســـت دەچن. بەو فکرەوە لە شاری وەژوور کەوت. ناڕەحەتو خەمگین پاڵی بە دارێکەوە دا. لە نەکاو ژنە دەوڵەمەندێک بە لایدا تێپەڕیو چاوی پێی کەوت. شەیدای جەماڵی بوو و گوتی:

هەر چەندە کە ئینســـانە لە بەر چاوی منو تۆ
مومکین نییە ئەم حوســـنە لە ئەبنای بەشەردا[2]

کەنیزی ئەو خاتوونە هاتە لایو گوتی: خاتوون دەفەرموێ: ئەگەر سەعاتێک بـــە جەماڵی خۆت میوانداریم بکەی، عومری هەتاهەتاییم دەســـت دەکەویو بۆ تۆش زەرەرێکی نابێ. جوابی داوە: دە فەرمانی ئێوەدام، هیچ عوزرێک نییە. بە ئەسپایی هەستا و رۆیشتە ماڵی خاتوون.

بـــە قانـــوون حورمەتی میوانـــی فەرزە
مەڕەنجێنـــە دڵـــــــم میوانـــی تۆیـــە

---

١. تۆ لە هەموومان ئامادەتری هەستە برۆ.

٢. نالی.

برینـــم کارییـــە، جەرگـــــــم بـــڕاوە
ئەویـــش کاری بـــرۆ و موژگانـــی تۆیـــە
ئەتۆ ســـووچت نەبوو، چاوت منی کوشت
مەفەرمـــوو چاوەکـــەم تاوانـــی تۆیـــە[1]

وە ڕۆژێکی دە حەسانەوەو نازو نیعمەتدا تێپەڕ کردو دە گەڕانەوەدا پێنجسەد درەمی خەڵات وەرگرت، دۆســـتەکانی بە جلوبەرگی تازە پۆشـــتە کردو لەسەر دەروازەی شار نووسی: "قیمەتی ڕۆژێک جەماڵو جوانی پێنجسەد درەمە". ڕۆژی دوایـــی بە کوڕە بازرگانیان گوت: ئەمڕۆ ئێمە دەبینە میوانی عەقڵو زانایی تۆ، ویستی بچێتە شار، لە نزیک ئەو شوێنە کەشتییەک پڕ لە سەت کاڵای گرانبایی گەیشـــتبووە قەراغ ئاو، بەڵام خەڵکی شـــار دەستیان ڕاگرتبوو، نەیاندەکڕی تا قیمەت دابەزێ. ئەو هەمووی بە قیمەتی گران بۆ خۆی کڕیو هەر دە یەک ڕۆژدا هەمووی فرۆشـــتەوەو سەتهەزار درەم قازانجی کرد. حاجەتی یارانی پێک هێنا و لەسەر دەرگای شار نووسی: "حاسڵی ڕۆژێک عەقڵ، سەدهەزار درەمە".

ڕۆژی دواتر بە شازادەیان گوت: ئەگەر تەوەکولی تۆ هیچ بەهرەیەکی هەیە، ئاگادارییەکی ئێمە بکە. ئەو بەو فکرەوە ڕووی دە شـــار کرد. ئەزقەزا ئەمیری ئەو شـــارە مردبوو، خەڵکەکەش تازیەبار بوون. ئەو بە دیتنی ئەو ڕێوڕەســـمە ڕۆیشـــتە سەرای پادشا و لە ســـووچێک دانیشـــت. چون دە گریانو شیوەندا وەک ئەوانـــی دیکەی نەدەکـــرد، دەرکەوان زۆری جنێو پێـــدا و ئەزیەتی کرد. کە جەنازەیان بردە دەرو ســـەرا چۆڵ بوو، ئەو هەر وا لەوێ ڕاوەستا. جارێکی دیکەش دەرکەوان چاوی پێی کەوت، زۆرتری خۆ کەر کردو بردیو زیندانی کرد.

ڕۆژی دوایـــی گـــەورەو ئەعیانی شـــار کۆ بوونەوە تا کاری پادشـــایەتی بە کەسێک بســـپێرن. چونکە پادشای کۆچکردوو میراتگری نەبوو. دەرکەوان پێی گوتن ئەم کارە بە نهێنییەکی زۆرترەوە ئەنجام بدەن، چونکە من جاسووســـێکم گرتـــووە، با لە وتووێژو ڕاوێژکاری ئێوە خەبەری نەبێتەوە. پاش ئەو خەبەرە، ڕووداوی خـــۆیو هەڵسوکەوتی نالەباری دەگەڵ شـــازادە بـــۆ گێڕانەوە. وایان

---

١. حەقیقی.

بە باش زانی بانگی بکەنو لە حاڵی بکۆڵنەوە. یەکێکیان نارد شازادەی لە گرتووخانەوە هێنا، لێیان پرسی: چۆنە هاتۆتە ئەم شارەو خۆی خەڵکی چ وڵاتێکەو لە کام شار لەدایک بووە. زۆر بە رێوجێ جوابی دانەوەو لە نەسەبو بنەماڵەی خۆی ئاگاداری پێدانو بۆی گێڕانەوە کە کاتێک باوکم کۆچی دوایی کردو براکەم دەسەڵاتی وڵاتی بە دەستەوە گرت، من بۆ پاراستنی گیانی خۆم شارو زێدی خۆم بەجێهێشتو لە کێشەو هەرای بێهوودە خۆم پاراستو بە خۆم گوت: اِذا نَزَلَ بِکَ الشَّرُّ فَاقعُدْ.[1]

تایفەیەک لە بازرگانان ناسیانەوە. باسی گەورەیی خانەدانو هەراویی پانتایی وڵاتی ئەویان هێنا گۆڕێ. ئەعیانو پیاوماقووڵانی شار، بوونی شازادەیان لەوێ زۆر پێ خۆش بوو، گوتیان: شایانی پادشایەتی ئەم هەرێمە ئەوە، چونکە زاتی شەریفو بنەچەکەی رەسەنو گەورەی هەیە. وە بێگومان لە روانگەی دادپەروەرییو سۆزو خۆشەویستییەوە بە شوێنی بابو باپیراندا دەڕوا و دابو نەریتو رێورەسمی ئەوان زیندوو دەکاتەوە. هەر لە جێوە هەڵیانبژاردو مەملەکەتێک بەم ئاسانییە کەوتە دەستیو تەوەکولی ئەو بەهرەیەکی ئەوا گەورەی لێ کەوتەوە.

وە هەر کەس لە پێگەی تەوەکولدا دەوام بێنێو بە نییەتی راست بیڕازێنێتەوە، بەهرەی لە دینو دنیادا بە تەواوی دەست دەکەوێ.

وە لەو شارە رەسم وا بوو کە پادشا رۆژی یەکەم بە سواری فیلی سپی بە دەوری شاردا دەگەڕان. ئەویش ئەو رەسمەی بەڕێوە برد، کاتێک گەیشتە دەروازەی شارو نووسراوەکانی دۆستانی چاو پێکەوت، فەرمووی بە دوای نووسراوەکانی ئەواندا بنووسن: "تێکۆشانو جوانیو عەقڵ کاتێک بەهرەیان دەبێ کە قەزای ئاسمانی دەگەڵی سازگار بێ. وە یەک رۆژ لە حاڵی من، بۆ پەندوەرگرتنی هەموو خەڵکی جیهان بەسە".

پاش ئەو گەڕانە، گەڕانەوە کۆشکو سەرا و لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشتو مەملەکەت کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو. دۆستەکانی بانگ کرد. خاوەن عەقڵی

---

١. کە ئاژاوەت بەسەردا نازڵ بوو خۆت مات کەو دانیشە.

کردە هاوکاری وەزیرانو خەڵاتێکی گرانبایی دا بە خاوەن جەماڵو دەستووری پێدا کە دەبێ لەم وڵاتە بڕۆی تا ژنان مەفتوونت نەبنو فەسادی لێ هەڵنایسێ. هەنگێ زانایانو حەکیمانی وڵاتی حازر کردو گوتی: لە نێو ئێوەدا زۆر کەس بە ئازایەتیو عەقڵو هونەرو لێهاتوویی لە من لە سەرترن، بەڵام موڵکو دەسەڵات بە چاوەدێری ئەزەلیو یارمەتی ڕۆژگار وەدەست دەکەوێ. وە هاورێیانی من کاسبیو کاریان دەکردو هەر کام شتێکی دەست دەکەوت. من، نە متمانەم بە زانستو کەسبی خۆم هەبوو و نە چاوم لە هاوکاریو یارمەتی کەسێک بوو. وە لەو تاریخەوە کە براکەم لە موڵکی میراتی خۆم دەرپەڕاندم، هەرگیز چاوم لەم پلەوپایەیە نەبووەو پێم وانەبوو وا گەورە دەبم.

تاق لێ مەدە، دیوتە تاقی کەسرا رووخا
ئەو عومرە وەفای نییە، نەما نەوشیروان[1]

لە نێو ئامادەبوواندا گەڕیدەیەکی دنیادیدە هەستا و گوتی: ئەوەی پادشا دەیفەرموێ کەلامێکە بە تەرازووی عەقڵو ئەزموونو زیرەکیو وریایی کێشراوەو میزان کراوە. وە هیچ لێهاتووییەک بۆ پادشای جیهاندار وەک زانستو حیکمەت نییە. وە پادشا بەو ئیشارەتەی کە فەرمووی نیشانی دا کە شایانی ئەم سیفەتانەیە. وە خودای ئافرێنەری جیهان خۆی دەزانێ کێ پەروەردەو گەورە بکا. خەڵکی ئەم ناوچەیە بەختەوەربوون کە تۆ بەو پلەوپایە گەیشتیو نووری عەدڵو سایەی دلۆڤانی تۆ بە سەریان کشا، کە ئەو قسەی تەواو بوو یەکی دیکە هەستا و گوتی: من زۆری لەسەر ناڕۆمو تەنیا بەو تاکە شێعرە دەیبڕمەوە.

پەسنت چ بدەم ئەوەندە جوانی
وەک هەر چی بڵێم جوانی، وا نی[2]

ئەگەر ئیزن بفەرمووی سەرگوزشتەیەک دەگێڕمەوە کە جێگەی سەرسووڕمان دەبێ. فەرمووی: بڵێ بزانم چیت پێیە: گوتی: من دە خزمەت

١. لە دیوانی حەقیقی وەرگیراوە بەرانبەر بە:
بر عکس شود هرچه به غایت برسید / شادی کـن چون غم به نهایت برسید.
٢. لە دیوانی هەژار وەرگیراوە بەرانبەر بە:
یگانه عالمی شاها، چه گویم بیش از این زیرا / همان آبست اگر کوبی هزاران بار در هاون.

گـەورە پیاوێکدا بووم. کاتێک بێوەفایی دنیام ناسـیو زانیم کە ئەم بووکە پیرە، زۆر پادشـای جحێڵو جوانی خواردووە، بە هەزاران عاشـقی سەر لە پێناوی کوشـتووە، بە خۆم گوت: ئەی نەفام! تۆ دەسـت لەناو دەسـتی کەسێک دەنێی کە دەستی رەدی بە سینگی هەزار پادشای دەستڕۆیشتووی زۆردارەوە نـاوە. بـە خۆت رابگە کە دەرفەت کەمـەو تەمەن کورتەو رێگە دووروودرێژ. نەفسی من بەو مەوعیزەیە راچەنیو وەخۆ هاتەوەو بە گیانو دڵ رووی دە کاری قیامەت کرد.

ڕۆژێک بە بازارێکدا دەسـووڕامەوە، راوکەرێک جووتێکی تووتی بۆ فرۆشتن دەگێـڕا. ویسـتم کە بۆ خێرو رزگاری ئەو لا، لە بەندیـان رزگار بکەم. راوکەر داوای دوو درهەمی دەکردو منیش لەماڵی دنیا هەر ئەوەندەم شک دەبرد. دوو دڵ بووم، نەمدەویست پووڵەکەم خەرج کەمو دڵیشم نیگەرانی تووتییەکان بوو. سـەرەنجام تەوەککول بە خودا کڕیمنو لە شار بردمنە دەرەوەو لە مێشەیەکدا بەرەڵڵام کردن. دەگەڵ هەڵفڕینە سـەر دارێک، بانگیان کردمو زۆریان سـپاس کردمو داوای لێبوردنیان کردو گوتیان: ئێمە پاداشی چاکەی تۆمان بۆ نادرێتەوە، بەڵام بن ئەم دارە گەنجێکی تێدایە، بیدەوەو هەڵیگرە. گوتم: سـەرم سووڕما! گەنج دە ژێر خاکدا دەبینن بەڵام لە فێڵو مەکری راوکەر غافڵ بوون؟ جوابیان داوە: دەگـەڵ قەزا و قەدەر هیچ ناکرێ. قەزا و قەدەر کە هات، دیتنو تێبینی لە عاقڵ دەسـتێنێتەوەو پیاوی عاقڵیش کوێـر دەکا، تا بەمجۆرە کاری خۆی راپەڕێنـێ. من عەرزم هەڵکۆڵیو خەزێنەکەم دیتەوە. پێتان نیشـان دەدەم تا ئەمر بفەرمووی بۆ خەزانەی بێننو ئەگەر ئیزن بفەرمووی منیش نەسـیبم تێی کەوێ. پادشـا گوتی: تۆوی چاکە تۆ چاندووتەو دەبێ بەهرەکەشی تۆ بیبەی. رەحمەتت نادەین.

کاتێک بەرەهمەن گەیشتە ئێرەو ئەم باسانەی گێڕاوە، رای بێدەنگ راوەستا و چیدی پرسـیاری نەکرد، بەرەهمەن گوتی: ئەوەی لە تواناما بوو لە پرسینو پەرسفدا دەگەڵ پادشا، پێشکەشم کردو شەرتی خزمەتم بەجێ هێنا، هیواداری کەرامەتێکم، کە پادشا فکری خۆی لەسەر ئەم باسانە دە کار بخا کە جوانییەکانی

حیکمـــەت خۆیان بنوێنن، وە قازانجی ئەزموونو تاقیکردنەوەش پەندوەرگرتنە. وە بەم کتێبە گەورەیی را و بۆچوونی شـــاهانە بە ســـەر پادشـــایانی رابردوودا وەدەرکەوتو عومری پادشا هەزار ساڵی لێ زیاد بوو، وە زۆری عەقڵو کەماڵی زانســـتو بلیمەتی ئەو بۆ خەڵکانی جیهان ئاشـــکرا بـــوو. وە ناوبانگی موڵکو دەوڵەتی ئەو لەســـەر رووبەری رۆژگار مایەوەو گەیشتە هەموو ئیقلیمەکانی دنیا و هەموو جیهانی داگرت. وە گوتوویانە:

تا دەوری کەمـــەر دەدا کەمەریەند
دەســـتی دژی تۆ بچێتە دەسبەند[1]

۱. تا کمر صحبت میان طلبد / کمر ملک بر میان تـــو باد.

□

# دوا قسەی وەرگێڕ[1]

رەنگە بەم کتێبە، دابشـلیم، کە پانتایی وڵاتەکەی لە سـەر یەک، لە چەند قەڵایەکـی وێرانو پێنج، شـەش جەنگەڵـی پڕ دڕکو داڵ زۆرتـر نەبوو ـ لە حاڵێکدا خاوەنشـکۆی ئەم دەوڵەتە چەندان هێندەی، وڵات بەدەسـتەوەیە ـ نـاوی بمێنێ کە لە درێژی زەمەندا کۆن نەبـێو لە نێو گەلانو نەتەواندا تازەو زینـدوو بمێنێتەوە. چونکە سـەرەتای ئەم کتێبە بە ناوی پیرۆزی پادشـا و بەرەکەتی گەورەیی‌و جوانی لەقەبو نازناوی ئەو، سوڵتانی بەرزەناوی پایەبەرز، بارامشا، قیبلەی پادشایانی نێوبەدەرەوەی جیهانو میراتگرو نێوڕاگری سوڵتان مەحموودو سـوڵتان مەسـعوود رازاوەتەوە. وە کورتەیەک لـە گەورەیی زاتی بێوێنەی ـ کە مایەی سـەربڵندی جوانییەکانـی رۆژگارەو گەوهەری تاقانەی زەمانە ـ لەسـەرەتادا باس کرا و بڕووکەیەک لە ئاسـەواری بیروڕا و شمشێری شـاهانە، کە مایەی راوەستاوی‌و شـانازی‌و رازاوەیی دینو دەوڵەتەو فەزیلەتو گەورەیی دەسـەڵاتو میللەت بە جەماڵی ئەو گەشەی کردووە، لەو سەرەتایەدا هاتە ئاراوە. وە رەمزێک لە کارە گەورەکانی خاَنەدانی گەورەی شاهەنشـاهی‌و ئەرکو تێکۆشـانی خاوەنشکۆیان، سوڵتانەکانی پێشـوو، اَنارَ اللهُ بَراهِینَهُمْ، کە گەردنو گوێی گەردوونی گەردان بە تۆقی منەتباری‌و عەبدایەتی ئەوان قورسایی لە سـەرە؛ وە شـانو پیلو سـینگو بەرۆکی زەمانە بە چارشێوشانو رەدای

---

[1]. مەبەست نەسروڵڵا مونشییە.

ئەنعامو خەڵاتی ئەوان رازاوەتەوە ـ دەگەڵ ئەو سـەرەتایە هاتووە ـ لەم رووەوە دەتوانین بزانین کە هۆی مەیلو رەغبەتی خەڵک بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە لە چیدایە. وە بە هۆی قبووڵی ئەم کارە لە لایەن مەجلیسـی ئەعلاوە، ضاعَفَ اللهُ اِشْـراقَهُ، دنیا پێشوازی هەمە چەشنە لەم کتێبە دەکا کە باسکردنی بە پێڕەوی لەنـاو دەوڵەتی بەهێزو توانا، لازالَتْ ثابتَةَ الاَرْکانِ، باری هەتاهەتاییو هەرمان وە دەست دێنێو تا کۆتایی عومری [عالەم] رۆژ بە رۆژ لە زیادبوونو گەشەکردندا دەبـێ، وە ئەڵبەتە خولانەوەی چەرخو پەلاماری زەمان ناتوانێ لێڵاییو تاریکی بخاتە سەر سەفا و جیلوەی ئەو.

وە ئەگەر بیدپای بەرەهمەن بیزانیایە کە نووسـینەکەی ئەو، ئەم شەرەفـو شـانازییەی بە نسـیب دەبێ، زۆر زۆر، فەخرو شانازی پێوە دەکردو تەمەننای دەکرد کە ئەم بەختەوەرییەی دەست کەوێو ئەم سەربەرزیو فەخرو گەورەییە بۆ خۆی مسـۆگەر بکا. وە ئەگەر گەیشتن بەم مورادە دەستی نەدابا، لە تاوان ئەم شێعرەی ئەبوونەواسی[1] دووپات دەکردەوە:

ئەگەر بەناوی کەسێک بێمە سەر شێعر نووسین
لـە باغی تەبعی منـا تۆ نەبی، نییـە بیانوو[2]

وە سـپاس بۆ خودا، ناوبانگی کارو خەسـڵەتو سـیفەتی بەرچاوی ئەم دەوڵەتە، ثَبَّتَهااللە، لە سـەر زارانەو بڵاو بۆتەوەو شـاعیرانو مەتحبێژان باسی دەکـەنو پێی هەڵدەڵێنو سـەرچاوە مێژووییەکانی پێشـوو بە دووروودرێژی لەسـەری دواون، بە تایبەتـی خواجە "ئەبولفەزل بەیهەقـی"، رَحِمَهُاللە، لەم بـوارەدا خزمەتێکی بەرچاوی کردووەو یادگارێکی بێ وێنەی بەجێهێشـتووە، هەر وەها فەرزانە "بولقاسم نەیشابووری"، رَحِمَهُاللە، مێژووی نۆرەی پادشایەتی پیرۆزی شاهەنشـاهی، مَدهااللە نووسـیوەو لەودا بە بارسـتای زانینی خۆی، ئەوەندەی ئاگادار بووە، نە بەو ئەندازەی کاری گەورەو خەسـڵەتە بەرزەکانی شاهانە هەڵدەگرێ، هەنگاوێکی هەڵگرتووە. دیسان، شاعیرانو باقی بەندەگان

---

١. ئەبوونەواس: شاعیری بەناوبانگی عەرەب لە زەمانی "هاروون رەشید" دا.
٢. اگر به نام کسی گفت بایدم شعری / به پیش طبع تو باشی همه بهانهٔ من.

بە هۆنەو پەخشـــان، ئەوەی پێویســـتەو بۆیان مومکین بـــووە گوتوویانەو لە ئاســـەواری خۆیاندا بە پێی خۆشەویستیو ئیخلاس زۆری لە سەر ڕۆیشتوون. ئـــەو کتێبانە لە لایـــەن لایەنگرانی موخلیـــسو وەفـــادارو بەندەگانی یەکدڵ دەخوێنرێنەوە. بەڵام ئەم ســـەرجەمە لە لای دۆســـتو دوژمنو موســـوڵمانو کافـــرو بێدینەوە مەقبووڵو پەســـند کراوەو تا ڕۆژێک زبانی فارســـی لە نێو خەڵکـــدا دەکار دەکرێ، بە هیچ کلۆجێـــک وەلا ناندرێو لە بیر ناچێتەوە. وە بە گۆڕانی بارودۆخو نوێبوونەوەی ڕووداوان لەودا کەموکووڕییەکو جیاوازییەک روو نادا؛ چون بنەڕەتـــی دانانەکەی کانی حیکمەتو گەنجی عەقڵانییەتە، وە بەو جلوبەرگە جوانـــەی من دە بەریم کرد، جوانییەکی وەرگرت کە عالەمیان مەفتوونو شـــەیدای بوونو لە ماوەیەکی کورتدا، هەموو هەرێمێکی گۆی زەوی دادەگرێ.

ئەوەی من ئیشـــارەم پێ کرد ڕەنگی لافلێـــدانو چاپوگووپی هەیە. بەڵام ئەگەر ســـەرنج بدرێو باشـــی لێ ورد ببنـــەوە، وە دەگـــەڵ کتێبەکانی تر کە گەورەو ماقووڵانی دەوروبەری ئەم گەورە بەڕێزە، مَدَّ اللهُ ظِلالَها و بَسَـط جَلالَها،[1] نووســـیویانەو دایانڕشـــتووە، پێکیان بگرن، دەزاندرێ کە ئەم وەرگێڕانە چۆن کراوەو لە هەموو چەشنە بەیانێکدا قودرەتو لێهاتوویی تا چ ڕادەیەک بووە.

وە ئەگەر ئەم بەندەیە کتێبێکی لە عەرەبییەوە بردە سەر فارسی، بازاڕگەرمی پێوە ناکا. چون ناوبانگی زاناییو فەزلی ئەو، لەوە لە ســـەرترە کە نیازی بەم کارانە بێو خاسو عام لەوە ئاگادارن کە ئەو لەســـەر فێرکارییو بەهرەی زانست پـــێ دادەگـــرێ. وە کەماڵی هیممەتی ئەو لە دابینکردنی هۆکاری ســـەعادەتو دەستخستنی هەموو چەشنە هونەرێکدا ئاشکرایە.

زەمانـــە کـــوڕی وەک منـــی لـــێ نەبوو
دە مەمشـــارەوە وەک کچی پا بە شوو![2]

قسەی ئاخر، ئەم بەندەی بەندەزادە، شەرەفێکی گەورەی بەدەست هێنا، وە

---

١. خودا سایەی بەردەوام بکات و زێدە شکۆی پێببەخشێ.
٢. زمانه ندارد ز من به پسر / نهانم چه دارد چو بد دختری؟

ناوبانگی لە دنیا بۆ هەتاهەتا هەر مایەوە. هەروەها زۆری وەفا و ئیخلاسی ئەو لە بەندەگی باشـــدا بۆ خەڵکی دنیا روون بۆوە. خودای تەعالا، سوڵتانی عالەم لـــە دینو دنیادا ســـەرکەوتوو بکا و تەواوی وڵاتانی رۆژهـــەڵاتو رۆژئاوا لە ژێر سێبەری ئاڵای شەکاوەو سایەی چەتری پیرۆزی شاهەنشاهیدا رووناک بکاتەوە. وە تینووانی هیوا و هومێد، لە ئاســـۆکانی جیهاندا، کە چاوەڕوانی ئیحســـانو بەزەیی شاهانە لە جامی دادپەروەری ئەو، تێراو بکا.

إِنَّهُ القادِرُ عَلَيهِو الْمُتَطَوِّلُ بِهِو اَلحَمْدُ لِلهِ رَبِّ العالَمينَ
وَ الصَّلاةُ عَلى رَسولِهِ مُحَمَّدٍو آلِهِ أَجْمَعينَ
وَ فَرَغَ مِنْ اِنْتِساخِهِ مَحمُودُ بنُ عُثمانَ بنِ ابى نَصْرِ الطَبرىُّ غَفَرَاللهُ لَهُ
وَ لِوالِدَيهِ وَ لِجميعِ الْمؤمنينَ وَ لِمَنْ قالَ آمين.
ضَحوَةَ يَومِ الخَميسِ لِثَلاثِ لَيالٍ بَـقينَ مِنَ الْمُحرَّم سَنَةَ اِحْدىٰ وَ خَمْسينَ وَ خَمْسِ مِائةٍ.

□

# فەرهەنگۆک

| کوردی | کوردیو فارسی |
| --- | --- |
| **ئـ** | |
| ئاخێزگە | زێد، شوێنی لەدایکبوون □ زادگاه |
| ئاشنایی بەرایی | ناسیاوی پێشوو □ آشنایی مقدماتی یا اولیه |
| ئاکنجی | نیشتەجێ □ ساکن |
| ئاگربرین | برینی بەسۆزو ئازار □ آتش زخم، زخم دردناک |
| ئاوەشی | میوە یا گوڵی داوەریو بە سەرما یا ئاوی زۆر □ میوه یا محصول فاسد شده براثر آبیاری زیاد |
| ئاودیمەن | ئاونوما، حەوز بۆ جوانی □ آب‌نما |
| ئاوەز | فام، عەقڵ، هۆش □ عقل و هوش |
| ئاوەزمەند | فامیدە، عاقڵ، بەهۆش □ عاقل، هوشمند |
| ئامێکی هاتەوەبەر | کەمێک بووژاوە، هاتەوە سەر خۆ □ نفسی تازه کرد، کمی حالش جا آمد |
| ئەقرەبا، عەقرەبا | دۆستو ئاشنا و نزیکان □ نزدیکان، اقربا |
| ئەنگێوە | ئەوەی چاک دەپێکی، لێزان □ صائب، دقیق |
| ئەنگوستەچاو | تاریکو تنووک □ تاریک و ظلمانی |

ئەندەروون | ژووری ماڵ بەشی ژنو منداڵ، حەرەم □ اندرونی
ئەی ڕۆ بابانێکمە | زاراوەی سەر زاری ژنان لە سەرسووڕماندا □ ای وای خاک عالم!

## ب

با بە چەنگ | دەم لە پووش، دەست بەتاڵ □ دست خالی، ندار
با پێوان | با کێشان، کاری بێهوودەو سەمەر □ آب در هاون کوبیدن
بازاڕگەرمیکردن | زەمینەخۆشکردن بۆ سوودی خۆ □ بازارگرمی کردن
بارستا | ئەندازە □ حجم، اندازه
بەدەو | جوانچاک، بۆشتاغ، ئەسپی خۆشبەز □ زیبا، شیک
بە خۆ فشین | لەخۆباییبوون □ مغرور بودن
بەخۆ (کەسێک، ...) خوڕین | لەخۆباییبوون، بە پاڵپشتی کەسێک یا شتێک لەخۆباییبوونو لافلێدان □ به کسی نازیدن و تعرض‌کردن
بەرەلێخ | دیواری پشتیوان، دیواری زیادی بۆ مەحکەمکردنی دیوارێکی رووخەک □ دیوار کمکی
بەرایی | پێشوو، بەر لەوەی ئێستا، پێشەکی □ مقدمه، مقدماتی
بەرەگە | ڕێگەی نێچیر کە ڕاوکەر دەیگرێ، پێشبەندی ئاو □ سد، مسیر شکار
بڕەمبڕەم | هەوهەوی سواران، هەراهەرا و پەلەپەل □ هیاهو
بە قوونی خۆدا دان | دەریازبوون، هەڵاتن □ فرار، در رفتن
بە فەتەڕات دان | نابووتکردن، بە کوشت دان، بە با دان □ برباد دادن، نابودکردن
بە ئێرووبوون | دەوڵەمەندی □ رفاه
بنبەست | ڕێگەی بێ دەرچوون، بنگیراو □ بن‌بست
بەو بایە دەژیم لە لای دێ | ژیانم بەستراوەتەوە بە کەرەمو لوتفی □ زندگی‌ام به او وابسته است، به لطف او زنده‌ام
بێڕەزا | ملهۆڕ، زۆردار □ زورگو، مقتدر
بێ یەکو دوو | بێ ڕاوەستانو ساوەساو، لەجێوە □ بی معطلی و بی یکی

| | |
|---|---|
| | بە دو کردن |
| بینش | تێگەیشتوویی □ بصیرت، بینش |
| بوویەحیا (عربی) | ئیزرائیل، عیزرائیل □ عزرائیل، ملک‌الموت |
| بە سەرو سینگدا دان | شیوەنو دادو هاوار □ بە سر و صورت خود کوفتن |
| بە ئەژنۆی خۆدا دان | شیوەنو دادوهاوار □ بە سر و صورت خود کوفتن |

## پ

| | |
|---|---|
| پاناوک | شوێنێک ئاوێکی تەنکی تێدا کۆ بووبێتەوە □ آبگیر کم عمق |
| پەراکەندە | پرژو بڵاو □ پراکندە |
| پەرسف | جواب □ جواب پاسخ |
| پەسن دان | تاریفکردن □ تعریف و تمجید کردن، توصیف |
| پەلەوەر | باڵندە □ پرندە |
| پووشوو | پووش □ پنبە یا گیاە نرمو خشک برای افروختن آتش، هیمیە |
| پێخۆر | ئەوەی دەگەڵ نان دەیخۆن وەک پەنیرو ماست و... □ نان‌خورش |
| پێلاوکردنەوە | کەوش داکەندن بۆ حەسانەوە □ درآوردن کفش بە منظور استراحت |
| پێل | شەپۆل □ موج |

## ت

| | |
|---|---|
| تاڵاو بە گەروودا کردن | زەجرو ئەشکەنجە دان، عەزاب دان، تەمێکردن □ شکنجە کردن، عذاب دادن |
| تفاق دەبەرکردن | تفاق دان بە ماڵات □ علوفە بە آخور حیوانات ریختن |
| تۆم، تۆو، توو | دانەوێڵەی تایبەت بە چاندن □ بذر، تخم |
| تۆزی ناشکێنێ | نایگاتێ (لە هەڵاتنو کێبەرکێو بەراوردکاریدا) □ بە گرد پایش نمی‌رسد |
| تونداو | ئاوی خوڕێن □ تنداب |
| توێژە ناوینەکان | چینی ناوەندی کۆمەڵگا □ طبقات متوسط جامعە |
| تەقڵە، تەقڵەکوت | جیلیت، جلیتانی، بە پرتاو □ چهار نعل، بە سرعت |

| | |
|---|---|
| تەنەخی | تەنبەڵی، سستی □ تنبلی، سستی |
| تەنگ پێ هەڵچنین | گوشار خستنە سەر □ تحت فشار قراردادن، محاصره کردن |
| تەوەزەل | تەنبەڵ □ تنبل |
| تێچاندن | خراپ باس کردن، فزوولی □ بدگویی کردن در مورد کسی |
| بەدگویی | خراپ باس کردن، فزوولی □ بدگویی کردن در مورد کسی |
| تێک هەڵەنگووتن | تووشی یەک بوون □ برخورد اتفاقی با کسی |
| تەرکەوەتەن | غەریب، ئاوارە □ غریب، آواره |
| تێڕۆهاتن | پەلامار دان، تەماع دە ماڵو نامووس کردن □ حمله کردن، طمع در مال و ناموس کسی کردن |
| تێ ئاخنین | بە زۆر تێنان، پەستاوتن، زۆر خواردن □ چپاندن، پرخوری کردن |
| تیرێژ | تیشک، شوعاع □ شعاع |
| تێهەڵاچوو | هەڵکشاو، قەدبڵند □ کشیده، بلند، بالاکشیده |

## ج

| | |
|---|---|
| جامەخانە | ژووری راگرتنی جلوبەرگ بە تایبەتی لە ماڵی پادشایانو دەوڵەمەنداندا □ جامەخانە |
| جامین (جانب) ویستن | لایەنگریکردن □ طرفداری کردن |
| جەریبوون | ڕووداربوون، بێشەرمیکردن □ جسارت پیداکردن |
| جینگنە، جینگنۆکە | بە پرتەو بۆڵە □ نق زن |
| جێی بانگو هاواران | پەنا و پشتیوان □ پشتیبان در گرفتاری‌ها |

## چ

| | |
|---|---|
| چاپو گووپ | لافـو گەزاف، خۆهەڵکێشان □ لاف زدن، چاخان کردن |
| چاوچنۆک | خەسیس، بەرچاوتەنگ، بەتەماع □ حسود، آزمند، حسود |
| چزیلک | وردە پۆلووی ئاگر، دووگی برژاو □ جزغاله |
| چکەچکە | کەمکەم، برووکەبرووکە □ اندک، بسیار اندک |
| چوارناڵە | هەڵاتنی توندی ئەسپ □ چهار نعل |
| چوارپەل لە عاسمان دان | سەمای ئەسپ، خۆشبەزی، توند هەڵاتن □ رقص اسب |

| | |
|---|---|
| چەپگەردی گەردوون | زەمانەی ناسازگار □ چرخ چپ گرد |
| چەختی | لاسار، پڕڕوو، بێحەیا □ بی‌حیا، پررو |
| چەقاڵتە | توێخێک گۆشتی ڕەگاوی □ گوشت پر از رگ |
| چەرمە چەقاڵتە | توێخێک گۆشتی ڕەگاوی □ گوشت پر از رگ |
| چەنەوەر | نۆڕوەڕ، نۆڕبڵێ □ حراف، وراج |
| چیکڵدانە | چینەدان، ئەندامی جێگەی دانە لە پەلەوەردا □ چینه‌دان |
| کەمچیکڵدانە | ئەوەی زوو تووڕە دەبێ، کەم حەوسەلە □ زودرنج |
| چێڵ | مانگا □ ماده گاو |

## ح، خ

| | |
|---|---|
| حەژمەت | مەینەت، غەمو پەژارە، کەسەر □ محنت، اندوه |
| حەشاردەر | شتێک کە خۆتی تێدا دەشاریتەوە، سەنگەر □ مخفی‌گاه |
| خۆبەکەمزان | کەسێک کە بێ دەعیە بێ □ متواضع |
| خواز | خواست، ویست □ خواست |
| خورتوێژ | قسەجوان، قسەخۆش □ خوش‌کلام |
| خوسرەو | پادشا، سوڵتان □ شاه، سلطان |
| خۆ نەدیو کردن | خۆشاردنەوە، خۆ حەشاردان □ مخفی‌شدن، مخفی‌کردن خود |
| خۆ هێنانە حاڵی جاوی | خۆ مراندن □ خود را به موش مردگی زدن |
| خۆ هەڵمساندن | خۆ تووڕە نیشان‌دان، خۆ بە گرینگ دانان □ باد در غبغب انداختن |
| خیرەسەر | دێوانە، سەرەڕۆ، نافەرمان □ خیره‌سر |
| خێل | جیچ، چاوی خێلو خیچ □ لوچ |

## د

| | |
|---|---|
| داخورپان | داکەوتنی دڵ، ترسـانو دڵەڕاوکێ لە نەکاو □ شوکه شدن، فروریختن دل |
| دارێکی گەیاندمێ | دارێکی لێدام، زەبرێکی بە دار لێدام □ با چوب ضربه‌ای به من زد |
| داگر | داپۆشەری هەمەلایەنە، گشتگیر □ شامل |
| دانواندن | کۆتاهاتن، تەسلیمبوون □ کوتاه آمدن، تسلیم شدن |

| | |
|---|---|
| داو دان | (لە کایەی نەردێندا) داوی زۆرتر لە حەریف کردن □ داودادن |
| داوەرووکان | کۆبوونەی جەماعەت بەپەلەو لە نەکاو □ تجمع سریع و ناگهانی |
| دراج | زێوەکەو، پۆڕ □ دراج |
| دەسگرۆ | دەستگیر، یارمەتیدەر □ دستگیر، مددکار |
| دەستبڕ | گرانفرۆش، گرانجانو فێڵباز لە موعامەلەدا □ گرانفروش، تیغزن |
| دەست لە گونان درێژتر | سەرنەکەوتوو، تێشکاو □ ناکام، دست از پا درازتر |
| داڵگۆشت | کزو لاواز □ استخوانی، لاغر |
| دڵچڵکن | دڵپیس، بەدنییەت □ دل چرکین، ناباور |
| دمبێن لێدان | بێدەنگکردنی بەزۆر □ ساکت کردن |
| دە خێڵەکەوە هاتن | تێکەڵ هاتن، حاڵەتی رشانەوە □ حالت تهوع |
| دەستی رەد بە سینگەوە نان | قبووڵ نەکردنی ویستی کەسێک، وەدەرنان □ دست رد به سینه کسی گذاشتن |
| دەست ئاوەڵا | سەخی، بەخشندە □ دست و دل باز |
| دەستهاتوو، دەستخستوو | شتێک کە حەولی بۆ درابێو دەست کەوتبێ □ اکتسابی |
| دەست تێ وەرێنان | شتێک دە ئامێز گرتن، بازنەکردنی دەست لە دەوری کەسێک □ دست را دور چیزی حلقه کردن |
| درکاندن | فاشکردن، ئاشکراکردن، بەزحمەت باسی شتێک کردن □ افشا کردن |
| دوو زبان | فزوول، قسەهێنو قسەبەر □ دو زبان، فضول |
| دژواز | دژی یەک، نایەکسان □ متضاد |
| دەمتەڕ، دەمچەور | دیلبیلان، قسەزان □ زبان چرب، چرب زبان |
| دیتران | ئەوانی تر □ دیگران |

## ر

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | پانتایی، پانایی □ سطح، رویه |
| ڕووش تێهاڵاندن | تەشقەڵەکردن، بوختانو شلتاغ □ دبه کردن به |
| ڕەپێچەک دان | بە هەڕەمە لێخوڕینو بردن □ باعجله راندن گله یا جماعت |

| | |
|---|---|
| ڕەتاندن | ڕەپێچەک دان، لابردنی بە پەلە ◘ بردن یا کنار زدن با شتاب |
| ڕەواندنەوە | لێک بڵاوکردن، ترساندنو ڕەتاندن ◘ رم دادن |
| ڕەنگئامێزی | تێکەڵاوکردنی ڕەنگەکان بۆ وێنەگەری ◘ رنگ‌کردن، رنگ‌آمیزی |
| ڕیشنەرم | نەرمکێش، ترسنۆک، خوێڕی ◘ ترسو، جبون |
| ڕووەک | گیا، هەرچی شین بێ ◘ رستنی |
| ڕۆژی پەسلان | ڕۆژی قیامەت ◘ روز قیامت |
| ڕەگەڵ خستن | ناردنی کەسێک وەک یارمەتیدەر دەگەڵ موسافیر ◘ همراه‌کردن |
| ڕژانە سەر | هێرش کردنە سەر ◘ حمله‌ور شدن به |

## ز، ژ

| | |
|---|---|
| زیان گرێ دان | باس نەکردن، ڕاگرتنی نهێنی، نەدرکاندن ◘ ساکت ماندن |
| زیپکە | جۆش، وردە، (ورکە) زیپکە بەرد ◘ جوش، ریزه |
| زێڕکفت | زێڕلێدراو ◘ زرکوب، زراندود |
| ژینەوەر | زیندەوار، زێوەر ◘ جانداران |

## س

| | |
|---|---|
| ساردبوونەوە | مردن، گیان دان ◘ مردن، سردشدن |
| سۆسەکردن | سۆراخکردن، پەی بە شوێنی کەسێک بردن ◘ سراغ گرفتن، پیداکردن |
| سلاربوونەوە | مردن، تۆپین ◘ مردن، سقط شدن |
| سۆرەو تۆرە | خزمو قەومی ژن یا مێرد ◘ قوم و خویش همسر |
| سواڵەت | گڵینە ◘ سفال |
| سوارەبەر | ئاژەڵی سواری (ئەسپ، ئێستر، کەرو...) ◘ مرکب‌سواری |
| سەرئەفراز | سەربڵند، سەربەرز ◘ سرافراز |
| سەرەتاو بنەتا | دوو جەمسەری سەرو ئاخر ◘ ابتدا و انتها |
| سەرەتی | گەورەیی، حاڵەتی لە سەرتربوون ◘ امتیاز، برتری |
| سەربەڕێ | ڕام، ئارام، حاواوە ◘ سربراه و مطیع |
| سەرەبەن | جەمسەری بەنو دەزوو لە گلۆڵەدا ◘ سرنخ |

| | |
|---|---|
| سەرەنگریێ بوون | بەربوونەوە، کەوتن بە سەر □ کلە معلق شدن |
| سەرکۆنەکردن | لۆمەکردن، تانووت لێدان □ ملامت کردن، طعنەزدن |
| سەر لە پێناو | گیانفیدا، سەردانەر □ جان‌فدا، سرباز |
| سەرەدەرکردن | حاڵیبوون، تێگەیشتن لە □ پی بردن، سردرآوردن از |
| سەلکەبزووت | سەرەبزووت، نیمسووز □ چوب نیمسوز |
| سەرەڕۆ | سەرکێش، نافەرمان □ سرکش و نافرمان |
| سەهلان | ناوی کێوێکە لە هەرێمی (نەجدی) عەرەبستان، زۆر سەختو ئەستەم □ کوهی در عربستان |
| سەهەندە | بێحەیاو ئاژاوەگێڕ □ بی شرم و ناآرام |

## ش

| | |
|---|---|
| شارشێوێن | کینایە لە کچی جوانو عیشوەگەر □ شهر آشوب، زیبا |
| شاژنی ئەستێران | مەبەست "رۆژ"ە □ ملکە ستارگان، خورشید |
| شکەنۆک | ناسکو تورت، هەر شتێک زوو بشکێو بپەڕێ □ شکننده، نازک |
| شلَغەدان، شلَغەکردن | کۆبوونەوە، لێک هاڵانو داوەڕووکان □ تجمع زیاد |
| شەشرو بێژ (بێش) | بێ حیسابو کیتاب، بێ دەست پێوەگرتن □ بی‌دربی |
| شۆفار | جاسووسو نێوان تێکدەر □ سخن‌چین، نمام |
| شۆرەکات | شۆرەزار، زەوی نمەکدارو بێحاسڵ □ شورەزار |
| شەڕە دندووکە | دەمە قاڵە، شەڕە قسە □ جنگ لفظی |
| شەقشەقین | تێهەڵدان، لێدان بە شەق □ با لگد بە جان کسی افتادن |
| شەنە بە با کردن | بە با دان، خەرجکردنی بێحیساب □ بر باد دادن |
| شێر سواری فەلەک | مەبەست "رۆژ"ە □ آفتاب |

## ع، غ، ف، ق

| | |
|---|---|
| عەرز قووتی دا | ونبوونی لە نەکاو، بێ سەروشوێن چوو □ زمین او را بلعید و گم شد |
| قرنە گۆمە | سەر دە ئاو رۆکردن، شەڕە مەلە □ در آب فروبردن سر و درآوردن |
| قسەی کاڵ | قسەی ناسک، جنێو، قسەی سووک □ دشنام، توهین |

| | |
|---|---|
| **قسەی زبر** | **قسەی ناحەز، قسەی ناسک** □ کلام درشت، توهین |
| **قوپان** | **رۆچوونی بەدەنەی دەفرو ئامراز** □ قوز شدن، فرورفتگی |
| **قوڕی کوێ بە سەردا کەم؟** | **رێگەچارەم چییە؟ چی بکەم؟ (لە ناهومێدیدا)** □ چه خاکی به سرم بریزم! |
| **قوون دادان** | **هەڵترووشکان، لە سەر قوون دانیشتن** □ نشستن روی کپل |
| **قەلەبەڵەکە** | **قالاو، چەشنێک قەل** □ زاغ |

## ک

| | |
|---|---|
| **کاری سەکرانە** | **کاری شێتانە، بێعەقڵانە** □ کار احمقانه |
| **کاڵان** | **جێگای خەنجەرو شمشیر** □ غلاف خنجر و شمشیر |
| **کڵۆڵیو ملۆڵی** | **سستیو داکەوتوویی** □ پیری، ضعف و سستی |
| **کۆختەی خەمان** | **ژووری غەمو خەفەتو دە فکرەوەچوون** □ کلبه احزان |
| **کولاوکە** | **رۆچن، دەلاقەی میچ، کولانە** □ روزن، روزنه در سقف خانه |
| **کونجید** | **کونجی** □ کنجد |
| **کەس بە کڵاوی ناپێوێ** | **کەس بە پیاوی نازانێ، کەس حیسابی لەسەر ناکا** □ کسی به او اهمیت نمی‌دهد |
| **کەکرە** | **گیایەکی زۆر تاڵە** □ گیاهی بسیار تلخ |
| **کەلەلا** | **ماندوو، لە پێ کەوتوو** □ خسته و از پا افتاده |
| **کەمدوو** | **کەمقسە، کەسێک کەم دەدوێ** □ کم حرف |
| **کەندڕ** | **قووڵکە، چاڵایی** □ حفره |

## گ

| | |
|---|---|
| **گرانجان** | **گرانفرۆش** □ گرانفروش |
| **گرێبەست** | **پەیمان، قەرارومەدار** □ پیمان، معاهده |
| **گوڕم** | **تین، گەرما، بڵێسە** □ گرم، لهیب آتش و گرما |
| **گوڵئەستێرە** | **کرمێکە بە شەو دەدرەوشێ** □ کرم شب‌تاب |
| **گولە** | **هیچو پووچ، ناقۆڵا** □ نااصیل، نااصل، مردک |
| **گوێڕایەڵ** | **چاو لە فەرمان، گوێ لە مست، نۆکەرمەسلەک** □ گوش |

| | |
|---|---|
| | بەزنگ، تابع |
| گوێ لە مست | گوێڕایەڵ، چاوەڕێی فەرمان، نۆکەر □ گوش به زنگ |
| گوێزان | چەقۆی ردێن تاشین □ تیغ سلمانی |

## ل

| | |
|---|---|
| لان، لایەن | جامین، جانیب □ جانب کسی، طرف |
| لەشکاری | شیکاری جەستە □ کالبدشکافی |
| لە بنەوەبڕ | کەسێک کە لەبنەوە فێڵو ئاژاوە دەگێڕێ، ئاوری بن کا □ آب زیرکاه |
| لە خۆ ریاو | خوێڕی، ترسەنۆک □ جبون، بزدل، ترسو |
| لەجێوە | زوو، فەوری، بێ ماتڵبوون □ درجا، فوری |
| لە پێ کەوتن | ماندووبوون، شەکەتبوون □ خستەشدن، از پا افتادن |
| لە سەر زاران | بەناوبانگ، مەنشوور □ مشهور، شایع |
| لەجەر | کز، لاواز، داڵگۆشت □ لاغر و استخوانی |
| لەخۆباییبوون | مەغروربوون، بە دەعیەو ئیفادەبوون □ بە خود بالیدن، مغرور شدن |
| لۆمەو لەقەم | غەیبەت، بەدگویی، بە خراپ باسکردن □ تهمت و افترا |
| لەنگو لۆر | ناساز، شکاو، شەلو گێڕ □ ناجور، ناقص و ناکار |
| لێکدەرەوە | ماناکەرەوە، تەعبیریار □ تعبیرکننده، مفسر |
| لێک کردنەوە | ناسینەوە، ناسینی جیاوازی دوو شت □ از هم تشخیص‌دادن |
| لێک ترازان | لێک هەڵبڕان، جیابوونەوە □ از هم جدا شدن |
| لێڵ، لێڵایی | قوڕاو، ناڕوون، شلوێ، □ کدر، گل‌آلود |
| لێو بە بار | هەناسەسارد، کزو داماو، ناساغ □ بینوا و درمانده، غمگین |

## م

| | |
|---|---|
| ماتە هەڵگرتن | بۆسە گرتن، خۆ مات دان، مەڵاس بوون □ کمین‌کردن |
| مادەرزاد | زگماک □ مادرزاد |
| ماسوورە | لوولەی باریکو کورت □ ماسوره |

| | |
|---|---|
| مایه فیتنه | شەڕنەنگێز، شەڕهەڵایسێن □ شرانگیز، فتنه‌انگیز |
| مشککره | مەلێکە وەک سەقر کە مشک دەگرێ □ نوعی مرغ شکاری |
| منداری دوژمن زۆر | مەبەست ماڵو سامانی دنیایە □ جیفه و مال دنیا |
| مەتحبێژ | مەدداح، ئەوەی بە پادشا و کەسایەتییەکان هەڵدەڵێ □ مداح |
| موتوریه، متوریه‌کردن | پەیوەند لێدان، پێکەوە گرێ دان □ پیوند زدن |
| مەلکەمووت | ئیزرائیل، فریشتەی مەرگ □ عزرائیل، ملک‌الموت |
| مەفع بوونەوە | لەناوچوون، تێداچوون □ محو شدن |
| مەن | قورسایی ٣ کیلۆگرام □ من (وزن ٣ کیلو) |
| مەند | مەتین، بە زیپکو زاکون، بەڕێز □ متین، باوقار |

## ن

| | |
|---|---|
| نزم سروشت | خوێڕیو پەست، جەبوون □ پست فطرت |
| نەفام | ناحاڵی، نەزان، کەر □ نفهم ، نادان، احمق |
| وسکوت | بێدەنگ، خەفە □ ساکت، خاموش |
| وەڕەز | بێزار، ماندوو □ بیزار، خسته از |
| وە زگ کەوتن | ئاوسبوون، حامیلەبوون، منداڵ وە زگ کەوتن □ باردارشدن |
| وە گیان کەوتن | حەزبردن لە خۆراک، بە ئیشتیا خواردن □ لذت بردن از |
| وەکان | کۆی (وەک) □ امثال؛ وەکانی ئێوە □ امثال شما |
| وێچواندن | شباندن، وە شتێک یا کەسێک شباندن □ تشبیه کردن |
| وێ کەوتن | دۆستایەتیو نزیکی کردن، هەڤاڵەتی □ رفاقت کردن |
| وێناکردن | نیشان دان، ناساندن بە وێنە □ نمایاندن، نشان‌دادن |

## هـ

| | |
|---|---|
| هەژدەرهەژدەر | پەیتاپەیتا، بە توندیو لەسەر یەک □ پی‌درپی و سریع |
| هەڵکردن | بەڕێچوون (بێ تۆ هەڵناکەم) □ زندگی کردن، بەسەر بردن |
| هەڵپرووکان | سیسبوون، هەڵوەرین □ پژمردن، برباد شدن |
| هەڵاوارده | هەڵوارتە، شاز، بێمانەند □ استثنا، برجسته |
| هەڵاتن | دەربازبوون، دەرکەوتنی مانگو ڕۆژو ئەستێرە □ فرارکردن، |

| | |
|---|---|
| | طلوع کردن |
| **هەڵکورمان** | **دانیشتن یا هەڵنیشتن بە بێدەنگی‌و داماوی** □ کز کردن |
| **هەنگێ** | **ئینجا، پاشان، دوایە** □ سپس، آنگاه ، بعد |
| **هێز دە بەردا بوون** | **هەبوونی تاقەتو توانا** □ توان و طاقت داشتن |
| **هێڕ** | **گێژو وڕ، سەر لێ شێواو، خوارو گێڕ** □ گیج و منگ، کج و کوله |



ناوەندی توێژینەوەی کوردستانناسی

لە زنجیرە کتێبەکانی ناوەندی توێژینەوەی کوردستانناسیی زانکۆی ئازادی ئیسلامیی سنە

٢

کلیلەودیمنە بێگومان گەنجینەیەکی بەنرخە بۆ بەرینکردنەوەی پانتای هزرو ئەزموونی ژیانی مرۆڤ. خوێنەر بە خوێندنەوەی ئەم دەقە کلاسیکە نە تەنیا لەگەڵ وشەی قەبەو جوانیناسیو توانای ئەدەبیدا رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵکوو لە ڕێگای حیکایەت و گێڕانەوەوە ـ کە تیایدا لە هەموو دەفرایەتییەکانی ژانری چیرۆک وەک: دارشتنی کەسایەتی (Characterization)، فەنتەزیا (Fantasy)، گێڕانەوە (Narration)، کێشمەکێش (Conflict) کەڵک وەرگیراوە ـ سیاسەتکردن، بریاردان، ئەخلاق، مامەڵە لەگەڵ دەسەڵات، لەگەڵ مرۆڤو لەگەڵ ژیانو پێکەوە ژیانو پووچەڵکردنەوەی پیلانو حیکمەت فێر دەبێت. خوێنەری کلیلەودیمنە رووبەڕووی سەدان ئەزموونو بەسەرهاتو حیکایەت دەبێتەوە تا لە دەلاقەی ئەم دەقە کلاسیکەوە خۆ بسپێریتە ئەو هەموو ئەزموونو حیکایەتو بەسەرهاتە لە زاری ئاژەڵانەوە تا وانەی ژیان وەربگرێت.
بایەخی کلیلەودیمنە تا رادەیەکە بە هوموو زمانە زیندووەکانی دونیا وەرگێڕدراوەتەوەو هەموو میللەتانی دونیا لە خوێندنەوەی، چێژی خۆیانی لێ وەردەگرن.
پاش خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە بەنرخە بە کوردی ئەم راستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە کلیلەودیمنەی مامۆستا ئەحمەد قازیش ئەبێتە مایەی دەوڵەمەندکردنی زمانو ئەدەبی کوردیو ئەم هەنگاوەشی وەکوو هەنگاوەکانی دیکەی، خزمەتکردنە بە زمانو ئەدەبی نەتەوەکەی.

دیزاین: ئازاد سورخی





9 786005 647976

قیمەت: ١٨٠٠٠ تمەن